منتدى إقرأ الثقافي

# ئینسایکلۆپیدیای کەرکوک



## هونەری تەلارسازی و

### نەخش و نیگاری کەرکوك و دەورووبەری

### لە ڕوانگەی سەردەمە مێـژوویـیـەکانەوە

سەرپەرشتیاری گشتی نووسین و پێداچوونەوە

سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)

بەرگی هەشتەم



# ئینسایکلۆپیدیای کەرکوک

## بەرگی هەشتەم

## هونەری تەلارسازی و نەخش و نیگاری کەرکوک و دەوروو بەری لە ڕوانگەی سەردەمە مێژووییەکانەوە


نووسینی:

سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)



٢٠٢٣

دەزگای رۆشنبیریی جەمال عیرفان

بڵاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیریی
جەمال عیرفان ٢٠٢٣
زنجیرە: (١٤٥)

بەڕێوەبەری دەزگا:
سیروان حەمەسەعید حەمەخورشید

**ناوی کتێب: ئینسایکلۆپیدیای کەرکوک- بەرگی هەشتەم: هونەری تەلارسازیو نەخشو نیگاری کەرکوکو دەورووبەری لە ڕوانگەی سەردەمە مێژوویەکانەوە**
**نووسینی: سمکۆ بەهرۆز (ئەژی).**
**پێداچوونەوەو پێشەکی: عەبدولجەبار مستەفا باخەوان.**
**سەرپەرشتیاری نووسین و پێداچوونەوە: سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)**
**سەرپەرشتیاری زانستی و ئەکادیمی: د. یوسف گۆران**
**سەرپەشتیاری کارگێڕی: زاهیر شکور**
**دیزاینی ناوەوە: بورهان عەبدولکەریم عەلی**
**دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی**
**تایپ: بێریڤان پیشتیوان - زەینەب حەمید**
**وێنەگر: سەروەر عەبدوڵڵا.**
**نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم: ٢٠٢٣**
**تیراژ: ٥٠٠ دانە**
**چاپ: چاپخانەی تاران**

**لە بەڕێوەبەرێتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارە سپاردنی (٢٠٠٧)ی ساڵی ٢٠٢٠ پێ دراوە**

Tel: 0533202936 07736959302
email: jamalerfan99@gmail.com
jamal erfan cultural foundation
www. jamalerfan.com

ناونیشان: سلێمانی، شەقامی سالم، بەرامبەر قەیوان تاوەر

# ئینسایکلۆپیدیای کەرکوك

## بەرگی هەشتەم

## هونەری تەلارسازی و نەخش و نیگاری کەرکوك و دەورووبەری لە ڕوانگەی سەردەمە مێژوویییەکانەوە

نووسینی:
سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)

پێداچوونەوەو پێشەکی:
عەبدولجەبار مستەفا باخەوان

٢٠٢٣

# پێشەکی[٧]

هونەر ووشەیەکە زۆر لایەنی ژیان دەگرێتەوە (دەروونیو مەتریالی، موزیك، نەخشەکێشان، تەلارسازی، سینەما، شانۆ، وێنەکێشان، پاراستنی تەندروستی، بەکارهێنانی ڕەنگ، ڕووناکی، پەیکەرسازی، دارتاشی، ئاسنگەری.. هتد)، هەندێ بابەتی هونەر هەیە هەردووکی کۆ دەکاتەوەو بەیەکەوە دەیانبەستێتەوە لەناو یەك کاردا، تەلاسازی یەکێکە لەو هونەرانەی لەم بوارەدا خۆی دەبینێتەوە، نەك تەنها دوو بابەت هونەر بەڵکوو پتر لەخۆ دەگرێت (نەخشەکێشان، وێنەکێشان، ڕووناکی، ئەمانە زیاتر لایەنە دەروونیەکە دەگرنەوە، پەیکەرسازیو بەکارهێنانی ڕەنگو دارتاشیو ئاسنگەریو جۆرەهای هونەری تر.. هتد)، ئەمانەش لایەنی مەتریالییەکەیەتی. دەردەکەوێت گرنگی هونەری تەلارسازی، بەڵام گرنگییەکی تری هەیە ئەوەش بابەتی نووسینەکەی مامۆستا (سمکۆ)یە، بابەتە مێژوویەکەیەتی، بێ ئاساندنی ڕووی مێژوو ئاسان نیە ئێستاو دوواڕۆژ بخوێنینەوە، (مێژووی هونەری تەلارسازی ناوچەی کەرکوك لە ڕوانگەی سەردەمە مێژوویەکاندا) تایبەتمەندیێکی خۆی هەیە لەبەر ئەم هۆیانەی لای خوارەوە:

١. مێژووی هونەری تەلارسازی بوارێکی گرنگی گەلی کوردو ناوچەیەکی دیاریکراوی کوردستانی کردووەتە مەبەستی نووسینەکەی تا ڕۆژانی ئەمڕۆشی پێوەبێت بە دەگمەن مێژوونووسانو خەڵکانی پسپۆری بوارەکە بە لایدا چووبێتن.

٢. وەك کەلتوور، بەداخەوە لەو گەلانەین بایەخمان نەداوە بە پاراستنی کەلەپوری خۆمان، بۆیە سەرچاوەشمان زۆر کەمە بۆ مەبەستی لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی ئەم بابەتانە.

٣. هیچ دەزگایەکی تایبەتمەند نیە، یا ئەگەر هەبێت یا کەمتەرخەمە یا بێ تواناو کەم دەسەلاتو کەمی توانای ئابووری هەیە، بۆ لێکۆڵینەوەو پاراستنی کەلەپورە مێژوویەکانمانو بەتایبەتی لە کەرکوك.

ئەو هۆیانەی لای سەرەوە، بە بێ هیچ گومانێك ئەرکی مامۆستا سمکۆی زۆر قورس کردووەو لە چەندایەتیو چۆنایەتی ئەو سەرچاوانەی بەکاری هێناوە دەردەکەوێت، ئەمەش کارێکی مەزنەو کار ئاسانییەکە بۆ کەسانێکی تر گەر بیانەوێ لەسەر ئەم بابەتە کارێك ئەنجامدەن.

ماوەیەك بۆم ڕەخسا مامۆستا بووم لە بەشی تەلارسازی لە فەکۆڵتی ئەندازیاری زانکۆی سلێمانیو هەوڵمدا هونەری تەلارسازی کوردی بکرێتە یەکێك لە وانەکانی ئەم بەشەو بە یارمەتی هەندێ لە هاوڕێکانم بڕیاری لەسەردرا، بەڵام وەك وانەی تەلارسازی ناوچەیی (العمارة المحلية) لەبەر ئەوەی زۆربەی مامۆستاکان بڕوایان بەوەنەبوو کە کورد خاوەنی ئەم هونەرە بێت، هەر لەم بوارەدا دووجار میوانداری مامۆستا سمکۆم کردو جارێکیش مامۆستا عەبدولڕەقیب یوسف بۆ پێشکەشکردنی زانیاریەکانیانو چەسپاندنی هەبوونی تەلارسازی کوردی، بە شێوەیەکی چاوەڕوانەکراو هەر سێ وانەکە سەرکەوتووبوون، ئەم پەرتوکەش بوو بە سەرچاوەیەکی گرینگی وانەکە.

لە (٢٣-٢٥)ی ئاداری ساڵی (١٩٩٠) کۆنفراسێك بەسترا لە شاری فلۆرەنسای ئیتالی لە ژێر ناوی (کوردستان)، چەند بابەتیك دەستنیشان کرابوون بۆ لێکۆڵینەوەو باسکردن، بۆ یەکەم جار یەکێك لە بەشداربووان باسی تەلارسازی کوردی کرد، هاوڕێیەکم لە تەنیشت دانیشتبوو بە دەنگێکی نزمەوە چەرپاندیە گوێمەوەو ووتی: "ئێمەی کورد کوا ئەم هونەرەمان هەیە"، مامۆستای وانەبێژەکە ئیتالی بوو بەڵام هاوڕێکەم کورد بوو؟ پاش دەیان ساڵ ، لە ساڵی (٢٠١٣) بوو، بۆ ماوەی چەند خولەکێك ئەندازیارێکی تەلارسازی زۆر بەناوبانگی کوردم بینیو باسمان هاتە سەر تەلارسازی کوردیو بێ یەكو دوو ووتی: "ئێ کورد کوا خاوەنی تەلارسازیە ئێمە هیچمان نییە لەم بابەتە"، ووتم "ئەی چەرموو؟"، بێدەنگ بووو وازی لە گفتوگۆکەی هێنا.

باسکردنی سێ بابەتی لای سەرەوە وەك نموونە، شێوەیان بەداخەوە تاکوو ئێستا زۆرن، مەبەستم لێیان تەنها ئەوەیە دەبێت بیسەلمێنین بۆ خەڵکانی پسپۆری بوارەکە پێش ئەوانیتر کە کورد خاوەنی سامانێکی گەورەی ئەم هونەرەیە، ئەمەش کارو لێکۆڵینەوەو بۆچوونی زۆری دەوێت بۆ هەڵدانەوەو پشکنینی لاپەڕەکانی مێژوو و چینەکانی ژێر زەویو بخرێنە بەرچاوی ئەو لایەنو کەسانەی نایانەوێ بڕوا بە ڕاستییەك بکەن کە هەڵگری ڕاستەقینەی ناسنامەی نەتەوەیەکە خاوەنی مێژوویەکی زۆر کۆنە لەسەر ئەم خاکەو بە درێژایی ئەم مێژووە زۆری پێشکەشی مرۆڤایەتی کردووە.

مامۆستا سمکۆ بە ئەنجامدانی ئەم پەرتووکە بەشێکی باشی ئەو کارەی پێکاوەو زۆر زانیاری گرنگی خستوەتە ڕووو بە تایبەتی لایەنە مێژووییەکەیو پێویستە بکرێتە سەرچاوەیەکی بە نرخ بۆ بەدوواداچوونی یەك بە یەکی ئەو

بابەتانەی دەستنیشانکراون لە هەر سیانزە بەشی پەرتوکەکە "بە بەشی سەرچاوەکانیشەوە"، لەبەر ئەوەی ئەو بەشەش گرنگییەکی تایبەتی خۆی هەیە.

مێژووی تەلارسازی لە پەیدابوونیەوە تاکوو رۆژانی ئێستامان و لە ناوچەی کەرکوك و دابەشکردنی بە پێی چەرخ و سەردەمەکاندا، جیاکردنەوەی شێوەوو جۆرەکانی هونەرەکە زۆر سەرکەوتوو بووە تێیدا لەلایەنی روونکردنەوەی نەخشەو بەکارهێنانی کەرەستەی بیناو هەڵبژاردنی رەنگەکان دانانی کەرەستەی پێویست لە ناو تەلارەکاندا، پاشان جیاکردنەوەی بەکارهێنانی تەلارەکان چ ئەوەی بۆ نیشتەجێبونە یا پەرستگایە یا کۆشکی پاشاو فەرمانڕەواکانە یا بۆ بەکارهێنانی گشتیە وەك گەرماو یا نەخۆشخانە.

لەلایەنی پسپۆڕی هونەری تەلارسازیەوە، هەر یەك لەو بەشانە بواری تایبەت و پسپۆری خۆی هەیە لە زانکۆو پەیمانگاکانی وڵاتە پێشکەوتوەکاندا دەخوێندرێن و هەوڵدەدەن بۆ پاراستنی ئەو سامانانەی لە کۆنەوە بۆیان ماوەتەوەو بە هیچ نرخێك نایخەملێنن و بە سەدەها لێکۆڵینەوەو نووسینی جۆراوجۆر لەسەریان بڵاوکراونەتەوەو دەیان یاسای نیشتیمانیان بۆ دەرکراوە بۆ پاراستنیان و لە ناونەچوونیان چونکە ئەوانە بە موڵکی نەتەوایەتی دادەنرێت هەتا ئەگەر موڵکی شەخسیش بێت، بۆیە دانیشتوانی ئەو وڵاتانە هەموو کارە هونەری و تەلارسازیانە بە موڵکی خۆیانی دەزانن و دەیپارێزن و مێژووەکەی دەخوێنن و شارەزاییەکی باشیان هەیە.

هەڵبەتە ئێمەش دەتوانین زۆر بەئاسانی بەو کارانە هەڵسین گەر ئیرادەمان هەبێت، خۆ ئەوانە تەکنۆلۆجیای پێشکەوتوی ئەم سەردەمە نین، جۆرەها کارن هەموو کەسێك دەتوانێت رۆڵی خۆی تێدا ببینێت، گەر یەکێك خانووێکی کەلەپوری هەبێت چی دەوێت دەستکاری بکات بۆ پاراستن و هەڵنەسێت بە رووخاندنی و دروستکردنی خانویەکی ناشرین لە جێگاییەو گەوهەرەکە دەبێت بێ بەها بێت لە نرخیدا.

لەگەڵ دەستخۆشی لە هاوڕێم مامۆستا سمکۆو بەرەو بەرهەمی سەرکەوتو لەم بوارەداو بە ئاگاهێنانەوەی دام و دەزگا فەرمییەکان و کەسانی پسپۆری بوارەکە بۆ ئاوەڕدانەوەیەکی راستەقینەو بەرەو پاراستنی کەلەپوری تەلارسازی لە کوردستان و بە تایبەتی لە شاری کەرکوك و بکرێتە بەڵگەیێکی حاشا هەڵنەگرتووی چەسپاندنی کوردستانیەتی شارەکە.

ئەندازیاری تەلارساز:
عەبدولجەبار مستەفا باخەوان
کەرکوك

## بەشی یەکەم

# هونەری بیناکاری و نەخش و نیگاری سەردەمەکانی پێش مێژووی ناوچەکانی کەرکوك و دەوروبەری

هونەری بیناکاریو نەخشو نیگار شێوازێکی چەسپاوی ژیانی مرۆڤایەتییەو شوێنێکی دیاری کراوی هەیە لە بناغەی شارستانیەتی مێژووە جۆربە جۆرەکاندا.

دەتوانین هونەری بیناکاری دابنێین بە بنەڕەتی هەموو هونەرەکانی دی، چونکە بناغەی هەموو کارەکانی ترە لە بنیات نانی شارستانییەتی هەر شارێك یان ناوچەیەکدا. دامەزرێنەری بناغەیە بۆ دۆزینەوەی ڕابردووی هەر گەلێك ئەگەر بە دوای شارستانییەتە بنەڕەتەکەیدا بگەڕێین.

کاتێك باسی هونەری بیناکاریو نەخشو نیگاری ناوچەی کەرکوك دەکەین، زنجیرەیەکی مێژوویی بنەڕەتی بیناکاری ئەو شارەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە چۆن سەردەمە مێژووییەکان دەوریان بینیووە لەدروست بوونی ئەو ناوچەیەدا لە پێکەوە نانی شارستانییەتێکی مێژوویی سەردەم.. دەگەینە ئەو ڕاستییەکە هونەرەکە بەپێی سەردەمە مێژووییەکان هەنگاوی ناوە، بەڵام لەگەڵ سەردەمەکاندا کارتێکردنو جوانکاری (الابداع) دەوروپشتەکەیو ناوچەکەی مۆرکێکی تایبەتی خۆی وەرگرتووە، کە بە شارستانییەتی ناوچەکەی خۆی ناسراوەو دەناسرێتەوە لە ناو شارستانی کوردستاندا.

((نەخشکاری یەکێکە لەو هونەرانەی کە مرۆڤ هەر لە کۆنەوە بایەخی پێ داونو دەست ڕەنگینی خۆی تێدا خستۆتە کار، بۆیە دەشێ بکرێ بە بەڵگەیەکی دیکەی پێشکەوتنی شارستانییەتیو بلیمەتی ئەو ئەندامانەی کۆمەڵ[1].

چونکە هونەری بیناکاری بە گشتی هیچ جوانییەك نادات ئەگەر هونەری نەخشو نیگاری تێدا بەکارنەهێنرێت کە ئەو کاتە جوانکاریو بەدەوکارییەکی (الابداع) تر دەدات بە هونەری بیناسازییەکە.. ئەمەش وا دەکات بیناکاریو نەخشو نیگارو کۆتەڵو گۆزەکاریو هەڵکۆڵین، هەریەکە تەواو کەری ئەوی تر بێت بۆ تەواو کردنی جوانکاری هونەرەکە.

((ئەگەر سەرنجێکی نمونەکانی ئەم هونەرە بدەین لە کوردستاندا، بۆمان دەردەکەوێت کە یەکجار بەهێزو جوانو بەرزنو دەکەونە نێو خانوور دیوەخانو جێگەی دانیشتنی شارەکانەوە.. ئەم نەخشانە یان گەچین، یان لە دار کراون وەکو نەخشی دەرگاو پەنجەرەی دارو عورووسیو سەندوقو شتێ لەم بابەتە، یان لەسەر بەردی وەك مەڕ مەڕدان، یان لە پارچە شووشەی بچووکی ڕەنگاو ڕەنگ سازکراون))[2]، بۆیە بمانەوێت یان نەمانەوێت نەخشو نیگارو هەڵکۆڵین وەکو هونەری بیناکاری قۆناغی جۆربەجۆری بڕیوە تا گەیشتۆتە ئەم سەردەمەی ئێستامان، شان بە شانی بیناکارییەکە قۆناغەکانی خۆی قۆستۆتەوەو توانیویە کە تواناو قوڵو باسکی دیاری بکات. بوونی نەخشو نیگارو هەڵکۆڵینو جۆری ئەو ڕەنگانەو قەبارەی ئەو نەخشەی کە تێدا بەکارهاتووە، وای کردووە بتوانین مۆرکێکی جوانی ئەو هونەرە بدۆزینەوە لە نێوان هەزاران نەخشو نیگارو بیناکاریدا لە ناوچە جۆر بەجۆرەکانی کوردستان کە ناوچەی کەرکوکیش بەشێکە لەو وڵاتە فراوانە کە مۆرکی کوردستانیو مۆرکی ناوچەیی خۆی هەیە.

لێرە بە دواوە هەوڵدەدەم هونەری بیناکاریو نەخشو نیگارو گۆزەکاریو هەڵکۆڵین شی بکەمەوە لە ناوچەکانی (کەرکوك) بە تایبەتی شوێنەکانی (کەرکوك)و (پردێ)و (تازە)و (داقوق)و (خورماتوو)و (چەمچەماڵ)و (مەتارە).

*** سەرەتاکانی هونەری بیناکاری سەردەمی بەردینی کۆن لە ناوچەی کەرکوك:**

((ئەوەی تا ئێستا گرنگە شتێکی ئەوتۆ نەدۆزراوەتەوە بگەڕێتەوە سەردەمی بەردینی کۆنی ژێرەوە، تەنها شتێکی پارچە پارچەی ڕووکاری لەم لاو لەولا دۆزراوەتەوە.))[3].

بۆیە ئەوەی پێویستەو گرنگی هەیە بۆ باسەکەمان لەو

سەردەمەدا، ناوچەی دۆزراو (بەردە بەڵکە)یە.

((لە دووری سێ کیلۆمەتر کەوتۆتە سەرووی ڕۆژهەڵاتی (چەمچەماڵ)ەوە، لە دووری (٢٠٠) مەتر لە خوارووی ڕۆژهەڵاتی کەرکوکەوە. لە لێژاییەکی، لقێکی کورتی لقەکانی (چەشیرواسو) کە ڕێ دەکات بەلای خوارووی ڕۆژهەڵاتەوە، هاوگونجاو لەگەڵ دەشتی (چەمچەماڵ) بۆ (باسەرە)، لە دوایدا ئەشکێتەوە بۆ خوارووی ڕۆژئاوای، بۆ لای ڕووباری داقووق))[٤].

((بریتییە لە یەک پارچەیەک لە بەردی (کلس)، کەشێوەیەکی ڕێک و پێکی نییە، لەوانەیە کە لوولەکی بووایە ئەگەر تووشی خووران و داتاشین نەبوایە لە لاکانییەوە، هەروەها لە ژێرەوەی درێژییەکەی چوار مەترە، دەورەکەی لەپانترین شوێنی دیسان چوارمەترە، بەڵام دەوری بەشی ژێرەوەی بریتییە لە دوومەترو بیست سانتمەتر))[٥].

((ئەم شوێنە بریتییە لە یەک چینی شارستانی ژێر کەوتوو لە ژێر چینێک لە لیتەو زیخ بە بارستایی پێنج پێ، کە تێدا هەندێک کەرەستەو ئامرازی بەردینی تێدا دۆزراوەتــەوە، کە نیشتووی کلسی ڕەنگ سەوز داپۆشیوە، لە دوایدا بە ڕەنگی سووری کایی (تبنی)، بەڵام چینی بەردیی شوێنەکە زۆر بە چاکی یەکی گرتووە، بۆتە پارچەیەکی یەکگرتووی زۆر بەهێز.

لێکۆڵەرەوەکان گەیشتوونەتە ئەوەی کە: ئەم کۆتەڵە تەنها بریتییە لە پاشماوەیەکی سروشتی بۆ شوێنێکی خۆ پاراستن کە هۆیەکانی ڕماڵین و داخوراندن کاری لێ نەکردووە، ئەو کەرەستانەی کە لەسەر ڕووی ئەو شوێنە دۆزراوەتەوە لە کاتی خۆیدا لەژێر چینی ئەو بەردە دابووە، بەڵام بەهۆی هۆیەکانی ڕماڵین و داخوراندن هاتۆتە سەر زەوی لە سەردەمەکانی داهاتوودا.

پاشماوەکانی مرۆڤی لە کەرەستە بەردینەکان لەو ناچەیەدا دابەش دەکرێتە سێ بەشەوە:

– یەکەمیان بریتییە لە کەرەستەی چەوی.
– دووەمیان پاچی دەستی.
– سێیەمیان بریتییە لە کەرەستەی بەردە ئەستێ (صوان).

بەڵام کەرەستە چەوییەکانی هەموو بریتییە لە بەردی (کلسی و گەچی)، کە هەمووی لە جۆری کلسی ڕووبارەکەیە لە شێوەی تۆپی و هێلکەیی، هەنگاوەکانی دروست کردنی بریتییە لە توێکڵی لێوارەکان یان ڕووی چەوەکە بە کراندنی دوو پریشک یان زیاتر لەناوەڕاستییەوە، یان هەیانە بە پریشک کردنی دوو ڕووی لەیەک چوو لە لێوارەکەی.))[٦].

کەرەستە ئەستێ (صوان) ووردەکارەکانی کە زۆربەی پیشەسازی (بەردە بەڵکە) پێک دەهێنێت لە جۆرەهای جیاواز لە کرکرە (مقاشط)ی سادە دروست کراو لە پارچەی ئەستێ کە هیچ شێوەیەک ناگەیەنێت، هەروەها لە جۆرەها پریشک و پارچە، کە لە لێوارەکانی یا زیاتر لە لێوارێک، هیچ شتێک ناگەیەنێت کە بۆ چ جۆرە بەکارهێنانێک بەکار هاتووە.

بەڵام نێرەک (لب) جۆرەهایە، هەیە (پەیکە–قەوان) شێوەیە کە جۆرەها ڕووی هەیە، زۆری ئەم جۆرانە یان شێوە بچووک یان مام ناوەندییە. بەڵام پاچە دەستییەکانی، هەندێکی دروست کراوە لە پریشکی گەورە کەزۆر کەمە تیایاندا هەبێت پاچەکانیان شێوەیەکی باش و تەنکی هەبێت، چونکە زۆری پاچەکان شێوەیەکی سادەو ناڕێکە (غليظة)، کە سەرەتاکانی لە سەر شێوەی دڵ یان لۆزەیە، ژمارەیەکی کەمی لە جۆری درێــژە[٧]. وا باوەڕ هەیە کە پاچە دەستییەکانی (بەردە بەڵکە) دەگەڕێتەوە سەردەمێکی پێش سەردەمی ئەشکەوتی (زرزی)و (هەزار مێرد) نزیک لە سولەیمانییەوە.. خاڵێکی گرنگ ئەوەی لە (بەردە بەڵکە)دا بەچاو دەکەوێت ئەگەر بەراووردی بکەین لەگەڵ ناوچەکانی تری هەمان سەردەم، سەردەمی (ئەشیلیە)، ئەوەیە کە (بەردە بەڵکە) پاشماوەی حەوانەوەی مرۆڤی تێدانییە، چونکە ناوچەکانی تر، مرۆڤ بە دەستی خۆی مۆڵگەکەی دروست کردووە، لە کاتێکدا کە بەهار بووە یان کەش و ئاوو هەواکەی خۆش بووە دەستی کردووە بە بزاوتن و گواستنەوە لە شوێنێکەوە، بۆ شوێنێکی تر، لەگەڵ خۆیدا مۆڵگە کاتییەکەی گواستۆتەوە کە زۆر سانا بووە لە دروست کردنەوەیدا، مرۆڤ لەو سەردەمەدا مۆڵگەکەی بە جۆرێک دروست کردووە لە شێوەیەک کە لە ژێر زەوییەوە بێت لە قووڵییەکی دیاری کراو و سەرەوەی بە تەختە داپۆشیوە، بانی گرتووە بە پێستی ئاژەڵان و هێسک و پروسکی پاشماوەی ئاژەڵەکان))[٨] ئینجا دەگەینە ئەو ڕاستییە کە نەبوونی مۆڵگەیەکی دیاری کراو لە (بەردە بەڵکە)، بوونی ئەشکەوتی جۆر بە جۆر لە ناوچەکەدا وای کردووە کە مۆڵگەی حەوانەوەی بووبێت و لە کاتی بزاوتندا ئەشکەوتێکی تری دیبێتەوە بۆ ئارام گرتن.





**کەرەستە دەفرییەکانی (بەردە بەڵکە)**









**کەرەستە بەردینەکانی (بەردە بەڵکە)**

























**کەرەستە بەردینەکانی ڕاوکردن لە (بەردە بەلّکە)دا**




**کەرەستە بەردینەکانی ڕاوکردن لە (بەردە بەڵکە)دا**

*** ئەشکەوتی پاڵە گەورە:**

((کەوتۆتە دووری بیست میل لە ڕۆژهەڵاتی (چەمچەماڵ)[9] کەوتۆتە سەرووی ڕۆژهەڵاتی شوێنی (کەریم شایەر)ەوە، (پاڵەگەورە) پێك هاتووە لە سێ ئەشکەوتی لێك نزیك بوو، دەرگاکەی پێك هاتووە لە سێ گۆشەیەکی سەرەو ژێر، فراوانترینیان کەوتۆتە لای دەستە ڕاستەوە، پانییەکەی نزیکەی (٣,٥) مەترەو قوڵییەکەی نزیکەی هەشت مەترەو بەرزییەکەی یەك مەترە، لە ناویدا ژمارەیەك گۆزەی شکاوی ماوەی (نەینەوا)و (هۆری) نیوەی یەکەمی هەزاری دووەمی پێش زایینی تێدا دۆزراوەتەوە، لەگەڵ چەند پریشکێکی ئەستێی))[10].

((هەر چەندە چەند ئەشکەوتێك دۆزراوەتەوە لە سەرووی عێراقدا بەڵام ئاسەوار زانەکان هیچ وێنە یان هونەری هەڵکۆڵینیان نەدۆزیوەتەوە هەروەکو ئەوەی کە دۆزراوەتەوە لە خوارووی (فەرەنسا)و سەرووی (ئیسپانیا)و ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا..))[11].

لەوانەیە لەوەختی خۆیدا وێنەو هێڵی جۆربەجۆر کێشرابێت لە ئەشکەوتەکانی (شانەدەر)و (هەزارمێرد)و (پاڵی گەورە)و (زرزی).. چونکە زۆری ئەو کەرەستانەکە دۆزراوەتەوە ڕوویەکی (تجریدی) لە سەرەتادا هەبووە، بەڵام زاناکان گەیشتونەتە ئەوەی کە لە ڕابردوودا دیوارەکانی ئەم ئەشکەوتانە تووشی کارەساتی سروشتیو باو باران‌و لافاو بوونە، یان کەڵەکە بووی خوێناوو ڕوواندنی گیای درێژ لە نێوان بەردی ئەشکەوتەکەدا، بۆتە هۆی لە دەسدانی ئەو ئاسەوارە بە نرخانە یان، لە ناودانی وێنەی سەر دیوارەکان لە وانەیە لە کاتی خۆیدا بوونی هەبووبێت[12] دۆزرانەوەی کەرەستەیەکی زۆری جۆربەجۆر لەو ناوچەیە دەمانگەیەنێتە ئەوە کە شوێنی بەردەوامی ژیانی مرۆڤایەتی بووەو ژیانی تێدا بە بەردەوامی گەشەی کردووە، هەردەم ئاوەدانی پێوە دیار بووە.

*** ئەشکەوت یەکەم ماڵی مرۆڤ:**

لەگەڵ دروستبوونی ژیان لەگۆی زەویداو بەپێی ئەو گۆڕانە جیۆلۆجییەی کەبەسەر کەش‌و ئاو هەوادا هاتووە، ئەو ڕاستیە یەکلا بووەتەوە کە گۆی زەوی لە دەرئەنجامی کۆمەڵێك پێکدادانی لەگەڵ ئەستێرەکانی ترداو لە ئەنجامی دەرهاویشتەی گۆڕینی ئاو هەوا لەڕووی تیشکی خۆرو کاریگەری بەسەر هەسارەکانی ترەوە وای کرد کە گۆی زەوی بکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو گۆڕانە ئاو هەوایەی کەبەسەر ژیاندا هاتووە لە ئەنجامدا ژیان لە گۆی زەوی دروست بوو مرۆڤیش وەکو پێوستی ژیان لە ئاو هەواو خۆڵ‌و ئاگر بەردەوام بوو لە ژیانداو شارستانیەتە یەك لەدوای یەکەکانی دروست کرد، ئەویش لە چوارچێوەی ئەو یاسایەی کە گۆی زەوی پێدا ڕۆیشتووەو بۆتە دەروازەیەکی گرنگ لەخۆ گونجاندنی مرۆڤ لەسەر زەویدا.

مرۆڤیش گەلێك دەردەسەری‌و چەرمەسەری چێشتووە لەپێناو مانەوەی لە ژیان‌و بەردەوام بوونی لە پێشکەوتنی شارستانی.

لە ئەنجامی دروستبوونی دۆڵ‌و چیاو شاخ‌و دەشتاییدا گۆی زەوی تووشی چەند سەدەیەکی لێکترازان هەڵوەشان‌و داڕوخان بووە کە لەگەڵ خۆیدا بۆتە دەروازەیەکی گرنگ لەسەر گۆی زەوی.

لە ئەنجامی گۆڕانە جیۆلۆجییەکاندا ئەشکەوت‌و تونێڵ‌و ڕێڕەوە تووشەکان پەیدا بوونە لەگەڵ بەکارهێنانی بازووی مرۆڤیشدا بۆتە دالدەی یەکەم ماڵی مرۆڤایەتی.



**ئەشکەوتی پاڵە گەورە**



**وێنەی سەردیواری ناوەوەی یەکێك لە ئەشکەوتەکان**



**کۆمەڵێك ئەشکەوتی لای شارۆچکەی کفری**

*** گرنگی ئەشكەوت لە چاخە بەردینەكاندا :**

**لـەدوای** ئـەو سـەهـۆڵ بـەنـدانـە گـەورەیـەی كـە بەسـەر گـۆی زەویـدا هـات یەكەم شارستانیەك كە لـەدوای بەفرو بەستەڵەكەكانی گۆی زەویدا سەری هەڵدا سەردەمی چاخە بەردینەكان بوو

ئەشكەوت ئـەو مۆڵگە گرنگەی مرۆڤایەتیە دەتوانین **بە یەكەم** ماڵی مرۆۋ و بە یەكەم دەروازەی خۆ گونجاندنی **مرۆۋ لەگەڵ** ژینگەدا دایبنێین، لەبەر ئەوەی ئەشكەوتەكانی كوردستان‌و **گۆی** زەوی جێگەی خۆ سازدانی مرۆۋ بووە بۆ باشتركردنی ژیانی، ئەویش لەبەر گرنگی ئەشكەوت لە شوێنەكانی كۆچڕەویدا لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی تر.

ئەگەر بوونی ئەشكەوتەكان نەبووایە بەشێكی زۆری مرۆۋ نەیدەتوانی خۆی سازبدات لەگەڵ ئەو ژینگەیەی كە تێیدا گەورە بووە، چونكە ئەشكەوت گرنگییەكی گەورەی هەیە **لەڕووی ئابووری‌و** تەلارسازی‌و ئاینی‌و كۆمەڵایەتی.

**ئەشكەوت** هەرچەندە مۆڵگەیەكی بچووكە بەڵام پێگەیەكی **گرنگە بۆ** كۆبوونەوەی كۆمەڵێ كەس لە هاوپەیوەستی پەیوەندیە كۆمەڵایەتییەكان كە دەبێتە پێگەیەكی گرنگ بۆ چاككردنی زمان‌و خۆگونجاندنی بارە ئابووریەكەی ئەو كۆمەڵە كەسە كە لەو ئەشكەوتەدا دەژین.

ئەگەر سەیری شارستانیەتی چاخە بەردینەكان بكەین لە **كوردستاندا** دەبینین ئەشكەوتەكانی بەردە بەڵكە پاڵە گەورە هەزار مێردو شانەدەر دەوری گەورەیان بینیوە لە پێگەیشتنی مرۆڤی نیدرتاڵدا، لەبەر ئەوەی ئەشكەوت مۆڵگەیەكی خۆ سازدان بووە بۆ پێگەیاندنی ئاوەزی مرۆۋ لە فراوان **بوونی یان تێگەیشتنی بۆ شتەكانی دەوروبەری، ئەویش** لەچوارچێوەی **بەكارهێنانی ئەشكەوت وەك دەروازەیەك یان** پلیكانێك بۆ باشتر چاكردنی ژیانی.

ئەشكەوتەكانی سەردەمی **چاخە بەردینەكانی كوردستان** ئەو راستیەیان یەكلا كردۆتەوە كە چەندێك **توانیویانە خۆیان** بگونجێنن لە ئاو و هەوای كوردستاندا، لەبەر ئەوەی لەڕووی تەلارسازییەوە ماڵی یەكەم‌و لەڕووی كۆمەڵایەتییەوە پێگەی لێك تێگەیشتن‌و زۆربوونی مرۆۋ و پەیوەندی كۆمەڵایەتی‌و سازدان بوو بۆ دروستبوونی ئەو پەیوەندیانە.

لەڕووی ئابوریشەوە توانایەكی بەهێز بووە بۆ مرۆڤەكانی ئـەو ئەشكەوتە كە توانیویانە خواردنی خۆیان لەو ئەشكەوتەدا بەهاوبەشی دابەش بكەن‌و گرنگی پێ بدەن لە راوكردنی هاوبەشدا چ لەڕووی بەدەستهێنانی گۆشت‌و خوری‌و پێستەكەیدا.

لـەڕووی ئاینیشەوە پێگەیەكی گرنگی سرووتە ئاینیەكانیان بووە بۆ پەرستنی خوداوەندی دایك یان خوداوەندەكانی لـەوەدوا، ئەویش لەسەر بنەمای پەیوەندییەكانی ترس‌و تێگەیشتن بۆ جیهانێكی ترو خۆ شاردنەوە لە ئاژەڵە دڕندەكان.

لـەڕووی بیناكاریشەوە هەرچەندە كەموكوڕی **هەبووە،** بەڵام توانیویەتی ئەو دەورە گرنگە ببینێت بۆ خۆشاردنەوەی مرۆۋ لە سەرماو **گەرماو ئاژەڵە دڕندەكان.**

*** ئەشكەوتەكان وەكو یەكەم پێشانگای هونەری؛**

لەگەڵ پێشكەوتنی ژیانی مرۆڤایەتی لە **ئەشكەوتدا بیری** لەوە كردۆتەوە كە ئەشكەوتەكەی بڕازێنێتەوە **بە پێستی** ئەو ئاژەڵە دڕندانەی كە راوی كردووە **یان بەو ئێسك‌و** پروسكانەی كەوا لەدوای خواردنی ئاژەڵەكاندا **بەجێیان** هێشتووە.

ئەو كەرەستانەی كە لە ژیانی رۆژانەیدا **بەكاری هێناوە** لە تەون كاری‌و كەرەستەكانی راوكردن‌و شەڕدا **هەستاوە بۆ** بەكارهێنانی لەنەخشی تابلۆی هونەری لە **ئەشكەوتەكەی** لەسەرەتادا ئەو كەرەستانەی بەكاری هێناوە، **لە ڕەنگكردن‌و** هەڵكۆڵیندا بریتی بووە لەبەردی ئەستێ‌و **خەڵوزو رۆنی** رووەكی‌و ئاژەڵی بەتایبەتی ئەو ئاژەڵانەی كە راوی كردووە.

لە بەكارهێنانی (فڵچەش) بۆ تێكەڵكردنی ڕەنگەكان هەستاوە بە بەكارهێنانی خوری یاخود تووكی ئەو ئاژەڵانەی كەڕاوی كردووە، ئەو ڕەنگانەی كە زیاتر بەكاری هێناوە بریتی بووە لە ڕەنگی رەش‌و سپی، ئەویش لەبەر ئەوەی دوو ڕەنگی سەرەكین لەو ڕەنگانەی كە مرۆۋ ناسیویەتی.

رووناكی‌و تاریكی ئەشكەوت دەورێكی باڵای بینیوە بۆ بەكارهێنانی ڕەنگەكان لە كێشانی وێنەكانیدا، چونكە لە هەندێ باردا بەكارهێنانی ڕەنگی رەش **لە وێنەكێشانی** ئەشكەوتەكاندا هاوپەیوەست بوو لەگەڵ ئەو رووناكیەی لە ئەشكەوتەكەدا هەبوو، توانیویەتی جیهانێكی خەیاڵی وا دروست بكات كە بتوانێت دەربڕبێت بۆ ئەو ئەندێشەو خەیاڵاتەی كە لە چوار دەوریدا دروست **بوو بەتایبەتی بۆ** كێشانی وێنەی ئەو ئاژەڵانەی **كە سوودی لێ بینیوە یاخود ئەو** ئاژەڵە دڕندانەی **كە ڕاوی كردووە وەكو زاڵبونێك هەستی بەرامبەر ترس، چونكە ڕەنگدانەوەی وێنەی ئاژەڵێكی** دڕندە ئەو بیرو باوەڕە یەكلا دەكاتەوە كە لەپاڵ بازوو توانای هەست‌و ئاوەزیشی بەكاردێنێت بۆ ئەوەی ترس نەبێتە (مۆتەكەیەك) بەسەریدا لەكاتی راوكردنی ئەو ئاژەڵە دڕندەیە.

وێنەكێشان لە ئەشكەوتدا خۆی لەخۆیدا دەروازەیەكە بۆ جادوو سرووتە ئاینەكانی كە لەبەرامبەریدا كڕنووشی بۆ بردووە كە لەدوایدا بووە بە دەروازەیەكی گرنگ بۆ تێگەیشتنی لەدنیای پەنهان‌و شاراوە یان هەنگاوێك بووە بۆ تێگەیشتن لە ئاین بەڵام زۆر بەداخەوە ئەگەر سەیری ئەشكەوتەكانی كوردستان بكەین زۆر بەدەگمەن رێكدەكەوێت كە وێنە یان تابلۆیەكی تێدابێت، ئەویش لەبەر هۆكارە سروشتییەكان‌و دەستی مرۆۋ لە تێكدانی ئەویش بەهۆی سووتانی ئەشكەوتەكان یاخود سەوزبوونی گژوگیایەكی زۆرو لەدوایدا وشكبوونی‌و یان هۆكارەكانی باران‌و ئاو دەوریان بینیو لەدەستدانی ئەو تابلۆ هونەریانەی لەناو ئەشكەوتەكاندا، چونكە لە گەلێك كاتدا شێی ئەشكەوتەكان دەبێتە توانەوەی ئەو ڕەنگانەی كە لە تابلۆكاندا بەكار هاتووە.



یەکێك لە ئەشکەوتەکانی خورماتوو

*** ئەشکەوت لەڕووی تەلارسازی:**

ئەگەر لەڕووی بیناکارییەوە سەیری ئەشکەوت بکەین بریتیە لە مۆلگەیەکی قوولّی پێچاو پێچ کە زیاتر لە دەروازەی چیاکانەوە دروست بووە، ئەویش لە ئەنجامی داخوراندن و داڕوخانی کاریگەرە جیۆلۆجیەکان یان لە هەندێ کاتدا مرۆڤ بازووی خۆی بەکارهێناوە لە ڕێکخستنیدا.

هیچ ئەشکەوتێك پێوانەیەکی ڕێکو پێکی نیە بەڵکو هەمووی ناڕێکەو بە بنمیچێکی کەوانەی داپۆشراوە کە بەرزییەکەی زۆر نزمەو گەورەو بچوکی بە پێی ئەو شوێنەی کە تیای هەڵکەوتووە دەگۆڕێت ئەویش لە جۆری بەردەکەو کاریگەری داخوراندن تێیدا یان لەسەر بنەمای کاریگەری مرۆڤ بۆ گەورەکردنەوەی زۆری ئەشکەوتەکان دەروازەیەکیان هەیە یان لە هەندێك باردا چەند دەروازەیەکی پێچاوپێچ و جۆراوجۆریان هەیە، زۆری دەروازەکان بچووکن کە مرۆڤێك یان زیاتر پێدا تێناپەڕێت.

لەڕووی کەش و هەواشەوە ئەشکەوت لە هاویندا فێنك و لە زستاندا گەرمە، یان هەندێ لە ئەشکەوتەکان ماوەیەکی دوورو درێژی هاتوچۆی بەناو دەروویدا لە شوێنێکی جیاواز لە شوێنەکەی خۆی دەردەچێتەوە.

هەروەها ئەشکەوت جێگەیەکی گرنگە لەڕووی بیناکارییەوە بۆ پاراستنی مرۆڤ لەهێرشە دەرەکیەکان، بەتایبەتی ئەو هێرشانەی کە ڕوویانداوەو بووە بە هۆی پاراستنی ڕێژەیەکی زۆر لە مرۆڤ بۆ بەربەرەکانی لە هێرشەکاندا، هەروەها ئەشکەوت جێگەیەکی گرنگە بۆ شاردنەوەی خواردنەکانی مرۆڤ بەتایبەتی دانەوێڵەکان بۆ تۆوکردن لە وەرزی داهاتودا هەر ئەوەش وایکرد لە زۆربەی ئەشکەوتەکاندا دانەوێڵەی جۆر بەجۆر بدۆزرێتەوە کە مێژووەکەی بۆ سەردەمی چاخە بەردینەکان دەگەڕێتەوە.

*** ئەشکەوتەکانی کوردستان:**

ئەمانەی خوارەوە نموونەیەکە لە ئەشکەوتەکانی کوردستان کە هەریەکەی خاوەنی مێژوویەکی دوورودرێژن لە ڕەوتی ڕووداوە ێژووییەکاندا.

١. ئەشکەوتی (پاڵە گەورە) لەلای چەمچەماڵ.

٢. ئەشکەوتی (شانەدەر).

٣. ئەشکەوتی (هەزار مێرد).

٤. ئەشکەوتی (تۆم تۆم) لە باکوری ورمێ.

٥. ئەشکەوتەکانی (خوڕەمك ئاباد)و (هەلیلان).

٦. ئەشکەوتی (کل داود) لەسەر پۆلی زەهاو.

٧. ئەشکەوتی (کبە) لە باکوری شاری کرماشان.

٨. ئەشکەوتی (راوچییان) لە چیای بێستون.

٩. ئەشکەوتی (مەرخۆل) لە خۆرهەڵاتی ئەشکەوتی راوچییان.

١٠. ئەشکەوتی (مەڕنار) لە چیای بێستوون.

١١. ئەشکەوتی (مەڕدزان) لە چیای بێستوون.

١٢. ئەشکەوتی (مەڕ تاریك) لەسەرووی ئەشکەوتی راوچییان.

١٣. ئەشکەوتی (مەڕ ئیسماعیل) لەسەرووی ئەشکەوتی راوچییان.

١٤. ئەشکەوتی (مەڕی دوو دەرگا) لەسەرووی ئەشکەوتی راوچییان.

١٥. ئەشکەوتی (بێ خاڵ) لەدەشتی دیان.

١٦. ئەشکەوتی (بێستوون) لە سنووری ئێران.

١٧. ئەشکەوتی (زەرزی).

١٨. ئەشکەوتی (کێوانیان) لەناوچەی رەواندووز.

١٩. ئەشکەوتی (یەراك) لەناوچەی رەواندووز.

*** سەرەتاکانی هونەری بیناکاری لە کەریم شایەردا لە چاخی بەردینی ناوەڕاستدا:**

((کەریم شایەر شوێنەکەی لەلای گردەکانی چەمچەماڵ لە دووری دوو کیلۆمەتر لە لای سەرووی ڕۆژهەڵاتییەوە[١٣]. رووبەرەکەی نزیکەی دەهەزار مەتر دووجا دەبێت[١٤]، کە دەکاتە نزیکەی ئێکرێنێك[١٥]، ماوەی سەردەمەکەی دەگەڕێتەوە سەرەتای چاخی بەردینی ناوەڕاست لە دوای ماوەی (زاوی-چەمی)[١٦] لەبەر ئەوە دەبینین جۆرێکی جیاوازە لە سەردەمی بەردینی ناوەڕاست کە تایبەتمەندییەکی هەیە لە جۆری ئەو کەرەستانەی کە دۆزراوەتەوە لێی.

((چونکە پلەپلە دانیشتوانی (کەریم شایەر) لە کۆکردنەوەی میوەهاتو سەوزە، گەڕاونەتەوە سەر ژیانی کشتوکاڵی لەم سەردەمەداو هەر بە یەکجاری لە ئەشکەوت دوور کەوتونەتەوە[١٧] لە بەر ئەوە لە ڕووی دابەشکردنەوە کەوتۆتە نێوان (پاڵە گەورە)و (چەرمو)، هەر لە بەر ئەوە دەبینی ئەو ناوچەیە زنجیرەیەکی نەپچڕاوی سەردەمە بەردینەکانە.

((ئەم شوێنە کەوتۆتە سەر دوورییەکی دیاری کراو، پێك هاتووە، لە چینێکی نیشتەجێی تەنیا، کە ڕاستەوخۆ کەوتۆتە ژێر گردەکەوە (لە ژێر داپۆشراوەیی لیتەکەوە)، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێك کە مرۆڤ ژیانی ئەشکەوتیان بەجێ هێشتو بەرەو ژیانی نیشتەجێی هەنگاویان نابێت، وەکو ئەوەی دێیان دروست کردبێت[١٨]. دۆزینەوەی شۆستەیەکی چەوری نا ئاسایی بە تەواوەتی درێژەوە بوو لەناوچەکەدا، زەوییەکەی وا دەگەیەنێت بۆ بوونی کوختی دیاری کراو لە ناوچەکەدا، بەڵام هەرچەندە تا ئێستا نەخشەی نیشتەجێ بوونی تێدا نەدۆزراوەتەوە بە شێوەیەکی ڕوونو دیاری کراو.

ئەگەر هاتوو وا دابنێین کە شوێنی (کەریم شایەر) ناوچەیەکی نیشتەجێیی نیمچە کۆچەری بێت، کە ئەمە وا دەگەیەنێت ڕاستییەکە بەرەو پێشکەوتن بۆ بەرەو ژیانی نیشتەجێی بوونی بەردەوام[١٩].

((بەڵام ناتوانین بگەینە ڕاستییەکی تەواو لە شێوەی دروست کردنی خانووی (کەریم شایەر)دا. کە ناوچەکانی تری هەمان سەردەمی (کەریم شایەر) شێوەیەکی دیاری کراوی هەیە لە خانوو دروست کردن دا.. بەڵام دەتوانین بگەینە ئەو ڕاستیە کە خەڵکی (کەریم شایەر) کۆچی زستانو هاوینیان کردووە، کە لە زستاندا خۆیان ئاخنیوەتە ئەشکەوتە بەردیەکان خۆیان پاراستووە لە سەرما و باو بارانو لە هاویندا هاتوونە دەرەوە، بۆیە ڕێی تێدەچێت (ئەشکەوتی پاڵە گەورە) نزیکترین شوێنی داڵدەی خەڵکی (کەریم شایەر) بووبێت لە هاویندا هاتبوونە دەرەوە شێوەی ژیانێکی نیوە نیشتەجێیان دروست کردبێت. شێوەی هاتووچۆیەك بووە لە نێوان (پاڵە گەورە)و (کەریم شایەر)دا، ئەمەش دەمانگەیەنێتە ئەوەی کە بۆیە بایەخیان بە شێوەی بیناکارییەکی ڕێكو پێك ودیاری کراو نەداوە، چونکە لە ماوەی وەرزەکاندا کۆچ ڕەویان کردووەو خۆیان لە (پاڵە گەورە)دا مەڵاس داوە.

((ئاسەوار ئاسەکان چینێکی بەرد ڕێژیان دۆزیوەتەوە کە شێوەیەکی دیاریکراوی نییە، هەر بەردێکی بەقەدەر بارستایی دەستێك دەبێت، هەروەها پاچی بەردیو داسیان دۆزیوەتەوە، لەو باوەڕەدان کە تیژی داسەکەیان بەکارهێناوە بۆ بڕینی قامیشەڵان بۆ دروست کردنی خانوو، کۆمەڵە بەردی ئاگریان دۆزیوەتەوە لەگەڵ چاڵی دیاری کراو بۆ شاردنەوە، لەگەڵ دۆزینەوەی پارچە بەردی دەستاڕو دەستاڕی قازمەی بەردی پریشکدار، ئەمانە هەمووی ئەوە دەگەیەنێ کە کشتوکاڵ لە سەرەتا دابووە.. کەرەستەی ئارایشت دۆزراوەتـــەوە، وەکو میرو ملوانکەو بەردی حەپۆلەو دڵی، دۆزینەوەی دەنبووسی ئێسکی ژمارەکەمو سادە[٢٠]، دەتوانین هاوشێوەی (کەریم شایەر) لە ناوچەی (ملقعات) بدۆزینەوە لە سەر ڕێگای (کەرکوك-هەولێر)، لەم شوێنەدا خانووی هەڵکەنراو دۆزراوەتەوە لە ژێر زەوی کە پێك هاتووە لە دیواری خڕ کە لە سەر بەرد دروست کراوە کە بەردەکەی قۆقز نییە، درێژەکەی لە زیخو بەرد داڕێژراوە[٢١]، شوێنی هەندێکی بە پەرژین دەورە دراوە، ئەو شتانەی کەدۆزراوەتەوە پێك هاتووە لە ئەزامیلو هاوەناتی بەردی.))[٢٢].

*** گەشەکردنی هونەری بیناکاری لە چەرمودا:**

قەڵای (چەرمو) کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی شاری چەمچەماڵەوە لە دووری پانزە کیلۆمەتر، لە دووری سیو پێنج (٣٥) کیلۆمەتر لە ڕۆژهەڵاتی شاری کەرکوکەوە، توانرا کە پاشماوەی دێیەکی کۆن بدۆزرێتەوە لە ڕووبەری (١٤٠٠) مەتری چوار گۆشە، بەرزی لەسەر ئاستی دەشتەکەی تەکییەوە نزیکەی (٢٣) پێ بەرزە[٢٣].

ڕووبەری ئەم شوێنە (١٤٠×٩٠) مەترە، قوڵی پاشماوە شوێنەوارییەکەی نزیکەی (٧م) لە بەرزترین لوتکەی گردەکەوە قوڵە[٢٤]، کەوتۆتە سەر دۆڵێك کە یەکێك لە لقەکانی ڕووباری عوزێمی پێدا دەڕوات ئەویش ڕووباری داقوقە[٢٥]. بە دەستە ڕاستی ڕێگەی نێوان (کەرکوك)و (سولەیمانی) و دەستە چەپی ڕێگەی نێوان (چەمچەماڵ)و (سەنگاو)ی کەوتوەتە سەر.

لە زۆربەی سەرچاوە مێژووییەکاندا ئەم شوێنەوارە بە (چەرمو) واتە سپی بە ناوبانگە، چونکە تا ئەمڕۆش لە ناوچەی چەمچەماڵدا دێیەکی نزیك ئەم شوێنەوارە هەیە بە قەڵای (چەرمو) ناو دەبرێت[٢٦] شوێنەواری (چەرمو) لە چلەکاندا لەلایەن فەرمانگەی پاشماوە دێرینەکانی عێراقەوە

دۆزرایەوە.

لە ساڵی (١٩٤٨)ی زایینی نێردەیەکی هاوبەشی پسپۆڕی پاشماوە دێرینەکانی سەر بە (ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتی ئەمریکی)و زانکۆی (هارفۆرد)، سەرکاری نێردەکە کۆنەناس پرۆفیسۆر (ڕۆبەرت بریدوود) بوو، پسپۆڕە لە زانستی نەژادو شارستانی پێش مێژوو سەرەڕای ئەوەیش ئەندازیارێکی لێ هاتووی ئاوەدان کاری بوو، لەم ئەرکانەدا (لندا بریدوود) خانمی خێزانی یارمەتی دەدا کە ئەویش پسپۆڕ بوو لە توێژینەوەی پاشماوە دێرینەکانی پێش مێژوو، هەروەها خاتوو، (سارلوت ئۆتن) وێنەگری ئەم نێردەیە بوو، دکتۆر (فەرەج بەسمەچی) یش نوێنەری کارگێڕی پاشماوە دێرینەکانی عێراق بوو، ئەم نێردەیە یەکەمین جار (٢٤) ی مایسی بەهاری (١٩٤٨)ی زایینی دەستی بە پشکنین و هەڵکەندنی شوێنەواری (چەرموو) کرد بە تایبەتیش لە گۆشەی باکووری گردەکەدا، ماوەی یەك هەفتە کاریان لێ دەکرد. دووبارە لە ئەیلولی (١٩٥٠) زایینیدا دەست کرایەوە بە نۆرین و هەڵکەندن جارو بار تا ساڵی (١٩٥٥) زایینی پشکێنراوە نێردەکە ئەوەی بۆ دەرکەوت ئەم شوێنەوار نشینە لە شازدە چینی نیشتەجێ بوون پێك هاتووە تا قوڵی (٢٣) پێ پاشماوەی دێرینی لێ دۆزیەوە[٢٧].

چەند ژمارەیەك دانراوە بۆ دیاری کردنی مێژووی شارستانیەتی (چەرمو)، کە نزیکترینیان لە ڕاستیەوە پشکنینی زانستی دیاری کراوە بە هۆی ڕشتەی (ڕادیۆ کاربۆن-١٤)ەوە ساڵی (٦٧٥٠ پ.ز)ی دیاری کردووە[٢٨] بەڵام بە هۆی لێدانی تیشك لە سەر گوێچکە ماسییەکانی ئەم ناوچەیە ساڵی (٤٧٥٠ پ.ز) بۆ دانرا، لێکۆڵینەوەی دووبارە لە سەر خەڵوز، ژمارەی زیاتری بە دەستەوە دا، بەڕێز (بریدوود) ساڵی (٦٥٠٠ پ.ز) بۆ دانراوە [٢٩])، بەڵام زۆری لەو باوەڕدان لە ساڵی (٦٧٥٠) یان زیاتر دادەنێن بۆ شارستانیەتی (چەرمو)[٣٠].

هەندێك ژمارەی ماڵەکانی (چەرمو) لە بەرەبەیانی شارستانیەتی دا بە نزیکەی (٥٠) ماڵ داناوەو ژمارەی دانیشتوانیشی خۆی لە (٣٠٠) کەس داوە[٣١].

یان هەندێکی ژمارەی دانیشتوانی بە نزیکەی (١٥٠) کەس داناوە، ژمارەی خانووەکانی بە (٢٥-٣٠) خانوو دادەنێت، کە نزیکەی (٢٥) خانووی لێ دۆزراوەتەوە کە جێگەی نیشتەجێیی بێت[٣٢].

(چەرمو) یەکێکە لە کۆنترین مەڵبەندەکانی مرۆڤ لەم چەرخانەدا، هەروەها (میتاڵ-معدن) لەم چەرخانەدا بەکاردێ بە تایبەتی (مس)و (مسگەری) پەیدا دەبێت (١٦) چینی شارستانی لە شارۆچکەی چەرمودا دۆزراوەتەوە کە هەر چینەی هی چەرخێکە لە چینی یەکەوە هەتا چینی دە هی دەورەکانی بەردە وە هەر بەرد بەکار هاتووە بۆ کاروباری ژیان بەسەر بردن، لە چینی یانزەوە گڵ پەیدا دەبێت واتە پێنج چینەکانی دوایی لە چەرخی گڵ و میتاڵ دایە، دیارە ئەم شوێنە لە دەوری بەردی کۆنەوە ئاوەدان بووە، کە نزیکەی دە هەزار ساڵ پێش زایین بووە، بە گشتی شارۆچکەی چەرموو وێنەی شارۆچکەیەکی پێش کەوتوو پڕ بە پێت و بەرەکەتی چەرخەکانی (٧-٦) هەزار ساڵی[٣٣] پێش زایینییە لە کوردستاندا، بەڵکو یەکێکە لە کۆنترین شارۆچکە ئاوەدانەکانی جیهان[٣٤] کە یانزە چینی ژێرەوەی لە چینی یەکەمی ژێرەوە هیچ شوێنەوارێکی گۆزەکاری تێدا نییە، کە ئەمەش سەردەمی کۆنی سەردەمی بەردینی نوێ دەگەیەنێ، تێیدا پیشە سازی گۆزەکاری بەکار نەهاتووە کە پێی دەوترێت سەردەمی پێش گۆزەکاری نموونەی ئەم سەردەمەش لە (ئەریحا) لە (فەلەستین)و (چەتاڵ هیۆك) لە (ئەنادۆڵ) دۆزراوەتەوە[٣٥]، لەگەڵ پاشماوەکانی (جاینۆ) لە هەمان شوێن.

دەتوانین بڵێین شارستانی چەرموو دەچێتەوە سەر چاخی بەردینی نوێ لە ڕووی ئابوورییەوە بەڵام لە بەر ئەوەی گڵکاری نەبووە، ناتوانین بڵێین کە گەیشتۆتە قۆناغی چاخی بەردینی نوێی پێشکەوتن، هەرچەندە کە ئەویش هێشتا پێویستی بە بەڵگەو بە سەلماندنێکی وردی زۆر ترە[٣٦].

((بە پێی دەستنیشان کردنی (جاکێت)و (وولی) ئەوەیان بەدەر خستووە کە ڕێژەی (١٥٠-٢٠٠) کەس هەبووە، کە ڕێژەی پیشەکار لە یەك نیشتەجێدا بریتی بووە لە پێنج کەس لە خانوویەکدا. هەروەها پیرۆی (نظام) جم و جووڵ گەشەی کرد بوو، چونکە بەخێو کردنی ئاژەڵ وای لێ کردبوو کە بەکاری بهێنین بۆ گواستنەوەو جووڵە ئەمەش لە دیاردەی دۆزینەوەی شوێنەوەکارەکانیدا بەدەردەکەوێت، ئەویش لە بەر بوونی دۆزینەوەی شووشەی بورکانی (الزجاج البرکاني)[*] لە (چەرموو)دا، کە لەوانەیە لە ئەرمینیاوە لە وڵاتی ئەنادۆڵەوە هێنرابێت[٣٧].

لەم ماوەیەدا مرۆڤ گەیشتبووە هەوڵ بۆ دابڕانی پاشەڕۆکانی لە ناو خانووەکەو بەکارهێنانی لە کاری تایبەتمەندێتی داو لە باری جیاوازدا، هەروەها دۆزینەوەی شوێنی چێشت لێنان کە جۆرێکە لە سەرەتای تەنوور، بوونی شوێنی شاردنەوەو خەوتن و گوزەران کردن. هەوڵی چارەسەر کردنی شوێنگەیی داوە بۆ سەربانی خانووەکەی تا بۆ ئەوەی تایبەتمەندیەکی جوگرافیایی و سروشتی و ئاو وهەوایی هەبێت ئەویش بەبەکارهێنانی سەربانی لار لە یەك لاوە یان لە دوولاوە. بەڵام بەهۆی ڕێژەی کەمی ژمارەی دانیشتوانەوە بایەخیان نەداوە بە پێڕۆی ڕێگاو بانەکانی گەڕەکەکان بۆیە دەبینین نا ڕێکی پێوە دیارە[٣٨] هەروەها دۆزینەوەی ئامرازی ناو ماڵ لە چەرموودا ئەوە دەسەلمێنێ کە پێش کەوتنیان بە دەست هێناوە لە گۆڕانکاری مادی لە چاو چاخەکانی پێشووەوە.))[٣٩].

توێژەری نەرویجی (فریدیك بارپ) لەم ڕووەوە دەڵێ:- خانووەکانی چەرموو بناغەیان لە سەر بەردی سروشتی داناوە لە قوڕو بەرد دروست کراون، شێوەی خانووەکانیان لە پێشا خڕ بووە پاشان ژووری لاکێشەییان دروست کردووە.

(بریدوود)و هاوڕێکانی بۆیان ڕوون بۆتەوە کە دیواری خانووەکانیش بە قوڕ کەف ماڵ کراوە بە دارو قامیش سەربانیان گرتووەو قوڕبان کراوە، ناوەوەی ژوورەکانیش تەیمانی قامیشیان تێدا ڕاخستووە بە قوڕ سواغیان داوە، لە هەر خانوویەکدا لە (٣-٧) ژووری تیا بووە، هەر ژوورێ (٥-

٦) پێ بووە، لەم خانووەنانەدا تەنوورو کوانگی تێدا بووە، مردووەکانیش بە زۆری هەر لە نێو ژووری خانووەکاندا ناشتوویانن، بە کورتی خانووەکانی (چەرمو) هونەری ساکاری ئەندازیاریان پێوە بووە[٤٠].

ئەگەر بڕوانینە چینی دۆزراوەی پێنجەم دەبینین کە بنکەیەکی بەردی هەیە، هەروەها دۆزینەوەی قامیش لە زەوییەکەی کە بوونی خۆڵەمێشێکی سپی بەجێ هێشتووە، بەڵگەی بەکارهێنانی تەیمانی قامیشە لەو کاتەدا.

دەبینین دۆزرانەوەی ماڵێکی تەواو کە ژێرەوەی بە بەرد بەردڕێژکراوە، دۆزینەوەی (٣) کوانوو، کە وەکو بنکەی تەنووری ئێستا وایە خانووەکە پێك هاتووە لە ژووری ناوەکی و ژووری دەرەکی، کە لەوانەیە دووەم شوێنی حەوانەوەی ئاژەڵان بێت، لەوانەیە ئەم خانووانە بگەڕێتەوە بۆ پێش (٨٠٠٠ ساڵ).

ئەگەر سەیری هەندێك لە پاشماوەکان بکەین دەبینین دیوارەکەی بە بەردو قوڕ دروستکراوە لە شێوەی کەف ماڵ دایە وەکو دێیەکانی ئێستای کوردستان، کە ئەم خانووە دروستکراوە مێژوویەکەی دەگەڕێتەوە لە نێوان (٥-٦) هەزار ساڵ پێش زایین[٤١].




نەخشەی گشتی چەرموو خاڵە ڕەشەکان بریتین لەو چاڵانەی کە بۆ لێکۆڵینەوە هەڵکەندراون




**نەخشەی خانووەکانی چەرموو بەپێی ئەو هەڵکۆڵینانەی کراوە**




**نەخشەی خانووبەرەیەکی چەرموو لەچینە دۆزراوەکانی سەرەوەدا**



نموونەیەکی خانوو لە چەرموو



ڕوویەکی بیناکاری لە چەرمودا



ڕۆبەرت بریدوودو هاوسەرەکەی لیندا بریدوود



دەستەی کنەو پشکنین لە چەرمودا



تەلارسازی چەرموو، تیایدا بناغەی خانوو بە بەرد نیشان دەدات کە لەچینەکانی سەرەوە دۆزراوەتەوە




تەلارسازی چەرموو، تیایدا دیواری قوڕینی خانوبەرەکان نیشان دەدات



وێنەکانی کاتی ئیشکردن لە چەرموودا



خانوبەرەیەك لە چەرموو ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە بە خشتی قوڕ دروست کراوە




**ڕوویەکی ناوەوەی خانووەکانی چەرموو**



لێکۆڵەرەوەکان لە کاتی کنەو پشکنیندا لە چەرموو



لێکۆڵەرەوەکان لە کاتی کنەو پشکنیندا لە چەرموودا



**لێکۆڵەرەوەکان لە کاتی کنەو پشکنیندا لە چەرموو**



**لێکۆڵەرەوەکان لە کاتی کنەو پشکنیندا لە چەرموو**



زانایانەی شوێنەوار لە چەرموودا



زانایانەی شوێنەوار لە چەرموودا



**زانایانەی شوێنەوار لە چەرموودا**



**زانایانەی شوێنەوار لە چەرموودا**



دروست كردنی ڕێگایەك بەرەو چەرموو



شوێنەوارناسەكان لە نێو خەڵكی گوندی چەرموودا

*** قاپو قاچاغە قوڕینەکانی چەرمو:**

((نێردەی ئەمریکی لە ئەنجامی پشکنین‌و هەڵکەندن ئەوەی بۆ ڕوون نەبۆوە کە شوێنەواری (چەرمو) لە ١٦ چین نیشتەجێ بوون پێکهاتووە، تا ناخی ٢٣ پێ بەڵگەو پاشماوەی دێرینی لێ دەست گیر بوو بە بۆچوون‌و لێکدانەوەی (بریدوود)، پێك هاتنی ئەم ١٦ چینە (٤٠٠) ساڵی خایاندووە لە چینە هەرە ژێرەوەی تا یانزەهەمینی چینی، قاپو قاچاغی قوڕینی لێ نەدۆزرایەوە، ئەو یانزە چینەش سەرەتای نیشتەجێ بوون لە سەردەمی بەردینی کۆنەوە دەگەیەنێت، کە هێشتا قاپو قاچاغیان لە قوڕ نەزانیوە دروستی بکەن، بۆیەش بەم چاغە دەوترێت (پێش قاپو قاچاغی قوڕین) بەڵام لە پێنج چینەکەی سەرەوەیدا قاپو قاچاغی قوڕین‌و چینی‌و سەخسی قوڕینی لێ دۆزراوەتەوە، ئەم قاپو قاچاغانەش بەشی زۆری ئەو پاشماوە دێرینانەن کە لە چەرموو دۆزراونەتەوە، تەنانەت نزیکەی یەك ملیۆن پارچە چینی‌و سەخسی قاپو قاچاغی لێ دۆزرایەوە، سێیەکی ئەم پارچانە لە مۆزەخانەی بەغدان‌و دوایش نێردرا بۆ زانکۆی شیکاگۆ، لە چینی هەرە بنەوەدا پارچە قاپو قاچاغی بەردین کە لە بەردەئەستێ‌و جۆرە بەردێکی گڕکانیی تورکی (زجاج البرکان) دروست کراون لێی دۆزراوەتەوە ئەمیش پەیوەندی بازرگانی چەرموو لەگەڵ دانیشتووانی هەرێمی تورکیا دەگەیەنێت.

بەشێکی ئامرازو قاپو قاچاغیان لە بەردی نەرم تاشیوە بەڵام بەکارهێنانی بەردی نەرم بۆ سەردەمێکی نزیك دەگەڕێتەوە. (لندا) خانم دەڵێ: ((قاپو قاچاغە قوڕینەکانی بایەخێکی تەواویان هەیە بۆ ڕوونکردنەوەی پێش کەوتنی تەکنیکی پیشەسازی، بەڵام ئێمە لە بەر ئەوەی بەم پشکنینەوە خەریکین، هەر ئەوەمان بۆ دەکرێت جیایان بکەینەوە، ماوەی لێکۆڵینەوەمان نییە تا نەگەڕێینەوە ئەمەریکا)) بە کورتی بۆ یەکەمین جار دانیشتوانی چەرموو لە قوڕ قاپو قاچاغیان دروست کردووە تا هاتووە جۆری نایابترو قەشەنگ تریان دروست کردووە تەنانەت فێری ڕەنگ‌و نەخشاندنیشی بوون[٤٢].

قاپو قاچاغەکانی چینی پێنجەم‌و چوارەم باشترین جۆری قاپو قاچاغن، کە بریتین لە جۆری بۆیەکراو بە ڕەنگی سوور کە ژێرەوەی زەردێکی تاریکە بەلای سووریاودا دەچێت کە نەخش کراوە بە هێڵی پچر پچڕ، کە ئەمە بە قاپو قاچاغی چەرموی ڕەنگ کراو بە ناوبانگە، جۆری ئەمە لە ناوچەی تەپە گۆران لە ئێران دۆزراوەتەوە کە لە دەوری ٦٠٠٠ هەزار پ.ز واز لە بەکارهێنانی هێنراوە بەڵام قاپو قاچاغەکانی چینەکانی تر بریتییە لە جۆری زبر کە بە دەست دروست کراوەو خۆگێل کراوە لە بەکارهێنانی نەخش‌و نیگار وە سوور کردنەوەی باش نییە، کە ئەمە تایبەتمەندی قاپو قاچاغی چاخی بەردینی نوێیە.

شێوەیەکی گشتی هەروەها لە چەرمودا کۆمەڵێك دەفری دۆزراوەتەوە لە لێوارەکانی قەوی‌و شێوەی دروست کردنەکەی بێ بایەخە، هەروەها توانای بەرگری کەمە بەهۆی دابەزینی پلەی گەرمای ئەو کورەیەی کە تێیدا سوور کراوەتەوە زۆری شێی تێدایە، پاك نییە، باش نەشێلراوە وە زۆریان دەفری بێ ڕەنگ‌و بێ نەخش‌و نیگارن بەڵام گۆزەکاری ڕەنگاو ڕەنگ زۆر کەمە، نەخشەکانی پێك هاتووە لە هێڵی پچڕپچڕ کە بە ڕەنگی ڕەش یان سوور ڕەنگ کراوە، هەندێك نموونەی شێوەیەکی دیاری هەیە لە نەخشەکانی کە نزیك دەبێتەوە لە شێوەی ئاژەڵێ کە لە هەندێك کاتدا وا دەگەیەنێت لە بارێکی جوڵەدایە[٤٣].



دەفریەکی بەردی لە چەرموو



دەفرییەكی بەردی لە چەرموو




كەرەستە جۆراوجۆرەكانی تەونكاری لە چەرموودا



**کەرەستە بەردینەکانی ڕاوکردن لە چەرمۆدا**



**هێڵکاری کەرەستە دەفرییەکان لە چەرموودا**

*** کۆتەڵەکانی چەرمو:**

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت لە سەردەمی بەردینی نوێو سەردەمی چەرموو دا دۆزینەوەیەکی زۆری کۆتەڵی مرۆییو ئاژەڵی جۆربەجۆر هەبووە، (لە چەرمودا نزیکەی پێنج هەزار کۆتەڵ دۆزراونەتەوە کە زۆربەیان بە جۆرێکی باش سوور نەکراوەتەوە وە سوور کردنەوەکەی زۆر کەمە کە بەشێکی بە ڕەنگی سوور ڕەنگ کراوە، بەشێکیان ئەوە دەگەیەنێت کە بە خواوەندی دایك ناو ببرێت بە سکپڕیو قەڵەوی کۆتەڵەکەوە، کە دەلالەت لە سەردەمی بڵاو بوونەوەی پەرستنی دایك دەکات هەروەها کۆتەڵەکانی چەرموو دابەش دەکرێنە دوو جۆر لە شێوەی مرۆییو ئاژەڵی[٤٤] جۆری ئاژەڵییەکەی بریتییە لەو جۆرانەی کە لە ناوچەکەدا بەکار هاتووەو بەخێو کراوە.

بەکارهێنانی پیشەسازی گڵکاری بۆ یەکەم جار لە چەرموو دادەنرێت بە پیشەسازیەکی سەرەکی، بۆ تەواو کردنی سروشتی کۆمەڵگای کشتوکاڵی، بە تایبەتی لە سەرەتای بەکارهێنانی کشتوکاڵدا چونکە گواستنەوەی لە ئەشکەوتەوە

بۆ خانوویەکی سادە لە قوڕ دروستکراوو کۆبوونەوەیان لە کۆمەلگایەکی تا ڕادەیەك نیشتەجێ بوون، دادەنرێت بەکارێك بۆ کەسەکانی ئەو کۆمەلگایە.

پیشەسازی گۆزەکاری دادەنرێت بە هەنگاوێك بۆ دیاری کردنی سروشتی هەلسوکەوتی کەسەکانی لەگەڵ ژینگە تازەکەدا. گۆڕانێکە لە دەفری بەردییەوە بۆ دەفری (گلکاری)، هەروەها بەکارهێنانی بۆ ئالوگۆڕ، کە ئەمە دەمانگەیەنێتە بەیەك گەیشتنێکی خەلکی چەرموو لە تێگەیشتن و بەکارهێنانی ئاوەز، بەکارهێنانی ڕەنگ کردن و نەخش و نیگار مانای وەرگرتنی ئاوەزیانە بۆ تێگەیشتن و تاقی کردنەوەو تایبەتمەندێتی هەرچەندە گلکاری لە چەرمودا سادەیەو بێ هێزی پێوە دیارە[٤٥].

### * ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت لە پیشەسازی چەرموو:

بەکارهێنانی شووشە بورکانیەکان کە ئەمەش دەلالەت لە بوونی ئاستی بەرزی خەلکی چەرموو دەکات لە بەکارهێنانی شووشەی بورکانی چونکە بەکارهێنانی لە دروست کردنی دەفریەکاندا پێویستی بە توانایەکی زۆر هەیە لە پێکنانی ئەو دروست کردنەدا[٤٦].



کۆتەڵ جۆراوجۆرەکانی چەرموو

### * گۆڕانکاری هونەری بیناکاری سەردەمی بەردینی کانزایی:

((سەردەمی بەردینی نوێ کۆتایی هات لە عێراق و هەندێك دەولەتانی ڕۆژهەلاتی خواروو لە نێوان (٥٦٠٠ بۆ ٥٠٠٠) هەزار ساڵ پێش زایینی، سەرەتای پێشرەوی شارستانیەتێکی تر کە سەردەمێکی لێك چووی مێژوویە لە سنووری (٣٥٠٠) ساڵ پێش زایین و ئەو ماوە کاتییەی لە نێوان ئەو دوو مێژوویەدایە (١٥٠٠ بۆ ٢٠٠٠) ساڵ دادەنرێت بە سەردەمێکی زۆر گرنگی پێشکەوتووی مێژوویی لە دۆلی نێو دوو ڕووباردا (میزۆپۆتامیا)دا بە شێوەیەکی تایبەتی و دەولەتەکانی ڕۆژهەلاتی خواروو بە شێوەیەکی گشتی.

لێکۆلەرەوەکان چەند زاراوەیەکیان بۆ بەکارهێناوە گرنگترینیان (سەردەمی بەردینی کانزایی)یە، ئەم زاراوەیە ئەوەدەگەیەنێت کە دانیشتوانی (میزۆ پۆتامیا) گەیشتوونەتە سەردەمی دۆزینەوەی (میتال - کانزا)، بەلام لە سەرەتادا نەگەیشتوونەتە بە کارهێنانی هەتا ناوەڕاستیشی بەلام تەنها بایەخیان بە بەکارهێنانی بەرد داوە لە دروست کردنی کەرەستەو ئامڕازەکانیاندا هەروەها لەم سەردەمەدا بوو بە هۆی زۆر بوونی دێی کشتوکالی و فراوان بوونی گەلێکی گۆڕایە سەر فراوانکردنی شاری مێژوویی و بووبە ناوبانگ دەرکردنی لە سەردەمە مێژووییەکانی لەوەودواوە، فراوان کردنی ئەو کشتوکالەی لە سەردەمی بەردینی نوێدا هەبووە وایان لێ دەهات زیاتر بەرهەم بهێنن زیاتر لە پێویستییەکانیان، زۆری بەرهەمەکانیان بەکارهێنا لە ئالو وێردا، سەرهەلدانی چینی نوێ لە پیشەسازی و پیشە دەستییەکان وەکو گۆزەکارو بازرگان بە مانایەکی تر ئەوەیە

که لەم سەردەمەدا دابەشکردنی کار ڕوویداوە، نیشتەجێ بوون لە دەشتاییە کشتوکاڵیەکاندا، سەرهەڵدانی گۆزەکاری ڕەنگاو ڕەنگ بەنەخش و نیگاری جۆراوجۆر. کە هەندێك لە لێکۆڵەرەوەکان بە سەردەمی گۆزەکاری ڕەنگاو ڕەنگی دادەنێن[47].

لەم سەردەمەدا کشتوکاڵ بایەخی زیاتر دەدا بە ئاودێری بەهۆی هەڵکەندنی ڕووبارو لقەکانییەوە، کە ئەمە بووبە هۆی پێشکەوتنێکی گەورە لە ژیانی دانیشتوان لە ڕووی کۆمەلایەتی و ئایینی و ئابووری و سیاسیدا[48].

گۆزەکاری لەم سەردەمەدا شێوەیەکی ناسك و بۆیە کراو بە چەند ڕەنگێك، نەخش کردنی بەچەند نەخش و نیگارێکی ئەندازەیی جوان بووە[49].

(جۆرج ڕۆ) دەڵێت:

(هەموو ئەو شتانە چەرمووومان دەخاتە بیر بە سەردەمەکەیەوە، بەڵام کاتێك سەیری گۆزەکاری بە نەخش دەکەین سەردەمێکی مێژوویی لە چەرموو بەرزترمان (بالاتر) بە بیر دەهێنێتەوە[50]) ئەوەی سەرنج ڕادەکێشن ئەوەیە کە ناوچەیەکی زۆرمان وەبیر دەخاتەوەو لە سەرهەڵدانی شارستانی (بەردینی- کانزایی) وەکو ناوچەکانی (مەتارە، قادیشی گەورە، قادیشی بچوك) گردی (مەتارە) بۆیە ناونراوە بە ناوی دێی (مەتارەوە) کە (٣٨ کم) لە خوارووی شاری کەرکوکەوەیە کە شوێنێکی بچووکی هێلکەیی شێوەیی هەیە کە ڕووبەری بنکەکەی (٢٠٠) م دەبێت و بەرزی بە درێژی (٨) م لە سەر ئاستی زەوییەکانی دەوروبەر[51].

((نێردراوی ئامۆژگای ڕۆژهەلاتی سەر بە زانکۆی شیکاغۆ هەستا بە هەڵکەندنی گردی مەتارە بە سەرۆکایەتی دکتۆر (بریدوود) وە لە کاتی هەڵکەندا کەوتە دۆزینەوەی پاشماوەی سەردەمەکانی پێش مێژوو، وەکو ئەوەی لێکچووە لە شارستانیەتی دۆزراوەی گردی (حەسونەی) لای موسڵ)).

کارەکانی ئەم نێردەیە پێك هاتبوو لە لێکۆڵینەوەی چینەکانی نیشتەجێ بوون لە (مەتارەدا) و جێگیر کردنی سەردەمەکانی بە پێی مێژوو، ئەویش بە هەڵکەندنی چاڵێکی تەسکی بە پەیژەدا لە لای ڕووی ڕۆژهەلاتی گردەکە لە سەرەوە بۆ ژێرەوەی گردەکە وە ڕۆیشتنی لە سەر گردەکە بە دوو چاڵ، کارکردن لە چاڵێکیدا هەتا خۆڵی زەوییە رووتەکە، واز لێهێنانی دووەم چاڵ هەتا دوو چینی سەرەوە[52].

((بۆیە گردی (مەتارە) دادەنرێت بە نموونەی هونەری بیناکاری لای دێی (حەسونە)، کە دەگەڕێتەوە نزیکی ئەو ماوەیە کە خانووەکانی وەکو ئەوەی (حەسونە) کەوتۆتە گەڕەکی تەسك و دیواری هەندێك خانووەکان کەوانەیی بڕیویەتی و بنمیچەکەی کەوانەییە[53]، هەروەها ئەگەر سەیری هونەری گڵکاری بکەین دەبینین لێکچوونێك هەیە لەنێوان (حەسونە) و (مەتارە)دا، چ لە ڕووی شێوەی هونەری و نەخش و نیگار جۆری بەکارهێنانی ڕەنگدا.

نێردەکە توانی کە کێردێکی درێژ بدۆزێتەوە کە دروست کراوە لە شووشەی بورکانی ڕەش کە بەناوبانگە بە (ئەبسید) کە درێژییەکەی (٢٦,٥سم)ەو پانییەکەی (٢,٥ سم) کە نموونەی ئەمە نییە لە مۆزەخانەی عێراقدا کە لە کاتی خۆیدا جوتیارێك لە گردەکەدا بە ڕێکەوت دۆزیبوویەوە، دۆزینەوەی پارچەیەکی بچووك لە (رخامی سپی) کە هەر دوو لایەکەی بڕاوە لە شێوەی جەڕە، کە لەوانەیە بۆ پارچەی بەکارهێنانی خواردن دروست کرابێت[54]، لە بەر ئەوەی توانرا کە دێیەك بدۆزرێتەوە کە بینات نراوە لە سەردەمی (حەسوونە)، نزیکەی پێنج هەزار ساڵ پێش زایین کە توانرا پێنج چینی نیشتەجێ بوون بدۆزرێتەوە کە چینی ژێرەوە لەسەر گردێکی خوار دۆزراوەتەوە هەندێك چاڵی لێ دروست کراوە کە هەندێك لە چاڵەکانی لاکێشەییەو هەندێکی تری بازنەییە، ئاگریان تێدا کردۆتەوە لە ناوەوە بۆ ئەوەی دیوارەکانی قاڵب بگرێت، کە لەوانەیە شوێنی پاراستنی دانەوێڵەو جۆرەکانی بوبێت، ئەمە لەوانە نییە جێگەی نیشتەجێیی بووبێت چونکە زۆر بچووك بووە هەروەها توانرا کە چوار چینی تر بدۆزرێتەوە کە هاو سەدەی (حەسوونە) یە بێجگە لە دۆزینەوەی پاشماوەی سەردەمی بەردینی نوێ، پێك هاتووە لە شێوەی جۆربەجۆری گۆزەکاری ئەو سەردەمە بە هەموو جۆرە جیاوازەکانییەوە لە دڕشت و خەرزی شکاوە و چەماوەی شەپۆل شەپۆل هەروەها دۆزینەوەی گڵکاری کە ئەمە وا دەگەیەنێت بگەڕێتەوە سەردەمی حەسوونە.

نێردەکە کەوتە دۆزینەوەی دیواری قوڕی لە بەرزترین خاڵی گردەکەوە، کە ئەمە تاکە لەوجۆرە لەو شوێنەدا چونکە ناوچەی (قەرەتیاغ) دادەنرێت بە ناوچەیەکی نیشتەجێی (حەسوونە) کە ئەمەش دەلالەت لە بڵاوبوونەوەی ئەو شارستانییە دەکات لە خوارەوەییدا)).

گرنگترین شت ئەوەی کە لێی دۆزرابێتەوە پارچەی گڵکاری جۆربەجۆری سەردەمی (حەسونەو سامەڕا) لەگەڵ دۆزینەوەی جەڕەو دەفرو پارچە هێسکی لە شێوەی دەرزی و (مقاشط) و بەکرەی قوڕی (اقراص) بۆ بەکارهێنانی تەونکاری لەگەڵ دۆزینەوەی هێسك و پروسکی مرۆڤ بۆیە توانرا لەم ناوچەیەدا کە لە سیانزە خاڵدا چاڵ هەڵبکەنرێت، بێجگە لە چاڵی درێژی کە لە کۆتایدا ژمارەیەك ژوور دۆزرایەوە هێندێکی دروست کراوە لە قوڕو هەندێکی خشتی قوڕی بەکارهاتوون[55].

نموونەی لێك چوونی شارستانی (حەسونە) بێجگە لە مەتارە لە (قادیشی گەورەو قادیشی بچووك)یش دۆزراوەتەوە هەروەها لە گەلێك شوێنی تری کەرکوك وەکو ناوچەی (لەیلان، کفری، کەلار، حەویجە، شوان) کە هەندێکیان دەگەڕێتەوە سەردەمی (چەرمو)، تا ئێستا لێکۆڵینەوەی پێویست نەکراوە بۆیە زانیاری تەواومان بە دەستەوە نییە بۆ بەراوردی هونەری بینا کارییەکە، گەلێك شوێنی ئەم ناوچانە کەوتۆتە بەرکاری تێك دان و خاپوور کردن و دزین و ئاودیو کردن بۆ سنووری هەندەران.




هێلکاری پاشماوەی خانووەکانی گوندی مەتارە



شوێنی مەتارە لە کاتی کنەو پشکنیندا



شوێنی مەتارە لە کاتی کنەو پشکنیندا



شوێنی مەتارە لە کاتی کنەو پشکنیندا



شوێنی مەتارە لە کاتی کنەو پشکنیندا



شوێنی مەتارە لە کاتی کنەو پشکنیندا



گۆڕێکی دۆزراوە لە مەتارە

*** دەتوانین بگەینە ئەم ڕاستییانەی خوارەوە:**

١. دیارەو ئاشکرایە وێنەی شارستانی چەرموو ئەو نەتەوانەی (چەرمو) هەر لە ژووروی (میزۆپۆتامیا) دا گیر نەبوون و بلاوبونەتەوە بە گوێی رووبارەکاندا بەرە خوار. پرۆفیسۆر (بریدوود)، (٦٧٥٠) سالی پێش زایین داناوە بۆ داهاتنی گلێنەو گلْ لە (چەرمو)و (٦٠٠٠ ساڵ) بۆ کۆتایی شارستانی چەرموو و ٥٨٠٠ بۆ پەیدا بوونی شارستانی (حەسوونە)، کە یەکەم شارستانییە لە دەشتەکانی میزۆپۆتامیای ناوەڕاست و لە پێش (حەسوونە) دا هیچ کۆنینەیەکی دەوری بەرد لە ناوچەکانی بەرەو خوار کوردستان نەدۆزراوەتەوە، دووەم شوێن خوار (حەسوونە) یە کە گردی (ئەلسەوان)ە نزیك (سامەڕا)کە شارستانیەتی ئەم دوو ناوچەیە ناونرا شارستانی (حەسوونە) خانوو و مالی ئەم دوو شوێنە وەك خانووەکانی چەرمو، لە خشتی قوڕی و بەرد دروست کراون بە وێنەیەکی وا جوان کە ناچێتە ئەقلەوە کە نەتەوەیەکی بیابانی دروستی کردبێت چونکە ئەو نەتەوەیە کشتوکالْ و جووتی کردووە دەغلْ و دانی چاندووە ئاژەلی دابەستووە خانووەکانی گەورەو فراوان بووە ژوورەکانی لە دەوری حەوش و باخچە دروست کراون دایکە خوایان پەرستووە، کە خوای پیت و بەرەکەت بووە وەك خواکانی چەرمو، مردوویان لە ژێر زەمینی خانووەکاندا ناشتووەو گلْکاری و گلێنەکانیان وەك هینەکانی (چەرمو) بووە بە گوێرەی لێکدانەوەی (ڕادیۆ کاربۆن) ئەم شارستانیەی حەسوونەو گردی (ئەلسەوان) (٦٠٠٠ ساڵ پ.ز)ی بۆ دانراوە کە دەکەوێتە کۆتایی شارستانیەتی (چەرمو)، گلێنەکانی ئەم دەورە وەك ئەوانەی چەرموە لە وێنەو چەشندا کە بریتییە لە کوپەو گۆزەو دیزەی سوورو کەندوی گەنم لە ناو ژوورەکاندا دانراون هەندێك بە قیر یان قسلْ و گەچ سواغ دراون یان بە ڕەنگی سوور، لە گلێنەکانی (ئەلسەوان) سامەڕا ڕەنگی قاوەیی و ڕەش بەکار هاتووە لەگەلْ سوور بێجگەلەوەی ڕەسم و هەیکەلەکانی کۆتەلْ لە قوڕو بەرد دروست کراون، نیشانەی هونەرێکی بەرزترە لە هی حەسونە کە گەلێ بە ووردی هەستی بزوتنەوەو جولان و گیانلەبەری تێدا دەکرێ[٥٦]. بۆیە دەگەینە ئەو ڕاستیە کە شارستانی (چەرموو حەسونەو سامەڕا)و هەورەها سەرهەلْدانی گۆتییەکانیش لەودوا وە زنجیرەی ئەو سەرهەلْدانە مێژووەن.

٢. دەگەینە ئەو ڕاستییە کە ئەم ناوچەیە (کەرکوك) هەر لە بەرەبەیانی شارستانی بەردینەوە بەردەوام بووەو لێك پچڕانی تێدا نەبووە، چونکە سەردەمی بەردینی کۆن و ناوەڕاست و نوێ و کانزایی دۆزینەوەی زۆری ئەم سەردەمانە بەلْگەی ڕاستی قسەکەمانە، هەروەها شوێنێکی وەکو (چەرمو) کە سەرهەلْدانی هەموو سەردەمەکانی پێوەدیارە کە یەك لەدوای لەیەك سەردەمەکانی زیندو بۆتەوە.

٣. بەهۆی بەردەوامی شارستانییەتی سەردەمە بەردینەکان وای کرد کە خۆئامادە دروست کردنێك پێك بهێنن بۆ شارستانیەتی هونەری بیناکاری سەردەمە مێژووییەکانی (گۆتی و لۆلۆیی و سۆمەری و ئەکەدی)، بۆ گەشە کردنی ناوچەیەکی وەکو کەرکوك بۆیە دەشتاییەکانی کەرکوك بوونە جێگەی گەشەکردنی هونەری بیناکاری و نەخش و نیگار.

٤. بەهۆی ئەو شۆڕشە پیشەسازی و کشتوکالی و کۆمەلایەتییەی کە لە چەرمودا سەری هەلْدا بوو بوو بە هۆی سەرهەلْدانی هەنگاوی هونەری بینا کاری و نەخش و نیگار چونکە ئەو هونەرە بیناکارییەی لە (چەرمو) سەرەتای دروست کردنی خانو بوو بۆ نیشتەجێ بوون و کارکردن بە پیشەی کشتوکالی و پیشەسازی کە. لە پێش چەرمودا لە کاری گەڕۆك و کۆچدا بوون بۆیە بیر کردنەوە لە بیناکاری زۆر مەحالْ بوو بەلام هەنگاوی بیناکاری بەرەو پێشەوە چوو لە (حەسوونە، قادیش، مەتارە).

٥. دەتوانین گونجاندنی باری ئاوو هەوا لەناوچەکەدا بە کارێکی گرنگی گەشە کردنی هونەری بیناکاری دابنێین چونکە ئەگەر ئاوو هەواکەی لە بار نەبوایە مرۆڤی (چەرمو، حەسونەو مەتارە) بیریان لە هونەری بیناکاری نەدەکردەوە چونکە بە پیتی زەوییەکەی وای کرد کە هونەری بیناکاری گەشە بکات شان بە شانی شارستانیەتی کشتوکالییەکە.

٦. ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت لە هونەری بیناکاری ناوچەکە لە سەردەمەکانی پێش مێژوو نەبوونی سەرهەلْدانی نەخش و نیگاری بیناکارییە کە ئەم جۆرە تەرزە (طراز) بەرچاو ناکەوێت لە چەرموو و مەتارەو قادیش و حەسوونە)، بەلام زیاتر ڕەنگی داوەتەوە لە هونەری گلْکاری دا.

٧. بەکارهێنانی (قوڕو بەرد)و (قامیش و زەل) وەکو کەرەستەیەکی زۆر پێویست بەکار هاتووە، هەر لە سەرەتای هونەری بیناکاری لە دوایدا بەکارهێنانی (قیر، قسلْ) لە هونەری بیناکاری بەلام بە شێوەیەکی زۆر تەسك و کەم، بەکارهێنانی بەرد لەبنەڕەتی دروست کردنی خانووەکاندا.

٨. بەکارهێنانی لاری لە سەر شێوەی سەری خانووەکاندا بۆ ئەوەی بگونجێت لەگەلْ گۆڕانی باری ئاوو هەوا لە بەرامبەر باران و بەفر لە هەوادا، تا بۆئەوی بەرگەیەکی باش بگرێت لە بەرامبەر گۆڕانەکانی ئاوو هەوادا.

٩. بوونی لێك چوون لە هونەری بینا کاری لە نێوان (چەرمو) لەگەلْ (جاینۆ)و (چەتالْ هیویك) لە کوردستانی تورکیا کە ئەمە لە خۆیدا دەمان گەیەنێتە ئەوەی لێك گەیشتنێك هەیە لە گەلْ هەردوو ناوچەکەدا چ لە ڕووی پێشکەوتنی کشتوکالْ و هونەری بیناکاری دا[٥٧].

١٠. دەتوانین نموونەی چەند ئەشکەوتێکی تر بدۆزینەوە بێجگە لە (پالەگەورە) وەکو ئەشکەوتەکانی (کوڕ کچان)و (پتەو پیرەچن)ی ناوچەی ئاغجەلەر (ئەشکەوتی کەمتیار)و ئەشکەوتی (گلْهر) نمونەیەکی ئەو جۆرە ئەشکەوتانەن[٥٨] کە دەوریان هەبووە لەو سەردەمانەدا.

١١. چاخی بەردنی نوێ، هاوگونجاوی شوێنێکی دیاری کراو نەبوو، هەموو ناوچەکانی ئەم چاخەیش هاوپەویستی و هاتووچۆ لە نێوانیادا هەبووە، کە هەریەکەی تێکەلاوی شارستانی یەکتری بوونە، بە شێوەیەکی ئەوتۆ تایبەتمەندی هەریەکەیان ڕەنگی داوەتەوە لەوی تریان

چ لە رووی شارستانیو كەلتوورو بەرهەمو تەلارسازیدا یان تایبەتمەندی رەنگو كەرەستەكان هەر یەكەیان تێكهەڵكێشی كۆمەڵێك پارچەو سیفەتەكانی یەكترین.

بوونی شوێنی چەرموو لەو ناوچەیەدا، پارچەیەكی دانەبڕاو نەبووە لەگەڵ ناوچەكانی تری كوردستاندا، بەڵكو هاوپەیوەستیەكی بە هێزی ئابووریو كۆمەڵایەتی هەبووە لەگەڵ ناوچەكانی: (جاینۆ[٥٩]، تەپە ئاسیاپ، گەنج دارە[٦٠]، تەپە گۆران، چاتاڵ هیووك[٦١]).

بەشێكی ئەم ناوچانە ئاڵوگۆڕی بازرگانیو ئابووری بەهێزیان هەبووەو بەشێكی بەرهەمەكانیان لە ناوچەكانی یەكتریدا دۆزراونەتەوە كە ئەمیش بەڵگەیەكی بەهێزی پەیوەندییە جۆراوجۆرەكان بوونە.

ئەوەی گرنگە لێرەدا ئاماژەی پێ بكەین ئەوەیە كە هەموو ناوچەكانی چاخی بەردینی نوێ هەڵگری كۆمەڵێك خاسیەتی خۆیانن كە بەشێكی هەریەكەیان توانوویانە خۆیان لە نێوان شوێنو پێگەی خۆیاندا لە شارستانی كوردستاندا هاوتەریبو گونجاو بكەن.

بوونی خوداوەندی دایك، شووشەی بوركانی، قوڕو بەرد، رەنگ، دارو قامیش، لە پاڵ بەردەوامی هەموو چینەكانی چاخە بەردینەكان سیفاتی هاوبەشی هەر



كنەو پشكنینی گشتی لە شارستانییەتی (چەتاڵ هیوك)




**هێڵکاری گشتی شارستانییەتی (چەتاڵ هیوك)**



شارستانییەتی (چەتاڵ هیوك)



شارستانییەتی (چەتاڵ هیوك)



کنەو پشکنینی گشتی لە شارستانییەتی (چەتاڵ هیوك)




ژیانی ڕۆژانە لە شارستانییەتی (چەتاڵ هیوك)







چەند ڕوویەکی شارستانییەتی (گەنجدارە)



کنەو پشکنین لە شارستانیەتی (جاینۆ)

یەکەیانە لەو سەردەمانەدا.

*** مێژووی ڕەنگ و نەخش و نیگاری کەرکوك لە هونەری تەلارسازی کوردستاندا:**

مرۆۃ هەر لەگەڵ سەرهەڵدانی شارستانیەتییەکانیدا، هەردەم بایەخی بەو ژینگەیەی خۆی داوە کە تێیدا پەروەردەبووە، بۆیە دروستبوونی شارستانیەتی مرۆڤایەتی ژینگەکەی دەوروبەری دەورێکی کاریگەری بینیوە لەپێگەیاندنی مرۆۃ لەقۆناغە مێژووییەکاندا.

سروشتی مرۆۃ لەوێدا سەرچاوەی گرتووە، کە هەردەم توانای خۆ گونجاندنی هەیە لەگەڵ ژینگەکەیداو توانای گۆڕانکاری بووە تا بۆ ئەوەی شارستانییەتێکی گەورەو پووخت بەئەنجام بگەیەنێ، مرۆۃ هەردەم هاوپەیوەستی قۆناغە مێژوویەکانی خۆی بووە، چونکە پێگەیشتنی لەو ژینگەیەی خۆیدا دروستکەری ئەو مێژووە بووە کە تێیدا گەورە بووە، بۆیە توانیویەتی لە دەوروبەرەکەیەوە جوانکارییەکانی ژیانی سەرچاوە بگرێت.

مرۆۃ بوونەوەرێکە هەردەم هەوڵ دەدات لاسایی ژینگەکەی خۆی بکاتەوە، چونکە ئەوەی لە چوارچێوەی ژینگەکەیدا هەیە زیاتر کاریگەری بەسەریەوە دیارەو چاو هەڵهێنانی ئەو ژینگەیە سەرچاوەیەکی بنەڕەتییە کە مرۆڤی ناوچەیەك لەگەڵ ناوچەیەکی دیکەی پێ دەناسرێتەوە.

ئەوەی لە جوانکاری مرۆڤدا دەبینرێت هەندێ جار هەوڵی داوە لاسایی سروشتی ژینگەکەی خۆی بکاتەوە، لەهەندێ کاتی تریشدا هەوڵی داوە بەدروستکردنی جوانکاری لەژینگەکەو دروستکردنی شێوازو شاکارێکی تر کە سەرچاوەکەی لەسروشتەکەی دەوروبەریەوە وەری گرتووە، بەڵام بەدەستکاری کردنی ژینگەکەی دەوروبەری، بۆیە مرۆۃ هەوڵی داوە چوارچێوەی سروشتەکەی بکاتە ئیلهامێکی گەورە لەهەموو بوارەکانی جوانکارییدا.

مرۆۃ هەردەم هەوڵی داوە خۆگونجاندنێك دروست بکات بۆ ئەوەی باری گوزەران و ژیانی ڕێکبخات، ئەو خۆگونجاندنەش

سەرچاوەکەی لەوەدا دروست بووە کە لەشوێنی حەوانەوەی خۆی لە ئەشکەوتەوە بۆ خانوو دەستی پێ کردووە، چونکە گۆڕانکاری لە شوێنی حەوانەوەی سەرچاوەی هەموو جوانکارییەکانی لەوەو دواوەیەتی بۆ ئەوەی بتوانێت پێشکەوتن بەشارستانییەتییەکانی بدات. خانوو ئەو دالدە سەرەتاییەی مرۆڤە کە تێیدا گۆڕانکارییەکانی ژیانی تێدا ڕوو دەدات کە دەبێتە بەهێزکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕۆشنبیرییەکان.

مرۆڤ بۆ ئەوەی ئاسوودەبێت لەو خانووەی کە دروستی کردووەو بۆ ئەوەی چاوو گوێ و لەشی ئارام بێت هەوڵی داوە ئەو جوانکارییانە بەکاربهێنێت کە بگونجێ لەگەڵ هونەری تەلارسازییدا.

دەستکاریکردنی سروشت، وەکو ئەوەی هەیە لەدەوروبەری مرۆڤدا ڕۆڵێکی باڵای هەیە لە ئارامکردنی چوار دەوری مرۆڤ، لەبەر ئەوەی دەستکاریکردنی سروشت هێمایەکی گەورەیە بۆ ئەوەی مرۆڤ خۆی بگونجێنێت لەگەڵ پێشکەوتنی شارستانیەتییەکانیدا ڕەنگ و نەخش و نیگار دوو خاسیەتی زۆر گەورەن کە هەردەم مرۆڤ بەکاری هێناوە لەئەشکەوتێکەوە تاکو هونەرێکی تەلارسازی لە خانوودا، ئەویش لەوە سەرچاوەی گرتووە کە بەکارهێنانەکانی لەو دوولایەنەدا بەشێوەیەکی سادەو بەردەوام بایەخی پێداوە تا بەوەی لەگەڵ گۆڕانە مێژووییەکاندا هەریەکە لەڕەنگ و نەخش و نیگاریش گۆڕانی بەسەردا هات. بەپێی قۆناغە مێژووییەکان سروشت سەرچاوەی گرنگی ڕەنگە، مرۆڤیش هەر لەوێوە سەرچاوەی ڕەنگەکانی وەرگرتووە، بۆیە دروستبوونی ژینگە بۆ مرۆڤ دەورێکی باڵای هەبووە لەپێگەیاندنی ڕەنگ لەلایدا، چونکە هەر مرۆڤێك لەو ژینگەیەی کە چاوی کردۆتەوە ڕەنگەکانی ناسیوە، بۆیە زاڵبوونی ڕەنگێك بەسەر ڕەنگێکی تردا کاریگەری ژینگەکە دەوری بینیوە لەباڵادەستی ڕەنگێك بەسەر ڕەنگێکی تردا.

جوانکاری لەڕەنگەکان بۆتە داهێنان لە هونەری نەخش و نیگاردا، چونکە لە هەندێك باردا ڕەنگ جۆرێکە لەنەخش و نیگار یان تێکەڵکردنی چەند ڕەنگێك هێمای دروستبوونی نەخش و نیگارە کە ئەبێتە دروستبوونی هێڵ و گۆشەکان لەملاو لەولادا، ئەوکاتە هونەری تەلارسازی تەواوکەری ئەو جوانکارییەیە.

***ڕەنگ لە مێژوودا:**

مرۆڤ هەر لەوکاتەی سروشتی ناسیوە بەڕەنگیش ئاشنا بووە، ژیانی مرۆڤێك لە شوێنێك و گەشەکردنی بارە کۆمەڵایەتییەکەی هاوپەیوەست بووە بەناسینی ئەو ڕەنگانەی کە لەدەوروبەری بووە. ڕەنگەکان لەسروشتەوە سەرچاوەیان گرتووە کە هەندێکیان ڕەنگی بنەڕەتین و ڕەنگەکانی تر لەوانەوە داڕێژراوە بەمانای ئەوەی مرۆڤ دەوری هەبووە لەجوانکاری لەڕەنگەکاندا.

سەرەتاکانی مرۆڤ بۆ ناسینی ڕەنگ دەوری هەبووە لەکاریگەری لەسەر بەرەو پێشچوونی ژیانی ڕۆژانەی، چونکە چاو هێمایەکی گرنگە بۆ ناسینی ڕەنگەکان لەهەمان کاتیشدا دەوری هەیە بەسەر دەروونی مرۆڤەوە بۆ وەرگرتنی ڕەنگێك بەسەر ڕەنگێکی ترەوە.

بۆ نموونە ئەگەر سەیری ژینگەی کوردستان بکەین دەبینین هاوپەیوەستیەکی گەورە هەیە لەنێوان ڕەنگ و ژینگەکەدا کە توانیویەتی مرۆڤ ببەستێتەوە بەجۆری ئەو ڕەنگانەی کە لەسروشدا هەیە، بۆیە تاکو ئەم سەردەمەی ئێستامان گەلێك لەو ڕەنگانە کاریگەری خۆیان بەجێ هێشتووە بەسەر دەروونی مرۆڤی کوردا، چونکە سەرچاوەکانی ڕەنگ لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی ژیاندا هاوپەیوەست بوونە بەو گۆڕانانەی لە ژیانی مرۆڤدا ڕوویان داوە، ئەویش کەوتۆتە ژێر کاریگەری بابەتەکانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕۆشنبیرییەوە.

سەرەتاکانی چاخە بەردینەکان لەکوردستاندا هەنگاوی یەکەم بوو کە مرۆڤ ڕەنگی ناسیوە لەو ڕەنگانەوە هێماکانی ژیانی هەڵهێنجاوە، چونکە مرۆڤی چاخە بەردینەکان لاسایی سروشتەکەی خۆی کردۆتەوە بە بەکارهێنانی ڕەنگ، ئەویش بەجوانکاری لەش بەجۆرەها ڕەنگی سروشتی کە لە گژوگیای سروشتدا هەبوو یان لاسایی ڕەنگی ئەو باڵندانەی کردۆتەوە کە لە دەوروبەریدا بوو، یان خۆی بەدوور گرتووە لەهەندێ ڕەنگ کەوا هەڵوێستەی کردووە لەبەرامبەریدا یان تووشی کارەساتێکی ناخۆش بووە بۆیە ئەو ڕەنگە لەلای نامۆ بووە.

دەرکەوتنی ئایین لەسەردەمی چاخە بەردینەکانداو لەسەردەمەکانی لەوەو دوای دەورێکی باڵای بینیوە لەپیرۆزکردنی ڕەنگەکان چونکە نیشانەی ئاینەکە ڕچە شکێن بووە بۆ ئەوەی بتوانێت ڕەنگ لەلای مرۆڤ پیرۆزکات.

کاریگەری ئابووری و کۆمەڵایەتی مرۆڤی فێرکردووە لەجوانکاری ڕەنگەکاندا، توانا ئابوورییەکەی مرۆڤ دەوری گرنگی بینیوە بۆ ئەوەی بتوانێت گۆڕانکاری بکات لەڕەنگەکاندا تا بەشێوەیەکی باشتر بایەخی پێ بدات.

*** مێژووی هونەری نەخش و نیگار:**

نەخش و نیگار مێژوویەکی زۆر کۆنی هەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ شارستانیەتیە کۆنەکانی مرۆڤایەتی، چونکە مرۆڤ هەر لەسەردەمە کۆنەکاندا بایەخی داوە بەرازاندنەوەی لەشی خۆی لەشێوەی خاڵ و هێڵ و نەخشی جۆراوجۆر تا کار گەیشتۆتە ئەوەی ئەم هونەرەی لە هەموو کارەکانی ژیانیدا بەکارهێناوە، بەتایبەتی لە ئەشکەوت و پەرستگاو خانوودا، تا کار گەیشتۆتە ئەوەی لەهونەری تەلارسازی بەشێوەیەکی فراوان بەکارهێنراوەو لەهەموو پێویستییەکانی ژیانیدا بایەخی پێداوە، بەتایبەتی لەکەرەستەکانی خواردن و جل و بەرگ و کەرەستەکانی خۆ ڕازاندنەوەی خشڵ و زێڕ. هونەری نەخش و نیگارو ڕەنگ توانایەکی خەیاڵی بەدەری مرۆڤن کە دەتوانێت ئەو ئارەزووە هونەرییەی خۆی بەکاربهێنێت و جوانکاری تێدا دروست بکات.

نەخشکار هەردەم توانایەکی فراوانی هەیە بۆ ئەوەی بتوانێت سەربەستی خۆی بەکاربهێنێت لەبەکارهێنان و دیاریکردنی یەکەکانی ڕەنگدا، تا بۆ ئەوەی بتوانێت هێڵەکانی نەخش لەگەڵ ڕەنگدا بگونجێنێت کە ئەوە یارمەتی گەورەی دەدات بۆ ئەوەی نەخشکار بیربکاتەوە لەچۆنێتی

بەکارهێنانی ئاوەزی خۆی بۆ ئەو هونەرە.

*** ئەشکەوتەکان یەکەم پێگەی هونەری ڕەنگو نەخش و نیگارن:**

مرۆڤ هەر لەسەرەتای چاخە بەردینەکاندا ئەشکەوت یەکەم ماڵی بووە کە بایەخی پێداوەو پێگەیەکی سەرەتای ژیانی مرۆڤایەتی بووە، کە توانیوییەتی قۆناغەکانی ژیانی تێدا گەشە بکات، ئەویش لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە هونەری خانوو دروستکردن لە یەکەم جاردا لەئەشکەوتەکانەوە سەرچاوەی گرتووەو ئینجا لەدەرەوەی ئەشکەوتەکاندا بایەخی بەهونەری خانووبەرەداوە.

سەردەمی ژیانی کێوێتی مرۆڤ قۆناغێکی تایبەتی بووە کە بایەخی بەڕاو ڕاوشکارداوە ئەوەندەی بیری لەڕاوکردن کردۆتەوە بیری لەخانوو دروستکردن نەکردۆتەوە، بەڵام دەتوانین بڵێین کە ڕاستیەك هەیە ئەویش ئەوەیە مرۆڤ لەو ئەشکەوتەی کە تێیدا ژیاوە هەوڵی داوە بایەخ بەهەندێك لایەن بدات بۆ ئەوەی بتوانێت پێویستییەکانی ژیانی بەشێوەیەکی ڕێك و پێك ڕێك بخات.

مرۆڤ لەئەشکەوتدا لە پاڵ حەسانەوەی یان لەدوای ڕاوکردن یان لەترسی ئاژەڵی کێوی بەدوای شوێنێکدا گەڕاوە بۆ ئەوەی ئارامی تێدا بگرێت بۆیە بایەخی بەو ئەشکەوتە داوە کە تێیدا ژیاوە.

مرۆڤ لە ئەشکەوتدا توانایەکی هونەری باڵای هەبووە کە هەوڵی داوە ڕەنگ و نەخش بەکاربهێنێ بۆ ڕازاندنەوەی ئەشکەوتەکەی، بۆیە دەبینین گەلێ کەرەستەی بەکارهێناوە وەکو بەردە ئەستێ و ڕەنگی سروشتی و ڕۆنی گیای ئاژەڵان و دوکەڵی ئاگرو خەڵوزی پاشماوەکانی بۆ هونەری ڕەنگ کردن.

دەبینین لە چاخە بەردینەکان و لەوەودوای چاخە بەردینەکاندا گەلێك کەرەستەی جۆراوجۆر دۆزراوەتەوە کە بەڵگەی ئەوەیە دەیسەلمێنن بەکارهێنانی ئەم کەرەستانە مرۆڤ بەکاری هێناوە لەهونەری وێنەکێشاندا یان بۆ بەکارهێنانی نەخش و جۆرەکانی ڕەنگ.

ئەگەر سەیری ئەشکەوتەکانی کوردستان بکەین دەبینین گەلێك نموونەی جۆراوجۆرمان هەیە بەڵگەی ئەوەن کە ئەشکەوتەکانی کوردستان یان ئەو مرۆڤانەی کە تێیدا ژیاون جۆرەها ڕەنگیان لەگەڵ هێڵی نەخش بەکارهێناوە بۆ ڕازاندنەوەی ئەشکەوتەکان، چونکە مرۆڤ لە کێشانی ئەو جۆرە هونەرەدا هەوڵی داوە بایەخ بەو لایەنە گرنگە بدات کە ئەویش بریتیە لە ئارامکردنێکی دەروونی، چونکە لەکاتی ڕاوکردندا هەستێکی دەروونی گەورە بەسەریدا زاڵە کە هێز بەکار دەهێنێ بۆ زاڵبوون بەسەریدا بۆیە لە هەندێ کاتدا لەناو ئەشکەوتەکەی بیری کردۆتەوە وێنەی ئەو ئاژەڵانە بکێشێت کە ڕاوی کردووە یان وەکو ئارامیەکی دەروونی کە ئەو ترسەی تێدا بڕەوێتەوە وێنەکانی لەناو ئەشکەوتەکەدا بەکارهێناوە.

سەرەتای ژیان لە ئەشکەوتەکان و ئەو ژینگەیەی کە ڕەنگەکانی تێدا دروستبوو کاریگەری خۆی تێدا بەجێهێشتبوو لەبەکارهێنانی ڕەنگ و نەخشی ڕەنگەکاندا، بەڵام ئەوەی جێگەی داخە بەشێکی زۆری ئەو هونەرە لەناو ئەشکەوتەکاندا لەناوچووە بەتایبەتی ئەشکەوتەکانی کوردستان و کەرکوك ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری کردنەوەی ئاگر لەلایەن مرۆڤەوە لەناو ئەشکەوتەکان، یان لەکاتی سەوزبوونی گژوگیایەکی زۆر لەناو ئەشکەوتەکاندا بووە بەهۆی سووتان و لەدەستدانی بەشێکی زۆری ئەو هونەرە، یان شێداری ناو ئەشکەوتەکان بە پێی گۆڕانەکانی ڕۆژگار بووە بەهۆی لەدەستدان و داخوڕاندنی بەشێکی زۆری ئەو هونەرە.

تاڵانکردنی ئەو ئەشکەوتانە لەلایەن مرۆڤەوە کە سەردەمێکی زۆری بەسەردا چووە بووەتە هۆی لەدەستدانی بەشێکی زۆری ئەو هونەرانە لەڕەنگ و نەخشدا.

ئەو ڕەنگەی زیاتر بەرچاو دەکەوێ لەناو ئەشکەوتەکاندا بەکارهێنانی ڕەنگی ڕەشە یان لەهەندێ کاتدا هەڵکوڵینی هەندێ وێنە لەسەر دیواری ناوەوەی ئەشکەوتەکان و لەکاتی کردنەوەی ئاگر لەناو ئەشکەوتەکەدا دەوروبەرەکەی بەرەش ڕەنگی داوەتەوەو ناوەکەشی بەسپی ڕەنگی داوەتەوە.

ئەگەر سەیری وێنەی ناو ئەشکەوتەکان بکەین دەبینین وێنەی ئاژەڵی کێوی جۆراوجۆری تێدا هەیە وەك و بەرازو مانگای کێوی و شێرو پڵنگ کە هەر هەموویان لەو چوار چێوەیەدا سووڕی خواردووە کە مرۆڤ بیری لەو وێنانە کردۆتەوە کە بەسەریدا زاڵ بووە.

لێرەدا دەتوانین ئەو ڕاستیە بڵێین کە ئەشکەوتەکانی کوردستان بەهەموو چاخە بەردینەکانەوە بایەخی گرنگیان بەژیانی ئەشکەوت داوەو توانیویانە بیکەنە یەکەم پێگەی ژیانی مرۆڤایەتی دەتوانین بڵێین ڕێچکەی شارستانیەتی چاخە بەردینەکانی لەوێوە سەرچاوەی گرتووە کە نموونەمان ئەشکەوتی شانەدەر، بەردەبەڵکە، هەزار مێردو پاڵە گەورەو گەلێکی تر.

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:

(١) (بانگەوازێك بۆ ڕووناکبیرانی کورد، لە پێناوی کۆکردنەوەو زیندوو کردنەوەی کەلەپوری کوردیدا)، عەبدولڕقیب یوسف، بڵاوکراوەکانی پرۆژەی هاوسەر، ساڵی ١٩٨٥، چاپخانەی (کامەران)، سلێمانی، لاپەڕە (٧٦).
(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو.
(٣) گۆڤاری (کۆڕی زانیاری کورد – المجمع العلمي الكردي)، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ساڵی ١٩٧٣، چاپخانەی (کۆڕی زانیاری کورد)، بەغدا، لاپەڕە(٥٨٦)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(عصور ما قبل التأريخ في وادي الرافدين على ضوء التنقيبات الاثرية في كردستان العراق) نووسینی: تاها باقر،
(٤) گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٣)، تشرینی یەکەم، ساڵی ١٩٨٣، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(من المواقع الاثرية في كردستان – بەردەبەڵکە)، نووسینی کەمال نوری مەعروف، لاپەڕە (١٣٢).
(٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٣٢).
هەروەها بڕوانە: (الكشاف الاثري في العراق)، د. قەحتان ڕەشید ساڵح، بەغدا، ساڵی ١٩٨٧، لاپەڕە (٧٦).
(٦) گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٣)، هەمان ژمارەی پێشوو، لاپەڕە (٤).
(٧) هەمان سەرچاوە پێشوو، لاپەڕە (١٣٤).
(٨) (الكشاف الاثري في العراق)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٨٥).
(٩) گۆڤاری (کاروان)، ژمارە ١٣، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٣٤).
(١٠) گۆڤاری (کاروان)، ژمارە ١٦، کانوونی دووەم، ساڵی دووەم، ١٩٨٣، لاپەڕە (١٤٨)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (من المواقع الاثرية في كردستان) (کەریم شاهر)، نووسینی کەمال نوری مەعروف،.
(١١) گۆڤاری (کاروان)، ژمارە ١٦، هەمان سەرچاوەی پێشوو،لاپەڕە (١٤٨).
(١٢) (تاريخ الفن العراقي القديم، الرسم والنقوش الجدارية والفخارية والحجرية وعلاقتها بفنون الاطفال)، نووسینی، محەمەد حوسێن جودی، وەزارەتی ڕاگەیاندنی عێراقی یارمەتیداوە لە بڵاوکردنەوەی، چاپخانەی نوعمان، نەجەف، ساڵی، (١٩٧٤ م – ١٣٩٤ هـ)، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٤١).
(١٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٣).
(١٤) (المرشد الى مواطن الاثار والحضارة، المرحلة الرابعة، بغداد–كركوك–السليمانية)، نووسینی: طه باقر، فوئاد سەفەر، بەغدا، ١٩٦٥، لاپەڕە (١٦).
(١٥) گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١٤)، حوزیران، ساڵی (١٩٨٧)، لاپەڕە (٨٨)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (کوردستان لە دوا دوای چاخی سەهۆڵبەندانەکەدا). نووسینی (فوئاد حەمە خورشید)و (مەریەم عەزیز فەتاح).

– هەروەها بڕوانە بۆ زانیاری دەربارەی ڕووبەرەکەی، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٦)، کە ڕووبەرەکەی بە (٥٥٠) مەتر دووجای داناوە.
(١٦) (العراق القديم)، جۆرج ڕۆ، وەرگێڕانی: حوسێن عەلوان حوسێن، وەزارەتی ڕۆشنبیریو ڕاگەیاندنی عێراق، ١٩٨٤، لاپەڕە (٧٧).
(١٧) گۆڤاری (کۆڕی زانیاری کورد)، بەشی یەکەم، ساڵی ١٩٧٣، چاپخانەی (کۆڕی زانیاری کورد)، بەغدا، لاپەڕە (٦٠٠)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(عصور ما قبل التأريخ في وادي الرافدين على ضوء التنقيبات الاثرية في كردستان العراق) نووسینی: تاها باقر، بەرگی یەکەم،.
(١٨) گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١١)، لاپەڕە (٦١)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(مرۆڤی چاخی بەستەڵەك)، نووسینی (دکتۆر جەمال ڕەشید ئەحمەد).
(١٩) گۆڤاری (کاروان)، ژمارە ١٦، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٤٥).
(٢٠) (العراق القديم)، جۆرج ڕۆ، وەرگێڕانی: حوسێن عەلوان حوسێن، وەزارەتی ڕۆشنبیریو ڕاگەیاندنی عێراق، ١٩٨٤، لاپەڕە (٧٧).
(٢١) گۆڤاری (کاروان)، ژمارە ١٦، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٤٦.
(٢٢) گۆڤاری (کۆڕی زانیاری کورد)، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ساڵی ١٩٧٣، چاپخانەی (کۆڕی زانیاری کورد)، بەغدا، لاپەڕە (٦٠٠)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(عصور ما قبل التأريخ في وادي الرافدين على ضوء التنقيبات الاثرية في كردستان العراق) نووسینی: تاها باقر.
(٢٣) (العراق القديم)، جۆرج ڕۆ، وەرگێڕانی: حوسێن عەلوان حوسێن، وەزارەتی ڕۆشنبیریو ڕاگەیاندنی عێراق، ١٩٨٤، لاپەڕە (٧٧).
(٢٤) (حضارة العراق)، نووسینی کۆمەڵێك نووسەرو مێژوونووس، بەشی یەکەم، لاپەڕە (١٢١).
(٢٥) (المرشد الى مواطن الآثار والحضارة)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٤– ١٥).
(٢٦) گۆڤاری (کۆڕی زانیاری کورد)، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ساڵی ١٩٧٣، چاپخانەی (کۆڕی زانیاری کورد)، بەغدا، لاپەڕە (٦٠٥)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(عصور ما قبل التأريخ في وادي الرافدين على ضوء التنقيبات الاثرية في كردستان العراق) نووسینی: تاها باقر.
(٢٧) گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (٥٥–٥٦)، لاپەڕە (٣٤)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(یەکەمین لانکەی مرۆڤایەتی)، نووسینی (ڕەزا شوان).
(٢٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٤–٣٥).
(٢٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٣٤.

(٣٠) (العراق القديم)، جۆرج رۆ، وەرگێرانی: حوسێن عەلوان حوسێن، وەزارەتی رۆشنبیریو راگەیاندنی عێراق، ١٩٨٤، لاپەڕە (٧٨).
(٣١) (مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، الوجيز في تاريخ حضارة وادي الرافدين)، بەرگی یەکەم، نووسینی (تاها باقر)، بڵاوکراوەکانی (دار البيان)، چاپی یەکەم، (١٩٧٣، ١٣٩٣) چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا، لاپەڕە (١٩٣).
(٣٢) گـۆڤـاری (ڕۆشـنـبـیـری نـوێ)، ژمـارە (٥٥- ٥٦)، لاپەڕە (٣٤).
(٣٣) (حضارة العراق)، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٧٩).
(٣٤) (تـاريخ فن العمارة العراقية في مختلف العصور)، نووسینی (شەریف یوسف)، (دار الرشيد للنشر)، ١٩٨٢، لاپەڕە (٣٨).
(٣٥) گۆڤاری (ڕەنگین)، ژمارە (٥٠)، ساڵی ١٩٩٢، لاپەڕە (٦)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(وڵاتەکەی خۆت بناسە، کوردستانی پێش مێژوو). بەشی سێیەم، دەربارەی قەڵای (چەرمو).
(٣٦) گۆڤاری (کۆڕی زانیاری کورد)، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ساڵی ١٩٧٣، چاپخانەی (کـۆڕی زانیاری کورد)، بەغدا، لاپەڕە (٦٠٥)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(عـصـور مـا قبل الـتـاريخ في وادي الـرافـديـن على ضـوء التنقيبات الاثرية في كردستان العراق) نووسینی: تاها باقر.
(*) تێبینی: هەرچەندم کرد کە زاراوەیـەکی تایبەتی بە (الزجاج البركاني) بدۆزمەوە کە جێگەی متمانە بێت تەنها شووشـەی بورکانی بـوو بۆیە ئـەوەم زیـاتـر بـەکـار هێنا.. هەرچەندە زاراوەی تریش هەیە بەڵام زیاتر جێگەی خۆی ناگرێت.
(٣٧) گـۆڤـاری (ڕۆشنبیری نـوێ)، ژمـارە (١١٤)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٨٩).
(٣٨) (حضارة العراق)، بەشی یەکەمو سێیەم، لاپەڕە (٢٩٣).
(٣٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٩٤).
(٤٠) گۆڤاری (کۆڕی زانیاری)، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ساڵی ١٩٧٣، چاپخانەی (کـۆڕی زانـیـاری کـورد)، بەغدا، لاپەڕە (٦٠٧)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(عـصـور مـا قبل الـتـاريخ في وادي الـرافـديـن على ضـوء التنقيبات الاثرية في كردستان العراق) نووسینی: تاها باقر.
(٤١) گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، (ژمارە (٥٥-٥٦)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٤- ٣٥).
(٤٢) گۆڤاری (اهل النفط)، کانوونی دووەم، ساڵی ١٩٥٢، ساڵی یەکەم، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(اهل النفط تتحدث في چرمو مع الباحثين (لان ادم عرف النفط)، نووسینی: عەبدولستار فەوزی.
(٤٣) گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (٥٥-٥٦)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٥-٣٦).
(٤٤) گۆڤاری (شانەدەر)، ژمارە ٦، حوزیرانی ١٩٨٨، ساڵی دووەم، ساڵی (١٩٩٨)، لاپـەڕە (٥٩)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(فخار ماقبل التاريخ والعصور التاريخية، اشكاله والوانه وزخارفه)، نووسینی زوبێر بیلال ئیسماعیل.
(٤٥) گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە (١١)، لاپەڕە (١٠١-١٠٣-١٠٤).
(٤٦) (حضارة العراق)، بەشی سێیەم، لاپەڕە (١٠، ١٦).
(٤٧) گۆڤاری (العربي، الكويتي)، ژمارە ١٤٥، کانون یەکەم ١٩٧٠، لاپەڕە ١٢٤، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(الصناعة في العصور الحجرية الحديثة)، نووسینی، یوسف زعێلاوی.
(٤٨) گۆڤاری (کۆڕی زانیاری کورد)، بەرگی دووەم، بەشی دووەم، لاپەڕە (٢٦، ٢٧، ٢٨).
(٤٩) (تاريخ فن العمارة العراقية في مختلف العصور)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٤).
(٥٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٤).
(٥١) (العراق القديم)، جۆرج رۆ، وەرگێرانی: حوسێن عەلوان حوسێن، وەزارەتی رۆشنبیریو راگەیاندنی عێراق، ١٩٨٤، لاپەڕە (٨٩).
(٥٢) گۆڤاری (سومر)، ژمارە ٤٤، جلدی (١-٢)، لاپەڕە (١٧).
(٥٣) گۆڤاری (سومر)، جلدی چوارەم، لاپەڕە (٣١٠).
(٥٤) (حضارة العراق)، بەرگی سێهەم، لاپەڕە (٨٥).
(٥٥) گۆڤاری (سومر)، جلدی پێنجەم، لاپەڕە (٣١٠).
(٥٦) (الكهف الاثـري في الـعراق)، دکتۆر قەحتان ڕەشید ساڵح، لاپەڕە (٩٢).
(٥٧) گۆڤاری (کاروان)، ژمارە ٦٢ کانونی دووەمو شوبات، ساڵی ١٩٨٨، لێکۆڵینەوەیەك بە ناونیشانی:
(سۆمەریەکان ئاری بوون)، نووسینی: دکتۆرە پاکیزە ڕەفیق حیلمی.
(٥٨) (نشوء الحضارة)، دێفدو جوان ئۆتس، وەرگێرانی (لوتفی ئەلخوری)، دار الشؤون الثقافية العامة، زنجیرەی سەد کتێب، چاپی یەکەم، ١٩٨٨، چاپخانەی (دار الحرية للطباعة) بەغدا، لاپەڕەکانی (١٧٧-١٧٨).
(٥٩) جاینۆ: یەکێکە لە شوێنەوارییانەی کە لە چاخی بەردینی نوێدا ئاوەدان بووە، کەوتووەتە دووری چل کیلۆ مەتر لە سەرووری رۆژئاوای دیار بەکر لە لووتکەی چیای تۆرۆس، لەسەر یەکێك لە لقەکانی رووباری دیجلەی سەروو. بە پێی سەرچاوەکانی کە پشکنینی بۆ کراوە دەگەڕێتەوە بۆ حەوت هەزار ساڵ پێش زایین، ئەم شوێنەوارە گەلێك هونەری تەلارسازی بەردینی لاکێشەیی تێدا دۆزراوەتـەوە بەشێکی ئاماژە بە کـاری تایبەتی دەکـات لـە دروستـکـردنیدا، کە هەندێك زەوی ژوورەکانی بە کاشی داپۆشراوەو لەسەرییەوە لە بەردی گەورە گەورە هەڵچنراوە.
(٦٠) گەنج دارە: ناوچەیەکی ئاوەدانی چاخی بەردینی نوێیە لە کوردستانی ڕۆژهەڵات کە کەوتووەتە بەشی ڕۆژهەڵاتی کرماشان لە ناوەڕاستی چیای زاگرۆس.
(٦١) چاتاڵ هیووك: ناوچەیەکی ئاوەدانی چاخی بەردینی نوێیە لە کوردستانی باکوور کە پاشماوەی گەلێك هونەری تەلارسازی تێدا دۆزروەتەوە کە بۆ شەش هەزار ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە، پاشماوەی گەلێك خانووی لە خشتی قوڕ دروست کراوەو گەچی تێدا دۆزراوەتەوە.

## بەشی دووەم

# هونەری بیناکاری و نەخش و نیگاری ناوچەی کەرکوك لە سەردەمە مێژووییەکاندا

هونەری بیناکاری سەرەتاکانی سەردەمە مێژووییەکان گۆڕانێکی هەمەلایەنەی بەخۆیەوە دیت کەبووە هۆی ئەوەی هەنگاوی چاك بنێت بۆ بەرەو پێش چوونی هونەری بیناکاری، ئەو بناغەیەی سەردەمەکانی پێش مێژوو، بووە هۆی گۆڕانێکی باشتر بۆ سەردەمە مێژووییەکان وگۆڕانێکی هەمەلایەنەی دروست کرد کە جێپەنجەی لەسەرتاپای کوردستاندا بەدەرکەوتو گەشەی بەردەوامی کرد لە قاوغێکی نوێدا لەبەر ئەوە وایکرد کە سەردەمە مێژووییەکان وەرچەرخانێکی پێش کەوتوویی پێش خۆی بێت.

ناوچەکانی (مەتارە)و (قادیش)و (حەویجە) کە لەسەردەمە مێژووییەکاندا ئاوەدان بوو، دەگەڕێتەوە بۆ بەردەوامی سەردەمەکانی پێش مێژوو، لەناوخۆیدا زنجیرەیەکی نەپچڕاوی دروست کرد بۆ ئاوەدانی، هەر لەسەردەمەکانی (گۆتی)و (لۆلۆیی)و (سۆمەری)و (ئەکەدی)و (ئاشووری)و (میتانی).

ناوچەی کەرکوك شوێنێکی گرنگی کۆڕەو بووە، لەسەرەوە بەرەو خوارووی (عێراق)، بۆیە هەردەم هونەری بیناکاری لەبرەودا بوو، شان بەشانی لایەنەکانی تر گەشەی کردووەو بۆتە خاوەنی مۆرکێکی خۆماڵی رەسەن، چونکە ئەو کۆچڕەوەی ناوچەکانی (چەرموو) تا ماوەیەکی چاك لە دەشتاییەکانی (کەرکوك)و دەورووبەرەکەیدا گەشەی کردو ئینجا بەرەو خوارووی عێراق گەشەیان کرد، مۆرکی هونەری بیناکاری ئەو سەردەمە بە تەواوەتی ئەو راستییە دەسەپێنێت کە ناوچەی کەرکوك بنکەیەکی گرنگی ئەو گۆڕانە بیناکارییە بووە.

لێرەوە دەگەینە ئەو راستییانەی خوارەوە لە هونەری بیناکاری سەرەتاکانی سەردەمە مێژووییەکان:-

١. بەکارهێنانی قوڕ وەکو کەرەستەیەکی سەرەکی لە هونەری بیناکاریداو، بەکارهێنانی بەشێوەیەکی فراوان ودروست کردنی شێوەی جۆراوجۆری خشتی کاڵ لە قوڕ ((چونکە لەبەر ئەوەی کەرەستەیەکی زۆرو کەمتر ئەرکی تێدەچێت و زیاتر توانای هەیە بۆ ئەوەی لەژێر دەستی ئەوەی بەکاری دەهێنێت لە بیناکاریدا[1] هەروەها توانایەکی چاکی هەیە بۆ بەدەست هێنانەوەی قوڕەکۆنەکە بێ ئەوەی گۆڕینێك دروست بکات لە دیوارە کۆنەکەداو، ئەوەی بەسە بۆ زیادکردنی چینێکی تازە لەسەر قوڕە کۆنەکە، کە بەهۆی گۆڕانی وەرزەکانەوە، تووشی داخوراندن بووە، بەکارهێنانی خشتی کاڵ بەشێوەی تێك هەڵکێش، بۆ ڕیزکردنی خشتەکانی))[2].

بەکارهێنانی بەردیش لەگەڵ قوڕدا بۆ دروستکردنی خانوو بەکارهاتووە، سەچاوەکان ئاماژە بۆئەوە دەکەن کە قیرو گەچیش بەکار هاتووە بەتایبەتی بەکارهێنانی (ئەسفەلت) لە کێشانی ناوەڕۆی ژوورەکانداو، گەچیش لە سنوورێکی دیاریکراودا بەکارهاتووە، ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ خوارووی عێراقدا، دەبینین لە ناوچەکانی کوردستان و کەرکوکدا بەشێوەیەکی زۆر بەکارهاتووە بۆ سپیکردنەوەی ژوورەکان.

٢. هەر لە سەردەمە مێژووییەکاندا هەنگاونان بەرەو دروستکردنی ژووری لاکێشەیی، لەژووری بازنەیی و چوارگۆشەییەوە، هەروەها هەنگاونان بۆ دروستکردنی هەرچوار سوچی ژوورەکان ودەرکردنی چەقی پێویست بۆ هەر چوارلاکانی.

٣. سەرهەڵدانی نووسین شان بەشانی هونەری بیناکاری کە ئەمەیش لەگەڵ خۆیدا هەنگاوی نا بەرەو بیری فراوانتر، چونکە سەرهەڵدانی نووسینی خەتی مێخی بوو بە هۆی فراوانی زمانی مرۆڤەکە لە چواندنی هەموو لایەنی هونەری بیناکارییەکەوە هەنگاوی نا بۆ ئەوەی بتوانێت خۆی سەقام گیر بکا لەبەکارهێنانی زمانی بیناکاری و نەخش ونیگار، کە گەلێك جار نەخش و نیگارەکە بوو بە بناغە بۆ تێکهەڵکێشی

زمانەکە، لەگەڵێك کاتدا نەخشەکە زمانەکەی خوێندۆتەوە.
٤. سەرهەڵدانی هونەری پەرستگا، وەکو هونەرێکی تری بیناکاری ودروستکردنی لەسەر شێوازێکی دیاریکراوو جیاواز لە هونەری بیناکاری خانووەکانی تـرداو، لەبەر پیرۆزی شوێنەکە، بیناکارییەکەشی بایەخی پێدراوە.
٥. سەرهەڵدانی دروستکردنی شووره بەدەوری شارەکەدا کە ئەمەش لەخۆیدا هەنگاوێکی سەردەمەکانی پێش مێژووە کەئەمجارە بە شێوەیەکی فراوانتر ولە قاوغێکی گەورە وقەبەتر دروستکراوە وشێوازی دروستکردنی بورجی چاودێری لەسەر شوورەکانی بۆ خۆپاراستن.
٦. ئەوەی لەناوچەی کەرکوکدا لەبەرچاو دەکەوێت ئەوەیە کە هونەری بیناکاری (گۆتی)و (لۆلۆیی)و (سۆمەری) و (ئەکەدی)و (هوری–میتانی) هەنگاوی گەورەیان ناوەو جێ پەنجەیان زۆر بەزەقی دیارە، ئەگەر بەراوورد بکرێت لەگەڵ ناوچەکانی تردا، چونکە ناوچەی کەرکوك خاوەنی تایبەتمەندییەکی زۆر ئاشکراو روونە، بۆ نموونە کارتێکردنی (هوری–میتانی) لەسەردەمی ئاشوورییەکاندا زۆر بەزەقی دیارە.
٧. سەرهەڵدانی دروستکردنی کۆشکی فراوانو قەبە، شێوەیەکی بیناکاری قەشەنگو دڵگیری هەبووە لەو سەردەمەدا کە نموونەی ئەمە کۆشکی (نوزی)و (کوڕوخانی) یە، هەم کۆشکێکی کۆمەڵایەتیو هەروەها بەڕێوەبەرایەتییە کە تێیدا بەڵگەیەکی گرنگە لە شوێنی بەرزی لایەنە کۆمەڵایەتییەکەی سەردەمی هورییەکان لە بواری تەلارسازیدا.
٨. سەرهەڵدانی هونەری نەخش ونیگار بە شێوەیەکی فراوان، کە نموونەی ئەمە کۆشکی (نوزی) یە، کە لەکاتی پێویست دێینە سەر بەراوردی ئەم نەخشانە.
٩. دروستکردن وهەڵکەندنی بیناکاری ئاوەڕۆ بە شێوەیەکی رێکوپێكو رێژکردنی بەقیرو چەوو بەرد بۆ راکێشانی دەرچوونی ئاو.
١٠. شان بەشانی هونەری بیناکاری ونەخش ونیگار هونەری گڵکاری وکۆتەڵ ومۆری لوولەکیش گەشەی کردوو شێوەیەکی رێکوپێکی بەخۆیەوە گرت.
١١. سەرهەڵدان وفراوان بوونی بیروباوەڕی ئایینی لەناوچەیەکی وەکو (کەرکوك) لەگەڵ خۆیدا گۆڕانێکی بنەڕەتی هونەری بیناکاری روویدا، وەکو ئەوەی کەسەرهەڵدانی ئایینی زەردەشتی، جۆرە پاڵپێوەنەرێکی هونەری دروست کردنی ئاتەشگە بوو، کە هەنگاوێك بوو بۆ زیاتر دروست کردنی هونەری بیناکاری.

*** هونەری بیناکاریو نەخشو نیگاری گۆتیو لۆلۆییو سۆمەریو ئەکەدییەکانی ناوچەی کەرکوك:**

نزیکترین سەردەمێکی مێژوویی بیناکاری ناوچەی کەرکوك کە بەدەستمان گەیشتبێت، هونەری بیناکاری (گۆتی) و (لۆلۆیی)یەکانە، چونکە کەرکوك بنکەی سەرەکی قەڵەمڕەوی گۆتییەکان بووە،ناوچەکانی سەروو رۆژهەڵاتی کەرکوکیش شوێنی گەشەی شارستانی (لۆلۆیی)یەکان بووە، کە زیاتر شارستانییەتەکەیان لەناوچەی سلێمانی ودەوروبەری بووە،بەڵام کارتێکردنی هونەرییان بەسەر ناوچەکانی کەرکوکەوە بەدیارکەوتووە، بۆیە تا رادەیەکی چاك تێکەڵاوییەکی بیناکاری لە نێوانیاندا بەدیارکەوتووە، کە خۆی دەبینێتەوە لە گەشەکردنی کۆچڕەویان بەرەو ناوچەکانی خوارووی عێراق، لە ناوچەیەکی هاوبەش ئەمیش سەرووی میزۆبۆتامیایە، بەڵام ئەوەی جێگەی داخە ئەوەیە کە تاکو ئێستاکە پشکنینێکی پێویست نەکراوە لە ناوچەکانی کەرکوك لەسەر هونەری بیناکارییان، ئەوەی کەکراوە شتێکی واپێویستی بیناکارییانە نییە.
لێرە بەدواوە، هەوڵ دەدەم کە رونکردنەوەیەك بکەم لەسەر هونەری بیناکاری (گۆتی)و (لۆلۆیی) یەکان هەرچەندە بەشێوەیەکی کەمو بێدرامەت بێت وبەڵگەی پێویست بەدەستەوە نەبێت.
((جێگای قەڵاو وێرانە کۆنەکان کە لە (ئەراپخا)و (زاموا) دا هەن نیشانەی ئاوەدانی کۆنی ئەم وڵاتانەن))[٣]، پاشای ئاشوورییەکان شاهیدی مەدەنیەتی ئەمانەن، ئاشوور (ناسرپاڵ)ی پاشای ئاشوور، بە کۆمەڵ وەستاو سەنعەتکاری لۆلۆکانی بردووە بۆ ئاشوور، بێجگە لەمە بوونی ئەو هەموو قەڵاو شاری لۆلۆیە کە پاشاکانی ئاشوور باسیان کردووە، بەڵگەیەکی ئاشکرایە کە ئەمانە دوو میللەتی مەدەنی وبەکەڵك بوون وبەقابیلیەتی ئێستای وڵاتەکەشا گومانی نیە کە ئەمە راستە. چونکە سامانی ئەم وڵاتە ئەوەندە زۆرە گومان نامێنێت کە بووبێتە هۆی پێشکەوتنی لۆلۆکانی ئەو کاتە))[٤].
بەڵام بیروبۆچوونی مامۆستای هونەر (ئەنتوان مۆرتگات) وایە دەربارەی گۆتییەکان کە:
(( لەتواناادا نییە دەستنیشانی ناسنامەی گۆتییەکان بکەین لە رێگای زانستی ئاسەوارەوە، وە (ف.ئەندریە) ئەوەی سەلماندووە کە بینایەك هەیە لە چینی (F) لە پەرستگای (عەشتار) لە (ئاشوور) کە دەتوانرێت بەهی گۆتییەکان دابنرێت، چونکە بنکەی خانووەکە لەبەرد دارێژراوە، بەڵام لەدوایدا لەگەڵێك شوێندا هی لەو جۆرە دۆزراوەتەوە کە ناگەڕێتەوە بۆ بنەڕەتی (گۆتی)یەکان، مرۆڤ دەتوانێت بیر بکاتەوە لەو کۆشکە گەورەیەی کە لە بەرد دروستکراوە لە گردی (خوێرە) لەسەرووی وڵاتی (میزۆپۆتامیا)، کە دەست پێدەکات لە سەردەمی سۆمەری کۆن، کە پەیوەندی کارێکی هەیە بە هۆرییەکانەوە، کە سەریان هەڵداوە لە هەزارەی سێیەمی پێش زایـنی، کە ناگەڕێتەوە سەر گۆتییەکان، مۆرێك دۆزراوەتەوە لە (ئەشنونا)، بابەتەکەی (ئەکەدی) یەو رووکارەکەی دیاریکراو نییە کە بەجۆرێك ناتوانین هیچ تیشکێکی چاك بگرین کە تایبەت بێت بە شێوازەکەی.
هەروەها ناتوانین بڕیاری ئەوە بدەین کە گۆتییەکان ئەوەندە بەهێز بوونە وژمارەیان زۆر بووە کە تا پلەیەکی وا بتوانن کاربکەنە سەر دانیشتووانی سۆمەریو وئەکەدییەکان لەلایەنی دروست بوونەوە، لەوانەیە لەلایەن ئاوەزیشەوە (العقل) دووبارە. هەروەها دەتوانین ئەوسەردەمەی (گودیا)

بگەڕێنینەوە بۆ سەردەمی گۆتییەکان. بەڵام بەڵگەکان زۆر بەدەستەوە نایەن بۆ ڕاستی ئەم بۆچوونە[٥].
دەتوانین بگەینە ئەم ڕاستییانەی خوارەوە:-

١. ناتوانین بڵێین ((کە گۆتییەکان هەمیشە سەرگەرمی شەڕو شۆڕ وبگرەو بەردە بوون، وەپاشایانی ئەوان پاشایەتییان بۆ نەکراوە ولەناوچوون. بەڵام ئەگەر وابێت چۆن توانیویانە (٩١) ساڵ حوکمڕنی کیشوەرێك بکەن کە لەو ڕۆژگارەدا لە رووی ئابوورییەوە لەپلە یەکی باڵا وکامڵدا بووە، واتا کیشوەری (سۆمەری)و (ئاکاد)وە لە دواییدا لەناو بچن))[٦].

٢. گەلی گۆتی گەلێکی چیایی‌و شەڕزان بوون، هەرچی پاشاکانیانە، ئەوە پاشا گەلێکی دڵ سەرت‌و توندوتیژ خاوەن دەسەڵات‌و زەبروزەنگ وبەترسی سەردەمی خۆیان بوون هەر لەبەر ئەوەیشە سەرچاوە ئەکەدیەکان کە ناوی هەندێکیان دەبات دەڵێ ((پاشای بەزەبرو زەنگی گۆتییەکان وجارجاریش دەڵێ ((درنجی چیا))[٧].

لێرەدا دەمانگەیەنێتە ئەو ڕاستییە کە لەبەر زەبروزەنگی گۆتییەکان، لەدوای رووخاندنی خۆیان هەموو ئاسەوارێکیان لەناو بردو سووتێنراوەو لەکەڵك خراوە، چونکە بەهێزییەکەیان وایکردووە کە لەگەڵ نەمانیاندا هونەرەکەشیان هەرەس بێنێت، نموونەی ئەم جۆرە کارانە زۆر زۆرە لە مێژوومانددا، بۆیە ((نابێت ماوەی کەمی سەڵتەنەتی پاشایانی گۆتی بەهۆی جەنگ وبگرەو بەردەوە دابنێین))[٨].

لەبەر ئەوە ناگەینە ئەو ڕاستییە تا بەوەی شوێنێکی فراوانی کوردستان هەڵنەدرێتەوەو ئاسەوارەکانیان لە شوێنەکانی دوور دەستی سۆمەری وئەکەدییەکان نەدۆزرێتەوە چونکە ئەوەی ژێردەستی (سۆمەری)و (ئەکەدی)یەکان تووشی لەناوچوون بووەو فەوتاوەو شوێنێکی وای نەماوەتەوە کە بکرێتە کاری بەراووردکاری بۆ سەردەمی گۆتییەکان، بۆ نموونە ناوچەیەکی وەك کەرکوك کە لە ڕابردوودا شوێنکی گرینگی ئەوان بووە.

٣. دروستکردنی بنەڕەتی بنکەی خانووەکانیان لە بەرد دروستکراوە، کەئەویش لەزۆر شارستانییەتی ناوچەکانی زاگرۆسدا بەردەوام بووەو هەبووە، بۆیە گۆتییەکان نەتەوەیەکی ئەو ناوچانە بوونەو لەوێوە گەشەیان کردووەو بەردەوام بوونە. کە نموونەی ئەم لێك نزیك بوونەوە (چەرموو)ی لای چەمچەماڵ‌و (حەسوونە)و (مەتارە)، کەلێکچوون هەیە لەبنکەی خانووەکانیان، کە لەوانەیە گۆتییەکان لە هونەری بیناکاری ئەوانەوە مابێتەوە.

بۆیە مامۆستای بەڕێز فوئاد حەمەخورشید گەیشتۆتە ئەو ڕاستییە کە:

((شارستانییەتی گۆتییەکان هەبێ ونەبێ، هەر بەرەو چاتر گۆڕان‌و لەدرێژی دانی شارستانییەتی پێشەوەی چەرمووە. چونکە کۆمەڵگەی کشتوکاڵی (چەرموو)، بەرە..بەرەو هەنگاو بەهەنگاو بەرەو چاتر گۆڕا، بووبە کۆمەڵگەیەکی شارستانی وپێشکەوتوو ترو، ئەنجام شارستانییەتی گۆتییەکانی لێ هاتە دی.

گۆتییەکان جۆرە هاوپەیمانی‌و یەکگرتنێکی خێڵەکی‌و هۆزایەتییان پێکهێنابوو ملکەچی فەرماندەیەکی ئۆروستوقراتی بوون کە بۆ ماوەیەکی کورتی دیاری نەکراو بەپاشا هەڵیان دەبژارد))[٩]

بۆیە دەگەینە ئەو ڕاستییە کە لێکچوونی هەمەلایەنێکی هونەری بیناکاری نەتەوەکانی زاگرۆس بەدی دەکرێت،لەبەر ئەمە هونەری بیناکاری گۆتییەکانیش بڕ بوونێکی پێوە دیارەو هاوچەشنە لەگەڵ ئەو نەتەوانەی زاگرۆسدا.

٤. بەهۆی لێکچوونی لایەنەکانی نەتەوەکانی زاگرۆس وایکردووە، لەگەڵ خۆیدا لێکچوونێکی بیناکاری دروستکردووە، گەلێك جیاکردنەوەی لێی زۆر بەگران دەکەوێت، چونکە لەبەر بەردەوامی ئاوەدانی شوێنەکەیان وایکردووە، هەر لەسەردەمەکانی پێش مێژوو بەزنجیرەیەکی نەپساوە بڕوات بۆ سەردەمە مێژووییەکان، نەتەوەیەکی بیانی نەهاتۆتە ناوی تا هونەرەکەی بەدیار بکەوێت، بەڵکو تەنها لەناو نەتەوەکانی خۆیاندا گەشەو لێکچوون دروست بووە، بۆیە لەیەك لەدواییەکی ئەو زنجیرەیەدا تەنها زیاد بوونێکی کەم رووی داوە لە تەکنیکی هونەری بیناکارییەکە، نەك لە شێوەو تەرزی هونەری بیناکارییەکان، بۆیە هونەرێکی بیناکاری (چەرموو) لەگەڵ (حەسوونە)و (مەتارە)و (گۆتی) دا بەراوردێك هەیە لە تەکنیکی هونەرەکەدا کە هاوسەنگە لە شکڵ وتەرزی بیناکارییەکە.

بۆ نموونە هەموویان بەردیان بەکارهێناوە، بەڵام بەپێی گۆڕانی سەردەمەکان، جیاوازی تەنها لە قەبارەی بەردەکەدایە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ زۆری بەرد لەو شوێنەدا کە لەگەڵ خۆیدا قەبارەو جۆری بەردەکە وڕێژەی بەکارهێنانی ئەو بەردە دەگۆڕێت.

بەڵام ئەگەر سەیری هونەری بیناکاری سەردەمی سۆمەری‌و ئەکەدییەکانی ناوچەی کەرکوك بکەین، دەبینین شتێکی بیناکاری دیاریکراومان بەدەست ناکەوێت، ئەوەی لەبەردەستماندایە بریتییە لە بیناکاری نیوچڵ‌و دۆزینەوەی چەند لایەنێکی گۆزەکاری‌و مۆری لوولەکی‌و هەندێك بەڵگەی جۆربەجۆر.

نێردەیەکی ئەمریکی لە کۆتایی بیستەکاندا شوێنێکی گرنگی دۆزییەوە لە ناوچەی کەرکوك کە پێی دەوترێت (گاسوور)، کەدەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەکەدییەکان، بەڵام لەسەردەمی (فجر السلالات - بەرەبەیانی بنەماڵە سەرەتاییەکان) داپەرستگایەك هەیە کە تایبەتە بۆخواوەند (عەشتار)و هاوشێوەی لە (ئاشوور)دا هەیە، هەندێك شتی گرنگی لێ دۆزراوەتەوە لەنزیك ئەم خانووەدا کە بریتییە لە هەندێك پارچە کە ڕۆشنایی گەورە دەخاتە سەر پەیوەندییە بازرگانی‌و ئاڵوگۆڕەکانی سەردەمی ئەکەدییەکان، هەروەها لەودەست نووسانەدا ئاماژە کراوە بۆ گەلێك دەزگای بازرگانی وڵاتی (ئەنادۆڵ) کە دەبێتە کەرەستەیەکی گرنگ بۆ داستانەکانی (سەرجۆن)ی هاوپەیوەست بەو بابەتەوە، هەروەها بە هۆی هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی بەڵگەی تر بۆ لێکۆڵینەوەیەکی (ناباوو - غیر مألوف) لەسەر دامودەزگای مەدەنی‌و سەربازی سەردەمی (ئەکەدی) ئەو کەرەستە کانزاییانەو مۆرە لوولەیی‌و گۆزە زۆرانە، دەتوانین



قەلای کەرکوك لەسەردەمی گۆتیەکاندا

بەراوردیان بکەین لەگەڵ ئەو چینەی کە هاوسەردەمە لە گردی (براك) کەلە نێوانیاندا گەلێك لایەنی لێکچوون هەیە لەگەڵ هاوسەردەمەکانیدا لە خواروو[10].

(ئەو پەرستگایەی (عەشتار)، (چینی ا) کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەکەدییەکان، وەلە (نوزی)دا گۆڕینێکی شکڵی وای لێ روونەداوە، کە زۆر کەم، ئەمەیش زیاتر بۆ ئەوە کراوە هۆڵەکە فراوان کراوە، کە تارێژەیەکی زۆر زیارەتی خەڵك رابگرێت، لەکاتی نوێژکردنو پەرستندا.. لەبەر ئەوە ناتوانین بڵێین کە ئەو پەرستاگایە هونەرێکی بیناکاری (هۆری) تەواوە بەڵکو تێکەڵاوە لە (هۆری- ئەکەدی) کەئەمیش نیشانەی تێکەڵاوی هونەری بیناکاری (ئەکەدی-هۆری) دەکات. ((کەلەمەودوا دێینە سەر باسی ئەم پەرستگایە)).

بۆ نموونە مامۆستا عەبدوڵڵا دارتاش لە کتێبەکەیدا (کارگورد لە مێژوودا) ئامارە بەوەدەکات کە بنەڕەتی ناوی کەرکوك لە (کارگود، کارگورد)ەوە هاتبێت کە ئەمیش بەلگەی ئاوەدانی بیناکاری کەرکوکە لەسەردەمی گۆتییەکاندا بەلام ئەم راستییانە لە دوا رۆژدا بەدەردەکەون[11].

ئەو سەرنج دەدرێت لەم چەند ساڵەی دواییدا لە کاری کنەو پشکنین لە ناوچە جۆربەجۆرەکانی کەرکوك ئەو راستییە یەکلا دەکاتەوە کە پاشماوەی سەردەمی (وەرکا)و (فجر السلالات) بەدەرکەوتووە، بەلام تا ئێستاکە لێکۆڵینەوەی پێویستی لەسەر نەکراوە بۆ بەراوردی سەردەمی گۆتییەکان. گرنگیەکی تر لەوەدایە کە (ئەراپخا) لەسەردەمی (گۆتییەکاندا) پایتەختیان بووە لە کەرکوك، ئەمیش بەلگەیەکی گرنگە بۆ ئەوەی پایتەختێکی وا گرنگ لە کەرکوك رێی تێناچێت کە هەر وا بە ئاسانی شوێنەواری تێدا نەدۆزرابێتەوە، یان پاشماوەیان بەدەر نەکەوتبێت، بۆیە تاکو لە دوا رۆژدا پشکنینو هەڵکۆڵینی پێویست نەکرێت بوونی گرنگی تەلارسازی گۆتییەکان لە کەرکودا بەدەر ناکەوێت.

بە پێی هەندێك لە بەڵگەکان کە لە ساڵی (١٩٤٨) لە رۆژئاوای شارەکە بەرچاو کەوت ئەویش گەڕەکی (عەرەفە)ی ئێستایە: (لە کاتی گەڕان بە دوای نەوت لەلایەن کۆمپانیای نەوتی عێراقەوە لە کەرکوك لە ساڵی (١٩٤٨) توانرا بەشێك لە شوێنەواری کۆن بدۆزرێتەوە کە بەشێکی زۆر لە کاتی هەڵکۆڵیندا لە ناوچوو بوو.

بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گشتی لە بەغدا لە کاتی هەڵکۆڵینەکاندا توانرا گەلێك لە ڕمو تیرو دەفری دروستکراو لە مسو قوڕ بدۆزرێتەوە کە مێژووکەی دەگەڕێتەوە بۆ شارستانیەتی سۆمەرییەکان لە ساڵی (٢٦٠٠) پێش زایین، لە پاڵ دۆزینەوەی گەلێك پاشماوە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەکەدییەکان، لە پاڵ پاشماوەی دۆزراو بۆ ناوەڕاستی هەزارەی سێیەمی پێش زایین)[12].

لێرەدا دەگەینە ئەو راستییە کە بنیاتنای قەلای کەرکوك دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە ماوە مێژووەی نێوان (گۆتی) و (سۆمەری)و (ئەکەدییەکان)و گەلێك پاشماوەش لە خوارەوەی کەرکوك ماوە تاوەکو ئێستاکە لێکۆڵینەوەو پ شکنین نەگەیشتووە پێی.

*** هونەری بیناکاری ونەخش‌و نیگاری هاوسەردەمی (هۆری-میتانی-ئاشووری) ناوچەی (نوزی)و (کوڕوخانی)و (ئال - ئیلانی) لای کەرکوك:**

((ئەوەی کە گرنگییەکی تایبەتی هەیە دەربارەی پاشەڕۆژی هونەری ئاشووری وڕۆژهەلاتی خواروو بە شێوەیەکی گشتی، هاتنی لێشاوی هۆرییەکانە لەسەرووی وولاتی نێوان دوو رووبار (مابین النهرین)، بەسەرۆکایەتی چینێك لە ئاری فەرمانڕەوا، کە ئەمیش ئەو میتانیانەن کە لەدوای رووخاندنی دەسەلاتی کەنعانییەکانەوە لە ماوەی درێژەوە بوو لە نێوان رووخاندنی دەسەلاتی حامورابی هەتا سالی (١٤٠٠)ی پێش زایینی، لەبەر ئەوە ناتوانین ئەو سەردەمە دابڕین لە هونەری (هۆری-میتانی) کە لەوکاتەدا دەسەلاتی میتانییەکان درێژبوو بووە لە چیای (زاگرۆس) هەتا (فەلەستین)، زۆر ولاتی ئاشوورییەکان کەوتبووە ژێر دەستیانەوە، هەرچەندە کە لەدوایدا رەچەلەکی ئاشوورییەکان زال بوو بەسەر فەرمانڕەوایی سیاسی هۆرییەکان بەلام دەتوانین بە (ئاوەز - العقل) بگەینە ئەو راستییە کە ئاشوورییەکان لە سەرەتای چەرخی چواردەهەمی پێش زایینی‌و لەدوایدا توانییان ئەو دەسکەوتە سیاسی‌و شارستانییە بەدەست بهێنن کە میللەتی (هۆری)و (دەولەتی میتانی) ئەیانویست بگەن پێی، سەردەمی تاریکی ئاشووری لە نێوان مردنی (شەمشی ئەدەدی یەکەم)ەوەیە، وەبوژاندنەوەی سیاسی ئاشوور لەماوەی سەدەی چواردەهەمی پێش زایینییە لەسەردەمی فەرمانڕەوایی ئاشووری (ئەدیبا ئەدەدی یەکەم) بوو[١٣]

لەبەر ئەمە ((ناتوانین چاو بپۆشین لەو کارتێکردنە گەورەیەی کە رووی داوە لە هاتنی هۆزەکانی (هۆری-میتانی) یەکان بۆ سەرووی عێراق لەسەر هونەری ئاشووری بە شێوەیەکی تایبەتی و هونەری رۆژهەلاتی خواروو بە شێوەیەکی گشتی... کە دەولەتەکەیان زۆرینەی زەوییەکانی ئاشوورییەکانی گرتبۆوە[١٤]. بەلام لەدواییدا هونەری ئاشوورییەکان پێش کەوتنی بەخۆیەوە دیوەتەوە دووبارە لە ماوەی سەدەی پانزەهەم‌و چواردەهەم، هەولیدا کە خۆی پاك بکاتەوە لەژێر کارتێکردنی (هۆری- میتانی)[١٥].

بۆیە ئاشوورییەکان توانیان کە ئاواتی سیاسی وڕۆشنبیرییان بەدەست بهێنن دوای دەرچوون لە ژێر کۆتی (هۆری-میتانی) لەماوەی سەدەی سیانزەهەمی پێش زایینی لە هاوسەردەمی سێ گەورە فەرمانڕەوایاندا کە ئەوانیش (ئەداد نیراری یەکەم)و (شەلمانسەری یەکەم)، (تۆکۆلتی میتنورتای یەکەم)، کە هەولیاندا بۆ پاراستنی ریازەی هونەری ئاشووری وباوەشیان بۆ کردەوە[١٦].

((هونەرمەندی ئاشووری بێبەشە لەسەرنجدان بۆ چوونە ناخی خودی، چونکە لە ژینگەیەکی شەڕوشۆڕو بگرەو بەردەو کاولکاریدا ژیاوە خۆی بەستۆتەوە بەخزمەتکردنی گەورەکەی بێ ئەوەی بچێتە ناخی ئاوەزییەوە (الفکرە)، بابەتەکانیان بریتییە لە شەڕکردن لەگەل کلدانییەکان‌و میدی‌و حیسی‌و هۆزەکانی ناوچە بەرزەکان، کەتووشیان بووە بەگەلێك گوێ درێژی کێوی وگەڕان بەدوای شێر لە ئەشکەوتەکانی چیای زاگرۆس، بۆیە دەبینین هیچ شتێك نەماوە لە بابەتەکانیان بێجگە لە رووداوی توندو تیژی‌و بگرەو بەردە، کە شێوازەکەی بێهێزی داپۆشیوە، بۆیە هونەری ئاشووری دادەنرێت بە سادەیەکی زۆرو وانیشان دەدات کە روویەکی تەواوی نییەو سێبەری تابلۆکە تەواو نییەو تەنها چەند هێلێکی کەمی بەدیار دەکەوێت[١٧].

بەلام ئەگەر سەیری هونەری (هۆری-میتانی) بکەین دەبینین کە یەککگرتنێکی تێدا هەیە لەو هونەرە لە نێوان ناوچەکانی ژێردەسەلاتیان هەر لە (عێراق)و (سوریا)و (میسر) کە درێژ بۆتەوە لە چیای (تۆڕۆس) هەتا چیای (زاگرۆس).[١٨]

ئەوەی ئێمە دەیزانین دەربارەی بیناکاری (هۆری-میتانی) بریتییە لە پاشماوەکانی بیناکاری لە (نوزی)و (ئالالاخە) لەسەردەمی پاشای میتانی گەورە (شوشتار). بەلام ئەمە ئەو بەلگەیە بەدەستەوە نادات کە نەخشەی ژێرەوەی پەرستگای (عەشتار) پاشماوەیەکی هۆری-میتانییە[١٩] دۆزینەوەی لە مەودوایی (کوڕوخانی)، هاوسەردەمی (نوزی) دەمانگەیەنێتە هەولدان بۆ بەراوردی هونەری بیناکاری (هۆری-میتانی) ناوچەی کەرکوك، پێش ئەوەی بگەینە سنووری بەراوردکاری هونەری بیناکاری سەردەمی هونەری (هۆری-میتانی) ناوچەی کەرکوك دەگەینە ئەم راستییانەی خوارەوە:

١. ئەوەی لەم قۆناغەی (هۆری-میتانی) دا بەرچاو دەکەوێت دروست بوونی هونەری بیناکاری وسەرهەلدانی بە شێوەیەکی فراوان وسەرهەلدانی بنیات نانی کۆشکی گەورەو قەبە، کە لە پێشدا زۆر بەکەمی بەدەردەکەوت، کەبە ناوبانگە بەزلی وفراوانی هونەری بیناکاری.

٢. فراوانی بەکارهێنانی هونەری نەخش ونیگارو سەرهەلدانی هونەری فرە بەرز کە لەپێشدا ئاوا بەو فراوانییە هونەری نەخش ونیگار بەکار نەهێنراوە.

٣. بەکارهێنانی رەنگ لە نەخشاندنی هونەری نەخش ونیگارو رازاندنەوەی لەسەر بنەمایەکی دلگیر.

٤. بەکارهێنانی هەموو پێویستییەکانی هونەری بیناکاری‌و تەواوکردنی هەموو لایەنەکانی ئەو هونەرە وهەولدان بۆ نەپچڕانەوەی ئەو پێویستییانە.

٥. سەرهەلدانی هونەری بیناکاری (هۆری-میتانی)و کاشی‌و تێکەلکێشکردنی لەگەل هونەری بیناکاری ئاشووریدا، ئەوەی کەلە ناوچەیەکی وەکو کەرکوك بەرچاو دەکەوێت ئەوەیە کە تایبەتمەندیەکی تارادەیەك تەواوی هونەری (هۆری-میتانی) روویدا، کە تێیدا زۆر جیاوازی وتایبەت مەندێتی هەیە لە هونەری بیناکاری ناوچەکانی تردا، هەمووشیان سەر بە هونەری (هۆری-میتانی)، ناودەبرێن، هەروەکو ئەوەی بەرچاو دەکەوێت لە هونەری بیناکاری (نوزی)و (کوڕوخانی)دا.

٦. ئەوەی لەسەردەمی ئاشووری ناوەڕاستدا بەرچاو دەکەوێت، کارتێکردنی هونەری (هۆری - میتانی) بەو سەرهەلدانی هونەرێکی کامل بووی لەو ناوچەیەدا، چونکە بوونی ئەو تایبەت مەندییە وایکرد بەرشالاوی هێرشی ئاشوورییەکان بکەوێت.




نموونەیەك لە هێڵکاری میتانی

٧. ئەوەی لەو سەردەمەدا بەرچاو دەکەوێت سەرهەڵدان و دروست بوونی قەڵایە لەسەردەمی ئاشوورییەکاندا و دابڕانی وەکو ناوچەیەکی نیشتەجێ کەنموونەی ئەمە قەڵایە (ئال ئیلانی، قەڵای کەرکوك).

٨. بە کارهێنانی نەخش و نیگاری ئەندازەیی و ئاژەڵی و رەمزی وخەیاڵی جۆربەجۆر.

٩. سەرهەڵدانی هونەری دروستکردنی پەرستگایە بە شێوەیەکی زۆر، زۆر فراوان و تایبەتمەند کە نموونەی ئەمە پەرستگاکانی (نوزی) و (کورپوخانی)یە.

١٠. کارتێکردنی هونەری بیناکاری ئاشوورییەکان، کارتێکردنێکی زۆر لاوازی هەبوو، بەسەر ناوچە داگیر کراوەکانەوە، ئەمەش زیاتر لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە هێرشەکانیان لایەنێکی کاولکاری هەبووە، زیاتر لەوەی کارتێکردنێکی ئاوەدانی بووبێت، ئەمەیش بەرروونی بەدەردەکەوێت لەسەردەمی ئاشووری نوێ و ئاشووری کۆندا، کە هیچ هونەرێکی بیناکاری ئاشووری بەرچاو ناکەوێت کە جێگای باس بێت.

*** هونەری بیناکاری و نەخش و نیگاری کۆشکی نوزی:**

((لەسەرووی عێراقدا دەتوانین بگەڕێین بەدوای نیشتەجێ بوونی میتانییەکان، کە ماوەیەك لەگەڵ کاشییەکان هاوچەرخ بوون، پاشای میتانییەکان فەرمانڕەواییان کردووە لە پایتەختەکەیان کە (واشوکانی)یە، کە دەکەوێتە نزیك سەرچاوەی رووباری خاپوور لە نزیکی ساڵی (١٥٠٠)ی پێش زایین، هەتا ناوەڕاستی سەدەی چواردەهەمی پێش زایینی، تائەو کاتەی کە دەسەڵاتەکەیان کۆتایی هاتووە، یەکێك لەو قەڵایانەیان لە سووچی خواروو، بەناوبانگ بوو، بەشاری (نوزی) کە کەوتۆتە دووری (١٢,٢) میل لە خوارووی رۆژئاوای کەرکوکی ئێستا (ئەراپخا).

لە کۆتایی بیستەکاندا، لەسەرەتای سییەکاندا، نێردەیەکی ئەمریکی لە زانکۆی (بنسلفانیا) لەژێر چاودێری (ریچارد ف. س. ستار) وئەوانەی تردا، کەوتنە پشکنین بۆ دۆزینەوەی شارستانی میتانییەکان کە دوا ئەنجامی کارەکە دڵخۆشکەرو لەهەمان کاتدا بێ ئومێد بوو لە هەندێك لایەنەوە.. کەتوانرا

کۆشك وپەرستگاو ژمارەیەك خانووی نیشتەجێی تایبەتو گرنگ بدۆزرێتەوە. هەروەها بەهۆی ئەو دۆزینەوانەوە دەگەینە ئەو ڕاستییە کە ئەم میللەتە ژیانێکی زۆر پێشکەوتوو پۆشتە ژیاون وپەیوەندی بازرگانییان هەبووەو بەم ڕێگایەدا پەیوەندییان بەزۆر وڵاتەوە هەبووە، لە ڕۆژهەڵات، هەتا وڵاتی (میسر). گردە سەرەکییەکەی بەناوبانگە بە (وێران شار – یورغان تەپە)، کەلە ژێریەوە شارێکی شوورە دراوە بەخۆی وکۆشكو پەرستگاکەیەوە، بەڵام گردەکانی تر پاشماوەی نیشتەجێکانی تر دەگەیەنێت[٢٠].

کۆشکی (نوزی) بریتییە لە کۆشکێکی ناوخۆیی لە نێوان گەڕەکەکان، کە جیای دەکاتەوە لە خانووەکانی دەوروبەری پەرستگاکە لەسەرڕوویدا، ئەم کۆشکە جیاوازییەکی وای نییە لەگەڵ کۆشکی (بەکرئاوا) یان لەگەڵ کۆشکی (ئەکەدی) لە (ئاشوور) یان لە کۆشکی (ماری)[٢١] ئەم کۆشکە پێك هاتووە لەدەروازەیەك کە دەڕوات بە چەند ژوورێکی ئێشکگرتندا بۆ گۆڕەپانێکی ناوەڕاستی چوار گۆشەیی کە تێیدا حەوزی چوار گۆشەیی ئاوی تێدایە، ئینجا هۆڵێکی درێژ دەبینین لە لێواری لای گۆڕەپانەکە (١٥×٥)م، لەدوایدا هۆڵێکی دووری گەورەتر دەبینین لە رووی پانتایی (١٩,٥×٨)م، کە ئەم دوو هۆڵە چەند ژوورێك پێکیانەوە دەبەستێتەوە، کە بریتییە لە ژووری تایبەتی وگەرماوی ئامادەکراو وپێشاویی (ئاودەست) تەواو بوو[٢٢].

لەیەکێك لە ژوورەکاندا چەند پارچەیەك هەیە لەسەر دیوارەکە کە تێکەڵاوە، بەڕەنگی سەوز لە شێوەی مێخە لەناوەڕاستەوە کە بە (ئاشووری)، (سقاطو)ی پێدەڵێن لەسەر دیوارەکە بە قوڕی گیراوە چەسپ کراوە، وەکو شێوەی نەخشی ڕێكو پێكو لە ژوورێکی تردا پاشماوەی هەندێك وێنەی سەردیواری ڕەنگاورەنگ دۆزراوەتەوە کە رووی ئاژەڵو نیوە مرۆڤە کە لە شێوەی (گا)و ئافرەتی گوێچکە درێژ بێ دەمو لووت کەلە شێوەی خانەی ڕێكو پێك دابەشکراوە کە لە نێوانیاندا خوداوەندی (داری ژیانی) ئاشوورییەکان جیای کردۆتەوە[٢٣].

دەبینین کە شەقامەکانی بەناو دیاریکراوە، وێنەیەکی تۆپۆگراف بۆ دانراوە، وەکو دابەشکردنی ئاو کە چۆن لە جۆگایەکی بچکۆلەوە چەند تۆڕێك تێردەکات، هەروەها ئاوگرەکان (خزان) پڕدەکات کە هەریەکە ناوی خۆی بۆ دیاریکراوە[٢٤].

دەربارەی هونەری وێنەی سەردیوار لە (نوزی)دا ئەوەیە کە دانیشتوان ڕەنگی سپی وەکو گەچیان بەکارهێناوە کە زۆرتردیارە لەسەر ڕەنگەکانی ترەوە.

دانیشتووانی (نوزی) سێ لای دیواریان ڕەنگ کردووە بەڕەنگی ئەرخەوانی بەڵام دیواری چوارەم بەرامبەر دەرگاکە بە سێ پارچە ڕەنگکراوەو لە نێوان هەریەکێکیاندا شریتێکی تەسك جیایانی کردووەتەوە، کە هێڵێکی حەلەزۆنی چوونە ناویەکی تێدایە، کەڕەنگەکان بریتین لە ئەرخەوانی و سوورو ئینجا ئەرخەوانی.

لە کۆشکی (نوزی)دا ولەو ژوورەی کە دەڕوانێتە سەرگەرماوەکەی دوای هۆڵی پاشایەتی (عەرش)و هۆڵی تایبەتی پاشا، پانتاییەك (رووبەرێك)، ڕەنگی کەوتوو لەسەر زەوی دۆزراوەتەوە، لەکاتی پشکنینی ئەم پارچانەدا دەردەکەوێت کە دیوارەکە دابەشکراوەتە سەر چەند ئاستێکی ئاسۆیی کەبەشی سەرووی بە شێوەیەکی شاقوڵی دابەش کراوەتە چەند رووبەرێکی ڕەنگی لاچوار گۆشەیی، تێدا ڕەنگی ئەرخەوانیو سوور وگوڵی (پەمەیی) بەکار هاتووە، وەکو ئەوەی کە وێنەکێش ویستوویەتی وێنەی رووی پەرستگا لەگەڵ دەرگاکە دروست بکات لەگەڵ شێوە پەنجەرەیەکی سێ گۆشەیی لەسەرییەوە، ئەم پانتایانە پەراوێز کراوە بە شریتێ کە نێوانیان بەنەخشی ئەندازەیی ڕازاوەتەوە، بەڕەنگی سپیو ڕەش یان ئەرخەوانیو سوورو لەژێر ئەم پانتایانەدا جارێکی تر پانتاییە شاقولییەکان دەردەکەوێتەوە، دابەش دەبێت بەسەر چوار گۆشەو لاکێشەداو لەنێوانیاندا وێنەی سەری (گا) بەڕەنگی ئەرخەوانیو شاخی بەڕەنگی ڕەش لەسەر تەختی سوور یان ئەرخەوانی یان ئەرخەوانی سپی ڕەنگ کراوە. ئینجا وێنەی درەختی (ژیان) دێت لەسەر تەختی ئەرخەوانی یان ڕەش، لە دواییدا وێنەیەکی ئافرەتی بێ دەم ولووت کە دووچاو ودوو گوێی درێژی وەکو گایی هەیە[٢٥].

هەندێك خانووبەرە هەیە لە لێواری سەرووەوە، تایبەتە بە جێنشینی (فەرمانڕەوای ئەراپخا) کە جێگەی لێکۆڵینەوەی تایبەتییە، لەگەڵ خانووی هەردوو برا (تیخب)و (شورکی تللا)، هەروەها خانووی کەسێك بەناوی (زیکی)، کە ڕێژەیەکی چاك لە کەرەستەی مسی (نحاس) بەخۆیەوە گرتووە لەسەری تیرو چەقۆ وئەو کۆشکەی کەلە نوزی دۆزراوەتەوە، زرێپۆشی ئاخنراوە بە پارچەی قورس، وەکەرەستەو چەند چەکێکی وەکو داسو (مخارم) وکونکەرو (تەشوی) کە هەمووی بەجێ هێڵدراوە لەکاتی رووخاندن وسووتاندنیدا[٢٦].

((ئەو کۆشکەی کەلە نوزی دۆزراوەتەوە، دروستکراوی سەردەمی یەکێکە لە فەرمانڕەواکانی سەردەمی پاشا (شوشتار)ە، لە سنووری (١٤٠٠) ساڵ پێش زایین، ئەم کۆشکە یارمەتیمان دەدات بۆ کاری بەراوردکاری، لە نێوان بیناکاری میتانیو ئاشووریدا، هەر چەندە پاشماوەکانی نەپارێزراوە، کە تەنها بەشێوەیەکی بەشییە (جزئی)، لەسەر ئەوە، لەوانەیە نەخشەکێشانە بنەڕەتییەکەی تەنها بە بۆچوون بێت (حدس). چونکە واپێدەچێت کە بەشێوەیەکی یەك لەدوای یەکی گەورە کرابێتەوەو فراوانکرابێت[٢٧].

کۆشکەکە هەمووی دەورە دراوە بە شوورەی دەرەکی گەورە، کە دەروازەی هاتنە ژوورەوەو چوونە دەرەوەی تێدایە، کەهەریەکەی لە شوێنی دیاریکراوە لە هەردوو رووی ناوەوەو دەرەوە، هەروەها دوو گۆڕەپان دروستکراوە هەر یەکە لە نزیك یەکتری، بەڵام نەك لەسەر یەك چەق، کە لەوانەیە دەروازەی سەرەکی ئەم کۆشکە لەلای سووچی سەرەوە بووبێت، کە بە بۆنەی ئەم دەروازەیەوە مرۆڤ یەکەم جار دەگاتە ئەو گۆڕەپانەی کە کەوتۆتە سەرووەوە، زیاتر لەوەی تر، لەوانەیە بەکار هێنرابێت وەکو گۆڕەپانێکی پێشوازی کردن.

ئەو سەکۆیانەی لە دیوارەکەدایە لەوانەیە بەکار هاتبێت بەشێوەی کورسی بۆ میوانی چاوەڕێکراو لەسەر دووڕیانی

سووچی خوارووی رۆژئاوای ئەم گۆڕەپانە ژوورێکی لاکێشەیی هەیە کە ئاگردانی لێیە، ئەم ژوورە بەکار هاتووە وەکو گۆڕەپانێکی ناوەکی، ئەم گۆڕەپانەی ناوەوەیە کە گەورەیە، ژوورێکی لاکێشەی تر لەلای خوارووی رۆژئاوایەوە، کە تارمەیەکی کۆڵەکەدار دەڕوانێت بەسەریدا، ئەمەیش تەنها ژوورێکی چاوەڕوانییە بۆ ژوورێکی لاکێشەیی فراوانتر کە سەکۆو ئاگردانی تێدایە، کەلە یەکێك لەلاکانییەوە کورتە، کەمرۆڤ دەتوانێت لەکاتی وەستاندا لەلای دەروازەکەیەوە روانگەکە ببینێت ئەم شوێنە لەوانەیە دروستکرا بێت بۆ خاوەن ماڵ.

دەبێت ئەوەمان لە بیر نەچێت کە بەهەمان جۆر ژووری لاکێشەیی هەیە دروستکراوە لە دووڕیانی رێڕەوەکاندا کە شوێنی روانگەو قوربانی تێدایە، نموونەی ئەمە هەیە لە کۆشکەکانی ئاشوورییەکان لە هەزاری یەکەمی پێش زایینی، (کۆشکی سەرووی رۆژئاوای کالخو دۆرشرۆکین یان گردی پارسیب)(٢٨).

مرۆڤ ناتوانێت بەربەرچی ئەو ئەگەرە بکات کە کۆشکی پاشایەتی میتانی، کارتێکردنی خۆی بەجێهێشتووە لەسەر هونەری بیناکاری ئاشووری، بەهەر جۆرێك بێت دەتوانین بڵێین کە کۆشکی (ئەدەد نیراری یەکەم) لەئاشوور لێکچووە لەگەڵ کۆشکی فەرمانڕەوایی (نوزی) لەشێوەی نەخشەدانانی گشتییەوە، هەروەها لەشێوەی ژوورە تاکەکانییەوە، دەتوانین بڵێین کە زیاتر لێکچووە لەگەڵ کۆشکی پاشایەتی کاشی، (کۆریکالزۆیی یەکەم) کە هاوسەردەمێتی، دروستکراوە لە (دۆرکوریکالزو).

ئەوەی گرنگە بۆ کاری بەراوردکاری نێوان هونەری (هۆری-میتانی)و (هونەری ئاشووری)، بریتییە لەو دۆزراوانەی کە پەیوەستە بەهونەری (هۆری-میتانی) ناوچەکانی (وێران شار-یۆغان تەپە)ی ناوچەی نوزی، کە رێژەیەکی چاك لەهونەری بیناکاری ونەخش ونیگاری میتانی تێدا دۆزراوەتەوە بێجگە لە رێژەیەکی زۆری تابلێی جۆربەجۆر، هەروەها دۆزراوەکانی (مەلوان) لەناوجەرگەی ناوچەی هۆرییەکان ئەویش لەناوچەی (خاپوور)و (بلێخە)، هەروەها پشکنینەکانی (وولی)یە لەو شارەی کە کەوتۆتە ئاقاری رۆژئاوای دەوڵەتی میتانی لە (ئالالاخ)، گردی (عطشانة) و کارە چاکەکانی (کلۆرشیفر) لە (ئۆغاریت)و لەدوایشدا دۆزراوەکانی پەیمانگەی رۆژهەڵات لە شیکاغۆ ودۆزراوەکانی دەزگای (م - فرابسرفون ئوبنهایم) لەنزیك (سەری کانی).




هێڵکاری کۆشکی نووزی

بەڵام تا ئێستا کارێکی گەورەی هونەری و بیناکاری شارێکی سەرەکی گەورەی دەوڵەتی میتانی نەدۆزراوەتەوە. ئەوەی کە بەدەستمان گەیشتووەو دۆزراوەتەوە، تەنها لە چوارچێوەی پەرستگاو کۆشکدایە کە هەمووی لەچوار چێوەی ناوچەی ئاقارەکانی میتانیدایە، هونەر لە ماوەی بابەت و ڕێژەیدا، تەنها ئەو دۆزراوانەیە کە ناسراوە بەنەخشی سەر مۆری (کەرکوك)، تا ئێستا بەشێکی کەم لەبەردەستماندایە بریتییە لە هونەری (هۆری-میتانی) ناوچەی کەرکوك لەوێنەی سەردیوارو کۆتەڵی قەبارەیی (النحت المجسم)و کۆتەڵی (هەڵتۆقیو)، ناتوانین شێوەی پێکهاتەکانی بگەڕێنینەوە، تەنها لەڕێگەی بەکارهێنانی بۆ چوونەکانمان نەبێت.

لەم ساڵانەی دواییدا گەلێك لێکۆڵینەوە کراوە لەسەر نەخشی مۆری (هۆری-میتانی) پەیوەست بەنەخشی مۆری ئاشووری ناوەڕاست، وزۆربەی ئەوەی کە لێکۆڵراوەتەوە، بریتییە لە چاپی ئەو مۆرانەی کە دۆزراوەتەوە لە تۆمارە بازرگانییەکانی (نوزی)و (ئاشوور)، ئەم مۆرانە تەنها بابەتەکانی ئەوە نییە کە لەلایەن (هۆری-میتانییەکان)ەوە بەکار هاتووە، بەڵکو تایبەت مەندییەکی تری هەیە ئەویش ئەوەیە کە دەتوانین مێژووییەکەی دیاری بکەین چونکە لەسەر تۆمارەکانی مێژووی بۆ دانراوە.

لە ماوەی سەدەی پانزەهەمی پێش زایینیدا بابەت و شێوازەکانی لە نێوان هۆری و ئاشووری دایە، نەخشکاری مۆری ئاشووری شریتی پەنجەرەیی بەکار دەهێنێت بۆ بەدەست هێنانی چەند ڕوویەکی وێنەیی کە لەشێوەی چەند تابلۆیەکی بەش بەش، کە لەدوایدا هەریەکێکی بەدەمامکێك (اقنعة) پڕدەکاتەوە، کەئەم کارەی دەکەوێتە ژێر سیحری هەمان بابەتی کە وێنەکێشی سەر دیواری کۆشکی فەرمانڕەوای نوزی بەکاری دەهێنێت بۆ ڕازاندنەوەی سەر دەرگاکەی کۆشکەکە.

لەبەر ئەوە دەبینین کە وێنەکێش لە (نوزی) هەڵدەستێت بە وێنەکردنی تابلۆی بەش.. بەش لەداری ژیان وسەری گاو دەمامکی هاتوچۆو بە کۆتەڵی (حاطور)، کەدەتوانین ڕەچەڵەکی (سووری)و (میسری) تێدا بدۆزینەوە، کەئەم جۆرە نموونانە زۆر ئاساییە بۆ دەوڵەتێکی میتانی کە دەسەڵاتی بەسەر ناوچەیەکی زۆردا گرتبێت هەر لە چیای (تۆرس) هەتا چیای (زاگرۆس)، کە سەری (بکرانی) هێمایەکی کۆنە کە بەکارهاتووە لەسەرەتای چاخی بەردین لەسەر گڵکاری گردی (حەلەف) بەڵام لە دوایدا (تحوير) کراوە لە نوزی بەڕێگایەکی زۆر تایبەتمەند، کە لە نێوییدا بنەڕەتی تایبەتی شێوە ئەندازەیی بەهێزی تێدایە. بۆ نموونە لە سەری (گا)دا هەست دەکەی کە پێکهاتەکەی بریتییە لە کۆمەڵێك نیشانەی ئەندازەیی، دەتوانین ئەو گوزارە (تجريد) ئەندازەیە ببینین لەوێنەی سەر ئەو دیوارە لەدەمامکی ئاژەڵێکی تردا. لەشێوازێکی لێکراوەیی (تجسيم)،کە دۆزراوەتەوە لە (ئالالاخ) لەکۆشکی (نقميبا)، ئەم دەمامکە (قناع) داتاشراوە زۆر بە وریایی لەبەردی کلسی سپی، کە داڕێژراوە شێوازە سروشتییەکەی بە داپڕانێکی تەواو کە زۆر بە زەحمەت دەتوانرێت شێوەی ئەم دەمامکە بناسرێتەوە تەنها شاخە شۆڕەوەبووەکانی نەبێت، کە ئەمە تاکە بەڵگەیە (شاخ) بۆ ئەوەی کە بەرانە، مرۆڤ (دەتوانێت بڵێت کە ئەمە بریتییە لە نەخش ونیگارێکی سەر دیوار وەکو ئەو دەمامکەی کە کێشراوە لە (نوزی)، لەسەر ئەمەشەوە لە (نوزی)، سەری بەرانێکی تر دۆزراوەتەوە، کە دروستکراوە لە بەردی گەچی (حجر الجبس)، کە نزیکە لەو شێوازەی دۆزراوەتەوە لە (ئالالاخ). بە بۆنەی لێك نزیکی ئەم دوو کۆتەڵەوە دەمانگەیەنێتە ئەوەی کە یەکێکی لەڕۆژهەڵات ویەکێکی تر لە ڕۆژئاوا، بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە بوونی هونەرێکی میتانی یەکگرتوو هەبووە، بەسیفەتێکی بنەڕەتی.

ئەوەی کەبەرچاومان دەکەوێت لەتابلۆی ئاشوورییەکان لەسەدەی چواردەهەم و سیانزەهەمی پێش زایینی، کەچاپ کراوە بە مۆری هۆری لە شێوازییان وەکو ئەوەی کە دۆزراوەتەوە لە مۆرەکانی (نوزی)و (ئالالاخ) بەڵام ئەوەی زیاتر جێگەی بایەخە لە مۆری (نوزی) ئەوەیە، بابەتەکانی تایبەت نییە بە بابەتی بچووکەوە لە نەخش و نیگاردا، بەڵکو بەشێوەیەکی زۆر ڕوون ودیاری کراوی هەیە[29].

### * هونەری گڵکاری نوزی:

لەناوەڕاستی هەزاری دووەمی پێش زایینی وهەندێك پێشتر لەوە، لەسەرووی عێراقدا وەبەتایبەتی لە ناوچەی کەرکوك جۆرێك گڵکاری بڵاوبۆتەوە، کە بەناوبانگە بە گڵکاری هۆری، تایبەت بە دانیشتوانی هۆرییەکانی ئەم ناوچەیە، جۆرێك لەگڵکاری دۆزراوەتەوە بەناوبانگە بە گڵکاری (نوزی). کۆنترین گڵکاری وەك دۆزرابێتەوە لە چینەکانی ژێرەوەی ناوچەی نوزییە[30].

ناوچەی (نوزی) شێوەیەکی تایبەتی هونەری گڵکاری هەیە، ڕازاوەتەوە بە شێوەیەکی زۆر جوان و ڕێك و پێك. کە نەخش کراوە بەوێنەی (حەلەزۆنی ڕاکردوو)، چەپکێ قژوگوڵ و هەروەها تەیرو تواڵ و درەختی باوی ئەو کاتە[31].

لەنەخشێکدا شێوەیەکی حەلەزۆنییە کەلەناو خانەی سێ گۆشەیی شێوە پێچاو پێچ ڕازاوەتەوە، لەنێوان خانەکانی یەکەم ودووەمدا هێڵی چەماوە ڕازاوەتەوە، لەگەڵ هێڵی ڕاست، هێڵە چەماوەکە کەوتۆتە نێوان هێڵە ڕاستەکانەوە.

جۆرێکی تر (کوپ) بریتییە لە گوڵ و دەوروبەرەکەی لەشێوەی چەپك ڕازاوەتەوە، بۆ نموونە هونەری سێ گۆشەیی نەخش کراوە، لە هەندێکی تریان شێوە چوار گۆشەیی دوو ڕەنگ ڕازاوەتەوە. ئەم جۆرە گڵکارانە بەڕەنگی سپی کراوە، لەسەر تەختی ڕەنگاوڕەنگ، کە ئەم جۆرە شێوەیە لەسەر دیوارەکانیش دەبینرێت.

لەبەر ئەمە دەتوانین نموونەی ئەم گڵکارییە لە نموونەی هونەری (نوزی)دا ببینین، ئەوەی زۆرتر باوە کوپی درێژە، بریتییە لە بنکەی لێك چووی شێوە گۆپکەیی هاوچووە وەکو (زر)و (نماذج)[32].

گڵکاری نوزی بۆیەکراوە بەڕەنگی ڕەش یان زەیتوونی هەندێك جار پرتەقاڵی تۆخ، وێنەکراوە بەسپی لەسەریدا، لە شێوەی ئەندازەیی وحەلەزۆنی[33].





نەخشی ناوەوەی کۆشکی نووزی

دەفرەکانی (نوزی)، ئەملاو ئەولاکەی زۆر ناسك دروستکراوە، دروستکردنەکەی لە قوڕێکی پاك ونەرمە هەندێك جار لەشێوەکانیدا کوپی بنکەیی خڕی پتەو هەیە بەڵام دەفرییە بێ ڕەنگەکانی نوزی جۆرەها شێوەی هەیە کەقوڕەکەی شێوەیەکی مام ناوەندی سوور کراوەتەوە، کە ڕەنگەکەی سەوز ئەشکێتەوە بەلای زەردەوە، ئەم دەفرانە لەسەر دۆڵابێك دروستکراوە کە زۆر بە خێرایی سووڕاوەتەوە. کوپەی گەورە بەکارهێنراوە بۆ پاراستنی خواردن یان ناشتنی مردووی منداڵ، زۆری نەخش کراوە بە پشتێنێکی هاو تەریب لە نەخش و نیگاری بەدیار لەسەر لاشەکەی لە بەشی سەرەوە، هەندێك کوپەی شێوەی هێلکەیی گەورەیی هەیە لەلای دەمەکەیەوە، کە هەندێکی ملی نییە[٣٤].

* پارچە دۆزراوەکانی ناوچەی نوزی؛

١. مۆری لوولەیی، دەگەڕێتەوە سەردەمی هۆری، بابەتەکەی تابلۆی دارخورمایەکە، لەتەنیشتێوە دوو مرۆڤ وەستاوە، لەژێرەوەی ریزێك ئاسکە هەیە، قەبارەکەی (٢,٤×١,١) سانتیمەترە، دروستکراوە لە هەویری شووشەیی، شوێنەکەی نوزیە، هەزاری دووەمی پێش زایینی.

٢. مۆرێکی لوولەیی، لەسەردەمی هۆری، بابەتەکەی پیاوێکە وەستاوە لەبەرامبەر دارخورمایەك، لە تەنیشتێوە ڕەوە ئاسکە هەیە لە ژێریانەوە نەخش و نیگاری ئەندازەیی هەیە، دروستکراوە لە هەویری شووشەیی قەبارەکەی (٢,٥×١,١) سانتیمەترە، شوێنەکەی ناوچەی نوزییە لەهەزاری دووەمی پێش زایینی...[٣٥].

٣. دۆزینەوەی پارچەیەکی هونەری نوزی کەلە شێوەی تەندوردایە، کەسەرەوەی بچووك ترە لە ژێرەکەی، هەموو لاشەکەی هەڵکۆڵراوە بەنەخشی شێوە سێ گۆشەیی دووچین لەسەرو خواری یەکتری، لە ژێرەوەیش کونێکی تێدایە، لەسەرەوەیش وا بەدیار دەکەوێت کە ملەیەکی بۆ کرابێت، بەڵام تا ئێستا نەزانراوە کە بۆچی بەکار هاتووە.

٤. دۆزینەوەی پارچەیەك کە تائێستا نەزانراوە بە شێوەیەکی تەواو بۆچی بەکارهاتووە، بریتییە لە دوو بەشی چوار گۆشە کە تارادەیەك بەشی سەرەوەی تاهاتووە بچووك بۆتەوە، لەخوارەوە لەهەرلاوە کونێکی لاکێشەیی هەیە، کە دەکاتە چوار کونی لاکێشەیی هەرچوار گۆشەیەك.




**کۆمەڵێك کەرەستەی بەکارهێنراوی (هوری - میتانییەکان) لە کەرکوك**




**کۆمەڵێک کەرەستەی بەکارهێنراوی (هوری - میتانییەکان) لە کەرکوک**




**کۆمەڵێک کەرەستەی بەکارهێنراوی (هوری - میتانییەکان) لە کەرکوک**




**كۆمەڵێك كۆتەڵی بەكارهێنراوی (هوری - میتانییەكان) لە كەركوك**




**کۆمەڵێك کۆتەڵی بەکارهێنراوی (هوری - میتانییەکان) لە کەرکوك**




**کۆمەڵێک کوتەڵی ئاژەڵی (هوری - میتانییەکان) لە کەرکوک**




**کۆمەڵێك کەرەستەی شەڕکردنی (هوری - میتانییەکان) لە کەرکوك**



**کۆمەڵێک کۆتەڵی ئاژەڵی (هوری - میتانییەکان) لە کەرکوک**







**کۆمەڵێك کەرەستەی قوڕی بەکارهێنراوی (هوری - میتانییەکان) لە کەرکوك**



بەشێك لە پاشماوەی شارستانییەتی (هوری - میتانییەکان) لە کەرکوك



بەشێك لە پاشماوەی شارستانییەتی (هوری - میتانییەکان) لە کەرکوك





بەشێك لە پاشماوەی شارستانییەتی (هوری - میتانییەکان) لە کەرکوك





بەشێك لە پاشماوەی شارستانییەتی (هوری - میتانییەکان) لە چۆنێتی ناشتی مردووەکانیان لە کەرکوك

*** هونەری بیناکاری ونەخش ونیگاری کووڕوخانی ناوچەی کەرکوك:**
(کووڕوخانی دەکەوێتە خوارووی رۆژئاوای شاری کەرکوك بەنزیکی (٤٥) کیلۆمەتر لەسەر رێگای کۆمپانیای نەوتی عێراق (I.P.C)، کە کەرکوك دەبەستێتەوە بە شارەکانی رۆژئاوای سەر رووباری (دیجلە)، ئەم گردە (٣٥) کیلۆمەتر دوورە لە خوارووی رۆژئاوای نوزی[٣٦].
گردەکە قەبارەیەکی ناوەندی هەیە کە پێوانەی لای درێژییەکەی (٢٠٠) مەتر دەبێت، لایە پانەکەی (١٣٥×١٤٠) مەتر دەبێت، ئەم گردە بەرز دەبێتەوە لەسەر خۆ لەلای خواروو، بەرەو لای سەروو، کە بەرزترین بەرزی دەگاتە (٤,٤٢) مەتر، کە لەوانەیە گردەکانی ئەم ناوچەیە هەمووی لەخوارەوە بەرەو سەروو هەڵکشابێت، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ هۆی هەڵکردنی (با) لە ناوچەکەدا[٣٧].
لێرە بەدواوە هەوڵدەدەم باسی بیناکاری چینی یەکەمو چینی دووەمی کوڕوخانی بکەم، کەچینی دووەمی بریتییە لە هونەری بیناکاری کۆشکی سەوز کە کۆشکێکە دەگەڕێتەوە سەر هونەری بیناکاری (هۆری–میتانی) سەردەمی ئاشووری ناوەڕاست. ئینجا لەدوایدا دێمە سەر باسی هونەری بیناکاری پەرستگا لەهەریەکە لە (نوزی)و (کوڕوخانی)دا وهەوڵی لایەنی بەراورد دەدەم لەهەردوو ناوچەکەدا، ئینجا دێمە سەر بەراوردی هونەری بیناکاریو نەخش ونیگاری (نوزی)و (کوڕوخانی).
سەرچاوەکان ئەوە بەدەردەخەن کە کۆشکی (کوڕوخانی) خانوویەکی سادە نەبووە بەڵکو کۆشکی یەکێکی ناودار بووە کە فەرمانڕەوایی ناوچەی (کوڕوخانی) بووە، دەستی رۆیشتووە بەسەر ناوچەکەدا. ئەمەش بەدەردەکەوێت:
لە چاکی هونەری بیناکاری، وەکو قەبارەی فراوانی وپانی دیوارەکانی وڕێکخستنی شێوەی پاشەڕۆی ئاو دابەشکردن لە ژوورەکاندا، هەروەها بەکارهێنانی رەنگ لەبۆیەکردنی هۆڵەکاندا... بەکارهێنانی خشتی سوورەوەکراو لە دیوارەکانی دەرەوەو لەناو ژوورەکانو زەوییەکانیدا، دۆزینەوەی ژمارەیەکی زۆری (رەقیم)ی قوڕ کە نزیکەی (٨٠٠) رەقیم دەبێت، بێجگە لە دۆزینەوەی مۆری لوولەیی وبزماری (گڵی)و سوراحی گەورەو کوپە وشووشەی رەنگاورەنگ[٣٨].




**هێڵکاری چینی یەکەمی کووڕوخانی**

*** کۆشکی سەوز چینی دووەمی کووڕووخانی:**
((کۆشکی سەوز خانوویەکی زۆر فراوانە، لاکێشەییە رووبەرەکەی دەکاتە (٣٠×٦٠) مەتر، لاکانی بەلای چوارلادا دەچێت، توانراوە نزیکەی (٢٦) هۆڵو هەیوانی لێ بدۆزرێتەوە، بەڵام ئەمە هەموو بەشەکانی نەبووە لەوانەیە لەبنەڕەتدا دوو چین بووبێت، بەڵگە بەدەستەوە هەیە کە ئەو راستییە بسەلمێنێت، ئەویش ئەستووری دیواری بیناکارییەکەیە هەروەها زۆری ئەو خۆڵەی کە کەوتۆتە سەر کۆشکەکە، نەخشەی ژێرەوەی کۆشکەکە دەکرێتە دووبەشەوە:
بەشێکی پێی دەوترێت بەشی گشتی کۆشکەکە (الجناح العام) کە دەکەوێتە لای خوارووی رۆژهەڵاتی بیناکارییەکەوە، بەڵام بەشی تایبەتی کۆشکەکە (الجناح الخاص) لەلای سەرووی رۆژئاوای کۆشکەکەوەیە.
ئەم کۆشکە تەنها دەروازەیەکی (مدخل) هەیە کە پانییەکەی (١,٥) مەترەو دەکەوێتە رووی کۆشکەکەوە لەخوارووی رۆژهەڵاتەوە، پانی ئەم رووە (١٥,٦٠) مەترە کە (٧,٢٠) مەتری بەدەرکەوتووە لەبەشەکانی تری بیناکارییەکە، ئەم رووە دیارە سێ سوودگەی گشتی (المرافق العامة)ی هەیە

لەگەڵ دوو بورجی گەورە.. ئەم جۆرە نەخشە کێشانە شێوەیەکی باوی هونەری بیناکاری عێراقی کۆن نییە.
وا بەدەردەکەوێت کە نەخشە کێشانەکەی ئەم کۆشکە کە لە هەزارەی دووەمی پێش زایینییەوە بینات نراوە بۆ کارێکی بەرگری دروست کرابێت... رووی کۆشکەکە بۆیەکراوە بەڕەنگی شینی مەیلەو سەوزو زۆری ژوورەکانی کۆشکەکەی پێ سواغ دراوە.
رووی کۆشکەکەی چوار دەرچووی هەیە (طلعات) کەرووی دەرەوەی دیوارەکەی رازاندۆتەوە، دوو دەرچوو لەلای بەردەمییەوە بە پێوانەی (١,٢٥× ٠,٤٥) مەترە، لەگەڵ دەرچوونێك لە تەنیشتیەوە بە پێوانەی (١,٢٥ × ٠,٤٥) م، (١×٠,٤٥) م.
رووی پێشەوەی کۆشکەکە دوو سەکۆی دروستکراوی هەیە لەخشت دروستکراوە (دکە) کە هەریەکە لەملاو ئەولای دەرگا سەرەکییەکەیە درێژی (٢,٩٠) مەترو پانی (٤٥) سم، بەبەرزی (٣٠) سم.. ئەمەش لەوانەیە بۆ دانیشتن یان ئێشك گرتن و چاوەڕوانی کردن بەکار هاتبێت.
دەروازەی دەرەوەی کۆشکەکە بەهۆی ڕاڕەوێك دەڕواتە نێو حەوشەیەکەوە بە پێوانەی (٥,٧٠×٤) مەتر وزەوی ئەو ڕاڕەوە دیارە کەبە جوانی داپۆشراوە بەخشتی (فەرشی)، ئەو حەوشەیەیی بەردەم، سێ سەکۆی هەیە کە بە دیوارەکەوە نووساوە، پێوانەکانیان بەڕێژەی (٢,٦٠×٣,١٠) مەترو (٨٥) سانتیمەتر پان و بەبەرزی لەنێوان (٣٥- ٤٥) سانتیمەترە، کەلەوانەیە هۆی دروستکردنی ئەم سەکۆیانە بۆ چاوەڕوانی بووبێت.
لەم حەوشەیەوە دوو چوونە ژوورەوەی هەیە یەکێکیان لە سووچی ڕۆژهەڵاتە، ئەوی تریان لە سووچی ڕۆژئاوایە کە دەڕواننە سەر هەردوو ژووری (١٤)و (١٥) کە ژووری (١٤) پێوانەکەی (٥×٢,٥)مەترە وەژووری (١٥) پێوانەکەی (٥,٣٥ ×٢,٥٠)مەترە کە هەردوو ژووری (١٤)و (١٥) بۆ هەڵگرتنی خواردن وشەراب بەکار هاتبێت، ئەویش بە دۆزینەوەی کوپەیەکی گەورەی زۆر لەهەریەکە لەو دوو ژوورەدا، حەوشەی پێشەوە چوونە ژوورەوەیەکی تری هەیە لەلای سەرووی ڕۆژئاوای کە دەڕوانێتە سەر ژووری (١٠) کە فراوانترین هۆڵی کۆشکەکەیە بە پێوانەی (١٤,٨٥ × ٤,٨٠) مەتر، ئەوەی ژووری (١٠) بە ژووری (١١) دەبەستێتەوە لەلای سەرووی ڕۆژهەڵاتی بەهۆی چوونە ژورەوەیەکەوە (مدخل) کە دەرچوویەکی (طلعات) دیواری هەیە لە هەردوو لاوە.
ڕێگای ڕێکخستنی ژووری (١٠)و (١١)، ئەو پاشماوە بیناکارییانەو ئەو کەرەستە شوێنەوارییانەی کە تیایەتی بەڵگەیە بۆ گرنگی ئەوەی کە لێچوونەوەی وەکو ئەو هۆڵی پێشوازییانەی کە باوبووە لە خانووبەرەی عێراقدا. ئێمە وا دادەنێین، کە هۆڵی ژمارە (١٠) هۆڵی پێشوازی گشتی کۆشکەکە بووە، ژووری (١١) شوێنی پاراستنی ئەو دەستنووس و (مستندات) تانە بووە کە خاوەنی کۆشکەکە بەکاری هێناوە لە پێویستییەکانیدا. کە ئەو هۆڵە وەکو هۆڵی پێشوازی پاشایەتی ئاشوورییەکان وایە، بۆچوونە ژوورەوەی دەبێت بسوڕێتەوە تا بێتە بەردەم فەرمانڕەوای کۆشك، لەوانەیە کە خاوەن کۆشك لەلای سووچی خوارووی ڕۆژئاوای دانیشتبێت، نزیك لەلای ئاگردانەکە، کە دانراوە لەسەر چوار خشتی (فەرشی)، لەکاتێکدا چوونە ژوورەوە لە سووچی ڕۆژهەڵاتی ئەو لایەی ترە.
هۆڵی پێشوازی چوونە ژوورەوەیەکی هەیە بۆ ژووری ژمارە (٩)، لەلای سەروویەوە، بەپێوانەی (٧,١٦×٥,٤٠) مەتر، کە ئەمە دوابەشی ژوورەکانی باڵی تایبەتی کۆشکەکەیە، تایبەتمەندی ئەم ژوورە دیار نییە، بەڵام بە بەهاترین پارچەی ئاسەواری لەم ژوورە دۆزرایەوە.
لەژووری (٩) وە دەروازەیەك هەیە لەسووچی خوارووی ڕۆژئاوایەوە بۆ ژووری ژمارە (٧) کە دەکاتە باڵی تایبەتی کۆشکەکە، لەحەوشەی ژمارە (٧) هەریەکە دەروازەیەك هەیە بۆ سەر ژوورەکانی (١)و (٣)و (٨)و (٩).
ژووری ژمارە (١) گەورەترین ژووری باڵی تایبەتی کۆشکەکەیە کە (١٠,٧٥×٥,٥٥)مەترە، کەلەوانەیە شوێنی نیشتەجێی خێزانی نێو کۆشکەکە بووبێت، ژووری ژمارە (٥) گەرماوی کۆشکەکە بووە، کە چینی ژێرەوەی ژوورەکە بەخشتی سوورەوەکراو و قیر داپۆشراوە، تا بۆ ئەوەی بەرگری بگرێت لە دزینی ئاو و شێ. بەڵام ژووری (٤) لەوانەیە شوێنێکی تری پاراستنی ڕەقیمی قوڕ بووبێت لەم ژوورەدا گەورەترین نووسراوی کۆنمان دۆزیوەتەوە هەروەها لەم ژوورە سەکۆیەك هەیە لەلای سەرووی ڕۆژئاوایەوە کەلەوانەیە بۆ ئەو کوپەیە کرابێت بۆ هەڵگرتنی تابلۆ قوڕییەکان.
شێوەی دروستکردنی ژووری (٦) لەشێوەی پیتی (L) دایە، بۆ ئەوەی بگونجێت بۆ کاری ئامادەکردن و دەرکردنی ئاوەڕۆی کۆشکەکە.. پێوانەی بەشی درێژی ژووری (٦) بریتیە لە (٧,٤٥ × ٢,٤٠) مەتر، بەشی پانی ژوورەکە بریتییە لە (٣,٦٠ × ٣,٦٠) مەتر، بەشی بچووکی ژوورەکە بیرێکی ئاوی تێدایە، کە بەچاکی بەخشت داڕێژراوە وەلەلای ژوورە درێژەکە ئاوەڕۆیەك دۆزراوەتەوە کە دەست پێدەکات لە بیرەکەوە، دەڕوات بەرەو ژووری (٣) کە دەبەسترێتەوە بەهۆی ئاوەڕۆی ژوورێکی تر، ئاوەڕۆیەکی سەرەکی ترەوە. هەروەها باسێکی وانییە دەربارەی ژوورەکانی ژمارە (٣)، (٨)، (١٢)، تەنها ئەو پاشماوە ئاسەوارییانە نەبێت کە بەڵگەی ئەوەیە کە بەکار هاتووە بۆ کاری ناوماڵ.
ئەو تایبەتمەندییە بیناکارییەی کە کۆشکی سەوز پێی بەناو بانگە، بوونی ژمارەیەك ژووری بچووك هەیە هەر لە ژووری (١٦-٢٢)، کەبەیەکەوە بەستراوەتەوە، درێژ بۆتەوە لە درێژی لای خوارووی ڕۆژئاواو لای سەرووی ڕۆژئاوای کۆشکەکە، پێوانەی ئەم ژوورانە بەم جۆرەیە:
ژووری (١٦) (٢,٩٥×٢) مەتر، ژووری (١٧) (٣,٦٥×١,٧٥) مەتر، ژووری (١٨) (٢,٨٥×٢) مەتر، ژووری (١٩)، (٢,٥×١,٦٠) مەتر، ژووری (٢٠) (٢,١٥×١,٩٠) مەتر، ژووری (٢١) (٢,٢٥×١,٩٠) مەتر، هەریەکە لەم ژوورانە دوو (کوە) ی تێدایە، کەتەنها ژووری (١٦) نەبێت کە یەك (کوە)ی تێدایە، پێوانەی ئەم (کوە)انە لە نێوان (٣٥-٧٥) سم پانی (١,١٥-٢,٦)م درێژی دایە، لەبنەڕەتەوە بنچینەکەی (نیوەبازنەیە)-(معقود)ە، زۆر دڵنیانین دەربارەی کاری ئەم ژوورانەو ئەو

کوونانەی لێی هەیە، بەڵام تەنیا ئەم کوونە قووڵانە بۆیە نەکراوە لە کۆشکەکەدا.

لەم ژوورانــەدا تەنها.. چەند تابلێتێكو هەیکەلی مرۆیی لێ دۆزراوەتــەوە. هەموو کونەکان کراوەیە، هیچ شتێکی لێ نــەدۆزراوە تەنها خۆڵێکی نەرمی سوور نەبێت لە هەندێکیاندا، بەهۆی قووڵی وتەسکی ونزمی بنمیچەکەی بەکەڵکی ئەوە نایەت بۆ هەڵگرتن بەکار بێت، بەڵام لەوانەیە ئەمە لەبنەڕەتدا گۆڕی دانیشتوانی کۆشکەکە بووبێت. ئەم گۆڕانە لەکاتی هێرشی دەرەکیدا بووبێتە هۆی تاڵان کردنی لەکاتی ئەوەدا هاتوونەتە سەر کۆشکەکەو دانیشتوانەکەیان کوشتووە.

دەبێت دان بــەوەدا بنێین کە گۆڕانکارەکانی (کۆشکی سەوز) شێوەیەکی دەگمەن ونەخشەسازێکی تایبەتی هەیە، کە هیچ گۆڕانێکی بەو جۆرە نییە لە نموونەی لە هونەری بیناکاری عێراقی کۆندا، بەڵام لەشێوەی ئەم (کوە) نەدا هەندێك لێکچوون هەیە، وەکو ئەوەی کە دۆزراوەتەوە لەهونەری بیناکاری (کۆشکی سپی)، (کۆریکالزۆ) لەناوچەی (عەگەرگوف) وە (خانووی سپی) کە دەگەڕێتەوە چینی یەکەم پێك هاتووە لە سێ ژووری درێژی هاوتەریبی یەکتری، لەهەر ژوورێکدا (کوە)یەك هەیە بەدرێژی هەردوولایە درێژەکان، ئەمەی (عەگەرگوف) دادەنرێت وەکو ژوورێکی هەڵگرتن (خزن)و کونەکانی وەکو گۆڕ بە کار هاتبێت (قبور).. بەڵام لەوانەیە ئەگەر لەرووی ئاسەواری‌و زمانەوانییەوە سەیری بکەین، دەگەینە ئەوەی کە شوێنێکی تایبەت بووبێت بەکاری ڕێوڕەسمی مردوو ناشتن (الطقوس الجنائزية)و ئەو (کوە) انە گۆڕ بووبێت، کە تایبەت بە خێزانی پاشایەتی (کاشی) یەکانەوەیە. بەڵام ژووری ژمارە (٢٦) ژوورێکی فراوانە بەقەبارەی (١٧,٥٠×٣,٦٠) مەتر، کە دەکەوێتە سوورچی خوارووی کۆشکەکە لەدوای ژووری (٨)و (١٠)ی کۆشکەکە، دیوارەکانی ژوورەوە بۆیەکراوە بەرەنگی شینی مەیلەو سەوز، دیوارەکانی دەرەوەی رازاوەتــەوە بە (دەرچوون) (طلعات)و بەناواچوون (الدخلات)، هەروەکو ئەوەی دیارە لە پاشماوەی دیوارەکانی ئەو لایەی کۆشکەکە، وەوا بەدەردەکەوێت کە هیچ دەروازەیەکی نییە بۆ ناو کۆشکەکە، بەڵام دەرگایەکی هەیە بۆ دەرەوە دەچێت، کاری ئەم ژوورە زۆر فراوانە، کە بە تەواوەتی دیارنییە، بەهۆی داڕووخاندنی دیوارو زەوی ژوورەکــە، بەڵام بەنەخشەی ژوورەکــەو ئەو بۆیەی بە پێی نەخشکراوەو پەیوەندی بە بەشەکانی تری کۆشکەکەوەیە، ئەوە بەدەردەخات کە لەوانەیە ژووری پێشوازی میوان بووبێت، چونکە بوونی دەروازەی دەرەکی ئەوە بەدەردەخات، بۆ ئەوەیە کە میوانی بێگانە بەدوور بگیرێت لە دانیشتوانی کۆشکەکە.

ئەگەر بەراوردی کۆشکی سەوز بکرێت لەگەڵ کۆشکەکانی هەزارەی دووەمی پێش زایین دەبینین کە تایبەت مەندییەکی بیناکاری هەیە ئەویش شێوەی بەرگرییە کە بەئاو داپۆشراوە، دەورە دراوە بە دیوارێکی دەرەوەی کۆشکەکە بە ڕێژەی ئەستووری (٣٠,٧٠) مەتر، کە حەوت بورجی گەورەی هەیە کە چەسپ کراوە لە سێ لای بیناکە، کە دوو بورجی بەدەردەکەوێت لەلای خوارووی ڕۆژهەڵاتی لەدوای هەردوو ژووری (١٤)و (١٥)، دوو بورجی تر لەناوەڕاستی لای خوارووی ڕۆژئــاوا، وسێ بــوورج بە درێژایی لای سەرووی ڕۆژئاوای کۆشکەکەوە لەگەڵ پەرستگاکە، کە تا رادەیەك هاوشێوەیە لەگەڵ بورجی لای سەرووی ڕۆژهەڵاتی پەرستگاکە، بەڵام ئەمە بەتەواوەتی بەدیارنییە، بورجەکان لە خشت دروستکراوە بە پێوانەی (٥×٥) مەتر تەنها ئەو بوورجە نەبێت لەلای سەرووی پەرستگاکەوە بە پێوانەی (٥,٥٠×٧,٥٠) مەتر، کەدەکاتە سێ بورجی کۆشکەکە (دوو بورج لەلای خوارووی ڕۆژئــاوای، بورجێك لە ناوەڕاستی لای سەرووی ڕۆژئاوایی)، کۆمەڵێك ژوور دروستکراوە لە تەنیشتەوە (ژوورەکان ژمارە ٣٣، ٢٤، ٢٥)، کە پێوانەی ئەم ژوورانە بەم جۆرەیە: ژووری ژمارە (٢٣) (٢×٢,٩٠) مەترو ژووری (٢٤) (٢,٦٠×٣,٣٠) مەترو ژووری (٢٥) (١,٧٠×٣,٣٠) مەترە، هیچ دەرگایەکمان نەدۆزیوەتەوە بۆ ئەم ژوورانــە، هەرچەندە کە بەرزی دیوارەکانیان ٤٠ سم، کە بەرزی دیواری هەردوو ژوور (٢٣)، (٢٤) (١,٦٠) مەتر، لەوانەیە ئەم ژوورانــە بەکار هاتبێت وەکو مەخزەن، یان لەوانەیە بۆ پاراستنی یەکێك بووبێت، یان لەو جۆرانەدا لەوانەیە کە چوونە ژوورەوە بۆ ئەم ژوورانە بەهۆی پەیژەی دار بوبێت بۆ هەڵگرتنی شت.

یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەم کۆشکە ئەوەیە کە شێوەی ئاوەڕۆیەکی چاکی هەیە (شبكة تصريف المياه) کە چەند جۆرە ئاوەڕۆیەکی هەیە کە هەمووی بەرەو ژووری ژمارە (٣) دەڕوات... کە چوونە بەرەو ئاوەڕۆی سەرەکی کۆشکەکە، ئاوەڕۆی سەرەکی دیواری کۆشکەکە دەبڕێت لەلای دیواری خوارووی ڕۆژئاوا، ئاوەڕۆکە فڕێ دەداتە دەرەوە بۆ ماوەیەکی دوور لە کۆشکەکەوە.

دەتوانین ئاوەڕۆیی سەرەکی بکەینە سێ بەشەوە لە کۆشکەکە، بەپێی ڕێگای دروست کردن وجۆری بەکارهێنانی کەرەستەی بیناکارییەکە:

١. بەشی یەکەم درێژییەکەی (٦,٨٠) مەترو پانی (١,٦) مەترو بەرزی (١,٤) مەتر، کە لە خشت دروستکراوەو لە ناوەوەی ئاخنراوە بە قیر، ئەم بەشە بنمیچەکەی تێك هەڵکێشە، خۆی گرتووە بە دیوارێکی بێ هێز کە لە ناو ئاوەڕۆکە بۆی دروست کراوە.

٢- بەشی دووەم درێژییەکەی (٣,٢٠) مەترو پانی (٧٠) سم بەرزی (٥٥) سمە، ئەمەیش لەخشت دروستکراوە، ئاخنراوە بەقیر، ئەم بەشە بنمیچەکەی تەختو داڕێژراوە بەخشتی فەرشی گەورە بە پێوانەی (٨×٥٢×٥٢) سم، کەوا بەدەردەکەوێت تایبەت بێت بە بنمیچی ئاوەڕۆکەوە، بۆ هەردوو لای بەشەکە چینێك قیر هەیە بۆ بنەڕەتی ئاوەڕۆکە.

٣- بەشی سێیەم درێژی (٥,١٠) مەتر بەشێوەیەك دروستکراوە جیاواز لە هەردوو بەشەکەی تر هەیە، ئەم بەشە بریتییە لە نۆکەندێك (قناة) پانییەکەی (٤٨) سمو قووڵی (٦٨) سم، لە زەوییەکە هەڵکەنراوە وئەم لاو ئەولای بەخشت هەڵچنراوە. بنمیچی ئەم بەشە داپۆشراوە بە دوو گرێ خشتی شێوە بەرمیلی، کاری ئەم دوو گرێیە (عقد)


چینی دووەمی کوڕوو خانی
کۆشکی سەوز
و
سەکۆی پەرستگاکەی


شێوەی دیاری کردنی پەیوەندی
نێوان هەردوو چینەکان

خشتە بۆ ئەوەیە وەکو ئەوەی تونێلێك (نفق) دروست بکەن لەسەر ئاوەڕۆکە، پانی هەر گرێیەك (١,٤٠) مەترە، درێژی هەریەکێکیان (٣,٥) مەترە، ئەوی تر (١,٦٠) مەترە، کۆتایی ئەم گرێیانە لە شێوەی کەوانە رایگرتووە کە لەناو دیوارەکەدا دروست کراوە، ئەمەش بەدیار دەکەوێت بۆ ئەوەیە تا قورسایی نەکەوێتە سەر ئەو دیوارەی گرێکانی راگرتووە، وابەدەردەکەوێت کە پاڵنەری سەرەکی دروست کردنی ئەم جۆرە توونێلانە بۆ ئەوە بێت هەڵسێت بەکاری چاککردن و پاککردنەوەی ئاوەڕۆکانی لە پیسی و پۆخڵی کەڵەکە بووی نێویدا[٢٩].

*** هونەری بیناکاری چینی یەکەمی کورپوخانی:**

((لەچینی یەکەمی کورپوخانی حەوت ژوور دۆزراوەتەوە کە دەست پێدەکات لە A-G))، کەلە وەرزی یەکەمی پشکنینندا تەنها سێ ژوور دۆزرایەوە کە بریتی بوو لە (a.b.c)، کە دروستکراوە لەسەر سنووری کۆشکی سەوز وپەرستگاکەی کە دەگەڕێتەوە بۆ چینی دووەمی کورپوخانی.

ڕێگای دروست کردنی ئەم چینە بەوە دەچێت کە پاشماوەی چینی دووەم هەر مابێت لەبەرزییەکی دیاریکراو بەهۆی زۆری پاشماوەی چینی دووەمی کورپوخانی نەتوانراوە کە لابرێت وهەستاون بەدروستکردنی لەسەر چینی دووەمەوە، چونکە وا بەدەردەکەوێت کە هەندێك خشت بەکار هاتووە کە هەمان پێوانەی خشتی چینی دووەم بوو بێت، بۆیە دانیشتوانی چینی یەکەم هەوڵی بەکارهێنانی خشتی چینی دووەمیان داوەو هەوڵی رووخاندنیان داوە، وا بەدیار دەکەوێت کە خانووەکانی چینی یەکەم جێگیرکراوە بە تەواوەتی لەسەر دیـواری خانووەکانی چینی دووەم، بەتایبەتی لەسەر پەرستگاکە، یان دابڕاو لە خانووی لەو کۆنتر یان دابڕان لە چینی دووەم چینێکی نیشتوو لەلەو لیتەیی چونکە ئەو چینە لەو لیتەیە کە هەیە پاکە، بەهۆی ئەوەی کە ماوەیەکی چاك دانیشتوانی چینی دووەم ناوچەکەیان بەجێهێشتووە، بەهۆی هەڵسانی لافاو باران لەو ناوچەیە وایکردووە کە چینێکی چاکی لەگەڵ خۆیدا هێناوە لە لم ولیتە بۆ ئەم ناوچەیەو ئەو شوێنەی پڕکردۆتەوە بەو لم ولیتەیە، چونکە ناوچەیەکی نزمە لەچاو (شێوی ئەوت) لەو ناوچەیەدا.

هەموو بیناکانی چینی یەکەم تەواو نییە تەنها ژووری (E) نەبێت، شێوەی نەخشەکێشانەکەی وەکو خانووەیەکی تایبەتییە کە بە ناوبانگە لە عێراقی کۆندا، پێك هاتووە لە حەوشەی ناوەندی و داپۆشراو بەخشت و دەورەدراو بە چەند خانووبەرەیەکەوە کە بەکار بهێنرێت بۆ کاری ناو ماڵی جۆر بەجۆر، دەتوانین خانووی (E) بکەین بە نموونەی هەموو خانووەکانی تری گردی کورپوخانی.

چینی یەکەمی (کورپوخانی) دادەنرێت بەناوچەیەکی نیشتەجێی دانیشتووان، چونکە چەند جارێك زەوییەکەی چاك کراوەو شوێن دەرگاو پەنجەرەکانی گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

**(خانووی A):**

پاشماوەی ئەم خانووە لەسەر لای خوارووی رۆژهەڵاتی کۆشکی سەوز دۆزراوەتەوە، کە هەندێك بەشی جێگیر بووە بەتەواوەتی لەسەر دیوارەکانی کۆشك و بەشەکانی تری دابڕاوە بەهۆی زنجیرەیەك لە چینی لم و لیتە، رووبەرەکەی (٢٣×١٦) مەترەو پێك هاتووە لە شەش ژوور (١-٤)، (٦-٧)، دەورە دراوە بە حەوشێکی گەورەو فراوان و داڕێژراو بەخشتی فەرشی، دەرگای دەرەوەی ئەم خانووە نەدۆزراوەتەوە، لەوانەیە لەلای خوارووی رۆژهەڵات بوو بێت.

**(خانووی B):-**

کەوتۆتە نێوان هەردوو خانووی (C) و (F)، وبنەڕەتەکەی یان جێگیرە لەسەر پەرستگاکە راستەوخۆ یان لەسەر چینێکی پتەوی ژێرەوەیە، رووبەرەکەی (٢٧ × ١٦)مەترە، وپێکهاتووە لە حەوت ژوور، دەورە دراوە بە حەوشەیەکی تا رادەیەك فراوان، رێژەکراوە بەخشتی فەرشی وەوا بەدەردەکەوێت کە ژووری (٣) چێشتخانە بووبێت چونکە بۆری وکەناڵی لێ دۆزراوەتەوە بۆ ئاوەڕۆکردنی ئاوی پیس، لەم ماڵەدا هەندێك دروستکراوی ترمان دۆزیەوە بۆ ئاوەڕۆی ئاوی باران و ئاوی بەکارهێنراوی ناو ماڵ، ئەم دروست کراوانە بریتییە لە حەوزی ئاوی زۆر بچووك دروستکردنی بەخشت لەزەوی حەوشەی (٤) وە ئەگات پێی بەکەناڵێکی (گڵکاری-فخاری) لەسەر شێوەی (U).

**(خانووی C):-**

کەوتۆتە نێوان هەردوو خانووی (A) و (B)، پاشماوەی بەشی ئەم خانووە بریتییە لە پێنج ژوور کە دەورە دراوە بە حەوشەو رووبەرەکەی بریتییە لە (٩×١٨×٨٠) مەتر، دەرگاکانی کە دۆزراوەتەوە کەوتۆتە نێوان هەردوو ژووری (١)، (٢) و ژوورەکانی (٣)، (٤)، (٦) و دووژووری (٤، ٥) و ژووری (٢) کونێکی تێدا هەیە لە دیـواری خوارووی رۆژهەڵاتی کە لەوانەیە بەزۆری ئەگەری ئەوەیە کە هەواکێش بێت کە بگاتە بەرزی بنمیچی ماڵەکە.

**(خانووی E):-**

کەوتۆتە لای سەرووی رۆژئاوای گردەکە، لەنێوان هەردوو خانووی (D) و (F)، بنەڕەتی ئەم خانووە جێگیر بووە لەسەر دیوارەکانی چینی دووەم، یان لەسەر چینی لم ولیتە وەکو ئەوەی بنەڕەتی خانووی (D)، نەخشەی دروست کردنەکەی چوار گۆشەییە تا رادەیەك، وپێوانەی (١٤,٩٠×١٢)مەترە، بریتییە لە هەشت ژوور (١-٨) و حەوشەی (٩)، دەروازەی ئەم خانووە دەکەوێتە نزیك سووچی رۆژئاوای خانووەکە، دەڕوانێتە سەر ژووری (٨)، بەهەمان جۆر ئەڕوانێتە سەر حەوشەی (٩)، هەندێك دروست کراوی لێ دۆزراوەتەوە بۆ ئاوەڕۆی باران وبەکار هێنانی ناوماڵ.

**(خانووی F):-**

ئەم خانووە کەوتۆتە لای سەرووی گردەکە لە نێوان هەردوو خانووی (B) و (F)، خانووی (F) دیوارێکی دەرەکی تایبەتی هەیە دابڕاوە لە دیـواری خانووی (B) لەکاتێکدا دیـواری

خوارووی ڕۆژئاوای هاو تەریبە لەگەڵ خانووی (E) زۆربەی بەشەکانی تووشی داخوراندن بووە، تەنها ڕووبەرێکی کەمی لێ دۆزراوەتەوە کە درێژی (١١) مەترو پانییەکەی (٩,٢٠) مەترە، دوو دەرگای هەیە لەلای سەرووی ڕۆژهەڵات دەڕوانن بەسەر حەوشەی (٣)، هیچ دەرگایەکی نەدۆزراوەتەوە لەنێوان دوو ژووری (١)و (٢)و لەنێوان ژووری (٢)و حەوشەی (٣).

**(خانووی G):-**

بەشێکی کەمی ئەم خانووە دۆزراوەتەوە (١١×١,٧٠) مەترە کە کەوتۆتە لای خوارووی ڕۆژئاوای گردەکە، هەرسێ ژووری (١)و (٢)و (٣) تایبەتمەندن بەوەی کە دیوارەکانی زۆر لاوازە کە قەبارەکەی لە نێوان (٢٦-٤٠) سمەو بەرزی (٤٠) سم[٤٠].

*** شێوەی هونەری بیناکاری پەرستگا لە (نوزی)و (کورخانی)دا:**

((پەرستگا لەوڵاتی میزۆپۆتامیا پەیوەندییەکی تەواوی هەیە بەکاروباری ژیانی پاش مردنی مرۆڤەوەو بنکەیەکی گرنگە بۆ دادوەری لەنێو خەڵکدا. لەسەرەتاکانی مێژوودا، لەو پەرستگایانەدا (کاهن-پنگر) وەکو دادوەر دەستیان دەڕۆیی و شوێنێکی گرنگیان هەبووە لەژیانی خەڵکدا. لەلایەنی ئابوورییەوە، داهاتێکی چاکیان بەدەست هێناوە بۆ پەرستگا، لەهەندێ لەپەرستگاکاندا ئاسەواری زۆر بەنرخ بەجێماوە، لەگەڵ پارچەی ئەدەبی و ئایینی تۆمارکراو لەسەر قوڕ.

پەرستگا چەند بابەتێکی پیرۆزی تایبەتی هەیە بەهۆی پەیوەندی بەخواوەندەکانەوە، چونکە شوێنی نیشتەجێی ئەوانە، بەشێوەیەکی بەردەوام یان لە چەند کاتێکی دیاری کراودا. شێوەی دروست کردنی پەرستگا دەگۆڕێت بەپێی جیاوازی سەردەمو میللەتانو بەپێی جیاوازییان لەڕووی شارستانییەوە، هەندێکیان بیناکاری سادەیان هەیەو لەشێوەی ماڵێکی بچووك یان کوخێك لەگوندێکداو قوربانی تێدا پێش کەش دەکرێت.

دانیشتوانی عێراقی کۆن، لە سەردەمەکانی پێش مێژوو، یەکێك لەبەردەکانی ماڵەکەیان دەکردە پەرستگایەك بۆ خۆیان، پێش ئەوەی پەرستگای گشتی دروست بکرێت. گرنگترین تایبەتمەندی پەرستگای عێراق دابەش بوونیەتی بەسەر دووبەشدا لە شێوازی بیناکارییەکەیدا یەکێکیان پێی دەوترێت پەرستگا و ئەوی تر پێی دەوترێت (زەقورە).

گرنگترین شتێك لەپەرستگای عێراقی کۆندا، ئەوەیە کەنەخشەیەکی تایبەتی هەیە، جیاواز لەخانووەکانی تر، گرنگترین شتێك لەو نەخشەیەدا بریتییە لە (بەردی پیرۆز) و (پەیکەر) کە لەبەرامبەریدا سەکۆیەك هەیە (سە کۆی سەربڕین)، کە شوێنی دانانی (پەیکەری خواوەندە) لە هەمان کاتیشدا شوێنی پێشکەش کردنی قوربانییە، هەروەها بوونی (میحراب) لەناوەڕاستی ژوورەکەو، لەدەرەوەی گۆڕەپانی پەیکەرەکە، بەردو سوورگەی گشتی تر هەیە و، وادەبێت پەیکەرەکە خۆی پەرستگایەکی سەربەخۆیە.

گرنگییەکی تری پەرستگا ئەوەیە کە دیوارەکانی بەجۆرێك ڕازاوەتەوە لەهەندێ چیندا چووە بەناوداو لەهەندێ چیندا هاتوەتە دەرەوە، هەروەها دیوارەکانی ڕازاوەتەوە بە حەزوزی قوڵ لە شێوەی پیتی (T)، بەڵام چوونە ژوورەوە لە شێوەی چەند چوونە ژوورەوەیەکی دووبارەیە، کەوادەکات دەرگاکە بگۆڕدرێت بە پێی شوێنی ئەو دوو دیوارەی کە لە تەنیشتیەوەیە، بەردی پەیکەرەکەش دەگۆڕدرێت لە پەرستگا بەپێی شوێنی چوونە ژوورەوەکە، ئەوەی لە کوردستاندا باوە ئەوەیە کە نوێژکەر کاتێك دەچێتە ژوورەوە لەو دوو دیوارە درێژەوە، ئەوەیە کە سەکۆی سەربڕین و میحرابەکە لەسووچێکی ژوورەکەیە، چونکە کاتێك دەچێتە ژوورەوە بۆ ژووری پەیکەر دەسوڕێتەوە بەلای ڕاست یان لای چەپ دا، بۆ ئەوەی بگاتە لای سەکۆی سەربڕین. ڕووی پەرستگا لە کوردستاندا بەرەو خوارووی ڕۆژهەڵاتە، وڕووی پەیکەرەکە بۆ سەرووی ڕۆژ ئاوایە.

لە هەندێك پەرستگادا چەند بەشێکی ناوەندی هەیە وەکو بوونی چەند ژوورێـك لـەدەوری گۆڕەپانەکە، لەهەندێك پەرستگای گەورە دروست کراوە بۆ چەند خوداوەندێك، کەلە هەندێك ژوورەکـان پەیکەری خواوەندی تر دانـراوە، بوونی ژووری تر بۆ کۆگا بۆ هەڵگرتنی کەلوپەلی پیرۆز یان بۆ بەکارهێنانی لەلایەن (کهنه)وە، کە شوێنێکی پەنایە بۆیان، یان ژووری تر هەیە بۆ نیشتەجێی (کهنه)، کەبەتەك پەرستگاکەوەیە. لەهەموو سەردەمەکاندا پەرستگا بەقوڕ دروست کراوە لەبەر پیرۆزی (قوڕ)[٤١].

لەهەندێك کاتدا لە کوردستاندا پەرستگا دەکەوێتە نێو ماڵەکانەوەو تەنها بەشێوەی بیناکارییەکەی دەناسرێتەوە.[٤٢]

دەربارەی پەرستگاکانی کوردستـان دەتـوانین دوو جۆر پەرستگا دەست نیشان بکەین:-

پەرستگاکانی پێك هـاتووە لـەژوورێـکی درێـژی سەرەکی پـەرستن کـەوەکـو خـەڵوەتـگا وایـەو چـوونـە ژوورەوە لەسووچێکی باری درێـژی ژوورەکـەوە دەبێت بۆ شوێنی بەرزی پەیکەری خوداوەندەکە یان لەلایەکی کورتی بەرامبەر بەشوێنی کۆتەڵی خواوەندەکە دەبێت، شوێنی پەیکەری خوداوەندەکە لەناوەڕاستی ژوورەکەدا دەبێت، کە شوێنێکی بەرزە لەزەوی خەڵوەتگاکەدا.

*** جۆرەکانی پەرستگا بەم شێوەیە:-**

- **یەکەم:-** پەرستگا لەسەر شێوەی چەقی شکاو (المحور المنكسر)، دەبێت چوونە ژوورەوە بۆ پەرستگاکە لەڕووی گۆشەیەکی وەستـاوەوە لە جوڵەکردن لە دەرگـاوە بەرەو پەیکەری خوداوەندەکە، کەبەرامبەری دێت.
- **دووەم:-** پەرستگای درێژەوە بوو (المعبد الطولي) چوونە ژوورەوە بەرامبەر پەیکەری خوداوەندە لەسەر چەقی درێژی خەڵوەتگاکەدا، جیاوازی لەهەردوو نەخشەی پەرستگاکاندا، لە شوێنی خەڵوەتگاکەوەیە، کە پەرستگای چەقی شکاو پێکهاتووە لەوەی کە هۆڵی خەڵوەتگاکە هاوتەریبە لەگەڵ لای درێـژی گۆڕەپانەکەی بەرامبەریو پێوەی نووساوەو




**هێڵکاری جۆرەکانی پەرستگا**

**دەردەکەوێتەوە بەهۆی دەروازەیەکەوە لەچەقی لایەکەوە، بەڵام پەرستگای درێژەوەبوو پێك هاتووە لە هۆڵێکی وەستاو، لەسەر چەقی درێژی لەسەر گۆڕەپانەکەی، لە چەقی شکاودا هۆڵەکەی نەبەستراوەتەوە بەهۆڵێکی تر لەگەڵ گۆڕەپانەکەیدا وەکو ئەوەی لە پەرستگای درێژەوەبوودا هەیە کە هۆڵێك لەبەینی دەروازەی چوونە ژوورەوەو گۆڕەپانەکەدا هەیە(٤٣).**

*** پەرستگا لە نوزی دا:**

**((پەرستگای (عەشتار-تیشۆب) لە نوزی بریتییە لە دوو پەرستگای پێکەوە نووساو، لەگەڵ سەربەخۆیی دەروازەی هەریەکەیان لەگەڵ ئەوی تردا.**

**پەرستگایەکیان پێك هاتووە لە هۆڵێکی گەورەی لاکێشەیی دیوار ئەستوور، دەروازەیەکی هەیەو، خاوەنی بورجێکە (عەشتار)، یان دوو دەروازەی هەیە (تیشۆب)، ئەم دەروازانە دەکەونە سەر لای درێژی بەرامبەر گۆڕەپانەکەی دەرەوەی، کە چەند ژوورێکی تاریکی تێدا دروست کراوە.**

**بەڵام ئەو سەکۆیانەی کە پەیکەری خوداوەندەکەی لەسەر دادەنرێت، دەکەوێتە لێواری لای کورتی خوارووی، کە دەکاتە سنگی هۆڵەکە، پشکێنەرەکان چەند سەکۆیەکیان دۆزیوەتەوە کە دروست کراوە لەلێواری دیوارەکان، لە (باسموسیان) لە دەشتی (دوکان) پەرستگای هاو شێوەی وەکو نوزی دۆزراوەتەوە، کەتایبەتمەندە بەبوونی ژمارەیەك پێگەی پێکەوە نووساو لەسەر چەند گۆڕەپانێکی یەك لەدوای یەکی دیواری، کە نموونەی چەند خانەیەکی نەخش و نیگاری، دووبارە کردنەوەی ئەم خانەی نەخشانە لەنێوان گۆڕەپانی دیوارەکان دابەش کراوە(٤٤).**

**ئەوەی بەناوبانگە لەپەرستگای (نوزی) ئەوەیە کە شێوەکەی لاکێشەییە، کەهاوشێوەیە لەگەڵ ئەو پەرستگایەی کە لە (کوڕوخانی)یە، بەڵام بنەڕەتی ئەم پەرستگایە گۆڕانی بەسەردا هاتووە لەسەردەمی پاشا (شوشتار) کە ئەمە بەدیار دەکەوێت لەبیناکاری پەرستگای عەشتار(٤٥).**

**((لەیەکێك لە زیارەتگاکاندا دیوارەکانی ناوەوەی ڕازاوەتەوە لەدەرەوە بەپارچەی داری لەسەر شێوەی داری درێژ کەچەسپ کراوە بەخانووەکەوە، لەهەندێك شوێنی تردا ڕووی دیوارەکان ڕازاوەتەوە بە (ناوکی دەرپەڕیو -سرات الناتئە) لەسەر شێوەی بزماری قوڕی شووشەیی، بەمانەوە هەندێك کەرەستەی چنراو نەخش کراوە بەمیرو، هەندێك کەرەستەی تر هەیە کە تێکەڵ کراوە بەکەرەستەی شووشەیی بەڕەنگێکی کراوە، وەکو ئەوەی کە باو بووە لە (میسر)، وەکو شێوەی شێری ئێشکگر (الاسود الحارسة)و، لەحاڵەتێکی تردا یەکێك لەدیوارەکان نەخش کراوە بەسەری بەرازی کێوی))(٤٦).**

**گرنگترین پارچەی شوێنەواری کەدۆزراوەتەوە لەم شوێنەدا بریتییە لەدەفری گلکاری لەسەر شێوەی شێرو شێوەی بەراز، کەڕازاوەتەوە بەنەخش و نیگاری خەرزی.**

**هەروەها ئاسەوارێکی قوڕی دۆزراوەتەوە لە شێوەی دەفری شێوە لاکێشەییە، بەربەستێك لە سەرەوەیدا کردوویەتە دووبەشی وەکو یەکەوە، دۆزینەوەی نموونەیەکی قوڕی بچوك لە یەکێك لە خانووەکان وەکو شێوەی چۆلەکەیەك، دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی هەزارەی دووەمی پێش زایین.**

**دۆزینەوەی بەرازێکی دروست کراو لە قوڕی سوورەوەکراو**



**هێلکاری پەرستگای (نووزی)**

تێکەڵ بە شووشە، بێجگە لەدۆزینەوەی پارچەی ئێسکی شێوە دەنبوسی جۆر بەجۆرو دۆزینەوەی پارچەی کانزایی وەکو پارچەی مسی (صفائح نحاسیة)و خەنجەرو داس و مەقاش و (الاسنة-تیژە ددان)و (النبال- تیر)، هەروەها دۆزینەوەی گڵاسی شووشەیی و خەپڵە خۆر (قرص شمس) دروست کراو لەمەڕمەڕ کە ڕووەکەی ڕازاوەتەوە بە دە سێگۆشەیی(٤٧).

*** سەکۆی پەرستگای کوڕوخانی:**

((ئەم سەکۆیە نووساوە بە درێژیی دیواری سەرووی ڕۆژهەڵاتی کۆشکەکەوە، سەکۆیەکی گەورەیە، بە پێوانەی (٢٢×٣٧) مەتر بەخشت دروست کراوەو، هەمان پێوانەی ئەو خشتەی هەیە کە کۆشکی سەوزی پێ دروست کراوە بەپێوانەی (٣٥×٣٥×١٠)سم.

ئەم سەکۆیە دەست پێ دەکات لەناوەڕاستی لای سەرووی ڕۆژهەڵاتی ژووری (١١)، بەردەوام دەبێت بەرەو سەرووی ڕۆژئاوا، لەسەر درێژی لای کۆشکەکە، لەم لایەوە سەکۆکە نەخشەی کێشراوە لەسەر شێوەی پایەپایە (Zigzag).

ڕووی سەکۆکە ڕازاوەتەوە بە چوونە دەرەوەو چوونە ژوورەوەی قووڵ لەبەرزترین خاڵی سەکۆکەوە لە سووچی سەرووی (١,٤٥) مەترەوە، تا نزمترین خاڵی لە سووچی خوارەوەی (٦٤)مەترە.

وادەردەکەوێت کە سەکۆکە دووجار تووشی کاولکاری بووبێت لەدەست درێژی دوژمن بۆ سەر کۆشکەکەو سووتاندنی دێیەکە، جاری دووەم لەلایەن دانیشتوانی چینی یەکەمەوە ڕووی داوە، ئەویش هەوڵی تەخت کردنیان داوەو هەندێك بەشیان بڕیوەو ڕووخاندووە بۆ دروست کردنی خانووەکانیان.

تا ئێستا هیچ خانوویەك نەدۆزراوەتەوە لەسەر سەکۆکە هەرچەندە لەو باوەڕەداین کە خانوویەکی گشتی (پەرستگا) یەك دروست کراوە لەسەر سەکۆکە.

نەخشەی گشتی سەکۆکە ئارەزووی هەیە بۆ درێژ بوونەوە کەئەمە وا دەردەخات کەپەرستگاکەش کەلەسەری دروست کراوە شێوەی لاکێشەیی هەبووە، ئەوەی کە پێویستە باس بکرێت ئەوەیە کە پەرستگاکانی (نوزی) یش کەهاوسەردەمێتی بەهەمان شێوە لاکێشەیی بووە. بەڵام ناتوانین بەشێوەیەکی تەواوی بیسەلمێنین کە گوایە ڕووی پەرستگاکەیش (Zigzag)ی هەبووە هەروەکو ئەوەی هەبووە لەڕووی سەکۆکەدا، ئەوەی بەسوودە لێرەدا کە بیلێین ئەوەیە کە پەرستگای (سن)و (شەمس)ی یەکەم (خواوەندی مانگ و خواوەندی خۆر) کەلەئاشوور دروست کراون لەلایەن پاشای ئاشووری (ئاشوور نیراری یەکەم) (١٥٣٣-١٥٠٨)ی پێش زایین، ڕووەکانیان پایەپایە بوون لەشێوەی (Zigzag)(٤٨).

*** پارچە دۆزراوەکانی کوڕوخانی:**

ئەو کەرەستە شوێنەوارییەکانی کە دۆزراونەتەوە لەکاتی پشکنینەکانی وەرزی دووەم کەمترە لەپاشماوەکانی وەرزی

یەکەم، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە پشکێنەرەکانی وەرزی دووەم زیاتر مەبەستیان کارکردن بووە بۆ دۆزینەوەی دیوارەکانی کۆشکی سەوزو پەرستگاکە، بەڵام ئەو پارچە کەمانەی کە دۆزراوەتـەوە هیچی کەمتر نەبووە لـەوەرزی یەکەم.

ئـەو کـەرەستـانـەی کـە دۆزراوەتـــەوە بریتییە لـە (٦٠٠) ڕەقیمی قوڕیو (٤٢) لاشەی مرۆڤو (١٦) مۆری لوولەکیو ژمارەیەکی زۆر لە چاپی مۆرو گلکاریو دەفری شووشە تێکەڵاوو شووشەییو میروویی جۆربەجۆرو ژمارەیەکی زۆری کانزاییو ئێسکیو بەردیو قوڕی.

لەژێر زەوی خانووی (D) سەر بەچینی یەکەم گۆڕێکی لاکێشەیی دۆزراوەتەوە، بریتییە لە پەیکەری کەسێکی مێرد منداڵ لەگەڵ دوو ئەنگوسیلەی مسیو (١٧) خەرزی دروست کراو لە عەقیقی سوور، بەڵام لەکۆشکی سەوز (٨) پەیکەری مرۆڤ دۆزراوەتەوە، کەتەواو نین، ژمارەی گشتی ئەوەی لەو بینایەدا دۆزراوەتەوە (٤٢) پەیکەرە. ئەو (٨) پەیکەرەی کە دۆزراوەتـەوە هەمووی داڕزاوەو پارچەکانی بڵاو بۆتەوە، حەوت پەیکەری لەناو ئاوەڕۆیەك دۆزراوەتەوە، دۆزینەوەی ئەم پەیکەرانە لەناو ئاوەڕۆدا، لەوانەیە لەترسی هێرشی سەر کۆشکەکەدا خۆیان شاردبێتەوە، بەڵام هەر دۆزراونەتەوەو شوێنەکەیان دیاری کراوە، دۆزینەوەی خەنجەرێکی گەورەی برۆنزی لەسەر یەکێك لە پەیکەرەکان، لە ژووری ژمارە (٢١) دایە، بەڵام نازانین کە گوایە ئەمە چەکی ئەو کەسە بووە، یان بەو چەکە کوژراوە[٤٩].

بەڵام لە هونەری گلکاری دا لە چینی یەکەمو چینی دووەم دا نمونەیەکی تری نەخشو نیگاری (هوری–میتانی)مان بۆ بەجێ ماوە لە هونەری گلکاری تاسو پاڵاوتەو دەفری کون.. کونو گلاسو گۆزەی مل پانو مل تەسكو فراوان، یان جەڕەی شووشەییو هەندێك کەرەستەی کانزایی.

جامە (تاسە)کانی کوڕوخانی پێك هاتووە لەقوڕو کای کوتراو، کەڕەنگی ئەرخەوانی کـراوەو گوێزیو پرتەقاڵی مەیلەو زەردو زەردی مەیلەو سەوز، دەتوانین (جامە)کان بکەینە دووبەش، هەندێکی ملێکی هەیەو هەندێکی تریان بێ ملن، وەملدارەکە شێوەلێوارێکی هەیەو لێوارەکانی هەندێکیان خواربۆتەوە یان خڕە یان نوشتاوەتەوە بەرەو دەرەوە[٥٠].

یەکێك لە جامەکان کەلەچینی دووەم دۆزراوەتەوە نەخشێك لە لەشی دەرەوەی جامەکە کراوە لە شێوەی نەخشێکی پێنچ پێنچو لەخوارەوەی ڕیزێکی تر کون.. کون بەشێوەی ئاسۆیی.

دەربارەی پاڵاوتەو دەفری کون کون سێ شێوە لەم جۆرە گلکارییانە دۆزراوەتەوە، دوانیان هی چینی یەکەمو ئەوی دی هی چینی دووەمە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی تا ئێستا نەزانراوە کە بۆچی بەکار هاتووە، لەوانەیە بۆ پاڵاوتنی شلەمەنی بەکار هاتبێت.

(گـلاس–قـدح)ەکـانـی، کـە نـزیـکـەی (٥) نمـونـەیـان لێ دۆزراوەتـــەوە، دوانیـان هی چینی یەکەمو سیانەکەی تر لەچینی دووەمـە کەبەشێوەیەکی چاك دروسـت کـراونو تونکلێکی لووسی هەیە، ڕەنگەکانیان لەنێوان هەنگوینیو پرتەقاڵی مەیلەو زەردو لێوارەکانیان تیژو دەرنەچوونە بەرەو دەرەوە، بەڵام گلاسەکانی چینی دووەم لێکچونیان هەیە لەگەڵ گلاسەکانی (نوزی)دا[٥١].

جـەڕەی شێوە دەم کـراوەو قـووڵو بێ مل چوار دانـەی لێ دۆزراوەتـــەوە، دووانـیـان لە چینی یـەکـەمو، دووانـیـان لە کۆشکی سەوز، کە یەکێکی بچوك ترە لەوانی ترو، ڕووی دەرەوەی قۆڵێکی (دەسکێکی) تەنکی لووسی پرتەقاڵی شێوە زەردی هەیە، نەخش کراوە بە (حەزووز) لە دەرەوەی لەشەکەی، هـەروەهـا جـەڕەیـەکـی ژووری (١٤) لەشەکەی نەخش کراوە بە نەخشی شریتیو حەزووزی[٥٢].

بەڵام جـەڕەی دەم تەسك کە ئەمەیش دەتوانین لە شێوەی ملەکەیەوە بیکەینە دوو بەشەوە، بەشێکیان ملی هەیەو ملەکەی درێژەو، هەندێکیان ملەکەی کورتەو لەنێوانیاندا لە شێوەو لەقەبارەیشدا جیاوازی هەیە، دەتوانین ڕەنگەکانی ئەم جەڕانە بەپرتەقاڵی مەیلەو زەردو پرتەقاڵی مەیلەو سەوزو هەنگوینیو کایی بناسینەوەو، نەخش کراوە بەشریتیو حەزوزی قوڕی لەسەر لەشی جەڕەکەدا.

سێ جـەڕەی (خەزەفی) گـەورەش دۆزراوەتـەوە، لە ژووری ژمارە (١٥)، لە کۆشکی سەوز کەوەکو ئەوەی نووزی وایە، ئەم جەڕانە لێواری چوارگۆشەییان هەیە، دوانیان بازنەییو، یەکێکی تر هێلکەیی هەیە، لەسەر لەشی جەڕەکە، نەخشێکی حەزوزو شریتی لەقوڕ هەیە.[٥٣].

هـەروەهـا دۆزیـنـەوەی جـەڕەی شووشـەیـی یـان تێکەڵاو بەشووشە، کەیەکێکیان ڕووی بەبۆیاغی شووشەیی ڕەنگ کـراوە کەڕەنگی سـەوزە بۆشین، بـەڵام ڕەنگەکەی نەماوە، وەگۆڕاوە بۆ سپی لەهەندێك شوێندا.

دۆزینەوەی سوراحی شووشە بەشکاویو پارچەیی لەژووری ژمارە (٩) بەشێوەیەکی هێلکەیی، فراوانترین شوێنی لەلای دەسکەکەیەوە ملێکی لوولەکی درێـژی هەیەو، لێوارێکی تەختی هەیە لـەسـەرەوە، چەماوەتەوە لـەلاوە، بنکەکەی تیژەو ڕەنگی زۆری بۆ دروست کراوە بەشێوەیەکی پێکەوە نووسان، وەکو ڕەنگی سپیو زەردو ڕەشو شینو سەوز، وەلەتەختی شین، هەروەها لەکاتی خۆیدا نەخش کراوە کە دەتوانرێت دوو شێوەی (فستونی) جیابکرێتەوە، کەهەمان شێوەی (نوزی) دیار دەدات.

شانزە مۆری لوولەکی دۆزراوەتـەوە کە هەندێکیان لەبەرد دروسـت کـراونو هەندێکی تریان لەمادەی (frit– فریت) ی سپی کە بەڕەنگی شووشەیی سەوزو زەرد ڕەنگ کراون، دوو (شەش پاڵو–خشتەك)ی قوڕیش دۆزراوەتەوە، هەروەها لەگەڵ چەند پارچەیەکی قوڕی کەنەخشی مۆری لوولەکی پێوەیە.

دۆزینەوەی ژمارەیەك مووروویش، بەشێوەو قەبارەی جیا.. جیا، کە هەندێکیان لەبەردو بەردی پیرۆزو (فریتی) سپیو شینو زەرد دروسـت کـراون، کـەدوو (مـوورو)ی گـەورەو بەرمیلی شێوەن کە داپۆشراوە بە مادەی شووشەیی ڕەنگ ڕەش، هەندێکیان شێوەی لوولەکیو تۆپیو نیوەتیرەییو هێلکەییو تەختو شێوەی تر[٥٤].

چەند پارچەیەکی (برۆنزی)و (زیوی)و (زێڕ)و (مسی) دۆزراوەتەوە کە هەموویان پارچەی جۆر بەجۆرو جیاوازن لەقەبارەو شێوەدا: کە سێ (گوارە)ی (ئاڵتونی) بچووکی لێ دۆزراوەتەوە لەسەر شێوەی (هلالی). لە ملوانکەی زیویدا سێ گۆشەو شێوەی خۆر دۆزراوەتەوە، برۆنزیش پارچەی گەورەی شەڕو پارچەی (درع – زرێ)یی دۆزراوەتەوە، لەمادەی مسیش سەری تیرو بزمارو ڕمو کەرەستەی جۆراوجۆری تر دۆزراوەتەوە[٥٥].

لەو دۆزراوانەی کە سەرنج ڕادکێشێت دۆزینەوەی ژمارەیەکی زۆری تەندوری قوڕییە لەچینی یەکەم، کە نزیکەی (١٠) تەندور دەبن، هەندێکی شێوەی لاکێشەیی و هێلکەیی و چوارگۆشەیی و بازنەیین. بەزۆری لەژوورەکانی چوارو حەوت و شەش و یەك و سێ دایە.

قەبارەکانیشیان بەپێوانەو شێوەی جیا جیایە لە درێژی و قوڵی و پانیدا، ئەوانەی کەدۆزراونەتەوە سەرەوەیان نەماوەو ئەوی ماوە زۆری ژێرەوەی تەندورەکانە[٥٦].

بەراوردێکی باری لێکچوونی هونەری بیناکاری و نەخش و نیگاری ناوچەی نوزی و کوڕوخانی:

١. چینی دووەمی (کوروخانی)و (نوزی) هەردووکیان دەگەڕێتەوە سەردەمی یەکگرتنی (هوری–میتانی) لە سەردەمی ئاشووری ناوەڕاستداو، شوێنێکی گرنگ و بەناوبانگی کەلتوری ڕۆشنبیری و ئایینی و بیناکاری بوونە لەسەرتاپای کوردستانداو کارتێکردن و پەیوەندی سیاسییان هەبووە لە ناوچەکانی دەوروبەرداو کارتێکردنی ئەم پەیوەندییانە، تا ناوچەکانی (میسر)و (سوریا)ی گرتبۆوە.

٢. هەریەکە لە (کوڕوخانی)و (نوزی) کۆتاییان هاتووە بەهەمان سووتاندن و کاولکردن، لەوانەیە لەهەمان کاتیشدا، هەر بەهۆی هەمان دوژمنەوە بوو بێت.

دەست نووسە نوسراوەکانی (کوڕوخانی) پێ دادەگرێت لەسەر ئەم ڕاستییە و، ئەوە ڕوون دەکاتەوە دەربارەی ئەو نەوانەی کە ژیاون لە (کۆشکی سەوز) داو ماوەی ئەو کۆشکە.

(د.عەبدوئیلا ئەلچەلەبی) لە نامەیەکدا کە دەربارەی کوڕوخانییە گەیشتۆتە ئەوەی کە پێنج نەوەی (جیل) ئەو کۆشکەو ماوەی (١٢٠–١٥٠) ساڵی لێك نزیك بوونەوەی بۆ ئەو پێنج نەوەیە داناوە، ئەوەی گرنگە لە (نوزی)یشدا پێنج نەوە دیاری کراوە.

ئەو ڕەقیمە قوڕییانەی کە لە نوزی دۆزراونەتەوە مێژووی دیاری کردووە بەنیوەی دووەمی سەدەی پانزەهەمی پێش زایین، پشت بەستنی بەنامەی پاشای میتانی (Saussatter)، کەفەرمانڕەوایی کردووە لەنێوان ساڵانی (١٤٥٠–١٤١٥) پێش زایین. لەبەرئەوە زۆر واقیعانەیە کەهەمان ڕەقیمی قوڕی چینی دووەمی کوڕوخانی و کۆشکەکەی بەهەمان مێژوو دەست نیشان بکرێت. چونکە ئەوەی پا دادەگرێت لەسەر ئەم ڕاستییە هەموو ئەو پارچە دۆزراوانەو بیناکارییانەی کە دۆزراوەتەوە لە (کۆشکی سەوز)دا، ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە هێرشی دەرەکی و ڕووخاندنی (نوزی)و (کوڕوخانی) لە وانەیە لەلایەن ئاشوورییەکانەوە کرابێت بۆ سەرکەوتن بەسەر یەکێتی (هوری–میتانی) لەو ناوچانەدا.

بەڵام زۆر بەزەحمەت دەتوانرێت سەرەتاو کۆتایی چینی دووەمی کوڕوخانی بەشێوەیەکی ڕاست دیاری بکرێت.

بەهەر شێوەیەك بێت، لەوانەیە ڕووخاندنی کۆشکی (کوڕوخانی) لە سەردەمی فەرمانڕەوایی پاشای ئاشووری (ئاشوور ئۆبلاتی) یەکەمەوە بووبێت (١٣٦٥–١٣٣٠)ی پێش زایینی دیاری کردنی ئەم مێژووەش، تەنها بریتییە لە (گریمان–فرضية)و پشت دەبەسترێت بەشێوەیەکی سەرەکی لەسەر ئەو کارو هێرش و ئەو شەڕانەی کەئەو پاشا ئاشوورییە پێی هەڵساوە لەناوچەکانی هۆرییەکان.

دوای ڕووخاندنی (کۆشکی سەوز)، دانیشتوانەکەی کۆچیان کردووە تا ماوەیەکی دیاری کراو، بەڵگەشمان ئەو نیشتووە پاکەیە لە لم و لیتە، کە دۆزراوەتەوە لە نێوان هەردوو چینی یەکەم و دووەمدا، کەس نیشتەجێ نەبووە لە کۆشکەکەو دروست نەکراوەتەوە، پشت بەستن بە دۆزینەوەی ئەو گڵکارییەی کە دۆزراوەتەوە لە چینی یەکەم، مێژووی ئەم چینەمان بەسەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زایین بۆ دیاری دەکات، ئەوەیش بەڵگەیە کە دووبارە نیشتەجێ بوونەتەوە لێی لەدوای سێ سەدەو نیو پاش ڕووخاندنی کۆشکی سەوز. دانیشتوانی ئەم چینە شارەزاییەکی چاکیان هەبووە لە پیشەی گڵکاریدا. ئەوەی لە (نوزی)یشدا ڕوویدا ڕێکەوت نییە کە دوای ڕووخاندنی چینی دووەمی (نوزی)، چینی یەکەم دوای ماوەیەکی تر نیشتەجێ بوونەتەوە کە دیاری کراوە بەسەردەمی ئاشوورییەکان[٥٧].

٣. لێکچوون لەهونەری بیناکاری کۆشکی (نوزی)و کۆشکی سەوز لە (کوڕوخانی)، بەڵگەیە لەسەربوونی دەسەڵاتێکی ناوچەیی لەهەردوو شوێنەکەدا، کەفەرمانڕەوای ناوچەکە بوونەو دەستیان ڕۆیشتووە بۆ هێنانی کارمەندو هونەرکاری زیرەك بۆ دروست کردنی نەخشەکانی هەردوو کۆشکەکەو بایەخ دان بەهونەر بەشێوەیەکی فراوان.

٤. بە کارهێنانی ڕەنگی کراوە لەهەردوو ناوچەکەدا، وەکو بەکارهێنانی ڕەنگی سەوزو گوڵی ئەرخەوانی و پەمەیی و زەردو پرتەقاڵی لەهونەری بیناکاریدا.

٥. بەکارهێنانی نەبەستنەوەی دیواری ناوەوە بەدیواری دەرەوە، بریتییە لەهونەرێکی (هوری–میتانی) کەئەمە نمونەی هەیە لەخانووەکانی (نوزی)و (کوڕوخانی) دا هەروەکو ئەوەی لەکۆشکی سەوزدا کەبەشی خێزان دیوارەکانی نەبەستراوەتەوە لەگەڵ دیوارەکانی دەرەوەی تەنانەت جۆری قوڕەکەش[٥٨].

٦. بەکارهێنانی ئاوەڕۆی ڕێکو پێك لەهەردوو کۆشکەکەداو بەکارهێنانی (قیر) لەڕێژ کردنی ئاوەڕۆکاندا.

٧. لەجۆری خشت و بەکارهێنانی قوڕو خشتی سوورەوەکراودا لێکچوون هەیە، تەنانەت لە قەبارەیشدا لێکچوون هەیە.. هەروەها بەکارهێنانی خشتی شووشەیی و ڕەنگاوڕەنگیش بەکار هاتووە.

*** ئایا کاشییەکان هونەری بیناکاریو نەخشو نیگاریان هەبووە لەناوچەی کەرکوکدا؟:**

(شوێنی بنەڕەتی کاشییەکان لەسەدەی حەڤدەهەمی پێش زایینی دەگەڕێتەوە بەشی ڕۆژئاوای چیای زاگرۆسو نیشتەجێ بوونە لەناوچەیەك کەپێی دەوترێت (تۆپلیاش)) ، لە کاتی داگیرکردنی وڵاتی بابل لەلایەن کاشییەکانەوە پێیان وتووە (کاردونیاش) [٥٩].

لەسەرەتادا بنەڕەتیان دەگەڕێتەوە سەر ئاقاری (لوڕستان) لە کوردستانی ڕۆژهەڵات، بەڵام دوای ماوەیەك هاتوونەتە ناوچەکانی میزۆپۆتامیاو شارستانییەتێکی بەرفراوانیان دروست کردووە لە نێوان سەدەی هەژدەهەمو حەڤدەهەمی پێش زاییندا، لەسەرەتادا بەناوبانگ بوونە بە کارکردن لە بواری کشتوکاڵدا لە دواییدا لە بواری کارگێڕیو بازرگانیدا دەوری گەورەیان بینیوە.

بەڵام ڕەچەڵەكو بنەڕەتی کاشییەکان پەرەی سەندووە لەماوەی سەدەی پانزەهەمی پێش زایین لەکاتی پاشاکانی ئەم دواییەی سولالەتی حەمورابی، ناویان هاتووە لە گەلێك ڕێکەوتن نامەی کڕینو فرۆشتنی تۆمارکراو لەسەر قوڕ [٦٠].

کاشییەکان بریتین لەهۆزەکانی هیندو ئەوروپاییەکان، کە نیشتەجێ بوونە لەچیا تووشەکانی لای سەرووی ڕۆژهەڵاتی عێراق کەبەناوبانگە بەووڵاتی (کشو) کە دەگەڕێتەوە بۆ ناوی خواوەندەکەیان (کشو) [٦١].

بۆیە مامۆستا (تاها باقر) دەڵێت:-

((کاشییەکان ئاری نەژاد بوونو لەناوچەکانی کوردستانەوە ڕوویان کردۆتە باشووری عێراق، ئەو دەوڵەتەی کە کاشیەکان لەهەزارەی دووەمی پێش زاینیدا لەعێراق دایان مەزراندووە نزیکەی (٤٠٠) ساڵ درێژەی کێشاوە)) [٦٢].

ئەگەر سەیری سەردەمی کاشییەکان بکەین دەبینین لە کاتی گواستنەوەی لەسەرووی کوردستانەوە بەرەو خوارووی عێراق، هەستان بەگواستنەوەی ئەو شارستانییەتیانەی کە هەیانبوو بەرەو ئەو ناوچانە.

((ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت کاشییەکان بایەخێکی زۆریان داوە بەئاوەدان کردنەوەی خانوی کۆن کە تووشی ڕووخاندن بووبوون لەوەختی خۆیدا)) [٦٣].

پاشای کاشییەکان وەکو (کریندداش)و (بورنابوریاش) و (کوریکلزوی یەکەم)و (کوریکلزوی دووەم) دەورێکی باڵایان هەبوو لە نەخشەسازی بیناکاری تایبەتیداو گەلێك پەرستگاو کۆشکی گەورە گەورەیان لە زۆربەی شاری سۆمەرییەکان بنیات ناوە.

دەبینین دەستێکی باڵایشیان هەبووە لەدروست کردنی پەیکەردا، هەروەها دەوریان بینیوە لەنەخشو نیگاری زۆر جوانی کۆشكو خانوو پەرستگاکاندا، هەروەها دەورێکی باڵایان هەبووە لە داتاشینی پەیکەری بەرجەستە، کەپێك هاتووە لە سەرێکی (فخاری)، کە قەبارەکەی نیوەی قەبارەی سەری سروشتییەو ڕەنگی ڕەشو سوریان زیادکردۆتەوە سەر ڕەنگەکان [٦٤].

کاشییەکان یەکێکن لەوانەی کەئەسپیان هێناوەتە وڵاتەوەو بەکاریان هێناوە بۆ شەڕکردن و، ئەسپ ئاژەڵێکی تایبەتی بووە بەکاشییەکان خۆیانو ڕێگایەکی تازەیان دۆزییەوە بۆ تۆمارکردنی مێژوو ئەمیش تۆمارکردنی ڕووداوەکان بەپێی ساڵی پاشاکانیان وەبەردی (کدرۆ) یان بەردی سنووری بریتییە لەدروست کردنی کاشییەکان خۆیان، چونکە لەوەو پێش نەبووە لەوڵاتی نێو دوو ڕووبار.

هەروەها کاشییەکان هەستاون بەنووسینەوەی دەقی ئەدەبیو ئایینییەکانی بابلیو سۆمەرییەکان.

هەندێك لەپاشای کاشییەکان وەکو (کریندداش)و (بۆرنابۆریاش)و (کۆری کالزۆی یەکەم)و (کۆری کالزۆی دووەم)، هەستان بەپێکەوەنانی ئەندازیارییەکی بیناکاری تایبەتی، ئەویش بەدروست کردنی هەندێك پەرستگاو کۆشك لەهەموو شارە سۆمەرییەکاندا [٦٥].

زانایانی ئاسەوار باوەڕیان وایە کە گوایە کاشییەکان هەستاون بەهێنانە ناوەوەی ئەندازیارییەکی تازەی بیناکاری ئەویش بەکارهێنانی تاقو کەوانەی لەسەر شێوەی نالی ئەسپ لەچوونە ژوورەوەی کۆشکەکانو پەرستگاوماڵەکاندا لەگەڵ دەرگای شوورەی شارەکان، بەتایبەتی جووتە کەوانە. نموونەیەکی تریان لەئەندازەیی بیناکاری هێنا ئەویش بەزیاد کردن لەسەر ڕووی دەرەوەی هونەری بیناکارییەکە، چونکە نەخشەی بیناکارییەکە مایەوە وەکو ئەوەی کەباو بووە لەلای سۆمەریو ئەکەدیو بابلییەکان [٦٦].

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت ئەوەیە کە:

١. کاشییەکان یەکێکن لەنەتەوەکانی زاگرۆس، بۆیە تێکەڵاوییەکی هەمەلایەنە هەیە لەناو ئەم نەتەوانەدا کەتایبەت مەندییەکی خۆی هەیە، وای لێ هاتوە کە ببێتە هۆی پەیدابوونی تێکەڵاوییەکی هونەری بیناکاریو نەخشو نیگار، بۆیە هیچ سەیر نییە کە هونەری بیناکاری کاشییەکان چڕوپڕییەکی ئەونەتەوانە بێت. چونکە جیاوازییەکی کەم هەیە لەنێوان هونەری بیناکاری کاشیو (هوری-میتانی)و (سۆمەری)و (گۆتی)و (لۆلۆیی)ی.

هەر لەبەر ئەمەیە کەئەم تایبەت مەندی هونەری بیناکارییەی نێوانیان هەریەك شتە، چونکە مۆرکی ئەم خاسیەتەی کاشییەکان لەخوارووی عێراقدا بەدەرکەوتووە نەك لەناوچەکانی کەرکوكو هەولێرو سلێمانی، کەتا ڕادەیەك بزر بوونی هونەری بیناکاری کاشییەکان دەبینرێت لەناوچەی کەرکوك لەچاو هونەری بیناکاری (هوری-میتانی).

٢. هەروەها کەمی ماوەی دەسەڵاتو فەرمانڕەوایی کاشییەکان لەناوچەی کەرکوك دا، چونکە ئەو باڵادەستییەیان نەبووە کە بتوانێت، دەسەڵاتی هونەری بیناکاریو نەخشو نیگاری بسەپێنێت بەسەر ناوچەی کەرکوك و، زیاتر ئەم کارتێکردنە لەخوارووی عێراقدا ڕووی داوە.

٣. کاشییەکان بایەخیان بەڕووی دەرەوەی خانووە کۆنەکانیان داوە، وەکو هورییەکان نەبوونە کە بایەخ بەتایبەت مەندی دروست کردنی هونەرێکی بیناکاری سەرتاپایی بدەن بۆیە تاڕادەیەك تێکەڵاوی ڕووی گشتی هونەری بیناکارییان بەدەردەکەوێتو خاسیەتە تایبەتییەکانی زۆر بەکەمی بەدیار دەکەوێت.

٤. لە کاتی خۆیدا ئەوەمان ڕوون کردەوە کەتارادەیەك لێکچوون هەیە لەنێوان کۆشکی سەوزی کوڕوخانی و کۆشکی سپی کاشی، بەڵام ئەو کارتێکردنە گشتی نییە کەبەڕوونی بەدەردەکەوێت، تەنها لەڕووی بورج و شوێنی بەرگری و شێوەی گشتی هەردوو کۆشکەکەیە.

٥. هەروەها لێکچوون هەیە لەنێوان بابەتەکانی کۆمەڵەکانی کاشی و هۆری-میتانییەکان لەڕووی بابەتی سەری گا و شێر و پڵنگ و ئاژەڵی تر، بەڵام جیاوازی هەیە لە شێوە و قەبارەی دروست کردنەکەدا بەڵام لەڕووی بابەتەوە هەموویان لەژێرکارتێکردنی نەتەوەکانی زاگرۆسن.

چونکە کاشییەکان زیاتر لەشێوەی کۆتەڵدا دروستیان کردووە بەڵام (هوری-میتانی) یەکان لەشێوەی وێنەی سەر دیواردا ئەم بابەتەیان بەرجەستە کردووە.

٦. خۆ ئەگەر سەیرێکی ئەو سێ جۆرە نەخشەی سەر دیواری دەرەوەی پەرستگای (کلسی) لە (وەرکا)ی باشووری عێراق بکەین، بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە هەرسێکیان کت و مت وەکو ئەوانەی سەرکڵاوی کوردی ناوچەی سلێمانین و لەسەداسەدیش لێك دەچن. ئەو سێ جۆرنەخشە، یەکەمیان دوو شێوە لەبزینەیی (معين) یەك لەناویەکدایەو، دووەمیان زنجیرە چەشنێکی سێ گۆشە (مثلث) ییە و، هەرچی سێیەمیشیانە بریتییە لەچەند ڕستێك خەتی پێچاوپێچی یەك لەسەر یەك(٦٧).

ئەگەر بەراوردێکی ئەم جۆرە نەخشانە لەگەڵ نەخشەکانی کۆشکی نوزی بکەین دەبینین ئەم جۆرە بابەتانە بەکار هاتووە، بەتایبەتی لە ڕازاندنەوەی لایەکانی نەخشەکان لەسێ گۆشەو چوار گۆشەو لەبزینەیی.

٧. کاشییەکان بایەخی زۆریان نەداوە بە کۆتەڵ و زیاتر ڕەمز و هێمایان بەکارهێناوە لە مۆرە لوولەکییەکانیان بە شێوەیەکی تایبەتی.

٨. بەکارهێنانی بەردی (کودۆرۆ) لە تایبەتمەندی کاشییەکان بووەو لەوەو پێش بەکار نەهاتووە.

٩. پڕکردنەوەی بۆشایی نووسینەکان بە نەخش و نیگاری ئەندازەیی و شێوەی ئاژەڵی(٦٨).

*** بنیاتنانی قەڵای کەرکوك (ئال - ئیلانی - ئەراپخا):**

تا ئێستا سەرچاوەیەکی دیاری کراو نییە، کەبەڕوونی کاتی دروست بوونی قەڵا دیاری بکات و هۆی سەرهەڵدانی قەڵا و بنیات نانەکەی دەست نیشان بکات. ئەوەی کە باسی لێوە دەکرێت تەنها بریتییە لە بیرو بۆچوونی جۆر بەجۆر کە هەرلایەك هەوڵدەدات بۆلای خۆی پەلە کێشی بکات و بیگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمە زمانەوانییەکانی کەنووسەرەکەی تێدا گەشەی کردووە، یان ڕێبازێکی ئایینی بەکار دەهێنن بۆ چوونە ناو ناخی مێژووی دروست بوونەکەیەوە.

لێرە بەدواوە هەوڵ دەدەم کەبکەومە شی کردنەوەی هەموو نووسینی ئەو نووسەرانەی کەباسی بنیات نانی قەڵایان کردووەو بۆچوونەکانیان هەڵبسەنگێنم و هەوڵ بدەم بۆ ئەوەی بگەینە مێژوویەکی نزیکی دروست بوونەکەی و ئەو هۆیانە کەدەوریان بینیوە لەبنیات نانیدا.

**یەکەم:**

((هەر لە ساڵی (١٧٥٠)ی پێش زایینی ناوی (ئەراپخا) هاتووە لە دەنگوباسەکانی پاشا (حەمورابی)دا(٦٩)) بەڵام باسی دروست کردنی قەڵا هیچ نییە، تا ئەوە بسەلمێنێت کە قەڵا لەو سەردەمەدا هەبووبێت، بەڵگەی ڕاستی بەدەستەوە نییە لەو سەردەمەدا کەپێی وترابێت ئەراپخا، بەڵکو پێی وتراوە (ئال-ئیلانی)، کەلەدواییدا دێینە سەر ئەم باسە بۆ بەراورد کردنی (ئەراپخا) و (ئال-ئیلانی).

**دووەم:**

ئەگێڕنەوە کە گوایا دروست کردنی (قەڵا) دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئاشوورییەکان. کە دامەزرێنەرەکەی (سەرداناپاڵ) ی کوڕی (سەنحاریب)ی کوڕی پاشای سی و دووەمی (٣٢) ئاشوورییەکانە، کەدەسەڵاتی گرتۆتە دەست لەساڵی (٨٠٠) ی پێش زایین. بەڵام هۆی دروست بوونەکەی دەتوانین بەم شێوەیە کورتی بکەینەوە:- کە گوایا (گەرمای-جەرمای) ناوێك، یەکێك بووە لە پاشا دەربەگەکانی سەر بە (سەرداناپاڵ)، فەرمانڕەوایی ئەو ناوچەیەی کردووە کە پێی دەوترێت (بیث گەرمای).

ئەم ناوچەیە شوێنێکی دیاری کراوی میدییەکان بووە، بۆ هێرش کردنە سەری لەلایەن فەرماندە کەیانەوە (ئەرباق)، بۆ ئەوەی (سەرداناپاڵ) بگاتە یارمەتی (گەرمای) هەڵسا بەناردنی لەشکرێکی سەربازی ئاشووری کە پێك هاتووە لە هەزار کەس لەگەڵ یەکێك لەبەگزادەکان بەناوی (بۆرزین)، هەستا بەدروست کردنی قایمگەیەکی بچووك و شوورە ڕێژکراو بەشوورەیەکی قایمی بچوك و هەستا بەدروست کردنی کۆشکی پاشا و یەکێکی تر بۆ فەرمانڕەوا و هەروەها دروست کردنی پەرستگا کە تێدا کرنووش دەبرا بۆ شێرو تەیرو تواڵی ڕەنگ ڕەش، ئەمە ڕووی دا لەماوەی پەنجا ساڵەی فەرمانڕەوایی (سەرداناپاڵ)(٧٠).

**سێیەم:**

دوو کتێبی کلدانی کۆن هەیە، خۆی دەدات لەسەر مێژووی قەڵای کەرکوك، کە (مەتران) (ئەدی شێر) هەستاوە بەوەرگێڕانی یەکێکیان بۆ زمانی تورکی لە ساڵی (١٨٩٦)ی زایینی و، ناوی ئەو کتێبەی دیاری نەکردووە کەوەرگێڕدراوە. بەڵام کتێبی دووەم بەناونیشانی ((اخبار الشهداء القديسين))ە، بۆزمانی بنەڕەتی خۆی (الاب پۆڵس بيجان) هەستاوە بەچاپ کردنی لە (لایبزگ) لە (ئەڵمانیا) کە دەسنووسێکی زۆر دەگمەنە و باسی (کەرکوك) هاتووە لەجڵدی دووەمی، کەچاپ کراوە لەساڵی (١٨٩١)ی زایینی لەلاپەڕەی (٥٣٥) کە کورتییەکەی بەم جۆرەیە:-

پاشای ئاشوورییەکان (سەرداناپاڵ-ئاشوور ناسر پاڵی دووەم)، (٨٨٤-٨٥٨)ی پێش زایینی، هەستاوە بەدروست کردنی قەڵای کەرکوك. چیرۆکی ئەم دروست بوونە بەم جۆرەیە:- یەکێك لەسەرکردەکانی (مادییەکان) بە ناوی (ئەرباق)، یاخی بوو لەدەسەڵاتی حکومەتی ئاشوورییەکان و دەستی گرت بەسەر (گەرمای-باجەرمی) لەنێوان زێی بچوك و شارەزوردا، پاشای ئاشووری هەستا بەسزادان و دەرکردن و دانانی کەسێك بەناوی (گەرمی) لەجێگەی و،

بڕیاریدا بە دروست کردنی قەڵایەکی قایم لە (کورا باجەرمی) کەدەکاتە ناوچەی کەرکوکی ئێستا، هەستا بەهێنانی هەزار کەس لەدەستو پێوەندەکانی خۆیو نیشتەجێ کردن لەو ناوچەیەدا، کەوای لێ هات بوو بەقەڵایەکی قایمو بەرگری دژی هێرشەکانی مادییەکانو هاوپەیمانەکانیان))، لەدواییدا ئەمیش سەربەخۆ بوو لە ئاشوورییەکان، بەڵام بۆ ڕاوێژکردن دەڕۆیشتە لای ئاشوورییەکان[٧١].

**چوارەم:**

سەرچاوەیەکی تر بەم جۆرە باسی دروست بوونی دەکات: ((دروست کەری ئەم قەڵایە (سەرداناپاڵ)، ئاشوور بانیپاڵ (٦٨١- ٦٦٨)ی پێش زایینی، هەستا بەدانانی یەکێك لەفەرماندەکانی بەناوی (گەرمی)، کە ئەم شارە لەسەدەی نۆزدەهەمدا بە (گرمی)و (گەرمای) بەناوبانگ بووە، لەوانەیە لەناوی فەرماندەی شارەکەوە (گرمی) هاتبێت))[٧٢].

((ئەم جێگەیە شوێنی گرنگی ئاشوورییەکان بووە کە (ئەدەد- نەراری دووەمی)، (٩١١-٨٩١)ی پێش زایینیدا وەسپی کردووە بەوەی کەشارێکی سەربازی گرنگ بووەو فراوانی کردووە پاشای ئاشووری (تەجلات پلاسەری سێیەم)، (٧٤٥-٧٢٧)ی پێش زایین، خۆیو دامو دەستەکەی وەکو بنکەیەکی سەربازی بەکاریان هێناوە))[٧٣].

**پێنجەم:**

هەندێك سەرچاوەی تر بەم جۆرە باسی دروست بوونی دەکەن:

((هەندێك دەنگوباس پا دادەگرن لەسەر ئەوەی کە گوایە (نەبوخوزنەسر) کوڕی (نابۆپلاسەر)ی پاشای (بابل) هەستاوە بەدروست کردنی ئەم شارەو قەڵاکەی لەساڵی (٦٠٥-٥٦٢) ی پێش زایین، ئەویش لەدوای ڕووخاندنی نەینەوا لەساڵی (٦١٢)ی پێش زایین.

ناو هێنانی بەردەوام بوونی ئەم شوێنە لەدەست نووسەکاندا هەتا ساڵی (٦١٥)ی پێش زایین، کاتێك کە پاشای میدییەکان (کی ئەخسار) هەستا بەداگیرکردنی ئەم شارەو کاولکردنی بەتەواوی، لەدوایی شکاندنی ئاشوورییەکان لەبەرامبەر (نابۆپلاسەر) هاوپەیمانی (کی ئەخسار)[٧٤].

**شەشەم:**

لە کتێبی ((مێژووی گشتی ئێرانی)) (سیرجان مەلکن) بەم جۆرە باسی دەکات: خەڵك واباوەڕی هەیە کە (بەخت نەسر- بختنسر) دامەزرێنەری کەرکوکە کە (بەخت نەسر) دەکاتە پاشای (بابل)ی (نەبوخوز نەسر)، کەتاڵانی جوولەکەی کردو ژمارەیەکی زۆریانی لێ بەدیل گرتو هێنایانی بۆ (بابل)، کە لەوانەیە هەواڵی دروست کردنی کەرکوك لەلایەن ئەوەوە تارادەیەك ڕاستی تێدا بێت، چونکە لەهەندێك کتێبی جوولەکەکاندا باسی هەڵیسانی ئاگری بابەگوڕگوڕ دەکرێت لەسەردەمی (نەبوخوز نەسر) لە ساڵی (٥٥٠)ی پێش زایینی[٧٥].

**حەوتەم:**

دروست بوونی (قەڵا) یان (شاری کەرکوك) دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (٥٥٠)ی پێش زایین بۆ سەردەمی (نەبوخوز نەسر) کەدەکاتە کوڕی (نابۆپلاسەر)ی سەرکردەی سوپای ئاشوورییەکان. قەڵا لەو کاتەدا بریتی بووە لەزنجیرەیەك گردی بچووك بچووك، کە (نەبووخوز نەسر) بڕیاریدا بەپڕکردنەوەی ئەو گردانە بەخۆڵ، تەختی کرد وە وای لێ کرد کە کردیە دەشتێکی پانو بەرزو وردە..وردە کەوتە قایم کردنی لەدواییدا بووە بنکەیەکی پیرۆزو حاجییەکانی دەهاتن بۆ زیارەتو بۆ کارکردن، هەستا بە شوێن دروست کردن بۆ حاجیو گەشت کەرەکان)[٧٦].

**هەشتەم:**

ئەم شارە ئاوەدان بووە لەسەردەمی (ئەشبی-ئەرا)، (٢٠١٧- ١٩٨٥)ی پێش زایین، کەهەڵگری پاشماوەی سولالەتی ئووری سێیەمە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە شاری کەرکوك زۆر لە (ئاشوور بانیپاڵ) پێشتر بووە کە نزیکەی چواردە سەدە بووە[٧٧].

**نۆیەم:**

لە کاتی دۆزینەوەی پەنجاو یەك ڕەقیمی قووڕی لەساڵی (١٩٢٣)دا، کە بریتییە لە دەسنووسی (مێخی)، دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پێش زایینی، لەدوای لێکۆڵینەوەی ئەو دەسنووسانە دەگەینە ئەو ڕاستییانەی کە بەشێکی شاری (ئەراپخا) پێی ووتراوە (ئال-ئیلانی) کە بەزمانی (ئەکەدی) مانای (شار) یان (گەڕەك)، یان (خواوەند) دەگەیەنێت[٧٨].

ئەوەی لە کەرکوك دەیبینین جیاوازە لەهەریمکە لە (نەینەوا)و (کالخ)و (دۆرشرۆکین)و (هەولێر)، چونکە سەرەتای دروست کردنی ئەم شارە بریتی بووە لە شارێکی دابەش بوو، پێکهاتووە لەشوێنی بەش بەش بوو لەیەکتری، هەرچەندە کەنزیك یەکتری بووە هەروەها دەورە نەدراوە بەشوورە تا بۆئەوەی شێوەی بڵاو بوونەوەکەی ڕابگرێت بەڵام لەکەرکوك بیناکاری ئایینی شوێنی گرنگی قەڵاکەی داگیر کردووە، ئەمەش لەناوەکەیدا بەڕوونی بەدیار دەکەوێت. دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لە هیچ سەردەمێکدا پایتەختی دەوڵەت نەبووە تا ببێتە شوێنی دروست کردنی کارە بەڕێوەبەرییەکان[٧٩].

**دەیەم:**

(س. ج. کاد) لێکۆڵینەوەیەکی لە گۆڤاری (ئاشوورییانو زانستی شوێنەواری ڕۆژهەڵات) لە ساڵی (١٩٢٦)دا بڵاوکردۆتەوە، لەسەر ئەو پەنجاو یەك ڕەقیمی قووڕییە کە دۆزراوەتەوە لەگردی کەرکوك. توانیویەتی بگاتە ئەوەی کەکەرکوکی ئێستا بریتی بووە لە شارێکی کۆن پێی وتراوە (ئەرابها)، (ئەراپخا) کە بەم ئاقارە بەگشتی ووتراوە (ئەرابها) پایتەختەکەی لەناو کەرکوك بووە، کەدەتوانرێت ئەو ناوەی لێ بنرێت کەپێی وتراوە شاری خوداوەند، هەندێك لەلێکۆڵەرەوەکان لەو باوەڕەدان کە پایتەختی پاشای سەر بەلایەنێك بووە، هەندێك واباوەڕی هەیە کە پاشاکانی نێو دوو ڕووبار لەوێ دانیشتوونە[٨٠].

**یانزەهەم:**

دەڵێن گوایە یەکێك لەپاڵەوانە بەناوبانگەکانی ئێرانی، ناوچەکەی خۆی بەجێ دەهێڵێت لەدەست زوڵمو زۆری پاشای ئێرانییەکان کە وڵاتی فارسیان بەڕێوە دەبرد، ئەم پاڵەوانە هەندێك لەدامو دەستەکەی هەڵدەگرێتو بەرەو ئەم

ناوچەیە دەکەونە ڕێگا. کاتێك دەگەنە ئەم شوێنە دەبینن کە ئاوی زۆری هەیەو ئاوو هەواکەی سازگارە بۆ ژیانو سووتانی ئاگرەکەی سەرنجیانی زۆر ڕاکێشاوە بۆ ئەوەی کەبڕیاری ئەوە بدەن کە لەوێدا نیشتەجێ بن.

ئەم پاڵەوانە بڕیاری داوە بەدروست کردنی ئەم قەڵایەی ئێستا، یەکەم کارێك کە پێی هەڵسان بریتی بوو لە هەڵکەندنی چاڵ بەپانی پەنجا پێو بەقوڵییەکی وا کەتابگاتە ئاو لەشێوەی بازنەیی داو هەستان بە کەڵەکە کردنی خۆڵەکان لەدەوروبەری بازنەکەدا، کە ئەم خۆڵە قەڵایەکی گرنگی دروست کرد لەدەوری چاڵەکەدا، لەدواییدا هەستان بەدروست کردنی بورجو قایمگە بۆی، ئەمە وای کرد کەببێتە قەڵایەکی سەربازیو هەستان بەدروست کردنی خانووبەرە لەسەریدا بۆ نیشتەجێ بوون، شوێنێی لێ دروست کرد بۆ ئەوانەی کەئاگر دەپەرستنو دێن بۆ زیارەت کردن کەدەبوایە باجیان بدایە لەجیاتی ئەم کارە، بەم ئیشەیان دەوت (کاری کوك)[81].

*** سەرنجو بۆچوونەکان دەربارەی دروست بوونی (قەڵا، ئال-ئیلانی، ئەراپخا):**

نەبوونی سەرچاوەیەکی بنەڕەتیو تەواو دەربارەی کاتی دروست بوونی قەڵاو دیاریکردنی ماوەیساڵو هۆی دروست بوونی قەڵا، چونکە تاڕادەیەکی چاك سەرچاوەکان لەچەند بازنەیەکی جیاواز. جیاواز دا دەسوڕێنەوەو تاڕادەیەکی چاك گەیشتن بەدیاری کردنی مێژوویەکی بەرچاو تۆزێك مەحاڵی پێوە دیارە، بۆیە هەوڵدەدەم بەپێی پێویست سەرچاوەکان بخەمە بەر تاو توێی لێکۆڵینەوەی ڕەخنەی مێژوویی.

تاکو ئێستا کە هەڵکۆڵین لە (قەڵا، ئال-ئیلانی، ئەراپخا) نەکراوە تا دەست نیشانی چینە مێژووییەکان دیاری بکات، کەئەو کاتە گەیشتنە ڕاستی دروست بوونەکەی ئاسان دەبوو، چونکە ئەوەی تەنها دۆزراوەتەوە بریتییە لەو دەسنووسە قوڕینانەی کە لەقەڵا لە ساڵی (١٩٢٣)دا دیاری کراوە. کە دەست نیشانی ماوەی سەردەمی ئاشووری ناوەڕاست دەکات، ئەمەیش دەمانگەیەنێتە ئەوەی گوایە قەڵا لەپێش ئەو مێژووەوە هەبووە، وەکو قەڵایەکی خاوەن شوورە یان ناوچەیەکی تەنها ئاوەدانی سەر بە (ئەراپخا).

بەهۆی ئەو پەنجاو یەك تابلۆ مێخییانەی کە دۆزراوەتەوە دەگەیەنە لێکۆڵینەوەیەکی یەك لایی، ئەمیش ئەوەیە لەوانەیە لەوەو پێشی ئەو مێژووییەش ئاوەدان بووبێت، هەر لەسەردەمی گۆتییەکانەوە جێگەیەکی دیاری هەبووبێت، بەڵام سەرچاوەکان کەمن بۆ یەکخستنی ئەو ڕاستییەی سەردەمی گۆتییەکان. چەند ڕاستیەك هەیە ئەوەیە ئەگەر کەرکوك لەسەردەمی گۆتیەکان ئاوەدان بووبێت پایتەختی (ئەراپخا) بووبێت دەبێت شوێنێکی وەکو قەڵا چینی ژێرەوەی بگەڕێتەوە ئەو سەردەمە، چونکە گۆتیو لۆلۆییەکان دەسەڵاتێکی فراوانیان لەو ناوچەیەدا هەبووە تا ماوەیەکی دوورو درێژ، هەریەك لە د. جەمال ڕەشیدو د. کەمال مەزهەر ئەو ڕاستییەی گۆتیەکانیان پشت ڕاست کردووە.

زۆری سەرچاوەکان باسی دروست کەری قەڵا دەکەن گوایە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (سەردانا پاڵ)، ئەگەر سەیری زنجیرەی پاشای ئاشوورییەکان بکەین دەبینین ئەم ناوە بەرچاو ناکەوێت، کە هەندێك سەرچاوە دەیگەڕێننەوە بۆ ئەوەی گوایە ناوێکی خوازراوی (ئاشوور پانیپاڵ) یان (ئاشوور ناسر نۆپاڵی دووەم)ە ئەگەر سەیری مێژووی فەرمانڕەواکەیان بکەین زۆر لەیەکەوە دوورنو ماوەیەکی زۆر لەنێوانیاندا هەیە دەربارەی ڕاستی مێژوویی و ماوەی فەرمانڕەواییان. بەڵام لەوانەیە (ئاشوور پانیبال)ە کە لە (سەردانا پاڵ)ەوە نزیکتر بووبێت کە ئەگەر لەڕووی زمانەوانییەوە بەراوورد بکرێت.

((لەم ساڵانەی دواییدا توانرا کە شوورەیەك بدۆزرێتەوە کە چوار بورجی چاودێری لێ بوو، کەهەریەکەی شێوەیەکی تاڕادەیەك جیای هەبوو، دروست کراوە لەخشتی کاڵ، توانرا لەلای یەکێکی بورجەکانەوە بەقووڵی شەش مەتر بچنە خوارەوە بۆ گەیشتن بەبنکەی بورجەکە، توانرا ڕیزێك خشت بدۆزرێتەوە کەڕازاوەتەوە بەنووسینی مێخی (مسماری) و بەزمانی ئاشووری))[82] بەڵام ئەو بنکەیەی ئەو بورجە هەمان ئەو بورجەی سەرەوە نییە، لەوانەیە ئەوەی ژێرەوە زۆر کۆنتر بێتو بگەڕێتەوە سەردەمی ئاشوورییەکان، ئەوەی سەرەوە لەوانەیە کەلەدوای سەردەمی ئاشوورییەکان بێت، کە دەکاتە سەردەمی ئەسکەندەر یان ساسانی یان پرسی ئەمە دەمانگەیەنێتە ئەوەی کەلەسەردەمێکی دیاری نەکراوی ئاشوورییەکاندا بنیات نراوە، بەڵام کەی تا ئێستاکە نەزانراوە، چونکە لەسەر ئەم بورجانەشەوە شوورەو بورجێکی تر دۆزراوەتەوە کە زۆر.. زۆر لەو سەردەمانەی تر نوێترە، دەگەڕێتەوە نزیکەی (٧٠٠-٨٠٠)ی کۆچی ((کە لەکاتی خۆیدا دێینە سەرباسی ئەم بورجە)).

هەروەها لە بەینی دوو بورجی ئەو شورانەی لای سەرەوەی کەبەرەو ڕێگای سولەیمانی دەڕوات نەخشێك هەیە کەتەنها سەرووی نەخشەکە ماوە، وەکو پێی دەچێت لە کاتی خۆیدا دەرگا بووبێتو لەدواییدا ڕێگای دەرگاکەی گۆڕا بێت بەڵام ئێستا بەتەواوەتی ئەو بۆچوونە ساغ نەبۆتەوە بەڵام لەبەراوردی نەخشەکەدا وا بەدەردەکەوێت کە هاوشێوەی سەردەمێکی دوای ئاشوورییەکان بووبێت.

پاشماوەی ئەو نەخشەی کەماوە بریتییە لەڕیزێك نەخشی چوار گۆشەیی کەلەسەر شێوەی ڕووی یەکێك لەلایەکانیەوە دانراوە کە ڕیزێك خشت لەسەرەوەو خوارەوەیدا نەخشە چوارگۆشەییەکانی خستۆتە نێو چوارچێوەکەیانەوە، نەخشەکان لەسەر ڕووی پانی دانراوەو لەبەینی خشتێكو خشتێکی ترا بۆشایی دروست کراوە کەدەکاتە نیوەی درێژی خشتێکیان،چوار چێوەیەکی وەکو لاکێشەی نێوانی هەردوو لا بورجەکەی بەستۆتەوە کەئەمیش بەهەمان شێوە لەشێوەی خشتەکان داڕێژراوەتەوە، ئەمە وا نیشان دەدات کە دەرگا بووبێت لەکاتی خۆیدا.

بۆ ئەوەی بۆ چوونەکەمان ڕوون بکەینەوە بڕوانە ئەم خشتەیەی خوارەوە دەربارەی هەریەکە لەپاشای ئاشووریو بابلییەکان.

ئەگەر سەیرێکی ئەم خشتەیە بکەین دەبینین ئەو پاشایانەی کەناویان هاتووە لەدروست کردنی قەڵادا هەریەکەی ماوەیەکی زۆر هەیە لە نێوانیاندا زۆر بە زەحمەت دەتوانرێت

هێڵی ڕاستی دروست کەری دیاری بکرێت، چونکە ئەم ماوانەی نێوانیان هی ساڵو دوو ساڵو دە ساڵ نییە بۆ دیار کردنی مەسەلەیەکی گرنگی مێژوویی وەکو دروست کردنی قەڵا[٨٣].

| ژ | زنجیرەی پاشای ئاشووری | زنجیرەی پاشای بابلی |
| --- | --- | --- |
| ١ | ئاشوور ئۆباڵتی یەکەم (١٣٣٠-١٣٦٥) | |
| ٢ | | نەبوخوز نەسری یەکەم (١١٠٣-١١٢٤) |
| ٣ | ئاشوور ناسر باڵی دووەم (٨٥٩-٨٨٣) (٨٥٨-٨٨٤) | |
| ٤ | سەنحاریب (٦٨١-٧٠٤) | |
| ٥ | ئەسەرحەدون (٦٦٩-٦٨٠) | |
| ٦ | ئاشوور پانیپاڵ (٦٣٣-٦٦٨) (٦٢٧-٦٦٨) | |
| ٧ | | نابۆبلاسەر (٦٠٥ -٦٢٦) (٦٠٥-٦٢٥) |
| ٨ | ئاشوور ئۆباڵتی دووەم (٦٠٩-٦١١) | |
| ٩ | | نەبوخوز نوسەری دووەم (٥٦٢-٦٠٥) (٥٦٢-٦٠٤) |

دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە گوایا قەڵا هەر لەسەردەمی پێش (هوری-میتانی)یەکانەوە هەبوو بێت، چونکە ئەو بۆ چوونە بەدەردەکەوێت ئەگەر کەرکوك لەسەردەمی پاشای ئاشووری (ئاشوور ئۆباڵتی یەکەم) ڕووخێنرابێت، هەریەکە لە (کوڕوخانی)و (نوزی)، لەناوچووبێت، بەپێی ئەو سەرچاوانە قەڵایش لەو کاتەدا ئاوەدان بووە.

ئەگەر کۆشکێکی وەکو (نوزی)و (کوڕوخانی) ئاوا بەو گرنگییە دروست کرابێت، قەڵاش هەمان سەردەمی ئاوەدانیو هەمان فراوانی کۆشكو قەڵای هەبوو بێت، کە زۆر سەرچاوە دەست نیشانی شوێنی دانیشتنی پاشا دەکەن لە (ئال-ئیلانی)، بۆیە ئەگەر فەرمانڕەوایەك کۆشکەکەی لە (نوزی) بەو جۆرە بیناکاریو نەخشو نیگارە ڕازابێتەوە، ئایا نابێت (قەڵا، ئال-ئیلانی)ی شوورەی بەدەوردا کرابێتو بورجی شوێنی پارێزگاری لێ کرابێت، وەکو ئەوەی لە کوڕوخانی بینیمان.

ئەگەر بەراوردێکی ئەو هونەری بیناکاریو نەخشو نیگارەی هەریەکە لە (نوزی)و (کوڕوخانی) بدەین لەگەڵ ناوچەکانی تری (هوری-میتانی) دەبینین کە لێکچوونێکی بیناکاری پارێزگاری گرنگی هەبووە، بۆیە کەرکوك پارچەیەکی ئەو ئیمپراتۆرییەتەی (هوری-میتانی)یەکان بووە، لەبەر ئەمە دەبێت بایەخی پێ درابێتو ئاوەدانو شوورە ڕێژ کراوە.

لەبەر گرنگی شوێنی کەرکوكو پاشماوەیەکی باڵای (هوری-میتانی) بوووە، وای کردووە کەهەر پاشایەك هاتووە بایەخێکی تایبەتی بە (کەرکوك-ئەراپخا) داوەو هەردەم هەوڵی ئاوەدان کردنەوەی هێڵی سەربازی ئەم ناوچەیەیان داوە، ئەمەش بەڕوونی بەدەردەکەوێت لەدوای ڕووخاندنی (هوری-میتانی)یەکاندا. چونکە دوای ڕووخاندنیان، ئاشوورییەکان پێویستیان بەوە هەبووە کەخۆیان قایم بکەنو دەرس لەڕابردوو وەرگرن تاجارێکی دی نەکەونە ژێر ڕکێفی هوری-میتانییەکان، هەستان بەقایم کردنی قەڵای کەرکوكو ئاوەدان کردنەوەی چ لەلایەن (ئاشوور ئۆباڵتی دووەم) یان (ئاشوور پانیباڵ) یان (ئاشوور ناسر باڵی دووەم) بوو بێت، هە ریەکە هەوڵی داوە هێڵی سەربازی ئەو ناوچانە لە هێرشی دەوروبەر بپارێزێت. هیچ سەیر نییە ئەگەر (نەبوخوزنەسری دووەم) هاتبێت ئەو ڕێگا سەربازییەی پتەوتر کردبێتو گردەکانی دەوروبەری پڕ کردبێتەوەو زیاتر بایەخی بەدروست کردنەکەی دابێتو دیلە جولەکەکانی بەکار هێنابێت لە کاری قایم کاری ئەم قەڵایە.

شتێکی زۆر گرنگ هەیە کە زۆری سەرچاوەکان هۆی دروست کردنەکەی دەگەڕێننەوە بۆ سەر ئەوەی کە ئاشوورییەکان ئەم قەڵایەیان دروست کردووە بەهۆی بەربەرەکانییان لەگەڵ میدییەکانو فەرمانڕەوایی میدییەکان بووە. هەردەم هەوڵیان داوە، کەئەم بەربەرەکانییە دابین بکەنو ڕێگای پێویست بگرنەبەر بۆ پارێزگاری کردنی. ئاشوورییەکانیش ڕۆژ بەڕۆژ لەگەڵ فراوان بوونی ئیمپراتۆریەتەکەیاندا بەربەرەکانیشیان لەگەڵ دراوسێکانی دەوروبەردا زیادی کردووەو بۆ پاراستنی ئەو ئیمپراتۆریەتە هەوڵیان داوە لەگەڵ دروست کردنی هێزی سەربازی بیناکارییەکی فراوانو پتەو دروست بکەن کەبەشێك بێت لەو بەرگرییە، لەدژی (هوری-میتانی) لەلایەكو (حیسی-حیثی)و میسری لەلایەكو میدییەکان لەلایەکی تر، بۆیە دیبلۆماسیەتی هەریەکەیان بەجۆرێك کاری کردووە کەڕەنگی داوەتەوە لەکاری سەربازیو بیناکاری ئاشوورییەکان، کە زیاتر بایەخیان داوە بەدروست کردنی شوورەو بورجو شوێنی بەرزی ستراتیژی.

لە سەردەمی (ئاشوور ئۆباڵتی یەکەم)دا ئاشوورییەکان ئەو بێ هێزییەیان لاداو خۆیان گرتەوەو توانیان ((کەهەستنەوە بەدروست کردنی دەوڵەتی ئاشووریو بەهێز کردنی، ئەمەش بەڕوونی بەدەردەکەوێت لەناوەکانی نێوان ئاشووریو میسریو کاشییەکاندا))[٨٤]. هەروەها ئاشوور ئۆباڵتی یەکەم

توانی خۆی ڕزگار بکات لەدەستەڵاتی میتانییەکان و هەستا بە بەکارهێنانی ناوی (پاشای گەورە)و (پاشای گەردوون)[٨٥]. بۆیە ڕێگەی تێدەچێت کەڕووخاندنی یەکێتی (هۆری–میتانی) لە لایەن ئاشوور ئۆباڵتی یەکەمەوە بووبێت[٨٦].

لەکاتی هاتنی (ئاشوور ناسر پاڵی دووەم) (٨٨٤–٨٥٩)ی پێش زایین گەلێك تایبەت مەندی تێدا هەبووە وەکو ئازایەتی و زۆرداری و هەوڵدان بۆ دەسکەوت و تازەگەری و بوێری هەر کەهاتە سەر حوکم هەستا بە هێرش کردن بۆ ناوچە شاخاوییەکانی سەرووی وڵاتی نێوان دوو ڕووبار، توانی کە بچێتە ژوورەوە هەتا زەوی (کوتموخۆ) لەشیوی دیجلەی سەروو[٨٧]. هێزی کۆکردەوە دژی گێرە شێوێنەکان لەچیای (کاشیاری) لەزەوی زامواو ناوچەی فوراتی ناوەڕاست لەماوەی جیاجیای فەرمانڕەواییەکەیدا[٨٨].

(ئاشوور ناسر پاڵی دووەم) هەستا بە دروست کردنی کۆشکی سەرووی ڕۆژئاوای (نەمروود) لەساڵی شەشەمی فەرمانڕەواکەی، بەیارمەتی ئارامییەکان کە هێنابوونی بۆ دروست کردنی ئەم کۆشکە، لەکاتی تەواو بوونیدا ئاهەنگێکی گەورەی گرت[٨٩].

بەڵام سەردەمی (ئاشوور پانیباڵ) هەروەکو (حەمورابی) دادەنرێت بەماوەیەکی زۆر گرنگ و وەرچەرخانێکی ترسناك لەمێژووی عێراقی کۆندا[٩٠].

لەکاتی مردنی (ئەسەرحەدون)دا دوو سەرکردە دانیشتن لەسەر کورسی فەرمانڕەوا، یەکێکیان (ئاشوور پانیباڵ) بوو لەنەینەواو ئەوی تر (شمس–شم– ئۆکن) بوو لە (بابل) هەر چەندە کە ئاقاری ئیمپراتۆریەکە هێشتا دابەش نەبوو بوو[٩١].

لەدوای مردنی (ئەسەرحەدون) کارێکی گرنگ کەوتە ئەستۆی (ئاشورپانیباڵ) ئەمیش دامرکاندنەوەی میسرییەکان بوو کەهەر لەسەردەمی باوکییەوە درێژەی کێشابوو، بەڵام سوپای ئاشووری هەر بەدوای فیرعەون کەوت، هەتا توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، توانیان کەشاری (تەیبە) داگیر بکەن و سەرکەوتن بەدەست بهێنن کە بوو بەسەرکەوتنێکی گەورە بۆ (ئاشوور پانیباڵ)[٩٢].

زنجیرەیەکی تر سەرکەوتنی بەدەست هێنا لەگەڵێك شوێنی جیا جیای تر لەسوریاو لوبنان و میسرو میدیاو بابل و سووسەدا[٩٣]. کەئەمە وای کرد ئاقاری ئیمپراتۆریەتی ئاشوورییەکان زیاتر فراوان بێت لە سەردەمی (ئاشوور پانیباڵ)دا.

هەر چەندە (ئاشوور پانیباڵ) ئەو سەرکەوتنانەی بەدەست هێنا لەوڵاتی (بابل)و (عیلام)، بەڵام تاڕادەیەك تەم و مژ هەیە دەربارەی ئەو ماوەیەی لەوەو دواوەی هەتا کۆتایی لەساڵی (٦٢٦)ی پێش زایین، زانیاریمان بەدەست ناکەوێت دەربارەی ڕووداوەکان تەنها لە سەرچاوە لاوەکییەکانەوە نەبێت، کەئەمەش لەوانەیە بگەڕێتەوە بۆ هۆی ئەو گێرە شێوێنیەی لەناوخۆدا ڕووی دا لەگەڵ تێکچوونی باری ئاسایی لە سنوورەکانی دەرەوەی ئیمپراتۆریەتەکە[٩٤].

بەڵام زۆر بەداخەوە شتێکی ئەوتۆ نازانین دەربارەی ئەو دەسکەوت و کارە بیناکارییانەی کە ئاشوور پانیباڵ پێی هەڵساوە، وەزانیاری باشترمان هەیە دەربارەی هونەر لەسەردەمی ئەودا[٩٥].

لێرەدا هەوڵ دەدەم چڕی بیرو بۆچوونی خۆم بخەمە ڕوو دەربارەی دروست کەری (قەڵا) کە ئایا دەتوانین ئەوە بسەلمێنین کەیەکەم کەسی دروست کەری قەڵا دەبێت کێ بێت، یان هیچ نەبێت بتوانین هێڵێکی ڕوونی بدۆزینەوە بەپێی ئەو سەرچاوە کەمەی کەبەدەستمانەوەیە لەدەسنووسە قوڕینەکانی قەڵاو دۆزرانەوەی ئەو بورجەی کەلەنەوەتەکاندا دۆزراوەتەوە لەقووڵی شەش مەتر لەبورجەکەی سەرەوە، ئەمە ڕوون دەکەنەوە کە قەڵا ئاوەدان بووەو شوێنێکی گرنگی بەڕێوەبەری و ئایینی و ستراتیژی هوری–میتانی بووە لەناوچەکەدا وەئەوەی کەشکی تێدا ناهێڵێتەوە ئەوەیە کە هوری–میتانییەکان بایەخیان داوە بەخۆ قایم کردن، بۆ فراوان کردنی دەوڵەتەکەیان و پاراستنی لەهێرشی دەرەکی، بۆیە هیچ بەسەیر نازانرێت ئەگەر (قەڵا–ئال ئیلانی)یش وەکو (نوزی)و (کوڕوخانی) خاوەن شوورە بووبێت و قایمگەیەکی سەربازی گرنگ بووبێت چونکە فراوانی بیناکارییەکانی هەریەکە لە (نوزی)و (کوڕوخانی) ڕاستی ئەم بۆچوونە یەکلا دەکەنەوە، ئەوەی ڕاستی ئەمە بەلادا دەخات گرنگی ئەم شوێنە بووە لەدوای هۆری–میتانییەکان چونکە ناوچەکانی هەریەکە لە (نوزی)و (کوڕوخانی) کوێر بونەتەوە بەڵام ئەم شوێنە بەردەوام قایمگەی بۆ دروست کراوە بۆ خۆپاراستن و ناوی هاتووە لەهێرش کردنە سەری بۆ داگیر کردنی لەلایەن حوکمڕانە جۆر بەجۆرەکانەوە. ئەوەی ئەم بۆچوونە ڕوون دەکاتەوە دۆزینەوەی ئەو سێ چینەیە لەشوورەو بورجی چاودێری کەهەریەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی جیا جیا.

هەموو ئەو سەرچاوانەی کەباسی دروست کەری قەڵا دەکەن تەنها باسی (سەردانا پاڵ) دەکەن بێ ئەوەی ئەو ناوە دیاری بکەن، تەنها بەبۆچوونی خۆیان لێکی دەدەنەوە هەندێك دەڵێن (ئاشوور ئۆباڵتی یەکەم)ە، (١٣٦٥–١٣٣٠)ی پێش زایینی یان (ئاشوور ناسر پاڵی دووەم)ە، (٨٨٤–٨٥٨)ی پێش زایینی، یان (ئاشوور پانیپاڵ)ە، (٦٦٨–٦٢٧)ی پێش زایینی، یان (ئاشوور ئۆباڵتی دووەم)ە، (٦١١–٦٠٩)ی پێش زایین، ئەگەر بەراوردێکی (سەردانا پاڵ) بکەین لەگەڵ کۆتایی لە هەریەکە ئەو پاشایانەی کەناومان هێنان دەبینین لێك چوون هەن، کەئەمەش لەوانەیە لە جێ گۆڕکێی زمانی ئارامییەکاندا ڕووی دابێت لەبێژەکردنی ناوەکاندا. وەوای کردبێت کەئەم سەر لێشێوانەی دروست کردبێت و تووشی لێڵی دۆزینەوەی ناوە بنەڕەتییەکەی کردبێت لەم سەردەمەی ئێستاماندا، کەنمونەی ئەمە (گرمای–باجرمی–باگرمی) یە، هەر لەسەردەمی ئارامییەکاندا ڕوویدا، یا کە کڵێسەکان لەکاتی نووسینەوەی ڕووداوە مێژووییەکاندا ئەم لایەنەیان فەرامۆش نەکردووەو بەبێژەتی ئارامی بێژەیان کردووە.

ئەو پاشایانەی کە ناویان هاتووە لە دروست کردنی قەڵادا هەریەکەیان خاوەنی مێژوویەکی دوورو درێژن لەچالاکی سەربازی و باڵادەستی فراوانی ناوچەکانی ئاقاری ئاشوورییەکان، لەشوێنە جۆربەجۆرەکاندا، بۆیە ڕێگای تێدەچێت هەریەکەیان هەستابێت بەدروست کردنی قەڵا یا

تازە کردنەوەی لە بارێکی بیناکاری چاکترو سازتر بۆ کاری سەربازی تا بەوەی بگونجێت لەگەڵ مەودای فراوانی دەوڵەتی ئاشوورییەکاندا بۆ خۆ ئامادەکردن لەگەڵ دوژمنەکانی ئاشوورییەکاندا.

((بەڵام ئەم شارە ئاوەدان بووە لەسەردەمی (ئەشبی-ئەرا)، (٢٠١٧- ١٩٨٥)ی پێش زایین، ئەمە پادادەگرێت لەسەر ئەوەی کەشاری کەرکوك زۆر لە پێش هاتنی (ئاشوور پانیپاڵ)ەوە ئاوەدان بووە، کە دەکاتە نزیکەی چواردە سەدە لەپێش ئەوەوە[٩٦].

ئەوەی کەوا پێویستە بیڵێن ئەوەیە کە دروستکەری قەڵا پێویستی بەهەڵدانەوەی چینەکانی ژێرەوەی قەڵایە تابۆ ئەوەی ماوە مێژووییەکانی دیاری بکرێت لەسەر ڕووی ئەو بیناکارییەی کە بەجێماوە، گرنگترین ماوە کەشکی تێدا نامێنێت سەردەمی (گۆتی، لۆلۆیی، هوری، میتانی)یە کە قەڵای تێدا دروست کراوە بەڵام لەدوایدا دووبارە دروست کراوەتەوە.

*** هونەری بیناکاریو نەخش و نیگاری سەردەمی نەخمینیو پرسیو سلۆقیو ساسانییەکان لەناوچەی کەرکوك:**

ئەم سەردەمە دادەنرێت بەماوەیەکی جیا لەهونەری بیناکاری، ئەمیش تێك هەڵکێش کردنی هونەری بیناکاری (فارسی-ئێرانی)و (هیلینی) بوو لەگەڵ هونەری بیناکاری ئەم ناوچەیەدا کەخاوەنی هونەری بیناکاری هوری-میتانیو ئاشووری بوون. بۆیە وەرچەرخانێکی جیایە لە هونەری بیناکاری سەردەمەکانی پێش خۆی، کە لەگەڵ خۆیدا تەوژمێکی تری بیناکاری ڕاپێچ کردە ناو هونەری بیناکاری ناوچەکەوە کە لەوە پێشتر نەبینرا بوو، چونکە هەندێك بابەتو خاسیەتی تەرزی بیناکاریو نەخشو نیگار دروست بوو کە پێویستی بەوە دەکات کە هەڵوێستی دەربارەی بگرین بۆ بەراورد کردنی بەرەو هونەری بیناکاری ئیسلامی لەوەو دوای ئەو هونەرانە.

ئەو ماوەیە دادەنرێت بە وەرچەرخانێکی ئایینی گەورە لە ڕۆژهەڵاتدا دەربارەی ئایینی جوولەکەو مەسیحیو زەردەشتی کە هەموو ئەم ئایینانە خاسییەتێکی بیناکاریو نەخشو نیگاری هێنایە گۆڕێ کە جیا بوو لەسەردەمەکانی پێش خۆی چی لەڕووی بابەتی بیناکارییەکە یا شێوەی بیناکارییەکەو تایبەتمەندییەکی وای دروست کرد کەمۆرکی ئەو بیناکارییە تا سەردەمە ئیسلامییە جۆربەجۆرەکان درێژە بکێشێتو پاشماوەی ئەو ماوە مێژووییە هەتا ئەم سەردەمانەی ئێستامان هەر بەردەوامە. کە ئەمە زۆر بەتایبەتی ڕەنگی داوەتەوە لە هونەری بیناکاری ناوچەی کەرکوك.

گۆڕینی بیروباوەڕە ئایینییەکان لەگەڵ خۆیدا بۆچوونی تازەی دروست کرد دەربارەی ژیانو پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکانو سازدانی ئەو پەیوەندییانە بۆ ئەوەی بگونجێت لەگەڵ هونەری بیناکاری چوارچێوە ئایینییەکە.

لەناوچەیەکی وەکو کەرکوکدا دوو بیروباوەڕی ئایینی ئەویش زەردەشتیو مەسیحی جێپەنجەی خۆیان دیاری کرد بۆ لەوەو دوای هونەری بیناکاری، بەڵام ئەگەر دەستی کاولکاری نیمچە دورگەی عەرەبی لە کاتی بڵاوبوونەوە ئایینی ئیسلام نەبووایە زۆر شتی گرنگی ئەو بیناکارییە دەدۆزرایەوە. چ لەشێوەی بیناکاریو نەخشی ئیقۆنیو دوکەڵ کێشی ئاتەشگەکاندا کە ناوچەیەکی وەکو کەرکوك تووشی پاشاگەردانیو دووری فەرمانڕەوایی کارگێڕی ناوچەکە لەگەڵ ناوچەکانی تر تووشی پشتگوێخستن بوو کە زۆربەی شەڕو شۆڕو هێرشە گەورەکان لەو ناوچەیەدا سەری هەڵدا کە بوو بە هۆی داڕمانی باری شارستانی لەو شوێنانە.

*** هونەری تەلارسازی هەخامەنشیدا:**

((ئەخمینییەکان بریتین لە کۆمەڵەی نەتەوەکانی (هیندو ئەوروپی) کە نیشتەجێ بوونە لەخوارووی ڕۆژئاوای وڵاتی ئێران لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زایین.

لە سەرەتادا لەژێر دەسەڵاتی پاشای میدییەکاندا بوون کە نیشتەجێی بەشی سەرووی ڕۆژئاوای ئێران بوون.

بەڵام (کۆرش) کەپێشەوای ئەخمینییەکان بوو هەستایە سەر میدییەکانو هێرشێکی کرد بەرەو ڕۆژهەڵاتو وڵاتی میدییەکانی داگیر کرد.

(کۆرش) پاشای ئەخمینییەکان ئیمپراتۆریەتێکی فراوانی دروست کرد کە سنووری خۆی دەدا لەهیند بەرەو ڕووباری (ئیجە)و ئاسیای بچووكو وڵاتی (بابل)و (ئاشوور)[٩٧].

لە کارەکانی (دارا) پاشای ئەخمینییەکان، دروست کردنی دەزگایەکی ڕێكو پێکی گەیشتنو پەیوەستی ناردنی پۆستەو بەستنەوەی بەچەند تۆڕێکی ڕێگا لەنێوان پارچەکانی ئیمپراتۆریەتەکەیو پایتەخت لە (برسیبولیس))[٩٨].

بۆیە ناوچەی کەرکوك کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئەخمینییەکان کە فەرمانڕەواییەکەیان لەعێراقدا نزیکەی (٢٠٨) ساڵ خایاند، لە (٥٣٩)ی پێش زایین هەتا ٣٣١ی پێش زایین. تا ئەو کاتەی کە کەوتە ژێر دەستی (سلۆقس نیقاتۆر)ی یەکێك لەسەرکردەکانی (ئەسکەندەری مەکەدۆنی)[٩٩].

ئەگەر سەیری ئەو ماوەیە بکەین لەکاتی ڕووخاندنی ئیمپراتۆریەتی ئاشوورییەکانو هاتنی نەتەوەی جۆر بەجۆری یەك لەدوای یەكو تا هاتنی ئەخمینییەکان بەم جۆرە بوو:

((زۆری خانووبەرەکان ڕووخا بوو یان چۆڵ ببوون، کەناڵی ئاوەکان پڕ ببووەوە بەلیتەو زۆری زەویو زارە چاکەکان بوو بوو بەبیابانو بەجێهێڵرا بوو. بۆیە هیچ سەیر نییە کە (زەینەفۆسن) کەوەسپی ئەو کاتەی داوەتەوەو دەڵێت:-

((نەت دەتوانی کە شوورەی نەینەوا (مسیلا) بناسیتەوە.. بێجگە لەهەولێر هەموو شارەکانی سەر بەئاشوورییەکان کاول بوو بوو یان وێرانە بوو بوو، وەکو شێوەی گوندێکی بچووکی لێ هاتبوو))[١٠٠].

لەسەردەمی هاتنی ئەخمینییەکاندا شێوازێکی نوێ سەری هەڵدا لەهونەری فارسی کەتایبەتمەندییەکی دیاری هەبوو بەتایبەتی لەسەردەمی (کۆرش)دا. فارسەکان سوودیان وەرگرت لەشارستانییەتەکانی وڵاتی میزۆپۆتامیاو

بایەخیان بەوەرگرتنی هونەری ئەم ناوچەیە داو کارتێکردنی میدییەکانیش بەسەریانەوە بەدەرکەوت بەتایبەتی لەلایەن پیرو باوەڕە ئایینییەکان.
فارسەکان بەوە بەناوبانگن کەبایەخیان دا بە دروست کردنی کۆشکی پاشایەتی فراوان، کە ئەمە وای کرد هونەری بیناکاری لەسەردەستی ئەواندا گەشە بکاتو هەوڵیان دەدا کە کۆشکەکانیان لەسەر کۆشکی ئاشووریو بابلییەکانەوە بێت. وەوا نیشان بکەن کەلەئاستی گەورەیی پاشای فارسەکان بێت، ئەم کۆشکانەیان دروست دەکرد لەسەر سەکۆی بەرز بەرز، دیوارەکانیان دەئاخنی بەمەرمەڕو نەخشیان دەکرد بەوێنەی ئاهەنگی پاشایەتی فارسەکان. کە تاڕادەیەك لەژێر کارتێکردنی هونەری ئاشووریدا بوون[(١٠١)].
مەبەستیان لەبەکارهێنانی زۆری کۆڵەکە بۆ ئەوە بوو کەئەوەی ببینێت واهەست بکات بەفراوانی کۆشکی فارسەکان[(١٠٢)].
هەرچەندە کە فارسەکان شارستانیەتێکی زۆری میزۆپۆتامیایان وەرگرت، بەڵام تایبەتی ئەو ئایینەیان پاراست کە لە ئێراندا باو بوو، کەباوەڕیان بەبوونی دوو خواوەند هەبوو یەکێکیان کەلایەنی خێرە کە لەڕووناکیدا بەدەردەکەوێت پێیان دەوت (ئاهورامەزدا–Ahurmazda)، خواوەندەکەی تر لایەنی شەڕ دەنوێنێت کە لەتاریکیدا هەیە وپێیان دەوت (ئەهرەمەن–Ahiramn)، باوەڕیان وابوو کە ئاگر سەرچاوەی ڕووناکییە. بۆیە هەڵدەستان بەدروست کردنی ئاتەشگە کەبریتییە لەخانوویەکی بەردی چوارگۆشەیی شێوە، کەلەناویدا ئاگر دەکرێتو لەسەرەوەی ئاتەشگەکە هەواکێشی بۆ دەکرا بۆ دەرچوونی ئاگر لە کونەکانییەوە، ئەم ئاتەشگانە شێوەیەکی سادەو ساکاری هەبوو ئەو جۆرە بایەخەی نەبوو لەدروست کردنیدا لەچاو کۆشکی پاشایەتی فارسەکاندا[(١٠٣)].
هونەری ئێران لە سەدەمی هەخامەنیشیەکاندا نە سەرەتاییەو نە سادەیە، بەڵکو هونەری ئەو رۆژگارە بارو قورساییەکی چەند لایەنێکی لەسەر شان بوو کە دەتوانرێت بە لێکۆڵینەوە لە هەر یەکێك لە هونەرو شێوازی هونەری بێگانەکان لە هونەری ئێرانی ئەو سەردەمەدا بدۆزرێتەوە.
دیارە کلدو ئاشوور گەورەترین کاریگەرییان لەسەر هونەری سەردەمی هەخامەنیشیەکاندا هەبووە، دروستکردنی هەیوانو پلەکانەی دەستکرد کە لە دوو لاوە لە بەرد دروستکرابوونو تاشرابوون، بە چاولێکەری لە کۆشكو تەلارەکانی کلدو ئاشووری دروستکرابوون، لەلایەکەوە ریزبەندی کردن بەو چەشنە کە لە کنەو پشکنین (تەپەی سیلکیشدا) هەیەو دەسنیشانکراوە.
لە دۆڵی (دیجلە)و (فوراتدا)، وەکو کلدە لە کردنەوەی خانووبەرەدا بە زۆری خشتیان بەکارهێنراوەو لە تەختی جەمشیدا تەختی زەویو خانووەکانو چوارچێوەی دەرگاکان، هەروەها کۆڵەکەو پایەکان لە بەرد تاشرابوون، بەڵام دیوارەکان بە خشت کرابوونەوە، لەم رووەوە لە ئێستادا هیچ نیشانەیەکیان یان نموونەیەکیان نەماونەتەوە[(١٠٤)].
هونەری تەلارسازی هەخامەنشییەکان، هەر وەکو تەلارسازی یۆنانی لە هەمناهەنگی یەکسانییەکی تایبەتیو بەهرەمەند بوو. پاشاکانی هەخامەنشی بە مەبەستی تەواوی نەخشەکانو بەرنامە گەورەکانی تەلارسازیو خانووبەرە کە لە راستیدا بە نیشانەی دەسەڵاتو زاڵبوونی گەورەپەتیان دەژمێردرێت.
لە تەواوی قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆری پانوبەرینی خۆیاندا، هونەرمەندانو پیشەوەرانی ئازمودەیان بۆ کارەکانی خۆیان هەڵدەبژاردو بە دویان دەگەڕان، لەم میناندا بەردتاشە باڵادەستەکانی یۆنانی لەوانی دیکە زیاترو باشتر بوونو رۆڵی گرنگیان گێڕاوە[(١٠٥)].
.. لە هەندێ شوێنی بناغەی خانووەکاندا کە بە خڕە بەردکرابوونەوە، وەکو هەموو دیوارێکی دیکە گەچو جاڕویان بەکار نەهێنابوو، بۆ قوڵفو بەستنی بەردی دیوارەکان، هەر وەکو چۆن لە خانووبەرەی یۆنانییەکاندا بابوو سوودیان لە پارچەو تەبەقی فلزیش وەردەگرتو دەکرانەوە[(١٠٦)].
ئەستوونەکان کە کەرەستیەکی گرنگی خانووبەرەی سەردەمی هەخامەنشی پێکدەهێنن بە هۆی سەرە ئەتوونەکانیانەوە کە بە وێنەی سەروسیمای زیندەوەرانی سروشتیو ئەفسانەیی پێکهاتوون جگە لەمە لە بەشی خوارەوەدا چوارگۆشەی بەردینیان بەکارهێناوە[(١٠٧)].
بە سەرنجدان لەوە کە هونەری هەخامەنشییان کاردانەوەی ئوسوڵی رامیارییانەو چۆنیەتی رەوشتی ئەشرافەکانیانەو وا بەستەی توێژ کاربەدەستانو گەورە پیاوانی کۆمەڵگەکەیان بوو، لەبەر ئەمە هونەرێکی ئاوەها لە هەموو روویەکەوە ناتوانێت گوزارشت لە ئازادی بکاتو لەمانەوەی ژیاندا لە چواچێوەیەکی تایبەتی تێناپەڕێت لەگەڵ ئەوەشدا لە لایەکەوە لە داهێنانی هونەری ئەو سەردەمە، هونەرمەندان گەلێك بیروڕای داهێنانیو وڵاتانو ناوچە جیاجیاکانیان لە ئەستۆگرتو شوێنیان کەوتن، بەڵام بە وابەستەبوون بە فەرمانی پاشاکانو نەبوونی ئازادی کار، لە کاری هونەردا شێوەو سەبکێکی تایبەتیان لە داهێناندا بەکاردەهێنا کە دەتوانین لە سەبکی دەرباریان ناوبەرین[(١٠٨)].

مامۆستا عەبدولرەقیب یوسف لەساڵی (١٩٩١)دا ئاتەشگەیەکی دۆزیەوە لەبناری کێوەکانی بازیان لەنێوان سلێمانیو کەرکوك، کەئەمەش بەڵگەیەکی گرنگە بۆ ئەوەی گوایە ئاتەشگەیەکی زۆر هەبووە لەناوچەکانی کەرکوکدا بەڵام تاکو ئێستاکە پشکنین نەکراوە دەربارەی دۆزینەوەی ئەم ناوچانە بۆ ئەوەی شێوەی بیناکاری تەواوی ئەم ئاتەشگەیانە بدۆزینەوە تا ڕاستی بۆچوونەکان بەدەربکەوێت[(١٠٩)].
بەهۆی کارتێکردنی ئایینی زەردەشتی ((زەردەشتەکان خانووی دانیشتنیان لەچەند لاوە هەواکێشی بووە (پەنجەرە) بۆ ئەوەی هەمیشە هەوای تێدا نەمێنێتەوەو پاك بێت[(١١٠)] کە کارتێکردنی ئەمە تائێستاش لەناوچەکانی کەرکوك ماوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتە لەبەکارهێنانی لە هونەری بیناکاریدا، کە لە خانووی لادێکانی دەورووبەری کەرکوك رەچاوی دەکەن.
لە کتێبی ئەسکەندەر نامە دا بەم جۆرە باسی کەرکوك دەکات کە دەکاتە سەردەمی ئەخمینییەکان لە ماوەی نێوان ساڵانی (٣٣٥–٣٣٠)ی پێش زایینی:–



دۆزینەوەی ئاتەشگەیەکی زەردەشتی لە بناری بازیان

((خاوەنی کەرکوك هاوپەیمان دەبێت لەگەڵ دارای سێیەم (داریۆسی سێیەم)، لەکاتی هاتنی هێزی ئەسکەندەر بەرەو وڵاتی فارس، پاشای فارسەکان (دارا) هەست دەکات بەترسی ئەو هێرشەی ئەسکەندەر بۆیە داوای یارمەتیو یەکێتی دەکات لە خاوەن فەرمانڕەوایی کەرکوك بۆ ئەوەی بەهانایەوە بێت، داوای لێکرد کە ڕێکەوتنێکی لەگەڵدا ببەستێت، بەڵام خاوەن فەرمانڕەوایی کەرکوك وەڵامی دایەوە لەکۆبوونەوەکە کە گوایە تەنها پەیوەندی نێوانیان برادەرایەتییەو ئەوەی کە گرنگە لای تەنها پاراستنی ئاسایشی میللەتەکەیەتیو لەو شوێنەدا کۆبوونەوەکەی بەجێ هێشت بەڵام لەم کارەدا دارا زۆر تووڕە بوو، هەستا بە هێنانی هێزێکی زۆر لەدوای چەند ڕۆژێك. کەلەو باوەڕەدا بوو دەتوانێت لە ماوەیەکی کەمدا بتوانێت قایمگەکانی بڕوخێنێتو داگیری بکات.

خاوەن فەرمانڕەوایی کەرکوك هەستا بەپێشوازی پاشای ئەخمینییەکان (دارای سێیەم) لەدووری دوو فەرسەخ لەقەڵای کەرکووکەوە، هەردوو سوپاکە وەکو یەك نەبوون کە سوپاکەی (دارا) سێ ئەوەندەی سوپاکەی کەرکوك دەبوو، شەڕ دەستی پێ کرد لەماوەی چەند دەقەیەکدا سوپاکەی (دارا) لێك هەڵوەشایەوەو (دارا) یەخسیر کرا لەلایەن فەرماندەی کەرکوکەوە، هەر لەو کاتەدا دارا ڕێکەوتنێکی کرد لەگەڵیدا، کەبریتی بوو لەوەی خاوەن فەرمانڕەوایی کەرکوك هەقی ئەوەی هەیە لەگەڵ کێدا ڕێکەوتن ببەستێت بێ ئەوەی پاشای فارسەکان هەقی هەبێت بەسەریەوە.

ئەم ئەمیرە خۆی دایە پاڵ ئەسکەندەرو شەڕی کرد شان بەشان لەگەڵیدا دژی (دارا)، لە کاتی شکانی سوپای (دارا) دا ئەم فەرمانڕەوایە داوای کرد لە (ئەسکەندەر کە میوان بێت لەقەڵاکەی، ئەسکەندەریش داواکەی قبوڵ کردو شەوێك خەوت لەو قەڵا مێژووییەدا).

لە کتێبی تری فارسیدا باس دەکات:-

((کاتێك ئەسکەندەری گەورە هاتۆتە قەڵای کەرکوك هەموو ئەو ڕێگایانەی کە دەڕوانێتە سەر قەڵاو ئەو ڕێگایانەی کە بەستراوەتەوە بەشارەوە، نەوتو زەیتی تێدا ڕشێنراوەو ئاگری تێ بەرداوە بۆ ئەوەی دیمەنێکی ترسناك دروست بکات، کە گوایا باڵای گڕی ئاگرەکە تا جەرگەی ئاسمان ڕۆیشتووە.

لە کۆتاییدا دەڵێت کەئەسکەندەر ئەم دیمەنەی لا جوان بووەو هەستاوە بەخۆڕێبەری ئەم ناوچەیە لەلایەن ئەم فەرمانڕەوایەوە، سەربەخۆییەی بمێنێت تا لەژیاندایە[111].

لێرەدا خاڵێکی گرنگ هەیە ئەویش ئەوەیە کە ناوچەی کەرکوك شوێنێکی دیاری ستراتیژی سەربازی هەبووە بۆیە لەلایەن ئەخمینییەکانەوە بایەخی تایبەتی پێ دراوەو هەوڵدراوە کەهەردەم بکرێتە بنکەیەکی گرنگی ئیمپراتۆریەتەکەو هێشتنەوەی لەژێر دەسەڵاتی ئەخمینییەکان.

سەرچاوەکان ئەوە دەسەلمێنن کە قەڵا هەبووەو قایمگەیەکی تایبەتی هەبووە بۆ بەرگری کردن لەهێرشی دەرەکی دووژمنو هەوڵ داوە، ئەم شوێنەی خۆی بپارێزێتو هەردەم بەرەو چاکتر سازی بکات کەئەمەش بەڕوونی بەدەردەکەوێت لەشەڕەکەی نێوان (دارا)و (ئەسکەندەری گەورە)دا.

ئەوەی کەسەرنجمان ئەدات لەسەردەمی ئەخمینییەکاندا گەلێك شوێنی ئاوەدان هەبووە سەر بەشارستانی ئەوان بووە هەر لە (قەڵای کەرکوك)و (ئاوگری حەمرین)و (چینی ژێرەوەی قەڵای شێروانە)و (دوبز)و (داقوق)و (خورماتوو)و

(مادهۆز – ماحوز)و (چینی یەکەمی کوڕوخانی)و (حەویجە) و (چینی دووەمو سێیەمی مزگەوتی داقوق)، کە لەکاتی خۆیدا دێینە سەر ئەم باسە.

((گردی ماحوز کە بە ئارامی مانای (شار) دەگەیەنێت، لە ساڵی (١٩٣٧)دا بەڕێوەبەری ئاسەواری گشتی عێراقی پشکنینێکی کورتی کرد دەربارەی ئەم گردە، کەتوانرا کەناڵێکی ئاودێری و چەند بوتڵی شووشەیی و دەفری خەزەفی کەدەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پرسی و ساسانییەکان،.. ئەوە ئەم ناوە شێوەی خۆی پاراستووە لەناوی شاری ئارامییەکان لە کۆندا بەناوی (ماحوزە)[١١٢]. کە لەوانەیە بنەڕەتی ناوەکە (مادهۆز) بوو بێت، کە بنەڕەتی وشەکە بۆ سەردەمی فەرمانڕەوایی میدییەکان بگەڕێتەوە، بەڵام ئارامییەکان گۆڕانیان لە بێژەت کردنی کردبێت.

گڵکارییەکانی ئەم سەردەمە پێك هاتووە لە دەفری قووڵ و گڵاسی جوان و ناسك کەوەکو توێکڵی هێلکە وایە وەڕەنگی ئەرخەوانی و سەوزی مەیلەو زەرد و هەروەها دەمی دەفرییەکان و قاپەکان ئەستوورە، بەناوبانگە بە (حزوزی) بازنەیی لەسەرە، هەروەها دۆزینەوەی مۆری لوولەکی پێك هاتووە، لەگوڵ و گەڵا و هێڵ، وەکو هێڵی کەدەست پێ دەکات لەبازنەیەکی ناوەندییەوە لەشێوەی خۆر.

دۆزینەوەی جەڕەی لەش (تەشی) بچووك و مل بچووك، لەسەرەتای دەسکەکەیەوە گیرەیەکی هەیە کەکۆتاییان دێت لەخوارەوە لەسەر شێوەی سەری ئاژەڵان، کۆتایی (بنکەی) جەڕەکە دێت بەپایەکی تیژ (مدبب)، قوڕەکەی سوور یان کاییە، بۆیەیەکی تەنکی پێوەیە کە تێکەڵاوە بەشووشەیی ڕەنگ سەوز کەنموونەی ئەمانە لەگردی (ماحوز) لەلای (حەویجە) هەیە[١١٣].

((لەنیوەی یەکەمی سەدەی چوارەمی پێش زایینیدا، بووە سەرهەڵدانی سەرکردەیەکی گەورەی جیهانی ئەویش (ئەسکەندەری مەکەدۆنی) یە، کە هۆی هاتنی بووە کۆتایی بەشێکی گرنگی مێژووی وڵاتانی کۆن و سەرەتایەکی تازەی دروست کرد بۆ پێکەوە لکانی ڕۆژهەڵات بەڕۆژئاواوە، کە هەموو ئەمانە لەماوەیەکی کەمدا ڕوویدا.

((دوای ئەوەی کە ئەسکەندەری مەکەدۆنی توانی ناوچەکانی ئەغریقییەکان وەربگرێتەوە لە ئاسیای بچووك لە فارسەکان لەساڵی (٣٣٤)ی پێش زایینیدا، ڕوویکردە ڕۆژهەڵات بۆ دەست گرتن بەسەر پاشماوەکانی ئیمپراتۆریەتی فارسەکاندا. دەستی گرت بەسەر سوریا و عێراقدا ساڵی (٣٣١)ی پێش زایین، توانی دەست بگرێت بەسەر دوا پاشای فارسەکان کە دارای سێیەم بوو لە شەڕی (ئاسووس) لەساڵی (٣٣٣) ی پێش زایین و شەڕی ئەربیلا لەساڵی (٣٣٠)ی پێش زایین، هێزەکەی فراوان بووە هەتا (هند)و بابلی کردە پایتەختی دەوڵەتە تازەکەی.

دوای ئەوەی ئەسکەندەری مەکەدۆنی بووە جێگرەوەی ئیمپراتۆریەتی فارسەکان، دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی هیلینی ئەغریقی لەڕۆژهەڵاتدا. ئەمە ڕێگای دا بە بڵاو کردنەوەی شارستانی و ڕۆشنبیری هیلینی لەڕێگای توانەوەی روحی هیلینی و ڕوحی ڕۆژهەڵاتی لەبۆتەیەکی یەکگرتوودا ئەمەش لەڕێگای دروست کردنی شاری تازە لەسەر تەرزی هیلینی لەسەر فورات و میسرو لەسەر ڕۆخی (سەند)و نیشتەجێ کردنی ئەغریقییە مەکەدۆنییەکان تێدا. هەروەکو لە پێشەوە باسمان کرد کە سەری لەقەڵای کەرکوك داوەو شەوێکی لەو قەڵایەدا بەسەر بردووەو ڕێنمایی خۆی بۆ فەرمانڕەوایی قەڵا ڕاگەیاندووە.

لە ساڵی (٣٢٣)ی پێش زایینیدا ئەسکەندەر لە (سوسە) کۆچی دوایی کرد، لەدوای خۆی بەریەرەکانی دروست بوو لەسەر دابەش کردنی ئیمپراتۆریەتە هیلنیستیە ڕۆژهەڵاتییەکەی، کەلەدواییدا کرا بەسێ بەشەوە. هەستان بەبڵاو کردنەوەی هیلنستی لەڕۆژهەڵاتدا بەڵام بەشێوەیەکی ترو بەڕێگەیەکی تردا[١١٤].

لەدوای ئەسکەندەر (سلۆقس) بوو بەگەورەی ئیمپراتۆریەی هیلنستی لەڕۆژهەڵاتی گەورەداو ئاقارەکەی درێژ بووەوە وەکو ئەوەی سەردەمی ئەسکەندەر هەر لە هیندەوە هەتا دەریای سپی ناوەڕاست[١١٥].

پاش ئەوەی هەموو ناوچەکانی بەهێزی چەك خستە ژێر دەسەڵاتییەوە، هەستا بەجێ بەجێ کردنی خەونەکەی بەگرێدانی ڕۆژهەڵات بە ڕۆژئاواوە، بڕیاری پایتەختێکی تازەی دا لەسەر (دیجلە) بەناوی سلۆقیە)).

سلۆقییەکان هەستان بەجێ بەجێ کردنی پڕۆیەکی تازە ئەویش دروست کردنی ئاقاری جۆر بەجۆری هێلنیستی لەناو جەرگەی ئیمپراتۆریەتە ڕۆژهەڵاتییەکەیان، ناوچەو ئاقارەکانی تر سەر بەو بوونە. نەخشەکەیان بریتی بووە لەپێکەوە بەستنی وڵاتی سوریا بەسەرووی میزۆپۆتامیا (نێوان دوو ڕووبار) بەیەك ئاقاری یەکگرتوو وەکو ئەوەی مقدۆنیایەکی تر، بۆیە شاری تازەی جۆربەجۆریان بنیات نا[١١٦] زۆربەی شارەکانی هیلنستی لەسەر ڕێگا بازرگانییە گرنگەکان دروست کرا بۆ بەستنەوەی ئاسیای ناوەڕاست بەمیزۆپۆتامیا، گەشەی کرد لەسەر بنەڕەتی ئەوەی بایەخیان بەئالوگۆڕی کەلوپەل دەدا[١١٧].

سلۆقییەکان بایەخێکی زۆریان دەدا بەپلەی یەکەم بە (سوریا)و (عێراق). هەوڵی پاراستنی سامانەکەیان دەدا بەهۆی دروست کردنی نیشینگەو شاری نیشتەجێ بۆ سەربازەکانیان لەناوچەی ستراتیژی گرنگ، ئەم ناوچانە جیاوازی هەبوو لەگەڵ یەکتری لەڕووی پێوانەو پێگەکانیەوە، گرنگی سەرەکییان پاراستنی دەسەڵات و پارێزگاری دەوڵەتی سلۆقییەکان بوو، کە لەهەمان کاتدا بنکەی ئەغریقییەکان بوو بۆ کارتێکردنی شارستانی هیلینیستیانە بەسەر ناوچەکەدا[١١٨].

ئەم شارو ئاقارانە دروست کرابوو لەسەر نەخشەی شاری ئەغریقییەکان.. کەتایبەت بوو بەشەقامی ڕاست، یەکتریان بڕیبوو لەگەڵ یەکتریدا بەهۆی گۆشەیەکی وەستاو[١١٩].

نەخشەی شارەکان کەباو بووە لەو ماوەیەدا بریتی بووە لەنەخشەیەکی نیو بازنەیی[١٢٠].

ماوەی حوکمڕانی سلۆقییەکان ئەگەر بەراورد بکەین لەگەڵ ماوەی ئەخمینییەکاندا دەبینین تاڕادەیەك هێمنی تێدا بەدی دەکرێت[١٢١].

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت لە هونەری بیناکاری سەردەمی سلۆقس ئەوەیە تووشی گۆڕین و ڕاست کردنەوە بوو لەبەرچەند هۆیەك کە پەیوەندی هەبوو بە ئاو وهەواو جۆری ئەو مادەیەی کەلەهونەری بیناکاری و نەخش و نیگاردا بەکار هاتووە، تا بۆئەوەی بگونجێت لەگەڵ داب و نەریتی ناوچەکەدا. چونکە بیناکارەکان هەوڵیان دەدا بەپێی ئەو بیناکارییەی کەباو بووە لەگەڵ تێکەڵ کردنی بیناکاری هیلنیستیدا.

بۆ نمونە سلۆقییەکان بەردی سروشتیان لە ناوچەکانی خۆیان بەکار دەهێنا لەهونەری بیناکاریدا، بەڵام کاتێك لەعێراقدا تووشی نەبوونی بەرد بوون لەهونەری بیناکاریدا هەستان بەبەکارهێنانی خشتی سوورەوەکراو یان خشتی کاڵ بەڵام لەسەرشێوەی بیناکاری خۆیان، کەئەمە لەهونەری نەخش و نیگاریشدا ڕەنگی داوەتەوە.

هەوڵی ڕێك و پێکی شارانیان دەدا. دروست کردنی شوورە بەدەوریدا. بەکارهێنانی بورجی چاودێری بۆ سەربازەکانیان لەدەوری شارەکاندا، هەوڵی کردنەوەی بازاڕێکی ناوەندییان دەدا لەڕووی بازرگانی و ئابوورییەوە.

خانووی دانیشتوان لەو سەردەمەدا پێك هاتبوو لە حەوشەیەکی بەربڵاو یان دوو حەوشەی لاکێشەیی بەربڵاو، دروست کردنی شارەکان لەسەر شێوەی یەکەیەکی چوار گۆشەیی (وحدة مربعة) ڕێکو پێکدا کەبەشەقام یەکەیەکی چوارگۆشەی لەوی تر جیاکردۆتەوە، هەندێك جار یەکەیەکی چوارگۆشەیی قەبارە هەشت ماڵ دەگرێتە خۆی، خانوەکانیان دەڕوانێتە سەر تارمە یا بنمیچێکی کەدەڕوانێتە سەر دووکۆڵەکە لە بەرامبەریدا، لەهەندێك خانووەکاندا گەرماو نووساوە بەژوورەکانەوە کە ئاوەڕۆی گۆزەیی (فخاری) بۆ دروست کراوە، زەوی ئاوەڕۆکە، قیر ڕێژ کراوە یان فەرشی بۆ کراوە بەخشتی سوورەوە کراو لەگەڵ قوڕی گیراوە، بەشێوەیەکی گشتی قەبرستانەکان جیا کراوەتەوە بەشوورە، هەرچەندە لەهەندێك شوێندا لەماڵان نێژراوە[١٢٢].

دەتوانین بەپێی سەرچاوەکانی مێژوو، قەڵای کەرکوك بگەڕێنینەوە بۆ سەردەمی سلۆقییەکان، بۆیە هەوڵیان داوە بەدروست کردنی قەڵایەکی ڕێك و پێك.، سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە سلۆقس بایەخی بەئاوەدان کردنەوەی داوە.

((ئەگەر سەرنج بدەین کە بناغەکەی پێك هاتووە لە چینێکی قوڕی گیراوە، تێکەڵاو بەبەردو تاشە بەردی گەورە.. گەورە، بەقووڵی یەك مەتر لەبناغەی قەڵاکەوە، کەهێزی توانای قەڵاکە، هەرتەنێك بۆ یەك مەتری چوارگۆشەیە))[١٢٣].

((سلۆقس هەستا بەئاوەدان کردنەوەو پاککردنەوەو جوانکردنی شارەکە! هەستا بەڕووخاندنی خانووبەرە کۆنەکانی و شوورە کۆنەکەی ڕووخاندو وای لێ کرد کەئەو پاشماوەیەی بەرز کردەوە لەشێوەی گردێك، هەستا بەدروست کردنی قەڵا لەسەری و شوورەیەکی بەردی گەورەی بەدەوریدا دروست کرد، پتەوی کرد بە (٦٥) بورجی چاودێری، هەستا بەدروست کردنی دوو دەرگا بۆیی کەیەکێکیان لەسەر ڕووی ڕۆژهەڵاتە، ئەوی تریان لەخوارووی ڕۆژئاوایە، یەکەمیان قایم کرابوو بە بورج لەم لاو ئەو لای باڵی دەرگاکەیەوە کە سلۆقس پەیکەرێکی سروشتی خۆی لەسەری دانا بوو بەقەبارەی سروشتی. کەناوی ئەم دەرگایە، دەرگای پاشا بوو، دەرگای دووەم ناوی دەرگای تۆتی (طوطی) بوو کەبەناوی فەرمانڕەوای ئەو کاتەوە بوو، سلۆقس بڕیاری دا بەفراوان کردنی شارەکە لەدەوری شوورەکە (قەڵا)، بڕیاری دروست کردنی کۆشك و خانوو بەرەی دا، شەقامی ڕێك و پێکی کردەوەو بازاڕی تازەی کردەوە.

دوای ئەوەی کاروباری شارەکەی ڕێکوپێك کردو کارە بەڕێوەبەرییەکانی سازدا هەستا بە بەخشینی دانیشتوان لەباج کۆکردنەوەی سەرانەیان و وای کرد کە کەرکوك ببێتە ئاقارێکی سەر بەدەوڵەتەکەی، کردیە جێگەیەکی هاوینە هەوار بۆ خۆی و پاشماوەی ئەو فەرمانڕەوایی سلۆقییانەی کەلەوەو دواوە هاتن. سلۆقیەکان هەستان بەهێنانی هۆزێکی زۆر بۆ نیشتەجێ کردنی لەدەوروبەری قەڵا بۆ ئاوەدان کردنەوە[١٢٤].

* پەیکەری خوداوەند ئەفرۆدێت:

یەکێك لەو پەیکەرانەی (تماثیل) کە دۆزراوەتەوە دەگەڕێتەوە سەردەمی (هیلینستی–سلۆقی)، پەیکەری خوداوەند (ئەفرۆدێت)ە کەلەناوچەی (تەق.. تەق)ی پارێزگای کەرکوك بەدەست کەوتووە[١٢٥].

پەیکەری (ئەفرۆدێت)ی کەرکوك پێك هاتووە لەپارچەیەك ڕەخامی سپی، کە بچووك ترە لەقەبارەی سروشتی کەلەشانییەوە هەتا لای ڕانی درێژی (٤٧,٥) سانتیمەترە کەسەرەکەی نەماوە، دەستی لای ڕاستی هەتا لای شانی، بەڵام دەستی لای چەپی بەتەواوەتی بزرە لەژێر قۆڵیەوە، ئەفرۆدێت بەدیار کەوتووە بەڕووتی کەقورسایی لەشی خستۆتە سەرقاچی ڕاستی، بەڵام قاچی چەپی هەندێك هاتۆتە پێش، بەهۆی جوڵەی قۆڵی چەپییەوە، بەدەردەکەوێت کەهەندێك نووشتاوەتەوە بۆ پێشەوە، لەگەڵ ئارەزووی بەرەو لای چەپ کەئەمە لەنەخشەی شانییەوە بەدەردەکەوێت، وادەگەیەنێت دەستی ڕاستی درێژ بۆتەوە بۆ خوارەوە لەدرێژەوە بووی دەستی چەپییەوە دیار دەدات، ئەگەری ئەوە دەکەین کەشێوەی شانی ڕاستی، لەگەڵ پاشماوەی دەستی، ئەوە بەدەردەخات کەبەشێوەیەکی سروشتی داڕێژراوە، لەگەڵ بەراوردی لەگەڵ کۆتەڵەکانی تری دۆزراوەی خوداوەند (ئەفرۆدێت)[١٢٦].

ئەگەر ئەم کۆتەڵەی (کەرکوك) بەراورد بکەین لەگەڵ کۆتەڵەکانی تری ئەفرۆدێت دەبینین جیاوازی هەیە لەنێوانیاندا، بەتایبەتی لەگەڵ کۆتەڵی ئەفرۆدێتی (حضر) دا. یان (فاتیکان) یان (کابیتۆل) یان (مدیجی).

((هەندێك لە مێژوونووسەکانی ئەغریقی دەربارەی ئەم خوداوەندە دەڵێن کەخوداوەندی خۆشەویستی ئەغریقی و جوانی و پیتییە[١٢٧])).

((دەتوانین کە مێژووی ئەم کۆتەڵە بگەڕێنینەوە بەپێی دروست کردنەکەی بۆ ماوەی هێلینسی دواوە، لەژێر



**پەیکەری خوداوەند ئەفریدۆت**

کارتێکردنی جۆری ئەفرۆدێتی (مدیجی)[١٢٨].
لە کۆتاییدا دەگەینە ئەوەی کە گوایا پەرستنی ئەم خوداوەندە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سلۆقی و پرسی، کەلەناوچەکەدا باو بووە، هۆی ڕێزی ئەم پەرستنە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هەڵگری ئەو سیفاتانەیە کەلەماوەی مێژووی کۆنی ڕۆژهەڵاتی کۆندا بەناوبانگ بووە، بۆ نمونە پەرستنی خوداوەند عەشتار کەخوداوەندی خۆشەویستی و شەڕە لەداستانی بابلیدا، کەپەرستنی ئەفرۆدێت هەمان بەردەوامی عەشتارە[١٢٩].

*** دۆزینەوەی چرادانێکی سەردەمی هیلینستی:**

توانرا لەناوچەی قەزای حەویجە لەدێی (مەحروسە) ئەم چرادانە بدۆزرێتەوە لەماوەی هیلینستی لەسنووری (٣٢٢-٢٢٦)ی پێش زایینی.

ئەم چرادانە بریتییە لەبرۆنز، کەبەرزییەکەی (٧) سانتیمەترەو درێژییەکەی (١١,٧) سانتیمەترە، بەرزی لەشەکەی لەگەڵ دەمەکەی (٩) سانتیمەترە، ڕازاوەو جوانە، دروستکردنی لاشەکەی شێوە هێلکەییە، دەمەکەی بازنەییەو قەباغێکی بازنەیی هەیە، کەچەسپ کراوە بە لێوارەکەیەوە بەهۆی جومگەییەوەیەکی بچکۆلە کە لەهەردوو لاوە کون کراوە بۆ چەسپ کردنی بزمار تێیدا، ڕووی قەباغی دەمەکەی ڕازاوەتەوە بەڕوویەکی مرۆیی لەشێوەی دەمامك کەسەری داپۆشیوە بەپارچەیەك یان دوو تۆپەڵە موو (پەلك)ی ئەستوور کە چەسپ کراوە لەبەشی سەرەوەی لەشی مرۆڤەکە، کەگۆشەیەکیان دروست کردووە بۆ خوارەوە لەسەروەی (تەوێڵ).
ئەم چرادانە دەسکێکی هەیە لەسەر شێوەی دووتەڵی دڕ کە چەماونەتەوە لەسەرەوەو چەسپ کراون لەشێوەی

حەلەزۆنی، کە لەکۆتاییاندا سەرێکی مرۆڤی هەیە لەشێوەی ئافرەت کەهەندێ قژی بەسەرەوەیە، ڕووەکەی دیار نییە بەتەواوەتی.
دەمی شوێنی فتیلەکەی دووبارە خڕە، دیارە لەسەر لەشەکەی وەلەناوەڕاستییەوە کونێکی تێدا هەیە کە چۆتە ناوی لاشەی چرادانەکەوە، لەوانەیە ئەم شوێنە بۆ ئەوەیە کە چرادانەکەی پێ هەڵواسرێت، یان چەسپ بکرێت لەشوێنێك، بەلام ئەمە لەشوێنەکەی نەماوەو بەجێهێلراوە[١٣٠].
سەردەمی فەرمانڕەوایی سلۆقییەکان نمونەی گۆزەکاری ئەغریقییەکانە لەڕۆژهەلاتی دەریای ناوەڕاست، ڕەنگی قووڕەکەی کەبەکار هاتووە کاییەو بۆیە کراوە لەدەرەوە بەسوور، بەلام بەپێی جۆری سووتانەکە زۆری و کەمی ڕەنگەکەی دەگۆڕێت.
جەڕەکانی ئەم سەردەمە گەورەو سێ گیرەکی هەیە، لەشەکەی نەخش کراوە بەسێ گۆشەو بازنەو درەخت و گەلای دارخورما.
((لەبنەڕەتدا پرسییەکان دەگەڕێنەوە سەر هۆزەکانی (هیندو ئەوروپی)یەکان شەڕ لەبەینی سلۆقی و پرسییەکان بەردەوام بوو بۆچەند ساڵێك. کەلەدواییدا پرسییەکان توانیان بەسەر سلۆقییەکاندا زاڵ بن و بتوانن عێراق داگیر بکەن لەسنووری ساڵی (١٤١)ی پێش زایینی، بەلام نەیانتوانی فەرمانڕەوایی عێراق بکەن تاسەردەمی (ئەرتەبانی دووەم) (١٢٨-١٢٤)ی پێش زایینی. کەفەرمانڕەوایی پرسییەکان تاساڵی (٢٢٧)ی زایینی خایاند[١٣١]. کە (بیت گەرمای) یان کەرکوك یەکێك بووە لەئاقاری فەرمانڕەواییان[١٣٢].
لەسەردەمی ئەواندا بەتایبەتی ناوچەکانی سەرووی عێراق بوژاندنەوەو نیشتەجێ بوون دەستی پێ کرد لەچەند شارێکی کۆنیدا، وەکو (نوزی)، (یۆرغان تەپە-وێران شار)و (کاکن)و (ترکەلان)و (تەپە کوڕا)[١٣٣]. پرسییەکان بایەخێکی زۆریان داوە بەبازرگانی و هەوڵدان بۆ فراوان کردنی بزوتنەوەی بیناکاری.
خانووی پرسییەکان بەناوبانگە بەفراوانی (بەرینی) دیوارەکانی هەروەها قەبارەی ئەو نەخشەی کەبەکار دەهێنرا، بەکارهێنانی گەورەیی شارەکان لەسەر شێوەی (ئەغریقی)، بەکارهێنانی کۆڵەکە لەدروست کردنی خانووداو کردنەوەی بازاڕی (ئاغورات) لەسەر شێوەی بازاڕی یۆنانی، بەکارهێنانی بەرد لەجیاتی خشت و خشتی سوورەوەکراودا، هەروەها هەیوانی کراوە لەدوای خانووەو گۆڕەپانی دەورەدراو بەکۆڵەکە (برستایل)[١٣٤].
پرسییەکان هەوڵی ئاوەدان کردنەوەی پەرستگاکانی پێش خۆیان داوە، کەئەمەش جۆرە ڕێگەدانە بۆ ئایینەکانی ترو نەرمی نواندن تێیدا[١٣٥]. هەوڵی فێرکردنی هونەری بیناکاری ئەغریقی و ڕۆمانی بدەن و لەگەڵ ئەو مادەو کەرەستانەی کەلەعێراقدا باو بووە بیگونجێنن[١٣٦].
پێوانەی خشتی کاڵی بەکار هاتوو بەدرێژی (٣٠-٤٢) سم و ئەستووری لەنێوان (١٠-١٣) سم، خۆڵی پاك و بەرد بەکارهاتووە، خشتی سوورەوەکراو لەسەر شێوەی ئاسۆیی و شاقوڵی، هەوڵی ئەوەیان داوە کە هونەر بەکاربهێنن لەدانانی خشتەکەدا بۆ دروست کردنی نەخش و نیگاری خانووەکان، لەناوچەکانی کوردستاندا زیاتر بەرد بەکارهاتووە لەبەر زۆری لەناوچەکەدا[١٣٧].
خانووە ئایینییەکانی ئەم سەردەمەی هەمووی بەیەك شێوە دروست نەکراوە، هەندێکیان لەسەر شێوەی (بابلی) کۆن و هەندێکی دی لەسەرەتاوە هەیوانی بۆ دروست کراوە لەگەڵ هەلگرتنی بیناکاری (هیلینستی)دا وەکو پەرستگای (ئاشوور)، چونکە پرسییەکان ڕێگەیان دابوو، هەموو کەسێك بەو شێوەیەی باوەڕی پێی بووە پەرستگا دروست بکات و بیپەرستێت[١٣٨].
بەکار هێنانی هەیوان لەدوو لاوە یان لەیەك لاوە لەدروست کردنی خانووی دانیشتوان باو بووەو بەکار هاتووە بۆ پێشوازی کردنی میوان[١٣٩].

*** هونەری تەلارسازی ساسانییەکان:**

ساسانییەکان فەرمانڕەوایی عێراقیان کردووە دوای ئەو ماوەیەی کەتوانیان زاڵ بن بەسەر پرسییەکاندا لەسەردەمی (ئەردەشیر) کە توانی دەسەلاتیان لە دەست دەربکات و حوکمی عێراق بکەن تا بلاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام لە عێراقدا[١٤٠]. کەرکوکیش یەکێك بووە لەو شارانەی کەکەوتۆتە ژێر دەسەلاتی ساسانییەکان.
ساسانییەکان لە هونەری بیناکاریدا بایەخێکی زۆریان دەدا بەکەوانەو قوبەو تاق کەلەکاتی خۆیدا لە هونەری بیناکاری ڕۆمانی و پرسییەکاندا بەدەرکەوت کەساسانییەکان بەزۆری بەکاریان هێناوە[١٤١].
بیناکاری ساسانی (معمار)، خشتی سوورەوەکراو و گەچیان وەکو ڕەگەزێکی بنەڕەتی بەکار دەهێنا لە هونەری بیناسازیدا[١٤٢].
ساسانییەکان بالا دەستییەکی گەورەیان هەبوو لە وێنەگرتندا لەژێر کارتێکردنی ڕۆمانەکاندا بوون، ئەمەش لەشێوازی نیشاندان و وێنەی بابەتەکانیاندا بەدەردەکەوێت کەلەڕاڕەوی گەرماوەکانیاندا کێشا بوویان، ئەم شێوازەیان لەهۆڵ و کۆشکەکانیشدا بەکار هێناوە[١٤٣]. کۆشکەکانیان دەڕازاندەوە بەدیمەنی ڕاوی ئاژەڵ و ڕووداوە گرنگە مێژووییەکان[١٤٤].
یەکێك لەکارە گرنگەکانیان ئەویش هەلکۆڵینی نەخش و نیگارە لەسەر گەچ، کە موسوڵمانەکانیش زۆریان لەمان وەرگرتووە لەشێوازیدا[١٤٥].
ساسانییەکان شێوەیەکی نوێی نەخش و نیگاریان بەکار دەهێنا، ئەویش بەدروست کردنی جۆری ئەو نەخش و نیگارانە لەپارچەپارچەی گڵ و چەوی ڕەنگاوڕەنگ کە هەڵدەستان بەداپۆشینی زەوی کۆشکەکان و گەرماوەکان و ڕێك و پێك ئەو نەخش و نیگارانەیان ساز دەدا[١٤٦].
هونەرمەندی ساسانی هەڵدەستان بەجوانکاری ڕازاندنەوەی دەفری و کاری ملوانکەو کەرەستەی جوانکردن و سیرامیك، کەرەستەی کانزایی و چەك و قاڵ[١٤٧].
هونەرێکی بیناکاری کە لەو سەردەمە باو بوو شێوەی (ئەزەج) بوو، کە بریتی بووە لەخانوویەکی بچووك و

بازنەیی و کەوانەیی بووە[١٤٨].

ئەگەر سەیری پاشماوەکانی هونەری بیناکاری بکەین لەکەرکوکدا دەبینین نمونەی لەناوچەکانی (گردی ماحوز) و (گردی قەڵای شیروانە) و (باوە شاسوار) و (چینی دووەمی کورپوخانی) و (قەڵای کەرکوك) و (گردەکانی حەمرین) و (ناوچەکانی شوان) و (ئاغجەلەر)، بەڵام بەداخەوە تاکو ئێستا لێکۆڵینەوە نەکراوە بۆ دۆزینەوەی ئەم ناوچانە.

*** تەلارسازی ساسانییان:**

"بە پێچەوانەی دەوڵەتەکانی (ملوك الطوائف-شاتیرەیی) پارتییەکان و ساسانییەکان توانییان هێزێکی ناوەندی و بە دەسەڵات دابمەزرێنن و بەم هۆیەوە دەوڵەتی ئەشرافگەرایی توندرەو کۆنتڕۆڵ بکەن، بە بەرنامەیەکی رێکخراو بەڕێوەبردنی کاروبارو کاری ئاودێری و شارسازی و تەلارسازی و پیشەسازی وولات لە ئاستێکی بێ هاوتادا، سەرنجی جیهانی شارستانیەتی خۆرئاوای بۆ لای خۆی راکێشا بوو. بە تێکشکانی ئیمپراتۆرەکانی رۆم، رامیاری خۆیان لە خۆرهەڵات و خۆرئاوادا پیادە کرد.

شوێنەوارو پاشماوەی کەلاوە گەورەکانی شارەکانی ئەو رۆژگارەو پانوبەرینی و فراوانبوونی نەخشی بەرجەستە، لەسەر سینگی چیاکان و بەردە تاشراوە زۆرو زەبەندەکان کە لەوانەوە بە جێماون و ماونەتەوە نیشاندەرێکی فراوانی رووداوی ناو شارەکان و سەر رێگاکانی. بە تایبەتی شەقام و پردەکانی هەمە جۆرەو دروستکردنی پەیوەندیکردن بە وڵاتانی دراوسێی دوور نزیك و دەسەڵاتخوازییەکانیان نیشانەی گەورەیەتییانە.

هەموو ئەمانە ئەوە نیشان دەدەن کە فەرهەنگ و هونەری ساسانیان پاشکۆیەکی هونەری هەخامەنیشییەکان و پارتییەکانە[١٤٩].

ئاگرگا یان ئاتەشگە، شوێنی چاودێریکردنی ئاگرد شوێنی مەراسیمی ئایینی گشتی و دنیاییش بووە، لە پێش ساسانیاندا لە سەردەمی هەخامەنشییان ئاگر لە شوێنێکی ئاواڵە و ئازاددا لەسەر سەکۆیەکی بڵند دەکرایەوە، لە دوای رێکخستن و نووسینەوەی یاساکانی ئایینی زەردەشت، لە سەدەمی چوارەمی زاینیدا پێشکەوتن و گەشەسەندنی ئایینی ناوبراو بە پێی یاساکانی ئەم ئایینە کە بڕیاری دابوو نابێت تیشکی خۆر لە ئاگر بدات. لە سەردەمی ساسانیاندا لە ژێر کەپرێکدا دەکرایەوە، ئەو کەپرەیان بە شێوەی ژوورێکی چوار دەرگا دارەڕا دەکرد، وەکو باوبوو دەرگاکانیان بە پێی هەر چوار لایەنەکەی باکوورو باشوورو خۆرهەڵات و خۆرئاوادا دەکرایەوە، لە کاتی نوێژو ستایشی ئاگردا پەیڕەوانی ئایینی زەردەشت دەیانتوانی زیارەتی بکەن و بە بێ ئەوەش لە ئاگرەکە نزیك ببنەوە، بەم شوێنەیان دەوت چوارتاق، شێوەی ئاتەشگەکان بە پێی ئەو زانیارییانە لە سەردەمی مادەکانەوە بە ئێمە گەیشتووە تاکو سەردەمی ساسانیان کەمێك گۆڕانی بە سەردا هاتووە، بەڵام بە گشتی ئاتەشگەکانیان بە شێوەی چوارتاقی سادەبوون، یان گەورەترو گرنگتر بوون کە داڵانێکیان بۆ زیارەتەکەران لە چوار دەوری چوارتاقەکە دروست دەکرد.

ئەو ژوورانەی کە لە سەردەنی ساسانیاندا گەلێك باویان هەبوو، ژوورە کەوانییەکان بوون، پایەکانی کەمێك لە دواترەوە دادەنرا تاکو زیاتر بمێنێتەوە، ژووری ئاتەشگە گومەزی هەبوو کە لەسەر چوار پایەی چوارگۆشە دروستکرابوو، ناوەڕاستی ئاتەشگەکە کوشتاگە بوو کە لە کاتی جەژنەکاندا ئاگری پیرۆزیان لە ئاگردانی ناوچەکەوە بۆ ئاتەشگەکە دەگواستەوە، ژووری ناوەندی ئاگردانێك و داڵانێکی گەورە بوو کە بە تەواوی بە خشت دروستکرابوو[١٥٠].

لە دوای کۆتایی هاتنی سەردەمی پارتییەکان سەبکێکی نوێی بەردتاشینی ساسانیان هاتە کایەوە، تێدەکۆشان تاکو هونەری بەردتاشین و بەرجەستکردنی نەخشە شکۆمەندەکانی خۆیان لەسەر رووی تاشە بەردەکان بەرجەستە بکەن[١٥١].

گەلێك شوێنەواری گەچ کراو دۆزراونەتەوە لەو سەردەمانەدا بریتین لە نەخشی بەرجەستەی دارمێو لەگەڵ وێنەی پەلەوەران و زیندەورانی جۆراوجۆر، ئەم نەخش و نیگارانە دیاوری باڵەخانەکانیان رازاندوەتەوە و بە شێوەیەکی قەشەنگ و هونەری ئەنجامی دراون[١٥٢].

(کلۆدیۆس ریچ) بەم جۆرە باسی ئاسەوارەکانی سەردەمی ساسانییەکانی ناوچەی کفری دەکات:-

لە (٢٦)ی نیسان چوومە سەرچەمی کفری شەوێ باران باریبو بەڕۆژ بناغەیەکی دیواری نزمی کۆنی دەرخستبووە دەرەوە، لەسەر دیوارەکە چەند پارچە مەرمەڕێکم بینی دیوارەکەی پێ ڕازابوەوە، دەستم کردە هەڵکۆڵینی دیوارەکە بینیمان لەسەر دیوارەکان وێنەی گوڵ نیگار کێشراوە بە ڕەنگێکی سووری بریقەدار، ڕەنگی خەتە سەرەکییەکان ڕەش بوو، شوێنەواری پێنج شەش ژوورمان بینی هەندێکیان لای دەستە چەپەوە کۆڵەکەی بۆ کرابوو. بەدیوی ڕۆژهەڵاتدا گردێکی بەرزمان بینی کرێکارەکانی ئەو ناوە چەند پارچە گۆزەی سوورەوەکراویان بۆ هێناین کەبەڕەنگی ڕەش بۆیە کرابوون لەوانە ئەچوون کە لە (بابل) و (سلۆقیە) دۆزرابوونەوە، ئەو پارچە خشتانەی بەرچاوم کەوتن بۆی دەرخستم کەئەو شوێنەوارانە هی سەردەمی ساسانییەکانن. لەسەر لوتکەی ئەم گردە بەرزە شوێنەواری چەند بینایەك هەیە زۆربەی ئەم جۆرە بینا کۆنانە ژێرخانی چوارگۆشەییان هەیە وەك ئەوانەی (قەسر شیرین و حەوشی کەرەك). (درێژایی ڕووبەری ئەم کەلاوەو شوێنەوارانە نزیکەی میلێك و پانییەکەشی چارەکە میلێکە، چەند شوێنێکمان لێ هەڵکۆڵی شتی ئەوتۆمان تیا دەست نەکەوت، بەدەستە چەپی ئاو ڕێژی چەمەکەی کفری شوێنەواری دیوارێك هەیە کە لەوێوە ئەپەڕێتەوە بەرەو کفری، لەناو ئاوڕێژەکەشدا چەند پارچە دروستکراوێکی گەورە کەوتوون، وادیارە ئەمە لەوەختی خۆیدا بینایەکی دروستکراو بووە، تەوژمی لافاوی ئەم ڕووبارە ڕووخاندویەتی.

دانیشتوانی ناوچەکە ئەڵێن ئەم پارچە گەورانە پاشماوەی ئاوبەستێکی گەورە بووە بەڵام بەبۆچوونی من شوێنەواری شوورەی شارەکەیە دوور نییە ئەم کۆتکە بەردانە لەدێریندا

بەر ئاوەکەی پێ گیراوە بۆ ئەوەی ئەو ئاوە بۆ کشتوکاڵ لەدەشتاییەکەدا بەکار بهێنرێت.
دانیشتوانی ناوچەکە ئەم جۆرە شوێنەوارانە بەهی (گاور– کافر) دەزانن، لەڕۆژئاوای باکووری ئاوڕێژەکەدا شوێنەواری هەڵکۆڵین لەسەر بەردێکی گەورە لەبەرچاوە بەوە دەڵێن (ماڵی گاوران)، مستەر (بەل لیی تو) بۆ چاو پێکەوتنێکی هەندێ لەشوێنەواری سەر ئەو گردانە چوو بوو کە بە سواری دە دەقیقەیەك دەبێت لەوێ چاوی بەچەند گۆڕێکی ژوور ئاسایی کەوتبوو، دەرگاکانیان نزم بوون لەناویاندا سێ شوێنی بچووك هەبوو لاشەی مردووی تیادا بوو درێژی هەریەکەیان پێنج پێ دەبوو. بناغەی ئەم گۆڕانە لە بناغەی گۆڕی (ئەخمینی)یەکان دەچوون(١٥٣).
لە (٢٧)ی نیسان:
ئەمڕۆ چووین بۆ بینینی شوێنەوارەکانی (ئەسکی کفری) کەکەوتۆتە باشووری ڕۆژئاوای کفرییەوە. وام ئەزانی شوێنەواری ئەم گردە شاری کفری جاران بووە. لە نزیك (ئەسکی کفری) یەوە گردێکی دەستکردی گەورە هەبوو لە گردەکەی (مجیلیبە) دەچوو دامێنی گردەکە ڕاست هاتبووە خوارەوە باراناو هەڵی دڕیبو لەیەکێ لەو درزە هەڵکەندراوانەدا گومەزییەکی بچووك دەرکەوتبوو کە بەخشتی سوورەوەکراو دروست کرابوو درێژی ئەم گردە لەخوارەوە بۆ ژوور نۆسەدو شەست پێ بوو پانییەکەشی لەڕاستەوە بۆ چەپ لەوە کەمتر بوو بەرزاییەکەشی پەنجاو حەوت پێ بوو، لەتەنیشت کەندڕەکانەوە هەندێکمان لێ هەڵکەند وردە ئێسکی ئادەمیزادو چەند پارچە گلێنەیەکمان لێ دۆزییەوە لەناوەوە هەموو بە بۆیە ڕەش کرابوو، لەسەر چەند پارچە گۆزەیەکدا وێنەی ئاسكو مانگامان لەناو کۆمەڵە بازنەیەکی بچووکدا بەرچاو کەوت. لەڕۆژ هەڵاتی ئەم گردەش گردێکی لەوان گەورەتر هەیە کە (ئاش تۆقان)ە. پاش چارەکە سەعاتێك گەیشتنینە شوێنەواری شوورەیەکی بچووك، ڕەنگە شوورەی شارەکە بووبێت، لەو شوورەیە شوێنەواری سێ سەد یاردەیەکی ماوە بەرزاییەکەی چەند پێیەکە، شوورەکە بەبەردی خڕ دروستکراوە. لەم دواییەدا پارچە گۆزەیەکی ساسانی زۆر نایابم دەست کەوت کەهەندێ نووسینی لەسەر بوو(١٥٤).
ئەگەر سەیری قەڵای کەرکوکیش بکەین یان ئەوانە کەلەمەودوا کە دەدۆزرێتەوە، لەوانەیە ناوچەیەکی گرنگی ساسانییەکان بوو بێت، بەتایبەتی لەهونەری بیناکاری کۆڵەکەو هەیوانو ئەزەچو بەکارهێنانی گەچو خشتی سوورەوەکراو.
دەربارەی شوورەی شاری کفری تا ئێستا شتێکی ئەوتۆمان بەدەست نەکەوتووە دەربارەی درێژیو پانیو شێوەی بیناکاری دروست کردنەکەیو هۆی دروست کردنەکەی. بەڵام گەلێك لە گەڕیدەکان ئاماژەیان بە بوونی کردووە.



شوورەی دەوروبەری شاری کفری لە سەردەمی ساسانیەکان

*** پرۆژەی ئاودێری گاوری کەلار:**

پاشماوەی ئەم هێڵە ئاودێرییە دەکەوێتە لێواری خۆرهەڵاتی رووباری سیروان، لە ناوچەیەك كە بە گوندی (عەلەومحە) یان (بەردە سوور) ناسراوە، درێژی ئەم بەشەی پرۆژەکە لەم ئاستەدا (١٥٥) مەترەو پاشماوەکەی پێکهاتووە لە سێ کەناڵی داخراو، یەکێکیان بچکۆلەیەو دوانیان گەورەن کە لە چینێکی چەوی ئەستوور هەڵکەنراون بە شێوەیەکی داخراو، لە نێوان کەناڵێك‌و کەناڵێکی تردا بۆشاییەك دەبینرێ‌و وادیارە لەو شوێنانەدا بە جۆگەیەکی سەرگیراو کە لە چینی چەوەکەوە دەرهێنراون‌و ئاوەکەیان تێپەڕاندووە. ئەم جۆگانەش لە ئاستی تۆنێڵەکاندا بوون بۆ رۆیشتنی ئاوەکە. ئەم پاشماوەیە پێوەی دیارە تا رادەیەکی چاك سەردەمی پێشکەوتووی چاخی ئاودێری سەردەمی خۆی بووە.:

کەناڵی یەکەم: ئەم کەناڵە لە شێوەی لوولەیەکدایە بە گچکەیی لە چینی چەوەکە دەرهێنراوە درێژییەکەی نۆ مەترەو پانییەکەی (٢,١٥) مەترەو بەرزییەکەی (١,٢٠) مەترە، دەمەکەی لە شێوەی لاکێشەدایە.

کەناڵی دووەم: درێژی ئەم کەناڵە (٢٠) مەترەو رێڕەوی کەناڵەکەش لە بەشی سەرەوەیدا لەسەر دوو باڵ دەرهێنراوە کە لێوانەیەکی بۆ کراوە بە درێژی کەناڵەکە لە هەردوو لاوە پانیەکە (٠,٩٥) مەترو بەرزی کەناڵەکە لە ناوەوە لە نێوان (١,٨٧-١,٩٠) مەترە، دەمی کەناڵەکە شێوەی لاکێشەیی وەرگرتووە.

کەناڵی سێیەم: درێژی ئەم کەناڵە (٣٠) مەترەو لە شێوەی لوولەیەکدایە، پانییەکەی (١,٣٠) مەترەو بەرزییەکەی (٢,١٠) مەترەو هەموو بەڵگەکان بۆ ئەوە دەچن کە سەردەمی ئەو پرۆژە ئاودێریە بۆ رۆژگاری فەرمانڕەوایەتی (کیسرای یەکەم) بگەڕێتەوە کە ناسراوە بە (کیسرا نەوشیروانی) پادشای ساسانی (٥٠١-٥٧٩) کە لە ماوەی نێوان ساڵانی (٥٣١-٥٧٩)ی زایینیی فەرمانڕەوایی دەوڵەتی ساسانی کردووە، ناوبانگی بە دادوەری‌و کاری ئاوەدانی‌و خزمەتگوزاری دەرکردووەو فەرمانی بەهەڵکەندنی رووبارو جۆگەو چاککردنەوەی پردی رووخاو‌و گوندە وێرانکراوەکان لە شەڕدا بە شێوەیەکی چاکتر لە جاران.

پێدەچێت لەوانەیە بۆ دوای (٥٥٠)ی زایینیی بگەڕێتەوە، چونکە بەر لەو مێژووە پادشا لە شەڕو شۆڕی بەردەوامدا بووە لەگەڵ بیزەنتییەکانداو ماوەی ئەو جۆرە کارانەی نەبووە جگە لەوەش خەزینەی وڵاتیش بەر لەو هەرچی هەبووە بۆ شەڕوشۆڕ تەرخانکراوە[١٥٥].



**پرۆژەی ئاودێری گاوری کەلار**



پرۆژەی ئاودێری گاوری کەلار

*** ئایا جوولەکەکانی کەرکوك پەرستگایان هەبووە؟:**

وەکو دەزانین کە جوولەکەکان لەعێراق پاشماوەی ئەو جوولەکانەن کە یەخسیر کراون لەسەردەمی (نەبو خوز نەسەر) داو بەش کردنیان بەسەر ناوچەکانی عێراقدا، کەکەرکوك بەشێکی ئەو پاشماوانەیە، کەماونەتەوەو ژیاون لەشاری کەرکوك بوونەتە پارچەیەکی نەتەوەیی لەو ناوچانەدا.

ئەوەی گرنگە جوولەکەکان و هاتنیان بۆ عێراق هەڵگری بیرو باوەڕو ئایینێکی جیاواز بوون لەبیرو باوەڕی ئایینی ئەو کاتەی کوردستان، بۆیە هێنانیان بۆ عێراق هەڵگری بابەتی ئایینێکی ترو موتوربەکردنی بوو لەگەڵ ئایینەکانی تری عێراقدا، کەوای کرد هەرچەندە لە قاوغێکی تەسك بوو بێت کەجێ پەنجەی لەهونەری بیناکاری لەوەو دوای (نەبوخوز نەسر) بەدەرکەوتبێت.

زۆر لەسەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە گوایە کاتێك نەبوخوزنەسر هاتووە بەدروست کردنی قەڵا جوولەکەکانی بەکار هێناوە لەهونەری بیناکاریێ قەڵای کەرکوکدا بۆ ئیش کردن، چونکە لەو کاتەدا ئەمانە دەست بەسەر بوونەو کاری زۆرە ملێیان پێ کراوە، بەڵام ئەمانە جێ پەنجەی خۆیان بەدەرکەوتووە لەبیناکاری ئەو کاتەی کەرکوکدا. بۆیە شوێنێکی دیاری کراویان بۆ دانراوەو چاودێری کراون، ئەمە ماوەیەکی زۆری ویستووە تا لەو قاوغە دەرچوونە، لەبەرئەوە مانەوەیان لەو ماوە زۆرەدا بمانەوێت و نەمانەوێت هونەری بیناکاری جوولەکەکان هەبووە لەشاری کەرکوکدا چ لەشێوەی پەرستگا یان خانوو بوو بێت، بەڵام سەرچاوەکان کەمن دەربارەی هونەری بیناکاری و نەخش و نیگاری جوولەکەکان هەرچەندە لەم لاو لەو لا چەند تیشکێك هەیە بۆ ئەو ڕاستییە. (لەکاتی پێویست دێینە سەرباسی خانووی جوولەکەکان).

هۆی کەمی سەرچاوەکانی هونەری بیناکاری دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەمانە سەربەستییان نەبووە کە بتوانن جموجوڵی بیناکاری بکەن، ئەوەی کە بەجێ ماوە لێیان کەوتۆتە بەر کاری کاولکاری.

نزرگەی (دانیاڵ پێغەمەر) پاشماوەیەکی جوولەکەکان بووە، بەڵام بەپێی ڕۆژگار دەست گیراوە بەسەر ئەم بیناکارییەو کراوەتە مزگەوت و منارەی بۆ زیاد کراوە، چونکە لە سەرەتاکانی ژیانیان لەوێدا پەرستگایان بووەو خودا پەرستیان کردووەو جێ نزرگەی پیرۆزی جولەکەکان بووە، بەڵام بەپێی سەردەم دەستی پێدا هێنراوەو شێوە بنەڕەتییەکەی لەدەست داوە.

سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ((ئەم مزگەوتە لەسەر پاشماوەی کەوانەکانی خانووە کۆنەکە دروست کراوە، کە لەژوورەوە دوو قەبری گەورەکانیان (حنین)و (عەزرا)ی تێدا نێژراوە)) ئەم بیناکارییە بەناوبانگە بەکەوانەی جوان و گرێ کەلەسەر بنکەیەکی هەشت ڕوویی دروست کراوە)). واباوەڕ هەیە کە ئەم بیناکارییە لەسەر پاشماوەی کڵێسەیەکی کۆن دروست کراوە بەناوی (مار-دانیال کلباسی) جوولەکەکان باوەڕیان وایە کە ئەو سێ لاوە (حنانیا)و (عزریا)و (مشیائیل) هەرسێکیان لەگەڵ پێغەمەر (دانیال) نێژراون، کەئەمانە لەو یەخسیرانە بوون کە (نەبوخوز نەسر) لە ساڵی (٥٨٦)ی پێش زایینی هێناویانی بۆ (بابل)، کەخەڵکی شارەکە باوەڕیان

وایە کە گوایە هەریەکە لەدانیال‌و (حەنین)و (عزیر) لەوێدا نێژراوە))[١٥٦].

لەبەر ئەوە ناتوانین کە دیاری شێوەیەکی بیناکاری پەرستگای تێدا بکەین کە بگەڕێتەوە سەر هونەری بیناکاری جوولەکەکان.

ئەوەی زیاتر هونەری بیناکاریان بەدیار دەکەوێت لە گەڕەکی (موسەڵڵا)و (جوولەکە)کانە، کە دوو گەڕەکی نیشتەجێی جولەکان بوون، بۆیە دەبینین کە خانووەکانیان هونەرێکی بیناکاری تایبەتییان هەبوو جیاواز لەخانووەکانی تری شارەکە.

لەکاتی کۆچ کردنیان بەرەو فەلەستین گەلێك لایەنی بیناکاری‌و نەخش‌و نیگاریان بەجێ هێشت کەکەوتۆتە بەر لاشاوی تالآن کردن کەیەکێك لەو بیناکارییانەیان (تەوراتە) کەیان بوو کە پەرستگای جوولەکەکانی کەرکوك بوو.

*** هونەری بیناکاری کڵێسەو نەخشی ئەیقۆنی لەناوچەی کەرکوکدا:**

بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی‌و دەنگدانەوەی لەدەوڵەتی ساسانییەکان، وای کرد لەگەڵ خۆیدا هونەرێکی بیناکاری دروست کرد ئەویش هونەری بیناکاری کڵێسەو نەخشی ئەیقۆنی بوو.

((دەستووسە ئایینییەکانی مەسیحییەت ئاماژە بۆ بوونی ژمارەیەکی زۆری کڵێسە دەکەن لەشارەکانی ئیمپراتۆریەتی ساسانییەکان. وەکو کڵێسەی (عذراء)و (القدیس سرکیس) لەناوچەی (تکریت) وەهەروەها کڵێسەکانی ناوچەی کەرکوك‌و هەولێر))[١٥٧].

هەر لەسەرەتای پەیدا بوونی ئایینی مەسیحییەوە بەرهەڵستی یەك لەنێوان کڵێسەو موگەکانی ئایینی زەردەشتی لەدەوڵەتی (ساسانی)دا پەیدا بوو بوو.

لەسەرەتادا زۆربەی مەڵبەندی مەسیحیەت لەوڵاتە شاخاوییەکانی کوردا بووە، لەبەرئەمەیە، کەزۆربەی زۆرداری‌و چەوسانەوە کەوتبوە سەر دانیشتوانی **ئەو** وڵاتە (بەتایبەتی ناوچەی فەنەك، بازەبدا، باقەردا، مەیافارەقین، هەولێرو کەرکوك)، ئەو چەوساندنەوەیە لە سەردەمی حوکمڕانی شاهپوری یەکەم‌و ئەردەشیری دووەمدا گەیشتە پلەیەکی بەرز کەهەزاران لەو دانیشتووانە وەکو مەسیح هەڵواسران.))[١٥٨]، بەڵام هەندێك سەرچاوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کەپاشاکانی دواوە تۆزە ڕێگە دانێکیان دا بەمەسیحییەکان، بەڵام لەسنورێکی دیاری کراودا))[١٥٩].

بەم جۆرە سەر لەنوێ دەست کرا بەچاك کردنەوەی کڵێسە ڕووخاوەکان‌و ئازاد کردنی دیلەکان‌و ڕێدان بەقەشەکان لەبەجێ هێنانی کاروباری ئایینیاندا))[١٦٠].

ناوچەی کەرکوك هەر لەسەرەتای بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحیەتدا گەلێك دێرو کڵێسەی تێدا بڵاو بوونەوە کە ئەمە هەندێکیانە:-

١. کڵێسەی (دێر یوسف):

**ئەمە بەناوی یەکێکەوە کە ناوی یوسفە کەلەدەستی (ئەدی)** و (مادی) بۆتە مەسیحی لەکاتی هاتنیان بۆ شارەکە، بۆ ئەم کڵێسەیەی بەناو خۆیەوە دروست کردووە[١٦١].

٢. کڵێسەی (تۆقریتی):

لەسەر دەستی ئەسقەف (یۆحەنا) ئەم کڵێسەیە تازە کراوەتەوە.

٣. کڵێسەی (حاصا):

ئەمە لەنزیك شارەکە لەلای کێلگەیەکەوە دروست کراوە[١٦٢].

٤. کڵێسەی (تۆباوی):

کەدانیشتوانی کەرخە سلوخ کردیانە ئەسقەفی خۆیان‌و بەناوییەوە ئەم کڵێسەیەیان دروست **کرد**[١٦٣].

٥. کڵێسەی (لاشوم):

ئەمەش لەدێی لاشوم لەلای داقوق دروست کراوە کە شوێنێکی گرنگی بڵاو کردنەوەی ئایینی مەسیحی بووە.

٦. کڵێسەی (ماحوزا).

٧. کڵێسەی (خڕبەجەلال)[١٦٤].

٨. کڵێسەی (تۆباوی مارۆن).

٩. کڵێسەی (مەریەم ئانا):

((ئەم کڵێسەیە لەسەر قەڵا دروست کراوە، کە بیناکارییەکەی لەبەردو گەچ دروست کراوە، تاکو ئێستاکە کەوان‌و گومەتی ماوە کەمیحرابەکەی دەڕوانێتە سەر بینایەکی لاکێشەیی کە چەماوەتەوە وەکو پشتی ماسی، وەکو ئەوەی باو بووە لەهونەری بیناکاری کڵێسەکاندا، ئەمە لەکاتی عومەری کوڕی خەتابدا کراوەتە مزگەوت‌و لەسەدەی سیانزەهەمی زایینی تازە کراوەتەوە))[١٦٥].

١٠. کڵێسەی (سوور)–کڵێسەی (تەهماز کرد):

ئەمە کۆنترین پاشماوەی ئایینی مەسیحییە لەعێراقدا. دەگێڕنەوە کە گوایا ئافرەتێك لەکەرخ سلوخ هەبوو ناوی شیرین بووە دوو کوڕی هەبووە، کەکاتێك هەواڵی شەهید کردنی مەسیحیەکان دەبیستێت لەلایەن ساسانییەکانەوە، داوا لەسەرکردەی ساسانییەکان دەکات کە لەگەڵیاندا شەهید بکرێت، ئەویش هەردوو کوڕەکانی لەبەردەمی سەر دەبڕێت، خۆشی دایدەگرێت‌و هەل هەلە لێ دەدات . بۆیە سەرۆکی ساسانییەکان لێی دەپرسێت کەبۆ چی واڕووی خۆشە کە دەبینێت کوڕەکانی شەهید دەکرێت، لەوەڵامدا دەڵێت: ئەوەی ئەمدیوە دیتم، بەڵام کاتێك ئازایەتی ئەم ژنە دەبینێت (تەهماز کرد) پەشیمان دەبێت‌و باوەڕ دەهێنێت بە ئایینی مەسیحی، کاتێك (یەزد جەرد) **ئەمە دەبیسێت** بڕیاری کوشتنی تەهماز کرد دەردەکات.

بەڵام لەدواییدا لەساڵی (٤٧٠)دا بڕیاری **دروست** کردنی کڵێسەیەك دەردەکات لەو شوێنەی کەشەهید کران **هەریەکە** لە (تەهماز کرد)و هاوەڵەکانی.

لەماوەی شەڕی جیهانی یەکەم دا دەوڵەتی عوسمانییەکان کردبوویان بەشوێنی تەقەمەنی هەڵگرتن، لەکاتی کشانەوەیان لەدەستی ئینگلیزەکان هەستان بەتەقاندنەوەی کڵێسەکەو دەوروبەری، بەڵام لەدواییدا وەستا (**ئلیاس** عیسی) لە کاتی مەتران (ئیستیفان جەبری) هەستا بەدروست **کردنەوەی** لەسەر پاشماوەی **کڵێسە** کۆنەکە بەناوی کڵێسەی (**تەهماز کرد**)و **زەوییەکانی دەوروبەری**

کردە گۆڕستانی مەسیحییەکان.
لە ساڵی (١٩٨٣-١٩٨٤)دا (بۆڵس ئیستیفان یوسف) هەستا بەدروست کردنی پەرستگایەکی تازەو لکاندییە بە پەرستگا کۆنەکەوە[١٦٦].

ئەمانەی کەلەسەرەوە باسمان کرد چەند ڕوویەکی کڵێسەکانی کەرکوك بوو لەسەردەمە جیا جیایەکاندا، بەڵام هەوڵدەدەم شێوەی ناوەوەی بیناکاری ئەم کڵێسانەش ڕوون بکەمەوە هەرچەندە کە زانیاریمان کەمە دەربارەی هونەری بیناکارییان و چۆنێتی دروست کردن و شوێنی پەرستنەکەی چۆن بووە.

هونەری بیناکاری کڵێسە هەر بەبەردەوامی شوێنە پیرۆزەکانی لەوەو پێشی خۆیەتی و تەنها گۆڕینێکی کەمی سەردەمەکەی خۆیەتی یان هەر گۆڕینی تێدا ڕووی نەداوە تەنها لەجۆری کاری پەرستنەکەدا نەبێت.

((دەبینین کڵێسەکانی ڕۆژهەڵات جیاوازی هەیە لەگەڵ کڵێسەکانی ڕۆژئاوا))[١٦٧]. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کارتێکردنی پاشماوەی شوێنە پیرۆزەکانی پێش بیناکاری کڵێسە، چونکە ئەو تەرزەی بیناکاری شوێنە پیرۆزەکانی کە لەڕۆژهەڵاتدا هەبوو، جیاواز بوو لەتەرزی بیناکاری شوێنە پیرۆزەکانی ڕۆژئاوا.

((کڵێسەی ڕۆژهەڵاتی بەوە ڕازاوەتەوە کە سیمایەکی تایبەتی هەیە جیای دەکاتەوە لەهونەری بەنایی (ریازە) کڵێسەی ڕۆژئاوایی بیزەنتی و لاتینی کەئەویش پێی دەوترێت (بازلیك)، بوونی چەند دەروازەیەك (دەرگا) لە دوولای درێژی کۆتەڵەکە (هیکل)، کەلەهەردوو دیواری سەروو خوارووی ئەو هۆڵە گەورەیەی کەبەرەو ڕۆژهەڵات دەڕوانێت، کەشێوە لاکێشەییە. وەلەوانەیە زۆر نەڕۆین ئەگەر بڵێین کەتەرزی بیناکاری کڵێسەی ڕۆژهەڵاتی دەقا و دەقی تەرزی کۆمەڵگەی جولەکەیە[١٦٨]. لەهەمان کاتدا پەرستگای جوولەکەکانیش لەژێر کارتێکردنی تەرزی بیناکاری پەرستگاکانی لەوەو پێشی ناوچەکانی میزۆپۆتامیایە. بەڵام ئەمە لەهەموو کاتدا دەقاودەق دەرنەکەوتووە)) بەڵام ئەمە ئەوە بەدەردەخات کە کڵێسەکانی میزۆپۆتامیا لەژێر کارتێکردنی تەرزی بیناکاری بابلی..و ئاشوورییدایە[١٦٩]. یان لە ژێر کارتێکردنی ئەو شارستانییەتیانەی کە لە ناوچەکەدا هەبووە.

بەڵام پرسی و ساسانییەکان هیچ کاتێك هەوڵیان نەداوە کەزمان و ئایینەکەیان بەزۆر بسەپێنن بەسەر ئەو ناوچانەی کەداگیریان کردووە، کەنەتەوەکانی ژێر دەسەڵاتیان لە سەربەستی خوا پەرستی و نەریتی خۆیان ماونەتەوە. بەڕادەیەکی زۆر گەورە، بەڵام بابلی و ئاشوورییەکان زۆر حسابی ووردیان کردووە بۆ ئەم پێودانگەو بەستراونەتەوە بەگەلێك یاساو پیرۆزی ئەو نەریتانەی کەپیرۆز بوونە کە لەپێش هەموویانەوە هونەری بەنایی پەرستگا.

کەرەستەی باوی بیناکاری بریتی بووە لەخشت ئینجا خشتەکەیان سوورەوەکراو بووە یان خشتی کاڵ. بەڵام لەو شوێنانەی کەبەرد هەبووە، سوودیان لێ بینیوە لەدروست کردنیدا[١٧٠].

دروست کردنی گومەت لەسەر کڵێسەکانیشدا باو بووە کەنموونەی ئەمانە دۆزراوەتەوە کەبنکەیەکی چوارگۆشەی هەبووە[١٧١]، بەڵام لەوانەیە لەسەرەتایی هونەری بیناکاری کڵێسەدا ئەم گومەتانە ڕەچاو نەکرابێت بەڵکو لەدواییدا بەکار هێنرابێت و بووبێتە باو.

* هونەری ئەیقۆنات:

((ئەیقۆنۆگرافیا یان هونەری وێنەی ئەیقۆنی جیهانی مەسیحی، بریتییە لە بابەتێکی فراوان کە بووە هۆی فراوان بوونی باوەڕی مەسیحی، بەتایبەتی لە ڕۆژهەڵاتدا، بنەڕەتەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ڕەگی سەرەتاکانی مەسیحییەت. ئەگەر وادابنێین کە ئیقۆنۆگرافیا هونەرێکی تایبەتییە بەجیهانی مەسیحییەوەو پەیوەستی ڕوحی هەیە بە تێگەیشتنی مەسیحی بۆ دیتنی کاروبارو وێنەکێشانی.

هەر لەسەرەتای مەسیحییەوە، بۆچوونێك هەبوو بۆ تێگەیشتنی جوانکاری مەسیحی، کەئەمەیش ڕەنگی داوەتەوە لەمەسیح و مەریەم و شەهیدەکان و (قەدیس)و پێغەمەرەکان، لەهەڵگری ئەو چاکەو خێرانەی کە هەڵیان گرتووە لەگەڵ خۆیاندا. دەربڕینی ئەم سیفەتانە لەچوار چێوەی هێڵ و ڕەنگ و کەرەستەکانی وێنەکێشاندا. چونکە وایان کردووە کە ڕوحێکی تایبەتمەندی بدرێتێ بەوەی کە لە چوارچێوەیەکی مەییوو سارد نەبێت، تا بۆنەوەی ڕۆحێکی گەرمی باوەڕی ئایینی تێدا دروست بکات.

وێنەکێشی ئەیقۆنی گەلێك کەرەستەی تایبەتی بەکار هێناوە لە سێبەرو دووری و ڕۆشنایی بەرامبەر پێوانەی لەشی مرۆڤەکەو ڕەمزی ڕەنگی ڕێکخستنی ئەندازەیی و هێڵەکانی، هەموو ئەمانە دەکات تا بۆ ئەوەی لە چوارچێوەیەکی تەسك دەریبکات و بیخاتە سەر ڕوانینێکی ئەبەدی بێ کۆتایی لەبەرجەستە کردنی ڕوحی مەسیحیدا))[١٧٢].

بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە ئەم وێنانە لە نێوان دوو لایەندا بوو کەهەندێکیان بەرگریان لێ دەکرد و هەندێکی تر دژی ئەم وێنانە بوون، بۆیە هەردەم پیاوە ئایینییەکان بەرگریان لەم وێنانە دەکرد و بەبەشێکی شیاوی کڵێسەکانیان دادەنا، بەڵام، ئەوانەی دژی بوون بریتی بوون لە پیاوە گەورەکانی دەوڵەت و سوپا کە دەیانووت بەکارهێنانی ئەم وێنانەو کێشانی وێنەی مەسیح مانای دابڕانێتی لەلاهوتێتی مەسیح[١٧٣].

لەسەرەتاکانی ئیسلامیشدا کەوتنە بەرگری کردن و فەوتاندنی ئەم وێنانەو هەوڵی لەناودانیان دەدا، کە گوایا وێنە کێشانی مرۆڤ حەرامەو قورئان ڕێگەی نادات هەرچەندە کەشتێکی ڕوونی وانییە پا دابگرێت لەسەر ئەم کارە، بەڵام بۆ چوونەکەیان لەوەوە سەری هەڵدەدا کەببێتە هۆی پەرستنی ئەم وێنانەو فەوتاندنی بنەڕەتی ئایینەکە هەر لەبەر ئەم بەربەرەکانییەی کەڕوویدا دژی ئەم وێنانە دەبینین شتێکی ئەوتۆمان بۆ نەمایەوە لەهونەری ئەیقۆنات لەکڵێسەکانی ناوچەی کەرکوك، ئەویش پاش بڵاوبوونەوەی ئیسلام و داگیر کردنی کەرکوك لەلایەن سوپای ئیسلامەوە، هەستان بەڕووخاندنی هەموو ئەو وێنانەو نەخش و نیگارانەی کەشێوەی مرۆڤی بەرجەستە کردبوو.

تەنانەت گەلێك جار لەگەڵ ئەم دەست درێژییەدا هونەرێکی گەورەی بیناکاری لەناو دەبرا یان بەتەواوەتی دەشێوێنرا.

*** هونەری بیناکاری ئاتەشگەکان:**

(ئاتەشگە) شوێنی پەرستنی زەردەشتییەکان بووەو موغەکان تەراتیلی ئایینییان تێدا کردووە، پەرستنەکانی ئایینی زەردەشتیان جێبەجێ کردووە. هەرلەبەر ئەمە شوێنێکی پیرۆزی خەڵك بووەو بەچاوی ڕێزەوە سەیر کراوە، بایەخی تایبەتی پێ دراوەو هەوڵی بیناکارییەکی باڵای بۆ جێبەجێ کراوە.

هەر چەندە دەسنووس‌و لێکۆڵینەوەکانمان کەمە دەربارەی بیناکاری ئاتەشگە لەناوچەی کەرکوك بەڵام بەڵگەی زمانەوانی‌و ئاسەواری هەیە کە ئەوە دەسەلمێنێت کەئەم ناوچەیە خاوەنی بیناکاری ئاتەشگە بووە، هەرچەندە کە پشکنینەکان تا ئێستا وەکو پێویست نەکراوە بۆ پاڵپشتی ئەم ڕاو بۆچوونانە.

ئەگەر بەراووردی شوێنی بابەگوڕگوڕ بکەین لەگەڵ بنەڕەتی وشەی بابە گوڕ.. گوڕ دەبینین لێکچوونێکی زمانەوانی هەیە لەنێوان ناوەکەو بنەڕەتی وشەکە لە کتێبی پیرۆزی زەردەشتییەکاندا، کەناوی (گر.. گر) بە مانای دروست کەری هەموو شتە، (گراگرگر) بەمانای دروست کەری دروست کەرانەوە، بەمانای دروست کەری ئەوانەی کەشت دروست دەکەن[١٧٤].

بۆیە لەسەردەمی پێش زەردەشتییەکاندا ئەم ئاگرە بڵێسەی کردووە، کاتێك باوەڕی ئایینی زەردەشتی سەری هەڵداوە سووتانی ئەم ئاگرە سروشتییە کراوە بە ڕەمزی باوەڕی ئایینەکەیان‌و ڕێگای تێ دەچێت کە ئاتەشگەیان بەدەوردا دروست کردبێت‌و بوبێتە شوێنی زیارەت کردنی‌و جێ نزرگەی پیرۆزی ئایینییەکەیان. چونکە ئەگەر وابێت بۆ چوونەکان وا دەرناچێت کە دەڵێن کە (گر..گر) لەزۆری گڕی ئاگرەکەوە هاتووە بەڵکو لەجۆری خواوەندەکەوە هاتووە کەمانای دروست کەری گەیاندووە هەربۆیە دوای ماوەیەکی تر کراوە بەبابە گوڕ. گوڕ کەمانای پیاو چاك یان گەورەی دروست کەر دەگەیەنێت، کەپاشماوەی ئەم بابەتە لە پاشماوەی ئایینی کاکەیی دا زۆر بە ڕوونی بەدەردەکەوێت بۆ بەکارهێنانی.

ئەوەی کە تائێستا ڕوون نییە ئەوەیە کەهیچ پشکنینێکی ئاسەواری نەکراوە بۆ دۆزینەوەی ئەو پاشماوەیە، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە کاتێك ئیسلام هاتووە زۆر بەتووندی کەوتۆتە کاولکاری ئەم شوێنانەو لەگەڵ زەوییەکەدا خاپوور کراوە.

زەردەشتییەکان جۆرەها تەرزی بیناکارییان لەئاتەشگەدا داهێنا کەلەوەو پێش لەپەرستگاکانی ناوچەکانی عێراقدا نەبوو وەکو، دووکەڵکێش‌و دەروازەی هەواو بورج‌و ئاگردان‌و شوێنی ئێشگری ئاگردان‌و سەکۆی دانیشتن‌و دەروازەی دەرەوەی پەرستگاو شوورەی پەرستگا. چونکە سەرچاوەکان ئاماژە بۆئەوە دەکەن لەوانەیە ئەو بورجانەی لەسەر پەرستگاکان دۆزراونەتەوە کارتێکردنێکی ساسانی بێت[١٧٥].

ڕاو بۆچوونەکان بەوەدا دەشکێنەوە کە گوایە چینەکانی ژێرەوەی مزگەوتەکەی داقوق یان پەرستگا یان کڵێسە بووە چونکە ڕێی تێ ناچێت کە سێ مزگەوت لەسەریەك دروست کرابێت.

دۆزینەوەی ئاتە شگەیەك لە بناری کێوەکانی بازیانی نێوان سلێمانی و کەرکوك، دەمانگەیەنێتە بوونی تایبەت مەندییەکی جیا لە هونەری بیناکاری شوێنە پیرۆزەکانی پێش ئاتەشگە، کە بە ڕوونی چەند لایەنێکی بەدیار کەوتووە لە وێنەکەدا. هەرچەندە کە بەتەواوەتی ساغ نەبۆتەوە، بەڵام شێوەی دروست کردنەکەی دەتوانین بە هونەری ئاتەشگەی دابنێین.

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

(١) (حضارة العراق)، نووسینی کۆمەڵێك مێژوونووس، لاپەڕە (٩٧).
(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٩٨).
(٣) (مێژووی نەتەوەی کورد)، ساڵح قەفتان، لاپەڕە (٦٨).
(٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦٧).
(٥) ((الفن في العراق القديم))، ئەنتوان مورتگات، وەرگێڕانی د. عیسا سەلمان، سەلیم تاها تکریتی، چاپخانەی (الادیب البغدادي)، بەغدا ١٩٧٥، لاپەڕە (١٩٠-١٩١).
(٦) (میدیا)، ئی م دیاکۆف، وەرگێڕانی بورهان قانع ساڵی ١٩٧٨ چاپی یەکەم، لاپەڕە (١٦٥).
(٧) گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، لاپەڕە (٤١).
(٨) بڕوانە:
- (میدیا)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٦٥).
- (الفن في العراق القدیم)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٩١).
(٩) گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١٤)، حوزیران، ساڵی (١٩٨٧)، لاپەڕە (٨٩)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (کوردستان لە دوا دوای چاخی سەهۆڵبەندانەکەدا). نووسینی (فوئاد حەمە خورشید)و (مەریەم عەزیز فەتاح).
(١٠) (آثار بلاد الرافدین)، سینتون لوید، وەرگێڕانی د. سامی سەعید ئەلئەحمەدی، وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن، (دار الرشید للنشر)، ١٩٨٠، لاپەڕە (١٧٣).
(١١) (الفن في العراق القدیم)، هەمان سەرچاوەی پێشوو.
هەروەها بڕوانە:
گۆڤاری (کەرکوك) ژمارە (١)، ساڵی هەشتەم، ٢٠٠٧، لاپەڕە (٥٣-١٠٦).
(١٢) (المرشد الی مواطن الاثار والحضارة- الرحلة الرابعة، بغداد-کرکوك-السلمانیة)، تاها باقر، فوئاد سەفەر، بەغدا، ١٩٦٥، لاپەڕە ١٠.
هەروەها بڕوانە:
(کرکوك وهویتها العمرانیة)، سوبحی سەعاتچی، (مؤسسة وقف کرکوك)، کەرکوك، ٢٠١٠، لاپەڕە ٢٣.
(١٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو.
هەروەها بڕوانە:
(الفن في العراق القدیم، سومر وبابل وآشور)، د. سەروەت عوکاشە، (المؤسسة العامة للدراسات والنشر)، بەیروت، چاپخانەی (فینیقیا)، لاپەڕە ٤٠٩.
(١٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤١٠).
(١٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤١٧).
(١٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو.
(١٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦٠٥ - ٦٠٦).
(١٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤١٠- ٤١١).
(١٩) (الفن في العراق القدیم)، ئەنتوان مورتگات، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣١٨).
(٢٠) (حضارة العراق)، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (١٥٧).
(٢١) (حضارة العراق)، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (١٥٦).
(٢٢) (حضارة العراق)، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (١٥٧).
(٢٣) (حضارة العراق)، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (١٥٧).
(٢٤) (حضارة العراق)، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٢٠٨-٢٠٩).
(٢٥) (حضارة العراق)، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٢٧٧-٢٧٨).
(٢٦) (آثار بلاد الرافدین)، لاپەڕە (٢٠٧).
(٢٧) (الفن في العراق القدیم)، ئەنتوان مورتگات، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٢٠).
(٢٨) بەداخەوە نەمتوانی ناوی کتێب و نووسەرەکەی بدۆزمەوە لەبەر ئەوەی بەشێکی زۆری لێ دڕاوە.
(٢٩) (الفن في العراق القدیم)، ئەنتوان مورتگات، لاپەڕە (٣٣٥).
(٣٠) گۆڤاری (سومر)، بەشی یەکەم، جلدی چوارەم، کانون دووەم ١٩٤٨، لێکۆڵینەوەیەك لەسەر:
(الفخار)، د. فەرج بەسمچی، لاپەڕە (٢٩).
(٣١) (آثار بلاد الرافدین)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٠٨).
(٣٢) گۆڤاری (سومر)، هەمان سەرچاوەی پێشوو.
هەروەها بڕوانە:
(آثار بلاد الرافدین)، هەمان سەرچاوەی پێشوو.
(٣٣) گۆڤاری (سومر)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٩-٣٤).
(٣٤) (متحف راوتنشتراوخ بوست لمدینة کولونیا کنوز فن العراق من العصور القدیمة حتی الاسلام معرض في متحف)، ٢٧ حوزەیران هەتا ٢٠ ئەیلول ١٩٦٤، لاپەڕەکانی (٣٤-٧٣).
(٣٥) گۆڤاری (سومر)، بەشی یەکەم و دووەم، ساڵی ١٩٧٠ گۆڤاری (السادس والعشرون)، لاپەڕە (٥٢).
(٣٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٥٣-٥٤).
(٣٧) گۆڤاری (سومر)، بەشی یەکەم و دووەم، ساڵی ١٩٧٠ گۆڤاری (السادس والعشرون)، ساڵی ، ١٩٧٠ ل(٥٢).
(٣٨) گۆڤاری (سومر)، بەشی یەکەم جلدی سی و سێیەم، ساڵی ١٩٧٧.
(٣٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی (٣٨-٤٢).
(٤٠) بڕوانە ئەم سەرچاوانە:-
- (حضارة العراق)، بەرگی سێیەم، نووسینی کۆمەڵێك مامۆستا لاپەڕە (٢١٢-٢١٤).
- (المدینة والحیاة المدنیة)، بەشی یەکەم، کۆمەڵێك لە مامۆستایانی مێژوو، بەغدا، ١٩٨٨، لاپەڕە (٢١٤-٢١٧).
- (تاریخ فن العمارة العراقیة في مختلف العصور)، شەریف یوسف، ١٩٨٢، لاپەڕە (٨٤-٨٥).
(٤١) (المدینة والحیاة المدنیة)، بەشی یەکەم، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٣٠-١٣١).
(٤٢) (حضارة العراق)، بەشی سێیەم، لاپەڕە (١٠٦-١٠٨).
(٤٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٦٠-١٦١).
(٤٤) گۆڤاری (سومر)، ژمارە چوار، جلدی ٢٩.
هەروەها بڕوانە:

گۆڤاری (سومر) ژمارە ١٢ / ٣٨، لاپەڕە (٩٠).
(٤٥) (آثار بلاد الرافدين)، سیتون لوید، وەرگێڕانی د. سامی سەعید ئەلئەحمەد، لە بڵاوکراوەکانی (دار الرشيد للنشر)، ١٩٨٠، لاپەڕە (٢٠٦).
(٤٦) گۆڤاری (سومر)، ژمارە چوار، جلدی ٢٩.
هەروەها بڕوانە:
گۆڤاری (سومر)، ژمارە ١٢، جلدی ٣٨، لاپەڕە (٩٠)
(٤٧) گۆڤاری (سومر)، بەشی یەکەم، جلدی سی‌و سێیەم، ساڵی ١٩٧٧، لاپەڕە (٣٢).
(٤٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٣).
(٤٩) گۆڤاری (سومر)، بەشی یەکەم‌و دووەم، ساڵی ١٩٧٠، جلدی بیست‌و شەشەیەم، لاپەڕە (٦٥).
(٥٠) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٦٧)
(٥١) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٦٧-٦٨)
(٥٢) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٦٨-٦٩)
(٥٣) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٧١)
(٥٤) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٧١-٧٢)
(٥٥) گۆڤاری (سومر)، بەشی یەکەم، جلدی سی‌و سێیەم، لاپەڕە (٤١).
(٥٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٥-٤٦).
(٥٧) گۆڤاری (سومر)، بەشی یەکەم‌و دووەم، جلدی بیست‌و شەشەیەم، ١٩٧٠، لاپەڕە (٥٢).
(٥٨) (الكاشيون)، د. مەحمود ئەمین، (١٥٣٠-١١٦٠) ق. م ، لە گۆڤاری (كلية الآداب) وەرگیراوە، ج٦، ١٩٦٣، چاپخانەی (العاني)، بەغدا، لاپەڕە (٧).
(٥٩) گۆڤاری (شمس كردستان)، ژمارە ٣، ساڵی دووەم، ئادار، ١٩٧٣، لاپەڕە (١٩)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:
(من شعوب زاگروس القدماء - الكاشيون)، نووسینی (زبير البابلي).
(٦٠) (الكاشيون)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٧).
(٦١) (بانگەوازێك بۆ ڕووناکبیرانی کورد)، عەبدولڕەقیب یوسف، لاپەڕە (٨٤).
(٦٢) (الفن في العراق القديم، سومر، بابل، آشور)، د. سەروەت عوکاشە، چاپخانەی (فنقيا)، بەیروت، لاپەڕە (٣٧١).
(٦٣) (تأريخ فن العمارة العراقية في مختلف العصور)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٠٤-١٠٥).
(٦٤) گۆڤاری (شمس كردستان)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٢)
(٦٥) (الكاشيون)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٣).
(٦٦) (بانگەوازێك بۆ ڕووناکبیرانی کورد)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٨٤).
(٦٧) (الكاشيون ١٥٣٠-١١٦٠ ق. م.)، دکتۆر مەحمود ئەمین، چاپخانەی (العاني)، بەغدا، ١٩٦٣، لاپەڕە ٢٤.
(٦٨) گۆڤاری (الآخاء)، ژمارە ١٠ شوبات، ١٩٨٣، ساڵی ٢٢، لاپەڕە (٢٤).
(٦٩) گۆڤاری (الفيصل)، ژمارە ١٣٤، مارس، نیسان، ساڵی دوانزەهەیەم، لاپەڕە (١٤).
(٧٠) (العراق قديماً وحديثاً)، عەبدولڕەزاق ئەلحەسەنی، چاپی حەوتەم، لە بڵاوکراوەکانی (دار اليقضة العربية)، بەغدا، ١٩٨٢، لاپەڕە (٢١٧).
هەروەها بڕوانە:
(گەشتێك لە کوردستاندا)، عەلائوددین سوجادی، ساڵی ١٩٥٦، چاپخانەی (معارف)، بەغدا، لاپەڕە (٧٦).
(٧١) (الأســواق الشعبية في مدينة كركوك، دراسة انثروبولوجية)، شەفیق ئیبراهیم ساڵح ئەلجبوری، نامەی ماجستێر بەسەرپەرشتی د. خالید فەرج ئەلجابری، حوزەیران، ١٩٩٤ م-١٤١٥هـ)، لاپەڕە (٥-٦).
(٧٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦).
(٧٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٤).
(٧٤) گۆڤاری (الف باء)، ژمارە (٣١٠)، ساڵی حەوتەم (٢١ ی ئاب، ١٩٧٤)، لاپەڕە (٣٠-٣١)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:
(كركوك الآن وبعد ٢٥ سنة).
(٧٥) (قەڵای کەرکوك)، دلێر هیدایەت، بەزمانی ئینگلیزی، نامەی ماجستێرە کە لەزانکۆی بەغدا وەریگرتووە.
(٧٦) (الأسواق الشعبية في مدينة كركوك)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦).
(٧٧) گۆڤاری (بين النهرين)، ژمارە (٩١، ٩٢)، ساڵی (٢٣)، ١٩٩٥، لاپەڕە (١٦١).
(٧٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٦٣).
(٧٩) گۆڤاری (الإخاء)، ژمارە (٥، ٦)، ئەیلول، تشرین یەکەم ساڵی ١٩٧٦، ساڵی شانزەهەیەم، لاپەڕە (٢). لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:
(كركوك وقلعتها التأريخية)، فاخر عەبدولڕەزاق ئەلمەناع.
(٨٠) (ماذا في كركوك)، فەهمی عەرەب ئاغا، فازڵ محەمەد مەلا مستەفا، ساڵی (١٩٥٧)، لاپەڕە (٧).
(٨١) گۆڤاری (الف باء)، ژمارە (١٥٣٤)، ساڵی سێیەم، چوارشەممە، ١٨ شوبات ١٩٩٨، لاپەڕەکانی (٥-٦)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:
(قلعة كركوك المخفي والمعلن من تأريخ المدينة)، عەبدولستار ئەلبەیزانی.
(٨٢) (بلاد مابين النهرين)، ليوا وينهايم، وەرگێڕانی فەیزی عەبدولڕەزاق، ١٩٨١، لە بڵاوکروەکانی (دار الرشيد للنشر)، لاپەڕە (٤٦٠-٤٦٢).
هەروەها بڕوانە:
(العراق القديم)، جۆرج ڕۆ، وەرگێڕانی حوسێن عەلوان حوسێن، ساڵی ١٩٨٤، لاپەڕە (٦٧٠).
(٨٣) (العراق في التأريخ)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٣١).
(٨٤) (العراق القديم)، جۆرج ڕۆ، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٤٩).
(٨٥) لێکۆڵینەوەی زمانەوانی وولاتی کوردەواری، د. جەمال ڕەشید، هەمان سەرچاوەی پێشوو.
(٨٦) (العراق القديم)، لاپەڕە (٣٨٨).
(٨٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٨٩).
(٨٨) (العراق في التأريخ)، لاپەڕە (١٤٧).
هەروەها بڕوانە:

(الفن في العراق القديم)، ئەنتون مورتگات، وەرگێرانی د. عیسا سلێمان، سەلیم تاها ئەلتکریتی، چاپخانەی (الأديب البغدادي)، بەغدا، ١٩٧٥، لاپەرە (٣٦٤-٣٦٥).
(٨٩) (العراق القديم)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٤٥١).
(٩٠) هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٤٣٩).
(٩١) هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٤٤٠).
(٩٢) هەمان سەرچاوە.
(٩٣) (العراق في التأريخ)، لاپەرە (١٦٠).
(٩٤) (الفن في العراق القديم)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٤٢١).
(٩٥) (الأسواق الشعبية في مدينة كركوك)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٦).
(٩٦) (تأريخ فن العمارة العراقية عبر العصور)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٨٩-١٩٠).
(٩٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٩٠).
(٩٨) گۆڤاری (الفيصل)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٤).
(٩٩) (العرق القديم)، لاپەرە (٥٤٩-٥٥٠).
(١٠٠) (فنون الشرق الأوسط والعالم القديم)، نیعمەت ئیسماعیل عەلام، (دار المعارف) لە میسر، ١٩٧٥، لاپەرە (١٨٤).
(١٠١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٨٥).
(١٠٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٨٤).
(١٠٣) (مێژووی مۆسیقای کوردی)، حەمەی حەمە باقی، لاپەرە (٥٧).
هەروەها بڕوانە:
ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ)، ژمارە (٢١٧١-٢١٧٧) لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(دەربارەی نهێنییەکانی پەرستگای زەردەشتی دەربەندی بازیان)، عەبدوڵڵا کەریم مەحمود.
(١٠٤) (دێرینەناسی و هونەر لە سەردەمە مێژووییەکانی دەوڵەتی مادو هەخامەنیشی و ئەشکانی و ساسانی)، عەلی ئەکبەر سەرفراز، بەهمەن فەیرۆزمەندی، وەرگێڕانی: وریا قانیع، لاپەرەکانی (٢٣٨-٢٣٩).
(١٠٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٤٠).
(١٠٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٤٢).
(١٠٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٩٢).
(١٠٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٩٣).
(١٠٩) (زەردەشت)، نووسین و ئامادەکردنی عەبدوڵڵا قەرەداغی (مەلا عەلی)، سوید، ١٩٩٧، چاپی یەکەم، ١٩٩٧، ستۆکهۆڵم، لاپەرە (١٢١).
(١١٠) (ماذا في كركوك)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٨و ٩و ١٠).
(١١١) (المرشد إلى مواطن الآثار والحضارة، الرحلة الرابعة)، تاها باقر، فوئاد سەفەر، ساڵی (١٩٦٦)، لاپەرە (١٣).
(١١٢) (حضارة العراق)، بەرگی سێیەم، لاپەرە (٤٩- ٦٢).
(١١٣) (فنون الشرق الأوسط، من الغزو الأغريقي حتى الفتح الاسلامي)، نیعمەت ئیسماعیل عەلام، (دار المعارف) لە میسر، ١٩٧٥، لاپەرە (١٥، ١٦).
(١١٤) (العراق في التأريخ)، لاپەرە (٢٤٩).
(١١٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٤٩-٢٥٠).
(١١٦) (العراق القديم)، جۆرج ڕۆ، لاپەرە (٥٥٦).
(١١٧) (حضارة العراق)، بەشی سێیەم، لاپەرە (١٨٩).
(١١٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٥٠).
(١١٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٥٣).
(١٢٠) (العراق في التأريخ)، لاپەرە (٢٥٣).
(١٢١) (حضارة العراق)، بەشی سێیەم، لاپەرە (١٩٠-١٩٦).
(١٢٢) (قەڵای کەرکوك)، دلێر هیدایەت، بەزمانی ئینگلیزی.
(١٢٣) (العراق قديماً وحديثاً)، عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢١٨).
(١٢٤) (آفاق عربية)، ژمارە (١، ٢)، ساڵی دەیەم، کانونی یەکەم، ١٩٨٥، لاپەرە (٦٢).
(١٢٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٦٣).
(١٢٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٦٤).
(١٢٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٦٨).
(١٢٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٦٩).
هەروەها بڕوانە:
گۆڤاری (الف باء)، بێ ژمارە، کە لە هەشتاکاندا بڵاوکراوەتەوە، لاپەرە (٥٤- ٥٥)، بەناونیشانی:
(العثور على تمثال نادر لآلهة الحب اليونانية فروديت شمال العراق).
(١٢٩) گۆڤاری (سومر)، بەشی یەکەم و دووەم، جڵدی سی و دووەمین، ١٩٧٦، بەغدا، دار الحرية، لاپەرە (٤٢٨-٤٢٩).
(١٣٠) (تأريخ فن العمارة العراقية في مختلف العصور)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٩٥).
(١٣١) گۆڤاری (الفيصل)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٥).
(١٣٢) (العراق القديم)، جۆرج ڕۆ، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٥٦١).
(١٣٣) (تأريخ فن العمارة العراقية)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٩٦).
(١٣٤) هەمان سەرچاوە، لاپەرە (١٩٨).
(١٣٥) (حضارة العراق)، بەشی سێیەم، ١٩٨.
(١٣٦) هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٢٠٠، ٢٠١).
(١٣٧) هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٢١٥).
(١٣٨) هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٢١٦).
(١٣٩) (العراق في التأريخ)، هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٢٥٩).
(١٤٠) (لمحات عن الفن العراقي)، د. خالید جادر، سلسلة الثقافة الشعبية، مديرية الفنون والثقافة الشعبية، وزارة الأرشاد، چاپخانەی (الرابطة)، بەغدا، لاپەرە (٣٨).
(١٤١) (حضارة العراق)، بەرگی سێیەم، هەمان سەرچاوەی پێشوو.
(١٤٢) (لمحات عن الفن العراقي)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٩).
(١٤٣) (تأريخ الفن العراق القديم، الرسم والنقوش الجدارية

والفخارية والحجرية وعلاقتها بفنون الأطفال)، محەمەد حوسێن جودی، چاپخانەی (نعمان)، نەجەف، بەشی یەكەم، ١٩٧٣، لاپەڕە (٢٣١-٢٣٢).

(١٤٤) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢٣١).

(١٤٥) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢٣١، ٢٣٢).

(١٤٦) (لمحات عن الفن العراقي)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٠).

(١٤٧) (بانگەوازێك بۆ ڕووناكبیرانی كورد)، عەبدولڕەقیب یوسف، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٥٨).

(١٤٨) (شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ، ١٩٢٠)، نووسینی مستەفا نەریمان، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوكردنەوەی كوردی ١٩٨٥، لاپەڕە (٤٠-٤١).

(١٤٩) (دێرینەناسی و هونەر لە سەردەمە مێژووییەكانی دەوڵەتی مادو هەخامەنیشی و ئەشكانی و ساسانی)، عەلی ئەكبەر سەرفراز، بەهمەن فەیرۆزمەندی، وەرگێڕانی: وریا قانیع، لاپەڕە (٥٩٠).

(١٥٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦١١).

(١٥١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦١٨).

(١٥٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦١٩).

(١٥٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٢ - ٤٣).

(١٥٤) بڕوانە ئەم سەرچاوانەی خوارەوە بۆ زانیاری پێویست:-

- گۆڤاری (فیصل)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٧).
- گۆڤاری (الاخاء)، ژمارە (١٠)، ساڵی (٢٢)، شوبات ١٩٨٣، لاپەڕە (٢٧).
- گۆڤاری (ألف باء)، ژمارە (١٥٣٤)، شوبات ١٩٨٨، لاپەڕە (٥)، لێكۆڵینەوەیەكە بەناونیشانی:

(قلعة كركوك المخفي والمعلن من تأريخ المدينة).

(١٥٥) گۆڤاری (هەزار مێرد)، ژمارە ٢٤، ساڵی ٢٠٠٤، لێكۆڵینەوەیەك بە ناونیشانی:

(پرۆژەی ئاودێری گاوری لە كەلار)، حەسەن عەلی سەلیم، كەمال نوری مەعروف.

(١٥٦) (حضارة العراق)، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٢٥٥)

(١٥٧) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢٥٦).

(١٥٨) (لێكۆڵینەوەیەكی زمانەوانی)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٤٩).

(١٥٩) (حضارة العراق)، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٢٥٦)

(١٦٠) (لێكۆڵینەوەیەكی زمانەوانی)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٥٠).

(١٦١) (شهداء المشرق)، الاب البير ابونا، بەشی یەكەم، بەغدا ١٩٨٥، لاپەڕە (٢٦٣).

(١٦٢) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢٦٤).

(١٦٣) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢٦٥).

(١٦٤) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢٦٨).

هەروەها بڕوانە:

گۆڤاری (الفكر المسيحي)، ژمارە ٢١٦، ساڵی بیست و دووەم، حوزەیران، ١٩٨٦.

(١٦٥) گۆڤاری (ألف باء)، ژمارە ١٥٣٤، هەمان ژمارەی پێشوو، لاپەڕە (٥).

(١٦٦) گۆڤاری (الفكر المسيحي)، ژمارە (٢٢٠)، ساڵی بیست و دووەم، كانون یەكەم، ١٩٨٢، لاپەڕە (٤١٢).

(١٦٧) گۆڤاری (بين النهرين)، ژمارە (٥٣، ٥٤)، ساڵی ١٩٨٦، لاپەڕە (٥٢)، لێكۆڵینەوەیەكە بەناونیشانی:

(اصول العمارة الكنسية في العراق).

(١٦٨) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٥٣).

(١٦٩) هەروەها سەرچاوە، لاپەڕە (٥٤).

(١٧٠) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٥٤-٥٥).

(١٧١) گۆڤاری بين النهرين، ژمارە (٨٩-٩٠)، ساڵی ١٩٩٥، لاپەڕە (١٢٦)، لێكۆڵینەوەیەكە بەناونیشانی:

(الايقونوغرافيا السريانية)، نووسینی الاب د. عەبد بەدەوەی.

(١٧٢) (الكنيسة في الأزمنة البربرية)، نووسینی (دانیال روبس) بە زمانی فەرەنسی، ١٩٥٠.

(١٧٣) (زمن لكل الأزمنة، نظرات وآراء في الفن)، نووسینی (بلند حەیدەری)، چاپی یەكەم، المؤسسة العربية للدراسات والنشر ١٩٨١، لاپەڕە (٢٦، ٢٩).

(١٧٤) (زەردەشت)، عەبدوڵڵا قەرەداغی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١١٠).

(١٧٥) گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە (٥)، كانونی دووەم، ١٩٧٦، لاپەڕە (٢٠-٢٥)، لێكۆڵینەوەیەكە بە ناونیشانی:

(الأصول المعمارية للملوية)، د. تاهیر موزەفەر ئەلعەمید، لاپەڕە (٢٠-٢٥).

## بەشی سێیەم

# مێژووی هونەری بیناکاری و نەخش و نیگاری ناوچەی کەرکوك لەسەردەمە ئیسلامییەکان

سەرهەڵدانی سەردەمێکی نوێ، کە زۆر جیاوازی لەسەردەمەکانی ترو قۆناغێکی دیاری تر گەشەی کرد، بووە ڕاپێچی هەموو ماوەکانی لەوەو پێشترو توانەوەی لەناو بۆتەی بە ئیسلام بووندا، کارتێکردنی ئەم قۆناغە وایکرد کە هەموو شتێك لە خولێکی ئایینیدا گێژ بخوات و ڕوویەکی ئایینی داچۆڕاو لە هەموو جوانکارییەکی تری ئاوەزی مرۆڤ. بۆیە بمانەوێت و نەمانەوێت دەبێت بەسەردەمێکی جیاوازو قۆناغێکی جودا هەنگاوی بۆ بنێین، کە بووە هەرەس هێنانی سەردەمەکانی پێش خۆی.

ئەوەی لە شەڕکەرێکی ئیسلام ڕەچاو دەکرا هەوڵدان بوو بۆ بەدەست هێنانی تالآنێکی زۆرو بەدەست گرتنی سەرچاوەیەکی فرە لە بژێوی ژیانیدا، پێویستی بەوە هەبوو بایەخ بە توانایەکی وابدات کە هەموو شتێك لە بۆتەی ئیسلامدا بتوێنێتەوەو بیکاتە قوربانی دەسکەوتە مادییەکەی.

هەر لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین بەڵگەی زۆر بدۆزینەوە ڕاستی بۆچوونەکەمان بخاتە ڕوو، ئەوە بەدەر بخات کە تا چ ڕادەیەك زوڵم لە سەردەمەکانی پێش ئیسلام کراوە لە پێناوی بەجێهێنانی مەرامی چەند کە لەرقێکی پەروەردە بوو بە بیابان و تالآن و دەستدرێژی ئیسلامەتی بۆ ئەوەی جێگەو پایەی خۆی قایم بکات و شۆڕشەکەی بلآوبکاتەوە هەوڵیداوە، بەهەرچی جۆرێك بێت کەوا کارەکەی سەر بگرێ، هەرچی شتێك پەیوەندی بە ڕابووردوەوە بێت هەر ئەبێ بهێنێت لەو جێگەیەدا شتی نوێی عەقڵی شەڕکەرێکی ئیسلام درووست بکات، وا لەئاوەزی ئەو خەڵکە بکات کە گەڕانەوە بۆ ڕابردوو زۆر مەحاڵە. یەکە کارێك کە شەڕکەری ئیسلام پێی هەستا هەوڵدان بوو بۆ دابڕینی ڕابردووی ئەو ناوچانە لەگەڵ سەردەمی ئێستایاندا وای لێبکات بۆشییەك بخاتە نێو ژیانییانەوەو کاری مەحاڵ پێك بهێنێت، کە گەڕاوەتەوە بۆ قۆناغە ڕابردووەکە لە کارو توانای ئاوەزی ئەو مرۆڤە بەدەرە نموونەی ئەمە شۆڕشەکانی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام کە ناوچەی داقوق و خورماتوو و کەرکوك بەشێکی گرنگی دەرپەڕاندن بوو بۆ ڕزگارکردن لەو قۆناغە.

ساڵی (١٨)ی کۆچی قۆناغێکی نوێ بوو بە تایبەتی لە هونەری بیناکاری ونەخش ونیگارو لە هەموو لایەنەکانی تر زیاتر کەوتە بەر کارتێکردنی ڕۆژگارو زیاتر ڕابردووی لەگەڵ ئەو سەردەمەدا دابڕاو بووە دابڕانی هەزاران هونەری بیناسازی بەنرخ و بەها.

(عەرەبەکان لەکاتی پێغەمبەردا هونەرێکی تایبەتییان نەبوو کە جێگەی باسکردن بێت، بەڵام کاتێك (سوریا) و (عـێراق)و (میسر)و (ئـێران) یان ڕزگـار کـرد، هەستان بەدروست کردنی هونەری بیناکاری و نەخش و نیگار[1].

عەرەب لەپێش ئیسلام و سەردەمی خولەفای (ڕاشدین)دا هونەری بیناسازییان نەبووە، بەڵکو لەوەو دوا سەرەتاکانی لەسەر دەستی بیناسازی بێگانە بەدەرکەوتووە. لەزەمانی وەلیـدی کـوڕی عەبدولمەلیکی ئـەمەویدا، ئەندازیارێکی ئێرانی و چەند وەستایەکی دیانیان، بە داخوازی خەلیفە، هێنا و (الجامع الاموي) یان بنیاد نا کە یەکێکە لە گرنگترین مزگەوتەکانی وڵاتە موسڵمانەکان، نەخشە (فوسەیفسا)کانی ئەم مزگەوتەو (قصر المشتى) هونەرمەندی بێزنتی و دیانی سوریایی دروستیان کردووە[2].

هەستاون بەهێنانی زیرەکترین کارمەند لە پارچەکانی دەوڵەتی ئیسلامی بۆ دروست کردنی شاری تازەو کۆشك ومزگەوتی تازە[3].

ئەوەی دەیبینین کە بیناکاری ئیسلامی هەر لەسەرەتای دروست بوونییەوە گرێ دراوە بە چەند تایبەتمەندیەکی دیاری کراو[4]. ئەوەی کە لێی زیاد کراوە دەگەڕێتەوە ژێر کارتێکردنی گەشتی ئیسلام لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی

تر، وای لێکردووە هەستێت بە قۆستنەوەی ئەوەی کە هەبووە لەو پارچانەو بێتە ئەوەی یەك پارچەیەکی وا دروست بکات بێتە داهێنەری هونەری بیناکاری ئیسلامی. ئەگەر سەیر بکەین دەبینین کە لێکچوونێك هەیە، هەر یەکەی لەگەڵ یەکتریدا لەگەڵ پارچەکانی وڵاتانی ئیسلامیدا، لەگەڵ کەمە جیاوازییەکی وا کە ئەمەیش هەڵگری ئەو ژینگەیەو کارتێکردنی کەسەکانی ئەو ناوچەیەیە لە تایبەتمەندی ئەو داهێنانەدا[٥].

هۆی ئەو هەمەچەشنییە لەهونەری بیناکاری ئیسلامیدا دەگەڕێتەوە سەر هەمە چەشنی رۆشنبیری و رەگەزی نەتەوەکانی ژێر رکێفی دەوڵەتی ئیسلامی، بێجگە لەمەش سروشتی ئەو کەرەستانەی کە هەر ناوچەیەك بەدەستی دێنێت، لەگەڵ شوێنی جوگرافی وئاوو هەوای جیاوازی هەر ناوچەیەك لە ناوچەکانی ئاقارەکانی ناوچە ئیسلامییەکان[٦]. بۆیە دەیبینین هونەری بیناکاری ئیسلامی، قۆستنەوەی ئەو شارستانییانەی دەوروبەرێتی، وەکو ساسانی وبێزەنتی و هەستاون بەوەرگرتنی هەندێکی لەو شارستانییانەو هەڵیان گێڕاوەتە سەر تایبەتمەندی خوودی خۆیان، ئەمەش لەژێر کارتێکردنی ئەو باوەڕە یەکگرتووە ئایینییەدا بووە، کە رەنگی داوەتەوە لە هونەری بیناکاری شارەکانیشدا[٧].

پاشماوەکانی مەسیحی لە (میسر)و (سوریا)و (عێراق) سەرچاوەی تۆمارکردنی بابەتەکانی نەخش ونیگار بووە کە رەنگی داوەتەوە لە پاشماوەی سەردەمی سەرەتاکانی ئیسلامدا[٨]. بۆنموونە، عەرەبەکان پاش سەردەمی خولەفای راشدین، ئەم هونەرەیان لەنەخشی ساسانی وبێزەنتی وقیبتی وەرگرتووە[٩].

گەلێك شوێنەواری هونەری زۆربەیان دەستکردی نەخشکاری بێگانەن ونەخشەو وێنەکان شێوەی هیلنیستی وهونەری ساسانی و هیندیان تێدا بەکار هێنراوە.. هونەری عەباسی زۆر بەبابەتی لە هونەری ساسانییەوە وەرگرتووەو تەنانەت ئەو کارتێکردنە گەیشتۆتە ئیتالیاو هەموو وڵاتە ئەوروپاییەکانیش[١٠]. موسڵمانەکان (المجمع الزخرفي) یان لە هونەرە کۆنەکانی خۆرهەڵاتەوە پێگەیشتووە، وەکو داری مێوکە بەرەکەی هەنجیرو هەنار بێت، ئەم شێوەیە لەلایەن ساسانییەکان و قیبتییەکانەوە خراوەتە کار، بێزەنتیەکانیش پێیان نەزانیوەو لەهونەری کۆنی هیلنیستی دا نەبووە، هەروەها نەخشی باوەشێنی دارخورمایی و، (المروحة النخلية)و وێنەی هەناریان لە ساسانییەکان و، هەر سێ جۆرە نەخشی دار بە رەنگ و موتوربە کردن (تطعيم)و کونکردن (تخريم)، یان لە ساسانی وبێزەنتییەکان خواستووە. نەخشی (هاتای) کە دادەنرێت بە یەکێك لە خاسیەتە بنەڕەتەکانی هونەری عوسمانی و ناوەکەیشی توورکییە سەربە هونەری چینی وئێرانییە، ساسانییەکان، رۆمانییەکانیش زۆر رووی هونەری خۆیان لە نەتەوەکانی پێشوویانەوە وەرگرتووە، هەندێك لەو نەخشانەیش کە ئەمڕۆ لەلای چەند نەتەوەیەکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەبیندرێن نموونەیان لەسەر شوێنەواری ئاشوورییەکان و سۆمەرییەکان و ئەکەدییەکاندا هەیە، نموونەی لەم چەشنە زۆرن، سەرپاکیان ئەوە دەردەخەن کە هونەری ئیسلامی کەمتر بابەتی نوێ باو و تایبەت بە خۆی بووە[١١]. نموونەی ئەمە بەدەر دەکەوێت لە هونەری ئیسلامی ناوچەی کەرکوك لە تایبەتمەندی هونەری ئیسلامیدا لەگەڵ بەراووردی لەگەڵ ناوچەکانی تردا.

دەبینین زۆری هونەرەکانی پێش ئیسلام بایەخیان داوە بەنەخش ونیگار لەکارە هونەرەکانیاندا لەناوچەکانی رۆژهەڵاتی خواروو وئاسیا،[١٢] بەڵام موسڵمانەکان ئەم کاری هونەری نەخش ونیگارانەی بەهەستێکی تازەوە وەرگرت ولە سووچێکی تایبەتی وبە جۆشێکی بەگوڕەوە بەرەو پێری رۆیشتن. لەدوایدا بوونە دروستکەری جوانکارییەکی تازە. کە لەوەو دواوە بنەڕەتەکەی نەدەناسرایەوە وتوانیوویەتی ئەم هونەرە گەلێك بنەماکانی هونەری مەسیحی رۆژهەڵاتی وهونەری ئێرانی لەخۆی بگرێت.[١٣]

هونەرمەندی ئیسلامی هەستا بە بەکارهێنانی شێوازی تەوریقی ساسانی لەسەر بنەڕەتی گرێدانی (لکاندنی) باوەشێنی دارخورمایی بەڕێکوپێکی و نواندنی باوەشێنی تەواوو نیوە باوەشێن تێداو سازدانی بابەتی تر تێداو شێوەیەکی تری هونەری نەخش ونیگاری دروست کرد کە وورده وورده لە بنەڕەتییەکەی دوور کەوتەوە، کە بەزەحمەت دەناسرێتەوە،[١٤] نموونەی باوەشێنی ئەم دارخورمایە لەنەخش ونیگاری باوەشێنەکانی قەڵاو ناو شاری کەرکوك بەرچاو دەکەوێت.

وەرگرتنی شێوەی ئاژەڵی باڵدار لە هونەری ساسانی و بەکارهێنانی لە نەخش و نیگاری ئیسلامیداو هەوڵدان بۆ بەکارهێنانی بەشێوەیەکی فراوان،[١٥] لەگەڵ بەکارهێنانی نەخشی دارخورمایی[١٦].

ئەو نەخش و نیگارانەی کە ئەمڕۆکە لەکوردستاندا هەن و بەتایبەتی لەسەر خانوو و دەرگاو پەنجەرەو عورووسی سەندوقی دار، بە هونەرێکی کوردی دەژمێردرێ و نەخشکارانی زۆربەیان کوردن یان خەڵکی کوردستانن، کە بەشێك لەو نەخشانە لە هونەری عەرەبی ئیسلامی یان هونەری عوسمانی یان ئێرانییەوە وەرگیراون یاخۆ کارو جێدەستی ئەوانیان پێوە دیارە[١٧]. بۆ نموونە جێپەنجەی هونەرمەندی کورد لە ناوچەی کەرکوك بەدیارە لە هونەری باوەشێنی دارخورمایی ولۆقەندان و بوراق و تەوریق و نەخشی باڵدارو سێ گۆشەیی ولاکێشەیی لەمزگەوتەکانی وەکو (نائیب)و هەندێك ماڵی دەوڵەمەندی شارەکە.

دیاردەیەکی نوێ لەهونەری ئیسلامیدا روویدا ئەویش مەسەلەی وێنەی مرۆڤی و دروستکردنی کۆتەڵی مرۆڤی بوو، کە ئەمە لە سەردەمەکانی پێش ئیسلامدا شوێنێکی دیاری هونەری بیناکاری و نەخش ونیگار بووە وبەهایەکی گرنگی ئەو هونەرە بووە.

(کاتێك ئیسلام هات هەستا بە رووخاندنی ئەو وێنەو کۆتەڵانەی کە هەڵگری پەرستن بوو، ئەویش پێداگرتن بوو بۆ باوەڕ بە تاکی ئەو خوایە کە هاتووە لەو ئایینە نوێیەدا، بت پەرستی بەکفر دانا کە لەو کاتەدا باو بووە. دەبێت

دەستنیشانی ئەو ئەنجامە خراپە بکەین کە هەستان پێی وکاری کردە سەر هونەری وێنەکێشان لە سەرەتای سەدەی نۆیەمی زایینی، بەهانای ئەوەی کە گوایە (حدیثێ) پێغەمبەر هەیە ئەم جۆرە وێنانەی بە تەواوەتی قەدەغە کردووە کە هەلگری نموونەیی مرۆڤو ئاژەلانن، ئەم بیروباوەڕە باوو بوو هەتا سەرەتای سەدەی بیستەمی زایینی، تا ئەو کاتەی مێژوونووس‌و ڕەخنەگرانی هونەر لێکۆڵینەوەی جۆر بەجۆریان نووسی بۆ بێ تاوانی ئەم کارەو سەلماندیان کە ئەوانەی ئەمەیان تۆمار کردووە بە خەت‌و نەخش‌و نیگارو هونەری چکۆلەی تر جێگەی وێنەو کۆتەلی ئادەمییان گرتۆتەوە[١٨].

دەبینین ئەم باری قەدەغەکردن‌و جیاوازییە جێگەی بەریەرەکانی موسلمانەکان‌و (فقهاء) کان بوو لەسەر چۆنێتی ئەم کارە، چونکە لە قورئاندا دەقێکی دیاری کراو نییە دەست نیشانی ئەمە بکات[١٩]، هەروەها جیاوازیش هەیە دەربارەی (حدیثێ) پێغەمبەر لەسەر مەسەلەی قەدەغەکردن [٢٠]، مەسەلەی ئەم قەدەغە کردنەش لەکاتی کۆکردنەوەی (حدیث) دا ڕوویدا کە لەوە پێشتر شتی وانەبوو[٢١].

ئەم مەسەلەیەیش جیاوازی هەیە لە نێوان زانایانی موسلمانی (شیعە)و (سونی)دا کە هەریەکەی بەجۆرێك بۆچوونی خۆی خستۆتە ڕوو[٢٢] هەرچەندە کە بەریەرەکانی زۆر ڕوویدا بەلام کەژاوەی هونەری ئیسلامی ڕێڕەوی خۆی هەلگرتوو بەردەوام بوو، کە هەندێك بەربەست هاتە ڕێگای‌و نەیتوانی بە شێوەیەکی فراوان بەردەوام بێت، بەلام ئەگەر ڕاستت دەوێت ئەو خۆ شاردنەوەیە وایلێکرد کە پالی پێوە بنێت بۆ هێنانەدی گۆڕینی (تحوین)و تەرزی تازە، کە هەندێك نیشانەو سیمای جیایی خۆی هەیە.

مێژوونووسەکان دەست نیشانی ماوەی بووژانەوەی مێژووی هونەری ئیسلامی دەکەن لە نێوان ناوەڕاستی سەدەی حەوتەم‌و کۆتایی سەدەی نۆیەمی زایینی، ئەویش لەبەر ئەوەی تێکەڵ بوونێکی لە خۆڕا (العفوي) ی ئەو پاشماوەی شارستانییەتانەیە کە هەبووە لەوەوپێش هەستاوە بە وەرگرتنی بۆچوونی خۆی ئەویش بەدەرخستنی ئەو هاوسەنگییە لەنێوان تاقیکردنەوە دەولەمەندەکانی‌و خستنەژێر ڕکێفی بیروباوەڕی ئیسلام لە چوار چێوەی ئەم سێ لایەنەی خوارەوە تا بۆ ئەوەی بەدی ئەوە نەکرێت کە لە ئیسلام لایداوە:-

**یەکەم:-** ڕێگەدان بەکێشانی وێنەی ئاژەلی خۆمالی‌و ڕووتکردنەوەی لەو مانا کۆنەی کە هەیبوو.. هەولی ئەوەیان دەدا کە نەبەسترێتەوە بەو ژینگە سروشتییەی هەبووەو وەوای لێبکەن دوور بکەوێتەوە لە سیفەتی واقیعی.

**دووەم:-** ڕێگەدان بە کێشانی ئەو وێنەی ئاژەلانەی کە خوا حەلالی ڕاوو وخواردنی کردووە، یان ڕێگەی داوە بەکاری بهێنێت بۆ ڕاوو، وەکو تەیر وئاسکەو سەگ.

**سێیەم:-** ڕێگەدان بەکێشانی وێنەی ئاژەلانی دوو شێوە، کە هەلدەستێت بە تێکەلاو کردنی ئاژەلانی جۆربەجۆر وەکو ئەوەی سەری مرۆڤو لەشی ئەسپ‌و پێی ئاسکە[٢٣].

لێرەدا دەگەینە ئەو ڕاستییە کە مەسەلەی قەدەغەکردنی وێنەو کۆتەل، سەرهەلدانی دیاردەی ئەو ڕێگەنەدانە، دەگەڕێتەوە بۆ داشۆرانی ئاوەزی عەرەبی سەردەمی (جاهلی)، لەبیری پەرستی کۆتەل‌و کڕنووش بردن بووە بۆی (چونکە عەرەبەکان ئەو کۆتەلانەیان کردووەتە خوداوەندییان‌و دەیانپەرست‌و قووربانیان پێشکەش دەکرد، بۆیە ئەگەر پێغەمبەر هەستابێت بەقەدەغە کردنی ئەو خەلکە لەو پەرستنە، بۆ ئەوە بووە خەلکەکە لەو ڕێگایە دوور بخاتەوە[٢٤].

ئەگەر بەراووردێکی نیمچە دوورگەی عەرەبی بکەین لەگەل ناوچەکانی تر، دەبینین مەسەلەی پەرستنی کۆتەل زۆر دەمێك بوو لەناوچەکانی تر کۆتایی هاتووە، بلاوبوونەوەی ئایینی زەردەشتی‌و مەسیحی جێگەی خۆی گرتبوو، بووبووە بناغەیەکی بنەڕەتی ژیانی نەتەوەکانی دەرەوەی نیمچە دوورگەی عەرەبی، بۆ نموونە ناوچەی کەرکوك زۆر دەمێك بوو کەوتبووە بەر کارتێکردنی ئایینی زەردەشتی ومەسیحی‌و چەندەها شوێنی بیناکاری ئاوەدانی هەبووە کە ئەو ڕاستییە دەگەیەنێت چ لە هونەری دروستکردنی ئاتەشگەو کلێسەدا، بەرزی هونەری ئەیقۆنات لە نێو کلێسەکاندا هەبووە، تا ڕادەیەکی چاك بالادەستی ئەوە هەبووە کە ئاوەزی مرۆڤی ناوچەی کەرکوك لە قاوغە تەسکەکەی پەرستنی کۆتەل هاتۆتە دەرەوە وەکو هونەرێك سەیرکراوە نەوەك وەکو کۆتەلێکی ڕووت لەهونەر تەنیا بۆ پەرستن بەکار هاتووە.

فراوانی دیاردەی بەکارهێنانی کەرەستەی جۆربەجۆری بیناسازی نەخش‌و نیگار لە گەچ وبەردو قسل وخۆل وخشتی سورەوەکراو شووشەو دار وتەختە وفوسەیفیساو جۆرەها ڕەنگی جۆربەجۆر.

ڕەنگ کردن لە بیناسازی‌و نەخش‌و نیگاردا، بەکارهێنانی شێوازی هونەرکاری لە ڕێکخستنی خشت‌و ڕازاندنەوەی لە شێوەی چوارگۆشەو لاکێشەو بازنەو سازدانی لە چوار چێوەی نەخشەی بیناکاری جۆر بەجۆر. سەرهەلدانی شاری نوێ ودروستکردن‌و گەشە کردنی چەند ناوچەیەکی ترو ڕووخاندنی وفەوتاندنی زۆرەها شوێنی شارستانی تر. شارەکان جیاوازییان هەبوو لە جۆری کارە بەڕێوەبەری وهۆی دروست بوون وشوێنی بابەتەکەیدا، هەروەها ئەو کارتێکردنانەی کە دەوری هەبوو لە گەشەو پێشکەوتنیدا[٢٥].

ئەگەر سەیری ناوچەیەکی وەکو کەرکوك بکەین دەبینین لەسەرەتاکانی ئیسلامدا، بریتی بوو، لەناوچەیەکی تا ڕادەیەك گەورە بەلام پشتگوێ خراوە، ئەوەی کەباسی هەیە تەنها ناوچەی داقوقە، شوێنێکی دیاری هەبووە، بۆیە دەبینین کە دروستکردنی شاران لە سەردەمی ئیسلامدا تەنها هاوکێشە بووە بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانیان‌و جێ پێی خۆیان لە بەڕێوەبردندا، ئەو شارانەی کە ناوبانگیان هەبووە لە پێش ئیسلامدا پشت گوێ خراوە، یان شوێنێکی دیاری ئایینی هەبووە، کارێکی وایان کردووە کە ئەو ڕەگەی رابردووی دابڕێن.

دیاردەیەکی تر لەهونەری بیناکاری‌و نەخش‌و نیگاری ئیسلامیدا ڕوویدا ئەویش، بەکارهێنانی خەتی عەرەبی

وفارسی و تورکی، ورازاندنەوەی خەتی عەرەبی وەکو شێوەیەکی جوان لەگەڵ هونەری نەخش ونیگارو تێك هەڵکێشی لەگەڵ هاوتای یەکتری.

بەکار هێنانی جۆرەکانی خەتی عەرەبی وەکو (کوفی)و (رقعە)، جۆرە جوانکارییەکی تری دا بەهونەری بیناکاری ئیسلامی کە هونەرمەندی ئیسلامی لە بەکارهێنانی خەتدا، لە کێشانی هێڵی ئاسۆیی و ستوونیدا، دەرگایەکی بۆ والآ بووە بۆ هەوڵدان بۆ نوواندنی جوانکاری نەخش و نیگار[٢٦].

خەتی عەرەبی دیاردەی رەگەزێکی هاوبەشە لەهەموو هونەرەکانی جوانکاریدا، دەورێکی بنەڕەتی بینیوە لە هونەری بیناسازی ئیسلامی و بابەتی دەستی و دەستنووسی و کاری بەردی و مەڕمەڕیدا، کە دروستبوونی بڕبڕەی پشتی بەتین و پەیوەندییەکی ئۆرگانییە ناتوانێت خۆی لێ لادات لەبەر ئەوەی نەخشی خەتی عەرەبی گەورەترین پایەی نەخش و نیگاری هونەری ئیسلامییەو خەتی عەرەبی توانیویەتی کە گەشە بکات لە ئیسلامداو لەماوەیەکی کەمدا توانیویەتی بگاتە ئاستی نەخش و نیگار کە هیچ خەتێکی تر نەگەیشتووە پێی لە مێژووی مرۆڤایەتی بەگشتی.. بۆ نموونە هێڵە لارەکان خەتی (نسخ)ی، هەستێکی بێ پایانمان پێ دەبەخشێت کە هەڵگری سیفەتی کۆششی بەردەوام دەربڕینە.

خەتی (کوفی) بەشێوەیەکی تایبەتی کاری نەخش ونیگارێکی گرنگی هەیە لەچوارچێوەی هەرسێ شکڵەکەیدا (المورق)و (المشجر)و (المظفر) کە هونەرمەند لەماوەی پێکەوە بەستنی وشەکاندا دەتوانێت جۆرەها شێوە ئەندازەیی تارادەیەك.رووەو دژوار دروست بکات، هەروەکو ئەوەی لە (کوفی چوار گۆشە)دا هەیە ئەمیش شێوە ئەندازەییەو سووچەکانی راوەستاوە، کە کارێکی تا بڵێت وردو جوانکاری هەیە[٢٧].

زۆر جار وادەبینین لە خەتی (نسخ)یدا کە مەبەستی دوو شێوە جوانکاری گرنگ دەبینین لەسەر پانتایی کۆمەڵە نەخش و نیگارێکە، رووەکی شێوەی هێڵی وردکارە، یەکەمیان بریتییە لە دروستکردنی جۆرە (ئیقاع)ێك، کە بەهۆی ئاڵوگۆڕی سێبەرو رووناکی لە نێوان بەشە دیارو بەشە نادیارەکاندا، بەڵام دووەم بەخشینی پلەی جۆراو جۆری هەستی دەست لێدانە لە وردی و فراوانی، ئەو هەستەی کە بەدەست دێت لەدیتنی چاودا لەنەرمی و درشتی و کامڵ بوونی هونەریدا.

زۆری خەت خۆشەکان بابەتی نەخش ونیگارە جوانەکانیان وەردەگرن لەسەری پیتەکان ولقەکانی وکەوانەکان وماوەی هێڵەکانی ئاسۆیی و ستوونیدا.

زۆر جار دەبینین کە خەت خۆش یان نەخشکار هەڵدەستێ بە پڕکردنەوەی ریزێك نەخش ونیگار بەووشەکان یان پیتەکان کە هیچ پەیوەندی و مانایەك نییە لەنێوانیاندا، تەنها بۆ مەبەستی نەخش و نیگار سازدراوە... تاکو ئێستاکە پیتەکانی عەرەبی لە دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا بەکاردێت لە (رقش)و پەیکەرتاشی و رووی مزگەوتەکان و شوێنی میحرابەکەی[٢٨].

بیناکاری لە هونەری ئیسلامیدا ئەوەی گەیاندووە کە ئیقاعێکی سەپێنراوی هەیە بەبیرکارییەکی بەهێزو پەیوەندییەکی ئەندازەیی و ژمارەیەکی رووت لەهەر وێنەیەکی شێوەیی کە دژی گیانی ئایینی ئیسلام بێت. بۆیە دەبینین کە لێکردنەوەو (تجدید)و (هێما–رمز) دوو سیفەتی هاوشێوەی هونەری ئیسلامین و بناغەی سیفەتێکی بەردەوام دەگەیەنن هەتا ئەم کاتەی ئێستا. لێکردنەوە لەهونەری ئیسلامی بێ پایانە، کۆتایی نییە، بەووردی دیتنی چاو دیاریکراو نییە، دوورە لە روولێنانەوە (التکلف)، کە پابەندی کۆمەڵە یاسای ئیقاعێکی بیرکارییە.

هونەرمەندی موسڵمان وا دادەنێت کە چوار گۆشە ئەو شێوە بنەڕەتە تەختەیە کە رێکوپێك وگونجاوە بۆ بیناکاری، چونکە ئەو پەیوەندی بەهاوسەنگەی تەواو بووە، ئارامەو سادەیی دەگەیەنێت لەنێوان بەشەکانیدا، کەئەمەش لەگەڵ ناوەڕۆکی ئایینی ئیسلامیدا دەگونجێت کە بایەخ دەدات بە سادەیی و هاوسەنگی و ئارامی[٢٩].

دیاردەیەکی تر ئەویش کارتێکردنی کەرەستەی بیناکارییە (وابەدەر دەکەوێت کە سروشتی کەرەستەی بیناسازی و تایبەتمەندیەکانی بیناکاری، هەڵدەستێت بەدیاری کردنی سەرەتاکانی دەست پێکردنی شێوەی بیناسازەکە، کارتێکردنێکی گرنگی هەیە بۆ لەدایك بوونی بیناکارەکە (شێوە)، بیناکار ناتوانێت شێوەی بیناکارەکە دیاری بکات، تا نەزانێت چۆن مامەڵە لەگەڵ کەرەستەکەدا دەکات وشارەزایی تایبەتمەندی و سیفەت و نهێنییەکانی و توانای ئەو کەرەستانە تا بۆ ئەوەی بیری بیناسازییەکە بێتە بەرهەم).

هەروەها (کات) دەورێکی گرنگی هەیە بۆ بەخشینی کەرەستە تا بۆ ئەوەی سیفەتێکی ناوخۆیی بنەخشێنێت لەماوەی ئەو زانیارییەی مرۆڤە بۆ هەڵسوکەوت لەگەڵ کەرەستەدا، تا بۆ ئەوەی پەیوەندییەکی تەواو دروست بکات لەگەڵیداو سروشت دەورێکی گرنگی هەیە بۆ بەدەست هێنانی ئەو کەرەستانە[٣٠].

ئەگەر سەیری ناوچەی کەرکوك بکەین دەبینین ئەو کەرەستانەی کە لە بیناکاریدا بەکار هاتووە دەوری سەرەکییان بینیوە، لەهونەری بیناکاری ئیسلامیدا، چ لەرووی زۆری وکەمی لەناوچەکەو، چ لەجۆری ئەو کەرەستانەی کەبەکار هێنراوە، وەکو پێویستییەکی دیاری کراو بۆ سەرگرتنی پێگەیاندنی هونەری تەرزی بیناسازییەکە... بەهۆی نەبوونی هەندێك کەرەستەی بیناکاری ونەخش و نیگار، هەندێك تایبەتمەندی ناوچەکەی لەدەست داوە، لەهەمان کاتدا، تایبەتمەندی خۆی وەرگرتووە ئەگەر بەراورد بکرێت لەگەڵ ناوچەکانی دەوروبەریدا، بۆ وێنە بوونی هەندێك کەرەستەی وەکو بەردو گەچ و دار لەناوچەکەدا، تایبەتمەندێکی ناوخۆیی داوە بە بیناکارییەکە، بەڵام نەبوونی داری بەڕوو، خشتی سورەوەکراو، بەردی مەڕمەڕ، خشتی دیاریکراوی نەخش ونیگار، وایکردووە کە سیفەتێکی گشتی بیناکاری ئیسلامی بگەیەنێت، دوور لە تایبەتمەندی ناوخۆیی.

کاتێك بیناکار هەستاوە بەتازەکردنەوەی هونەری بیناکاری ناوچەی کەرکوك، هاتووە بە بەکار هێنانی کەرەستەی تر کە

سیفەتی ناوخۆییەکەی لەدەستداوە، وەکو ئەوەی لەجیاتی گەچ چەمەنتۆ بەکار هاتووە لەجیاتی نەخشی دەستکردی خۆماڵی خشتی نەخشداری بەکار هاتووە، کە نموونەی ئەمە تازەکردنەوەی مەرقەدی ئیمام ئەحمەد لە شەقامی (سەلاحەددین)، کە گومەزەکەی بەچەمەنتۆ دارێژراوەتەوە.

هەروەها لەتازەکردنەوەی تەکیەیی تاڵەبانی ئەگەر بەراووردێکی وێنەی بیستەکان و پەنجاکان و هەشتاکان بکەین، دەبینین، گۆڕانکارێکی بنەڕەتی لەناوەڕۆکی بیناکارییەکە ڕوویداوەو سیفەتە ناوخۆییە بیناکارییە کوردییەکەی لەدەستداوە لەکاتی تازەکردنەوەدا، بەتایبەتی لەرووی شێوەی نەخش و نیگارەکەیەوە.. کە نموونەی ئەم بەراوردە لە تازەکردنەوەی گومەزی سەوز (بوغدە خان)دا بەڕوونی بەدەردەکەوێت، کە ڕوویەکی گشتی وەرگرتووە.

تازەکردنەوەی قەڵای شێروانە لە هەشتاکاندا بەزەقی جیاوازی بەکارهێنانی جۆری کەرەستەکان دەوری بینیوە لە گۆڕینی شێوازی بیناکاری کۆشکەکەدا، وەکو بەکارهێنانی بلۆکی چەمەنتۆ لە تازەکردنەوەی پەیژەکاندا. لەکاتی تازەکردنەوەی هەریەکە لە مزگەوتی (ئیمام قاسم)و (نائیب) و (نوعمان)دا گەلێك سیفەت ورووی نەخش و نیگاری ناوخۆیی لەدەست داوە، تازەکردنەوەی خانەکانی ناو شاری کەرکوك گەلێك رووی کۆنی خۆی لەدەستداوەو لە جیاتی نەخشە کۆنەکانی نەخشی تازە باویان بۆ داناوە، کە زۆر لەگەڵ ڕابردوویدا جیاوازی دروستکردووە.

بەکارهێنانی ڕەنگ لە هونەری بیناکاریدا کەرەستەیەکی گرنگەو دەورێکی باڵای هەیە لە جوانکاری نەخش ونیگاری ئەو بیناکارییەدا.

(بەکارهێنانی ڕەنگ لەهونەری ئیسلامدا جێبەجێکردنێکی بنەڕەتی جوانکاری تەرزی بیناکارییە، زۆری بەکار هێنانی ڕەنگی سەوز وشین ڕەنگدانەوەی ئەو سروشتەیە وەکو ئاسمان و باران و دەشتایی بەپیت، بەکار هێنانی ڕەنگی ئاڵتوونی، مانای گەیاندنە بە بەهەشت کەبەرزترین شوێنە لە ئیسلامدا[٣١].

بەڵام ئەوەی بەرچاو دەکەوێت لەبەکار هێنانی ڕەنگی سەوز وشین لە ناوچەی کەرکوك و دەورووبەریدا، دەگەڕێتەوە سەر کارتێکردنی بیروباوەڕی زەردەشتی و دوو ڕەنگی پیرۆزی ئەو ئایینە بووە، کە کارتێکردنی هەتا ئێستاکە بەسەر پیرۆزی ئەو ڕەنگانەوە ماوە، کە ئەمیش لەبەکار هێنانی شوێنە پیرۆزەکاندا بەکار دەهێنرێت (لێرەدا دەگەینە ئەوە کە ڕەنگ دەورێکی کاریگەری نواندنی هەیە لە دەروازەی بەکارهێنانی ڕەنگەوە یان لەرێگای بەکارهێنانییەوە لەتەرزی بیناکاری، بۆیە شوێنێکی دیاری نەخشە کێشانی بیناکارییەکەیە[٣٢].

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت بیناکاری ونەخش و نیگاری ناوچەی کەرکوك بەکار هێنانی لێزانی دارشتنی ڕەنگە لە تەرزی بیناکارییەکەدا، زیاتر ڕەنگی کراوە بەکار هاتووە، بەکارهێنانی ڕەنگی تاریك زۆر کەم دارێژراوە، زیاتر دابەش کراوەتە نێو ڕەنگە کراوەکانەوە لەسەر پانتاییە کراوەکەدا تا بۆ ئەوەی ڕەنگە تاریکەکە خۆ بزر بوون بەخۆیەوە ببینێت.

ئەوەی گومانی تێدا نامێنێت کە هۆیەکانی ژینگەی سروشتی، ئاوو هەوایی بێت، یان جوگرافیایی کارتێکردنێکی ڕوونیان هەیە بەسەر مرۆڤ لە پێکهاتەی بایەلۆجی وسایکۆلۆجی وکارتێکردنی بەسەر گوزەرانی ژیانییەوە، هۆیەکانی جوگرافیایی هەڵگری تۆپۆگرافی زەوی وبەرزی و نزمی وسروشتی شوێنەکەییە، هۆیەکانی ئاووهەوا، هەڵگری پلەی گەرما وشێ وبزاوتنی خۆر بۆ لایەکەی و ڕێژەی باران و وەرزەکانی وتیژی هەواو ڕووی هەواکەیە[٣٣]. لێرەدا دەتوانین ئەوە بڵێین کەهۆیەکانی ژینگەی ئاوو هەوا دەورێکی گرنگیان هەیە لەلایەن بیناکارەوە بۆ پێکهێنانی تەرزی بیناکارییەکە لەسەر ئاستە جۆربەجۆرەکان، کە لەسەر ئاستی هێڵکاری ئەو بیناکارییە دەبێت وا بکرێت کە شوێنی ژیانی مرۆڤەکە لە بەرچاو بگیرێت، بۆ سوود وەرگرتنی مرۆڤەکە لەو ژینگەی ئاوو هەوایە[٣٤].

دەتوانین ئەوە بڵێین کە نموونە زۆرە بۆ سەلماندنی ڕاستی کارتێکردنی ئاووهەوا وەکو، دەروازەو حەوشەی ناوەندو ڕووی دەرەوەی خانووەکەو جۆری کەرەستەی بیناکارییەکە لە وەرگرتن و دانەوەی پلەی گەرمادا لە شەوو ڕۆژدا... هەروەها کردنەوەی هەواکێش لەرووی خانووەکەو کاری لەسەر گۆڕینی پلەی گەرما لە هونەری بیناکارییەکەدا. حەوشەی ناوەندی هەوای سارد هەڵدەگرێت، کەسەربەخۆ خۆی دەکاتە ژوورەوە کە ڕێژەی ئەو پلەی گەرمایە لەشەودا لە نێوان (١٦-١٢) پلەی سەدییە، ئەم هەوا ساردە دەپارێزرێت هەتا کاتەکانی نیوەڕۆی ڕۆژی دوایی. ئەو هەوایە دەمێنێتەوە کە حەوشەکە سارد دەکات، هەتا نیوەڕۆ، ساردی دەبەخشێت بە دیواری بۆشاییەکانی دەورووبەری، ئەم هەوا ساردە لەکاتی ڕۆژەکانی گەرمادا دابەش دەبێتەوە بۆ بۆشایی ناوەوە، بەهۆی دیاردەی تیشك وهەڵگرتن کە ئەبێتە هۆی ئارامی بەهۆی گونجاندنی ئەو پلەی گەرمایە، ئەم کارە بەشێوەیەکی تر ڕوو دەدات ئەویش بەلێدانی تیشکی خۆر لەناو حەوشەکە ئەبێتە بەرز بوونەوەی پلەی گەرمای ئەو هەوایە نزیکە لەسەرەوە، کە ئەبێتە گەرم بوون وبەرزبوونەوەی بۆ سەرەوە لەبەر سووکی کێشەکەی کە حەوشەکە دەبێتە شوێنی پاڵەپەستۆی هەوای نزم، ئەبێتە ڕاکێشانی هەوا لە بۆشاییەکانی دەورووبەری، ئەمە وا دەکات تەوژمی هەوا دروست دەکات، دەبێتە هۆی دابەزینی پلەی گەرمای بەرز[٣٥]. بۆیە دەبینین بەکارهێنانی حەوشە یەکێکە لە پێکهاتەکانی بیناکاری ئیسلامی، کە دروستکردنی حەوشەی ناوخۆیی بەژمارەو شێوەی جۆربەجۆر دەکرێ[٣٦].

دیاردەیەکی تر هەیە ئەویش کارتێکردنی هۆیە سروشتییەکانی ئاووهەوایە لە شێوەی دەرەوەی بیناکاری ئیسلامی، ئەویش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە بەکەمی بەکارهێنانی کەلێن (فتحە)ی دەرەوەی بیناکاری ئەویش بەکەمی چاو (فتحە) کە بەرەو دەرەوە بڕوانێت.

هەروەها بچووکی ڕووبەرەکەی، کە بیناکارییەکی پتەو (صلب)، کەمی کەلێن وژمارەو جۆری ڕووبەرەکەی لەبچووکیدا، ئەبێتە هۆی کەمی چوونەژوورەوەی پلەی گەرما بەرەو ناوەوە لە هاوین و بۆ دەرەوە لەزستاندا، دەبێتە پارێزگاری ڕێژەی پلەی گەرمای بیناکارییەکە لەنێو

بۆشایی کەمی کارتێکردنی پلەی گەرمای دەرەوە لەکاتی بەرزبوونەوەو نزم بوونەوەدا بەڵام بوونی دروستکردنی کەلێن لەسەرووی ژوورەکاندا نزیك لە بنمیچەکەیدا بۆ ئەوەیە کە هەوای گەرمی سووك بکاتە دەرەوە، ولەجێگەی ئەو هەوای سارد بێتە نێو ژوورەکانەوە(٣٧).

بوونی حەوشەی ناوخۆیی تەوەری ژیانی کۆمەڵایەتی ماڵە، کە ئەوەی لەناوچەکانی کوردستاندا باوە ئەوەیە کەبەرزترە لە ئاستی چینی ژێرەوەی خانووەکە، بەپێچەوانەی ئەوەی باوە لەتەرزی بەغدادی(٣٨). دەربارەی کەلێن لەسەرووی ژوورەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ ژێر کارتێکردنی ئایینی زەردەشتی، کە دەروازەیان لە ئاتەشگەو ماڵەکاندا بەکار دەهێنا، کە باوەڕیان وابوو نەخۆشی ناهێڵێت لەماڵەکەدا. کەنموونەی ئەمە زۆرە لەخانووبەرەی لادێی ناوچەی کەرکوکدا، بۆ هێشتنەوەی کەلێن لەسەرووی ژوورەکان بەتایبەتی لەژووری دیوەخاندا.. هەروەها دروستکردنی گومەت بەجۆرەها شێوەی ئەندازەیی، شێوەیەکی بنەڕەتی پێکهاتەی بیناکارییە بۆیە دەبینین ئەو شێوە تەرزەی کە لەگومەتدا هەیە دەورێکی گرنگی هەیە بۆ کەمکردنەوەی تیژی تیشکی خۆر بۆ سەر بیناکارییەکە، کە دەبێتە دابەزینی رێژەی پلەی گەرما لەسەر رووی بیناکارییەکەی بەشێوەیەکی گشتی(٣٩).

بەڵام بەکارهێنانی شێوە کەوانەیی‌و دروستکردنی گوومەت، ئیسلام لەهونەری بیناکاری نەتەوەکانی پێش خۆی وەرگرتووە، وەکو سۆمەری‌و گوتی لۆلۆیی، کە نموونەی ئەمە بەرچاو دەکەوێت لە هونەری بیناکاری چەرمووی ناوچەی کەرکوك کە لاری شێوەی رووەکەی بەدەردەکەوێت.

گرنگترین هونەری بیناکاری ئیسلامی ئەویش دروستکردنی مزگەوتە، کە شێوەیەکی تازەی بیناکاری بوو لەناوچەکەدا.. وبەتەرزێکی تری بیناکاری ئایینییەوە هاتە روو.

(بیناکاری ئایینی هەڵگری پەیوەندی رەمزی نێوان مرۆڤ وهێزە نادیارەکانە، وەکو خواو هێزی سروشتی وپەیوەندی بە تێگەیشتن‌و بیروباوەڕی ئەو بۆچوونانەوە هەیە(٤٠)، بۆیە دەبینین کە بیناکاری ئایینی هەڵگری جۆرەها بزاوتی ئایینییە، هەر لەبەر ئەمەیە دروستکردنەکەی زۆر گرنگەو ئارەزووی مرۆڤ وایە بۆ بایەخدان پێی‌و هەوڵدان بۆ بەدەست هێنانی توانای ئابووری بۆیی(٤١).

مزگەوت شوێنێکی دیاریکراوی هەیە لە ژیانی میللەتانی ئیسلامدا، کە وەکو ماڵی خوێ گرنگی پێ دەدات، هەر لەو شوێنەییدا گرنگترین (سرووتی) ئایینی دەگێڕدرێت، قورئانی پیرۆز پاڵ بە موسڵمانانەوە دەنێت بۆ بنیات نانی مزگەوت، کە ئەمە دادەنرێت بەکاری وەرگێڕانێکی دیار بۆ باوەڕبوونێکی نوێ بە بنەڕەتییەکانی ئیسلام(٤٢)، هەروەها لەگەڵ گەشەکردنی شارەکانیشدا، مزگەوتیش گەشەی کردووەو شانبەشانی هونەری بیناکاری‌و نەخش ونیگاری شارەکان ئەمیش پەرەی پێ دراوە، هەر چەندە کە لە سەرەتادا زۆر بە سادەیی‌و بچووکی زۆر بە دەگمەن رێکەوتووە کە بەرز بوو بێت.. سروشتی مزگەوت ئەوە بووە کە رێك نەکەوتووە لەگەڵ قەبەیی‌و دەست بڵاوی لە جوانکاریدا، چونکە دەبێت بگونجێت لەگەڵ سروشتی سادەیی‌و پاکی ئیسلامدا(٤٣).

مزگەوت بەکار هێنراوە وەکو شوێنێکی گرنگی فێرکردن‌و خوێندن، کە نموونەمان زۆرە لە ناوچەی کەرکوك کە هەم شوێنی نوێژکردن‌و هەم شوێنی خوێندنی ئایینی بووە، کە ئەمیش لەرووی بیناکارییەوە، ژووری خوێندن‌و ژووری قوتابیان وخەوتن زیادکراوە لەناو مزگەوتەکە، کە جۆرە تایبەتمەندییەکی هونەری بیناکاری مزگەوتە لە ناوچەی کەرکوك، وەکو ئەم شوێنانەی لای خوارەوە:

(پردێ)و (کفری)و (شوان)و (کەلار)و (تاڵەبان) و (سیامەنسور)و (سەنگاو)و (چەمچەماڵ)و (فەرقان)و (قادرکەرەم)و (قەرەبلاغ)و (بیسومە)و (لەیلان)و (هۆمەربل) و (یەحیاوە)(٤٤).

لە بەشەکانی لەمەودوای ئەم بەشە دێمە سەر باسی مزگەوتەکانی ناوچەی کەرکوك وەکو هەرسێ چینەکەی مزگەوت‌و منارەکەی داقوق ومزگەوتی منارە نەخشینەو مزگەوت‌و تەکیەی تاڵەبانی و، ئیمام قاسم، ونائیب‌و مزگەوتەکەی بولاق‌و مزگەوتی بان پردی دووەم، مزگەوتی شەقامی کۆماری.

لەناو بۆتەی هونەری بیناکاری ونەخش ونیگاری ئیسلامیدا، هونەری بیناکاری ونەخش ونیگاری سەلجوقی وئیلخانی وتەیموری وفارس‌و کوردی وتورکی‌و عوسمانی ئەتابەکی وعەباسی سەری هەڵدا، کە هەریەکەی خاسییەتێکی تایبەتی خۆی هەبوو، کە بووە دەوڵەمەند کردنی هونەری ئیسلامی لە ناوچەی کەرکوکدا، جێ پەنجەی ئەم شارستانییە زۆر بەزەقی بەدیار کەوت لەناوچەکەدا.

ئەگەر سەیری تەرزە هونەری بیناکاری‌و نەخش ونیگاری ناوچەی کەرکوك بکەین دەبینین کە لە ژینگەیەکی کوردەواری گەشەی کردووەو مۆرکێکی کوردەواری ئیسلامی تایبەتی تێدا هەیە، دەوڵەمەند بووە بەو هونەری بیناکارییانەوە کە هەبووە لە ناوچەکەدا لە پێش ئیسلامدا وەکو (ساسانی)و (ئاشوری)و (هوری-میتانی)و (پرسی)و (سەلجوقی).

هەر یەکە لەمانە دوورو نزیك دەوریان بینیوە لەکارتێکردنی بەسەر هونەری بیناکاری‌و نەخش‌و نیگاری ئیسلامی ناوچەکە، ئەمیش زیاتر رەنگی داوەتەوە لە جۆری نەخش ونیگارو بەکار هێنانی رەنگدا.

ئەو هونەرکارانەی کە دەوریان بینیوە لەهونەری بیناکاری هەموو کوردو خەڵکی ناوچەی کوردستان بوونە وبێگانە نەبوونە، ئەمەیش بەروونی بەدیارە لەدەست‌و پەنجەی نەخشەکاندا.. وەکو لێکچوون هەیە لەنێوان هونەری سنەو مەریوان لەگەڵ هونەری نەخش‌و نیگاری ناوچەی کەرکوك.

زاڵبوونی بیری دەمارگیری عەرەبی لەناو هونەری بیناکاری ئیسلامیداو هەوڵی چەسپاندنی رەگی کەلەپەقی نەتەوەیی عەرەبی‌و هەوڵدان بۆ سڕینەوەی مۆرکی بیناکاری (کوردی- ئیسلامی)، ئەمیش بە شێواندنی لایەنەکانی بیناکاری نەتەوەیی ناوچەی کەرکوك‌و توانەوەی هەموو نەتەوەکان لەناو بۆتەی بەعەرەب کردندا، تەرزی بیناکارییەکەش لەخزمەتی ئەودا ئیش بکات، هەوڵدان بۆ تێکدانی نەخشەی بیناکاری گەڕەکە کوردەکان، وای لێبکرێت بکەوێتە ژێر

کارتێکردنی دەمارگیری تایەفەگەری عەرەبی، وەمۆرکێکی عەرەبی بداتە گەڕەکە کوردییەکان وابکات بۆ لەناودانی نەخش ونیگاری (کوردی – ئیسلامی) شێواندنی هونەرکارە کوردەکەی، هەروەکو ئەوەی کرا لە ڕووخاندنی قەڵاو گەڕەکی شۆڕیجەو بولاق و گەڕەکی جولەکەکانی کەرکوك.

*** سەرەتاکانی هونەری بیناسازیو نەخشو نیگاری ئیسلامی ناوچەی کەرکوك:**

ئەوەی راستی بێت مێژووی سەرەتاکانی بیناکاری ئیسلام لەناوچەی کەرکوك، زانیاریمان زۆر کەمە شتێکی ئەوتۆ بەدەستەوە نیە تا بتوانین ڕوونی ئەو لایەنە یەکلا بکەینەوە، ئەوەی بەدەستمان گەیشتووە دەگەڕێتەوە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب دووەم خەلیفەی ئیسلام...

بەڵام ئەوەی کە دەیزانین دەربارەی، گوایە موسڵمانەکان (عەرەبەکان)، لەسەرەتادا هونەری بیناکارییان نەبووەو لە ناوچەکانی تری کە داگیرکراوە فێری هونەری بیناکاری ونەخش ونیگار بووە، چونکە شتێکی ئەوتۆ نەدۆزراوەتەوە لە نیمچە دوورگەی عەرەبی کە جێگەی باسی ئەم راستییە بێت.

یەکەم کارێك کە موسڵمانەکان پێی هەڵسان لەهونەری بیناکاری بریتی بووە لە دابین کردنی شوێنێك بۆ نوێژکردن، بۆیە هەوڵیان داوە ئەو شوێنانەی کە پیرۆز بووە لەلای خەڵکی ناوچەکە بیکەنە بنکەی ئەو نوێژکردنە، کار گەیشتۆتە ئەوەی کە گوێیان بە شێوەی بیناکارییەکە نەداوە، تەنها بیریان لەداگیرکردنی شوێنەکە کردووەتەوە، بۆیە شوێنی نوێژکردنی هەرهەمان شوێنی بیناکاری پێش خۆیەتی وگۆڕینێکی کەم ڕووی داوە، ئەویش گۆڕینەکە لەسەرەتادا لەشێوەی بیناکارییەکە نەبووە، بەڵکو هەستاون بەتێکدانی چەند لایەنێکی نەخش ونیگار وکۆتەڵی شوێنەکە کە لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامدا نەگونجاوە، کە نموونەی ئەمە هونەری (ئەیقۆنات)و کۆتەڵ و وێنەی مرۆڤییە.

ئەوەی سەرنج رادەکێشێت ئەوەیە کە ناوچەی کەرکوك، زۆری هونەری بیناکارییەکانی لە بنەڕەتدا کڵێسە بوونەو کراونەتە مزگەوت، وەکو مزگەوتی (گەورە–عوریان)و (چینەکانی ژێرەوەی مزگەوتی داقوق).

لێرەبەدواوە هەوڵدەدەم کە نموونەی چەند کڵێسەیەك بهێنمەوە کە کراوەتە مزگەوت وئەو گۆڕانکارییە کە ڕوویداوە زیاتر لە شێوەی نەخش ونیگارەکەیدایە وەکو لەتەرزی بیناکارییەکەدا.

*** چینی ژێرەوەی مزگەوتی پێغەمبەر دانیال:**

سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە وەختی خۆی ئەمە کڵێسە بووە کراوەتە مزگەوتو مزگەوتەکەش چەند جارێك چاککراوەو دەستی پێدا هێنراوە، کەلە بنەڕەتدا کڵێسەی (مار دانیال کلباس) بووە ولەکاتی هاتنی ئیسلامدا ئەمە هەبووەو شوێنی بڵاو بوونەوەی ئایینی مەسیحی بووە. کە لەوانەیە پاشماوەکانی ئێستا لە ئاستی کۆڵانەکانی دەوروبەر بووبێت[45].



ڕووی دەرەوەی نەخشەکانی مەرقەدی دانیال پێغەمبەر

وابڵاوە کە بنکەی ژێرەوەی کڵێسە بووەو لە دوایدا سێ جاری تر تازە کراوەتەوە لەسەر چینەکەی ژێرەوە.

*** چینی ژێرەوەی مزگەوتی (ئۆلو جامیع):**

مزگەوتی گەورە کە پێی دەڵێن (ئۆلو جامیع) یان (مەریم ئانا یان مەریەمانە)، بە پێی زمانی ناوخۆی مەسیحییەکانی کەرکوك، دەگەڕێتەوە بۆ ناوی (پاکیزە مەریەم)، لەچینی ژێرەوەی دیواری ئەم مزگەوتە توانرا کە (ئەیقۆنات) یان وێنەی پاکیزە بدۆزرێتەوە، لەگەڵ دۆزینەوەی پاشماوەی تر وەکو ماڵی شەهیدەکان، لەژێر زەمینێکی فراوانی تاریك، کە دەلالەتە لە بوونی شوێنی بەکڵێسە دەکات.لێکۆڵەری ئەڵمانی (هرتسفیلد) وای بۆ دەچێت لە بنەڕەتدا کڵێسە بووبێت، ئەویش لە شێوەی نەخشەکێشان و هونەری بەناییەکەیدا[46].

دەڵێن کە گوایە لەسەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب ئاوەدان کراوەتەوە لەسەر کڵێسە کە تا ئێستا پاشماوەی بەڕوونی دیارە، لەسەردەمی سیانزەهەمی زایینی دووبارە تازە کراوەتەوە، کەرەستەی بیناکارییەکەی پێکهاتووە لەبەرد وگەچ، تا ئێستا بنمیچی مزگەوتەکە وەکو خۆی ماوە لە بەهێزیو کەوانەو (عقود)و گرێ وگومەت، میحرابەکەی دەڕوانێتە سەر بیناکارییەکی شێوە لاکێشەیی چەماوە کە وەکو سەر پشتی ماسی وایە، وەکو ئەوەی باو بووە لەدروستکردنی کڵێسەدا[47]، لە کتێبی (تقویم قدیم للکنیسة



مزگەوتی (ئۆلۆ جامیع)

الكلدانية النسطورية) وا باس هاتووە بە بوونی کڵێسەیەك لە کەرکوك بە ناوی (مەریم بەتول) لە نێوان (١٠٠٠-١٧٠٠) ی زایینی.

پاشماوەی ئەم مزگەوتە شتێکی ئەوتۆی نەماوە تەنها بریتییە لە گوومەت وبانگۆکەی، کەدەڵێن گوایە بەهۆی هەورە تریشقەوە لەناو چووە[٤٨]، لێرەدا دەگەینە ئەو راستییە کە تێك هەڵکێشێکی بیناکاری هەیە لەنێوان مزگەوت و کڵێسەدا، مزگەوتەکە زۆر لایەنی بیناکاری کڵێسەی تێدا ماوە. یان لەوانەیە پێش هاتنی (عومەر کوڕی خەتاب) ئەم کڵێسەیە لەناو چووبێت یان بەجێهێڵراوە، ئینجا موسڵمانەکان هاتوونە کردوویانەتە مزگەوت.

سەرچاوەکان بەدەستەوە نییە کە ماوەی هونەری بیناکاری مزگەوت و کڵێسە، دیاری بکەین، ئەویش بەهۆی ئەو تازە کردنەوەیەی کە بەسەریدا هاتووە، زۆر لایەنی بیناکارییەکەی لەدەست داوە، موسڵمانەکان لەو کاتەدا نەگەیشتبوونە ئەوەی کە هونەری بیناکاری سەربەخۆیان هەبێت، بۆیە زیاتر بایەخیان بەشێوەی گشتی بیناکاری کڵێسەکە داوە، بۆ بنیات نانی مزگەوت لەسەر قەڵا، ئەمانەی باسمان کرد یەکەم پاشماوەی سەرەتاکانی هونەری بیناکاری ئیسلامییە لە ناوچەی کەرکوك، ئیتر سەرچاوەی تر نیە بەدەستمانەوە کە ئاماژە بۆ ئاوەدانی قەڵاو بیناکاری خانووەکانی قەڵا بکات، شوێنی ئاوەدانی تری قەڵا، یان دەرەوەی قەڵا.

زۆر سەرچاوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە گوایە شوێنی مەرقەدی (ئۆمەر مەندان) پەرستگا بووە لەپێش ئیسلام، شوێنی ئاگرەکەی باوە گوڕ..گوڕ پەرستگای لێبووە بۆ پەرستن.

ئینجا پرسیارێك خۆی قووت دەکاتەوە ئایا لەکاتی ئیسلامدا بەهەمان شێوە کراوەتە مەرقەد یان مزگەوت و هەندێك دەستی پێدا هێنراوە، کە وەکو ئەوەی کە ئۆمەرمەندان ئێستا کراوەتە مەرقەدێکی ئیسلامی.

*** هونەری بیناکاری ونەخش ونیگاری ئیسلامی سەردەمی عەباسییەکانی ناوچەی کەرکوك:**

ئەوەی کە روونە بنەرەتی هونەری بیناکاری ئیسلامی لەسەردەمی عەباسییەکاندا سەری هەڵدا، چونکە تا ئەوکاتەی ئەو بایەخەیان نەدابوو بە هونەری بیناکاری وئەوەی کە هەبوو هەر لاساییکردنەوەیی هونەری بیناکاری نەخش ونیگاری نەتەوەکانی ناوچەکە بووە، سەرەتاکانی ئەم هونەرە دەست پێشکەری عەباسییەکان بووە، ئەویش بەبازووی نەتەوەکانی غەیرە عەرەب، بەڵام کەوتە چوار چێوەی هونەرێکی ئیسلامییەوە.

ئەوەی لە ناوچەی کەرکوکدا بەرچاومان دەکەوێت لەسەرەتاکانی هونەری عەباسییەکان لەناوچەکەدا وەکو نەبوون وایە، ئەوەی روونە لە هونەری بیناکاری سەردەمی عەباسی دواوەیە، کە ئەمیش خۆی لەچەند هۆیەکدا دەبینێتەوە:

١. بەهۆی زۆری رووداوی شەڕو ئاژاوەو هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، بەتایبەتی لەناوچەی (داقوق) وای کردووە زۆربەی شوێنەکانی بیناکاری ونەخش ونیگار کەوتبێتە بەرکاری کاولکاری وفەوتاندن، نموونەمان لەوانە کۆشکی داقوق و شوورەی شاری داقوق، کە هیچ پاشماوەیەکی بەدەستمان نەگەیشتووە، بەڵام سەرچاوەکان دەست نیشانی دەکەن بە بوونی.

٢. بەهۆی پشتگوێ خستنی ناوچەیەکی زۆری کەرکوك‌و بایەخ نەدان پێی لەسەردەمی عەباسییەکاندا بەشێوەیەکی گشتی وای لێهاتووە کە ئەو بایەخە وەرنەگرێت، ببێتە بنکەیەکی گرنگی بڵاو بوونەوەی ئیسلامی ولە پاڵیدا هونەری بیناکاری ونەخش ونیگار گەشە بکات.

٣. بەهۆی شەڕو ئاژاوەو گێچەڵی نەتەوەو هۆزەکانی وەکو سەلجوقی وئیلخانی وتەیموری وهۆلاکۆ، وای لێهاتووە وڵاتەکەیان تووشی کاول‌و داڕووخان کردووە.

٤. لەبەر ئەوەی ناوچەی کەرکوك شوێنێکی گرنگی ئایینی زەردەشتی ومەسیحی بووە، هەردەم هەوڵ دراوە ئەو شارستانییەتە کاول بکرێت وشوێنەواری نەمێنێت.

سەلجوقییەکان بریتین لە هۆزە کۆچەرییە تورکمانەکان، کە هاتوونەتە خوارەوە لە ئاقاری (تەرغین) لەئاسیای ناوەڕاست، هەرچەندە کە خۆیان لەهونەری بیناکاری ونەنتیکەی هونەری بەناوبانگن، چونکە لەبەر ئەوەی هەستاون بە بەکارهێنانی خەڵکی ئەو وڵاتانەی داگیریان کردووە لە ئاقارە ئیسلامییەکانداو پاڵیان پێیانەوە ناوە بۆ ئەو کارانەی پێیان وتوون لە هونەری بیناکاری، سەردەمەکەیان، ناوبانگە بەقەبەیی بیناکاری‌و فراوانی‌و بەهێزی رووکەشەکەی بەناوبانگی بە گۆڕینی وێنەی ئاژەڵ‌و جیاوازی کردنی لە سروشتدا، وەکو ئەوەی کە هونەری ئیسلامی بە شێوەیەکی گشتی پێی بەناوبانگە، بێجگە لەو دیاردانەی تەرزی سەلجوقی، زۆری بەکار هێنانی نەخش ونیگاری بەرجەستەییە، بەتایبەتی لەرووی دەرەوەی بیناکارییەکان[٤٩].

سەلجوقییەکان بەناوبانگن بەزۆری دروستکردنی مەرقەد لەسەر شێوەی قوولەی لوولەکی، یان لە شێوەی رووی جۆربەجۆر، یان لەسەر شێوەی بیناکاری شێوە گومەت، هەروەها سەلجوقییەکان بایەخیان دەدا بە دروستکردنی قوتابخانە بۆ فێرکردنی (مذهب)ی سونی[٥٠]و چۆنێتی دروستکردنی مەرقەد لەسەر شێوەی قوولەکی، بەردەوام بوو لەسەردەمی سەلجوقییەکان هەتا سەردەمی مەغۆلەکان[٥١].

### * مەرقەدی ئیمام باقر لە داقوق:

گوومەت رەگەزێکی بیناکاری گۆڕاوی هونەری (ئەزەج)ە کە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی بیناکاری وڵاتی (میزۆپۆتامیا)[٥٢]. دروستکردنی گوومەت گۆڕانی پیادا هات لەسەردەمی ئیسلامیدا، تا کار گەیشتە ئەوەی کە گوومەتی خانوو، مزگەوتەکان جیاوازی هەبوو لەگەڵ تەرزو رێگەی بیناکاری ئەو گوومەتانەی کە لەسەر مەرقەدەکان دروست کراوە، ئەمە بەردەوام بوو، هەر لەناوەڕاستی سەدەی پێنجەم هەتا سەردەمی عوسمانی، شێوەی ئەم گوومەتانە لەزۆری کاتدا (قووچەکی–قووتەکی–مخروطي) بووە، شێوەیەکی بەرزو گەورەی هەیە، ئەویش بەڵگەی گرنگی مردووەکەیە، لەناوەوەو دەرەوەی جۆرەها نەخش ونیگاری (مقرنص)ی هەیە لەیەکتری نزیك دەبێتەوە تا بەوەی قووچەکییەکە تەسك بێتەوە بەرەو سەرەوە.

ژووری مەرقەدەکە لە زۆری کاتدا پێکهاتووە لە شێوەی چوار گۆشەیی، هەندێك جار شێوە لاکێشەی بینراوە، بەڵام بەوێنەیەکی زۆر کەم، هەندێك لەو ژوورانە لاکانی لەسەر نەخشەیەکی هەشت لایی، هەموو مەرقەدەکان تەنها دەرگایەکیان هەیە، هەندێکی میحرابێکی هەیە لە ژوورەکە، یان هەندێکی تر لە تەنیشتەوە ژووری نوێژ کردنی هەیە، بەڵام هەندێکی تر هیچ بەڵگەیەك نییە کە شوێنی نوێژکردن‌و میحرابی هەبێت[٥٣].

ئەم جۆرە مەرقەدانە لەزۆر شوێنی عێراقدا هەیە کە لە دروست کردنیداخشتی سوورەوەکراو بەرد لەهەندێك کاتدا هەردووکی بەکار دەهێنرێت. جۆری (مقرنصات)ەکەی دەگۆڕێت بە پێی جۆری کەرەستەی بیناکارییەکەی، لەهەندێك ئاقار کە بەرد بەکار دەهێنرێت (مقرنصات)ەکەی سێگۆشەیە (تەخت)، بەڵام لەو ئاقارەی کە خشتی سوورەوە کراو بەکار دەهێنرێت (مقرنصات)ەکەی چەماوەیە (بۆ خوارەوە)[٥٤].

هەڵسان بەکاری دەست پێهێنان وچاککردن، یەکێکە لەو هۆیانەی، لەدەستدانی بەشێکی گەورەی نەخش ونیگاری ئەو بیناکارەیانە، هەرچەندە کە دەیپارێزێت لە رووخاندن[٥٥].

مەرقەدی ئیمام باقر دەگەڕێنەوە سەر محەمەدی باقر، بەڵام ئەم ئیمامە لە (مەدینە) لە دایك بووەو لە (بقیع) کۆچی دوایی کردووە.

ئەم مەرقەدە پێکهاتووە لە ژوورێکی چوار گۆشەیی کە لاکانی بەتەواوەتی (٥×٥)م، ئەستووری دیوارەکانی (١,٠٥) م، دەرگاکەی دەکەوێتە لای رۆژئاوای، پانییەکەی (١,٣٣) م، میحرابی ئەم مەرقەدە داپۆشراوە بە چینێکی گەچ، کە وایکردووە نەخش‌و نیگارەکانی بەدیار نەدات، بەڵام کاری ئەم تازەکردنەوەیە بەردەوام بووە تێیدا، تا کار گەیشتۆتە ئەوەی دوو پەنجەرەی تێدا کراوەتەوە، بەبەرزی یەك مەتر لەهەر یەکێکیاندا، کە کەوتوونەتە لای رۆژهەڵات‌و سەرووە، تا بۆ ئەوەی کە دەچیتە ژوورەوەی مەرقەدەکە دیمەنی گۆڕستانەکەی دەوروبەری ببینرێت.بەبەرزی هەتا (٢,٢٠) م هیچ نەخش ونیگارێك نییە، بەڵام لەوەو دواوە ریزێك (دخلات) دێت لەدەوری مەرقەدەکە، پێکهاتووە لە چوار (دخلات) لەهەر دیوارێکدا، هەر (دخلە) یەکی ناوەڕاستی پانترە لە ئەوەی ئەملاو ئەولای لەهەر سوچێکی (مقرنص)ێك دروستکراوە کە لووتکەکەی پێکهاتووە لە گرێ (عقد)ەیەکی بازنەیی کە ناوەوەی دەورەدراوە بە سێ (مقرنص)، لە نێوان دوو (مقرنص)دا پانتاییەکی نەخش ونیگار هەیە بەشێوەی لووتکەیەکی گرێی نیوە بازنەیی نەخشێکی نووك تیژ، لەم شوێنەدا پەنجەرەیەك کراوەتەوە، لەکاتی ئێستادا سێ پەنجەرەی هەیە، بەڵام پەنجەرەی چوارەم داخراوە، لەوانەیە لەکاتی تازە کردنەوەدا رووی دابێت.

بەسەر ئەم ریزەی کە باسمان کرد ریزێکی تر دێت کە دەست پێدەکات بە (مقرنصات)ی گوومەتەکە، وادیارە کە شەش ریزە، بەڵام دووبارە بیناکارییەکەی بە شێوەیەکی چاك دەرنەکراوەتەوە، کەوا دیارە رێکوپێك دەستی پێدا نەهێنراوە. لەسەر ئەم ریزانەوە دوانزە (مقرنصات) هەیە

كە كڵاوەكەی پێك دەهێنێت، پێكهاتووە لە شێوە تۆپی، ئەم دیوارانە گشتی داپۆشراوە بە چینێكی ئەستوور لە گەچ.

لەدەرەوەی ریزی (مقرنص)ە دوانزەییەكەو كڵاوەی گوومەتە شێوە تۆپییەكە، بەروونی بەدیارە، هەمووی داپۆشراوە بە گەچ، كە زۆری رووە بنەڕەتییەكەی لەدەست داوە، بەڵام شێوەی (مقرنص) ەكان و چینەكانی بە روونی دیارە.

(مقرنص)ەكان لەسەر لەشێكی شەش پاڵویی ژوورەكەن، كە درێژی لایەكی (٧,١٠)م وبەرزی پێنج مەترە، چاوی گوومەتەكەی نزیك مەترێك دەبێت لە دیوارەكانی ئەم مەرقەدە یان لە رووەكەی هیچ نووسراوێك نییە كە ئاماژە بۆ ئەوە بكات كە دەگەڕێتەوە بۆ چ كەسێكی كە لەوێ نێژراوە، یا مێژووی دروستكردنەكەی، بەڵام بە بەراووردكردنی لەگەڵ گوومەتە قووچەكییەكانی كە لە عێراقدا هەیە، هاوشێوەیە لەگەڵ گومەتی (زمرد خاتون)و (ئیمام دوری)، ئەویش لە شێوەی (مقرنص)ە لەناوەوەو دەرەوە[٥٦].

*** چینەكانی مزگەوتەكەی داقوق و منارەكەی:**

یەكێك لەو ئەمیرە بەناوبانگانەی كە دەوری هەبووە لەسەردەمی عەباسییەكان، ئەویش (موزەفەرەدین كەوكەبەری)یە كە فەرمانڕەوایەكەی بەردەوام بوو لە نێوان ساڵانی (٥٨٦-٦٣٠) كۆچی. نزیكەی دەكاتە چل وچوار ساڵ لەكاتی ئەودا هەولێر گەیشتە پۆپەی پێشكەوتن، لەلایەنەكانی بیناكاری وكۆمەڵایەتی و رۆشنبیریدا[٥٧]، یەكێك لەكارەكانی (موزەفەرەدین) لەناوچەی كەركوكدا بۆمان بەجێماوە منارەكەی (داقوق)ە، كە لە وەختی خۆیدا هەم مزگەوت و هەم منارە بووە، بەڵام مزگەوتەكەی رووخاوەو منارەكەشی لەرووخاندندایە، بەشێوەی دروستكردنی نەخشەكەی دەتوانین سەردەمەكەی دیاری بكەین، وەكو بەراووردێك لە شێوەی منارەكانی (هەولێر)و (بەغدا)و (سنجار)دا هەیە[٥٨]، بەڵام زیاتر رێگەی تێدەچێت بگەڕێتەوە سەردەمی (موزەفەرەدین كەوكەبەری)، لەنێوان ساڵانی (٥٦٢-٦٣٦)ی كۆچی[٥٩]. لە (٢٧)ی ئابی ساڵی (١٩٦٥) دا بەڕێوەبەرایەتی ئاسەوار، هەوڵیدا بەكاركردن وهەڵكەندن لە رۆژهەڵات ورۆژئاوا، بۆ دیاریكردنی پانتایی مزگەوتەكە وزانیاری دەربارەی بیناكاری و مێژووی سەردەمەكانی، توانرا كە پاشماوەی سێ مزگەوت، هەریەكەی لەسەر ئەوی تر دروستكراوە، ئەمەش وایكردووە هونەری بیناكارییەكەمان لێ بزر بكات، ئەم مزگەوتانە تووشی رووخاندن و لەناوچوون بوونە لەكاتی هێرشەكانی (تەیمور لەنگ)دا بۆ سەر رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، خەڵكەكەش خشتەكەیان دەركردووە وبەكاریان هێناوە بۆ خانوو دروستكردن، تابەوەی لەم ساڵانەی دواییدا دەوری (داقوق) كەم بۆتەوە، پاش ئەوەی هونەری بیناكاری لە (كەركوك)و دەوروبەرەكەی فراوان بووە[٦٠]. هەوڵدرا كە هەڵكۆڵین لە چینی یەكەم و دووەم زیاتر بكرێت، هەتا چینی سێیەم، ئەو شێوەیە بەكارهات بۆ دۆزینەوەی ئەوەیە كە تەنها بۆ چینێكی دیاری كراو نەگەڕان، بەڵام بەدوای هەر سێ چینەكەدا گەڕان لەیەك كاتدا لەشوێنی نوێژكردن ولای رۆژئاوای بەشێوەیەكی تایبەتی.

كاتێك چینی یەكەم و دووەم دۆزرایەوە، هەوڵدرا كە بەڵگەیەك بدۆزرێتەوە بۆ بوونی چینی سێیەم، بێجگە لە مزگەوتی یەكەم ومزگەوتی دووەم.

مزگەوتی سێیەم پێكهاتووە لەسێ بەش: شوێنی نوێژكردن وحەوشەو كۆڵەكەكانی مزگەوتەكەو لاكانی رۆژهەڵات و رۆژئاوای، لەگەڵ منارە بەناوبانگەكەی. لەپێشدا شوێنی نوێژ كردنەكەی دۆزراوەتەوە، پێكهاتووە لەسێ بەشی كۆڵەكە لوولەكی، دروستكراوە بەخشتی سوورەوەكراو، لەدەرەوە فراوان كراوە بە چینێكی زۆر گەچ، كۆڵەكەكانی لەسەر بنكەیەكی چوار گۆشە چەسپ كراوە لە خشتی سوورەوەكراو وگەچ، درێژی بنكەكەی (١,١٧)م، بەرزی كۆڵەكەكان لە نێوان (٣٠-١٠٠)سم، بنكەی ژێرەوەی كۆڵەكەكان چەسپ كراوە، بەبەردی گەورەو خوڵ و نوورە، بەقووڵی (١,٦٠)م، شوێنی نوێژكردنەكە پێكهاتووە لە چوار حەوشەی پانی، كە لەرۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوایە لەسەر حەوت حەوشی درێژی لەسەرەوە بۆ خوارەوە ئەو خشتەی كە بەكار هاتووە بۆ خشت رێژكردنی زەوی مزگەوتەكە پێوانەكەی (٤٠×٤٠×٢)سم بەڵام لەكاتی چاككردندا قەبارەكەی كراوە بە خشتی (٢٤,٥×٢٤,٥×٥,٥)سم.

ئەو دیوارەی كە شوێنی نوێژكردنەكە جیادەكاتەوە



نەخشەكانی منارەی داقوق

## وێنەیەکی گشتی بەشی ناوڕاستی نوێژکردنی مزگەوت




پاشماوەی دۆزراوی بەشی ناوەڕاستی شوێنی نوێژکردنی هەر سێ مزگەوتەکە

لە حەوشەی مزگەوتەکە چەند شتێکی دەرچوو هەیە لە دوای کۆڵەکەکانەوە لەلای ڕۆژئاوایەوە دعامەیەکی سەیری هەیە پێکهاتووە لە چوار کۆڵەکەی نیوە بازنەیی لەسەر بنکەیەکی چوار گۆشەیی، کە ئەمانە دەکەونە دوای کۆڵەکەی یەکەمەوە[٦١].

کۆی گشتی پێوانەی نوێژکردنەکە (٤٤٢) مەتر دووجایە وادەبینین درێژی نوێژکردنەکە (٢٦) مەترو پانییەکەی (١٧) مەتر بێ، بەڵام پێوانەی مزگەوتەکە (٢٢,٩) مەترە لە ناوەوە، هۆی ئەو جیاوازییە هەیە لەنێوان درێژی نوێژکردن ودرێژی لای مزگەوتەکە دەگەڕێتەوە بۆ بوونی (دکاکی) لەهەردوولای ڕۆژهەڵات وڕۆژئاوای مزگەوتەکە[٦٢].

منارەکەی داقووق دەکەوێتە سووچی خوارووی ڕۆژئاوای مزگەوتە کۆنەکەوە، کە درێژییەکەی ئێستای لەسەر گردەکەوە (١٧,٨٠) مەترە، بەڵام لە ڕووی مزگەوتە کۆنەکەوە

(٢٣) مەترە[٦٣].

بنکەکەی هەشت لاییە، لەوانەیە دوو حەوزی بێت[٦٤]، ئەم منارەیە شێوێنراوە چ هۆی سروشتی بووبێت یان مرۆیی، خەڵکی ناوچەکە هەوڵی دەرکردنی خشتەکانیان داوە بە پێی سەردەم بۆ دروستکردنی خانووەکانیان بە تایبەتی لەبنکەکەیەوە دەرکراوە، بەڵام ئینگلیزەکان لەکاتی خۆیاندا چاکیان کردووەتەوە، بنکەکەی شێوێنراوە، لە ساڵی (١٩٢٥) دا دیسان دەستکراوە بەچاککردنی سەرووی رۆژهەڵاتییەوە بەخشتو نوورە، لەساڵی (٢٧)ی ئابی ساڵی (١٩٦٥) دیسان دەستی پێداهێنراوە بۆ چاککردن[٦٥].

ئەم منارەیە لەخشتی سوورەوەکراو دروستکراوە لە سەرەوە، بەڵام بنکەکەی لەخشتی سوورەکراوو نوورە دروستکراوە، بنکەکەی شێوەیەکی چوار گۆشەیی هەیە، درێژی لاکانی نزیکەی (٤) مەتر دەبێت وبەرزی لەزەوی مزگەوتەکەوە نزیکەی مەترێك دەبێت، شێوە هەشت لایەکەی درێژی لاکەی (١,٦٠) مەتر دەبێت، ئینجا شێوە لوولەکییە نەخشدارەکەی دێت کە بەسێ شێوە نەخش کراوە[٦٦]. جۆرو قەبارەی ئەو خشتەی کە بەکارهاتووە، لەدروستکردنی منارەکەدا بریتییە لە شێوەیەکی چوارگۆشەیی، درێژی لاکەی (٢٢) سم دەبێت، قەبارەکەی (٦) سم دەبێت، شێوەیەکی پتەو ورەنگێکی سووری هەیە، هەروەها هی مزگەوتەکەش چوارگۆشەییە، درێژییەکەی (٢٢,٥) سم دەبێت، قەبارەی (٦,٥) سم، بەڵام لەکاتی چاککردنەکەدا خشتی (١٨,٥) سم، بەقەبارەی (٥) سم بەکارهاتووە[٦٧].

ئەوکەرەستانەی بەکارهێناوە لە مزگەوتو منارەکەدا بریتییە لە قامیشو خشتی کاڵ وقوڕی گیراوە بەشێوەیەکی سەرەکی، گەچو خشتی سوورەوە کراویش لە کاتی پێویستدا بەکارهاتووە.

(بنکەی هەشت لاییەکەی دانراوە بەدوو ریز میحرابی چەماوە (کەوانە)، لاشەکەشی رازاوەتەوە بەچەند شێوەیەکی نەخش ونیگاری ئەندازەیی هونەریان بەکار هێناوە لەریزی خشتەکان[٦٨]. دەتوانیت بگەیتە سەر منارەکە بەهۆی پەیژەیەکی حەلەزۆنی، کەدەست پێدەکات لەسەری بنکەکەیەوە، کە لاشەکەی دەبرێت بەڕوویەکی پێچەوانەی میلی کاتژمێر[٦٩].

لاشە لوولەکییەکەی رازاوەتەوە بەسێ جۆر نەخش ونیگار. ئەو نەخش ونیگارەی کە لاشە هەشت لاییەکەی رازاندووەتەوە، بریتییە لە نەخشی خشتی سوورەوەکراو و پێکهاتووە لە (شرفة عمياء)ی لاکێشەیی شێوە، لەناوەوە گرێی نووك تیژی هەیە، هەرلەبەرزی ئەوەوە (شرفە) یەکی بچووك هەیە کە هیچ گرێی تێدا نییە، ئەم نەخشانە تەنها پێنج رووی ئەم شێوە هەشت لایەی رازاندووەتەوە، رووەکانی تری هیچ نەخشێکی تێدا نییە، رووی سەروو رۆژهەڵاتی منارەکە پاشماوەی دیوارێکی خواروو رۆژهەڵاتی مزگەوتەکە دیارە، بەڵام رووی خوارووی رۆژئاوایی لاشە هەشت لایەکەی کەوتووەتە نێو مزگەوتەکەوە.

لاشەیی لوولەکی منارەکە سێ جۆر نەخشو نیگاری خشتی سوورەکراوی هەیە، یەکەمیان بریتییە لە شریتێکی تەنکی پێکهاتوو لە نەخشی چوار گۆشەیی، لە تەنیشتیەوەی دوو شێوە (امیجان) هەیە، جۆری دووەم پێکهاتووە لە نەخشی خشتی سوورەوەکراو لە هێڵی شکاوە، سێیەم بریتییە لە (معینی) نادیار[٧٠].

لە منارەکەی داقوقو مزگەوتەکەیدا چەند پاشماوەیەکی گۆزەکاری وملوانکەو شتی جوانکاری دۆزراوەتەوە. دۆزینەوەی جەڕیەکی رەنگی قاوەیی، مەیلی بەرەو سەوز هەیە کە یەك دەسکی هەیە، بەناوبانگە بە (بارپۆتین)، ملێکی (قووچکی) هەیەو بنکەکەی بۆ سەرەوەیە لێوارەکەی شکاوەیە، بنکەکەی تەسکەو کەوانەییە، کونی تێدا هەیە، نەخش کراوە بە نەخشی (ناتئ) لەدەسکەکەیو لەسەر بنکەکەی، لەلای دەسکەکەی نەخشی ریزێك سەری مرۆڤ هەیە کە ژمارەی (١٤) سەر دەبێت، کە بە سوور نەخش کراوە، نەخشەکانی خوارەوەی بریتییە لە بازنەی بچووك وئەستێرە کە لەشی جەڕەکەی داپۆشیوە.

دۆزینەوەی جەڕەیەکی شێوە تەشی (مغزل)، کە رەنگی شینە لە ناوەوەو دەرەوە[٧١]، دۆزینەوە جەڕەیەکی مسی مل درێژ، کە نەخشی شێوە کەوانەیی پێوەیە، ناوی خاوەنەکەی لەسەر نوسراوە بنکەکەی قۆقزە (مقعر)، لەشەکەی نیوە قۆپییە، ناوی خاوەنەکەی (حیدر رزا علیشای)یە، کە نزیکەی (٦٨١) پارچە پارە لەناو ئەم جەڕەدا دۆزراوەتەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی قەرەقۆینلۆ وتەیمور لەنگ[٧٢].

*** هونەری بیناکاری ونەخش ونیگاری سەردەمی (مەغۆلی- ئیلخانی) یەکان:**

داگیرکردنی مەغۆلی بۆ عێراق بەشێك بوو، لەدروستکردنی ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی گەورە، کە ئەمە لەسەردەمی جەنگیزخاندا سەری گرت، ئەمیش بەداگیرکردنی بەشێکی گەورە لە (چین) و ناوەڕاستی ئاسیا و رۆژهەڵاتی ئەوروپا. کە هۆلاکۆ بەرەو عێراق هات بۆ ئەوەی بتوانێت وڵاتانی ئیسلام لەرۆژهەڵات داگیر بکات[٧٣].

ئیلخانییەکان فەرمانڕەوای عێراقیان کردووە لە ماوەی هەشتاو دوو ساڵ لە نێوان (٦٥٦-٧٣٨)ی کۆچی (١٢٥٨- ١٣٢٨) ی زایینی، لە دوای ئەوان جەلائیرییەکان هاتوونە تا ساڵی (٨١٤) کۆچی، چەند ساڵێکیش لەژێر فەرمانڕەوایی (تەیمور لەنگ)دا بووە[٧٤].

ئەو تایبەتمەندییەی کە بیناکاری ونەخش ونیگاری مەغۆلییەکان پێی بەناوبانگە:

١. بایەخدان بە رووی بیناکاری، ئەویش لەبایەخ بەدەرەوەو ناوەوەی، بەتایبەتی دەرگای سەرەکی بیناکارییەکە.

٢. منارە لەکاتی عەباسییەکاندا بەسترابووە بە مزگەوتەکەوە ئەویش بەجیاکردنەوەی منارەکە لە بیناکارییەکە.

٣. ئەو کەوانەییەی کە لەسەردەمی عەباسییەکاندا هەبوو گەشەی پێدراو زیاتر تیژ بوو لەگەڵ زیاتر نزمیدا.

٤. بەکارهێنانی (مقرنصات) بەشێوەیەکی چڕ لە منارە دروست کردندا.

٥. بەکارهێنانی خشتی سوور، کە بەناوبانگە بە بچووکی

قەبارە، ئەمیش یارمەتی ئەوە دەدات بۆ شێوە سازدانی نەخش و نیگار.

٦. لەم ماوەیەدا شێوازی نەخش ونیگاری قووڵ لەسەر خشت بەناوبانگ بوو، کە بووە گواستنەوەی نەخش ونیگاری ئەندازەیی ورووەکی لەسەر گەچ ومەرمەڕ بۆ سەر خشت.

٧. بەکارهێنانی کاشانی لەسەر پانتاییەکی فراوان وجوانکردنی نەخش ونیگاری خشتی پێی[٧٥].

٨. بایەخدان بە جۆرەها رەنگ، وزیاتر بایەخ بە رەنگی شین و رەنگی کایی کراوە.

٩. بایەخدان بەخەت و کەمکردنەوەی پانتایی رەنگی.

١٠ بایەخدان بە دەرخستن و جل و بەرگی وێنەو نەخشەکان.

١١. بایەخدان بە هێزی دەربڕین.. وبایەخ بە شێوازی (چین) لە وێنەکێشاندا.

١٢. بەکارهێنانی خەتی کوفی، وبەکارهێنانی خەت بە گەورەیی بەتایبەتی لەسەر مەرقەدەکان[٧٦].

*** گومەزی سەوز – گومەزی بوغدە خان:**

لە کاتی ئێستادا پێی دەڵێن گومەزی سەوز، کە خەڵکەکە باوەڕیان وابووە، ئەو کاشیانەیەی کە بەکار هاتووە لە نەخش ونیگارەکەیدا، رەنگی سەوزە، بەڵام دوای لێکۆڵینەوە بەدەرکەوت رەنگی شینە نەك سەوز، ئەویش بە بەکارهێنانی قاشانی شینە لە نەخش و نیگاردا[٧٧]. یان ئەم مەرقەدە بەناوی ئەو ئافرەتەوە بەناوبانگە کە لە کاتی رۆیشتنی بۆ بەجێگەیاندنی ئەرکی (حەج) لە کەرکوك کۆچی دوایی کردووە بەناوی (بوغدە خان)[٧٨]، یان هەندێك لە سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە گوایە ئەم مەرقەدە شوێنی شازادەیەکی کورد بووە لە سەردەمی ئیمارەتی زەنگەنەدا، بۆیە تاکو ئێستاکە لێکۆڵینەوەی تەواو لە بنەڕەتی ناوەکەی نەکراوە.

ئەم گوومەتە لەسەر قەڵایە لە سووچی خوارووی ماڵی (کەماڵ زادە ئەحمەد)، لە نزیکی دەرگای قەڵا لە سەرووەوە، لەدووری دەرگاکەوە بە نزیکەی (٢٠٠)م.

دەربارەی مێژووی ئەم گوومەتە لەهیچ سەرچاوەیەکی باس نەکراوە، بەڵام نووسینێکی مێژوویی هەیە لە یەکێك لە دەروازەکانی، کە گوایە گۆڕی ئافرەتێکی گەنجە، ساڵی (١٣٦٠)ی زایینی بۆ دانراوە، ئەمیش بەڵگەیە بۆ ئەوەی دەگەڕێتەوە کۆتایی ئیلخانییەکان و سەرەتای فەرمانڕەوایی جەلایریەکان، کە بایەخیان بە گوومەت و بەکارهێنانی رەنگی شین لەسەر کاشانی، هەروەکو ئەوەی لەم گوومەتەدا بەکارهاتووە.

بیناکارییەکی هەشت لاییە، لایەکی (٥) مەتر دەبێت بەرزی گشتی (١٠) مەتر دەبێت، بەرزی دیوارەکانی شەش مەتر دەبێت، پێکهاتووە لە دوو چین، چینی ژێرەوە چوار گۆشەیە لە ناوەوە سێ پەنجەرەو دەرگایەکی هەیە بۆ رووناکی، سەرەوەی بریتییە لە دوو گوومەتی لەسەر یەك، کە گوومەتی یەکەم (لەناوەوە) هەشت لای هەیە، دانراوە لەسەر چوار کەوانەی نیوە بازنەیی، بەڵام دووەم پێکهاتووە لە زەوی چینی دووەم، چینی زەوی لە ناوەوە بریتییە لە چاڵێکی شێوە لاکێشەیی، درێژی (٣,٢٠) مەترو پانی (٢,٥) مەتر دەبێت و قووڵی دوو مەترە، کە لاشەی مردووەکەی لە نێو گۆڕەکەدا بووە بەڵام لەلایەن خەڵکەوە تاڵان کراوە کە گوایە ئاڵتوونی تێدا هەبووە.

چینی دووەم لە ناوەوە چوار گۆشەیە، بریتییە لە چوار کەوانەی شێوە نووك تیژ، لە شێوەی (کوە) لە نێو ئەم کەوانەدا نەخش ونیگاری رووەکی هەیە، کە رەنگ کراوە بە قاوەیی، بەڵام لە کۆتایی گرێی ژێرەوەی کەوانەییەکان، بوونی ئەفریزی کاشانی شین کە بەدەوری لاشەی گوومەتەکەدا هاتووە لە ناوەوە، هەر چوار سووچەکەی (مقرنصات) ی هەیە، گوومەتەکەی لەسەر دانراوە، ئەم گوومەتە وا بە دەردەکەوێت کە لەوانەیە نووك تیژ بووبێت.

شێوەی بیناکارییەکە لەدەرەوە هەشت لایی هەیە لەسەر بنکەیەك دانراوە، دروستکراوە لەبەرد وگەچ، بەرزییەکەی (١,٥) مەترە، لەسەر بنکەکەیەوە ریزێك خشت (منجور) دانراوە بەرزی (٦)سم، کە بەدەوری گوومەتەکەدا هاتووە، درێژی گشتی (١٩,٨٤)م، رووبەری گوومەتەکە لەدەرەوە، لەسەریەوە ریزێك لەبەردی سووری رێك و پێك دانراوە وپێوانەی یەکێکی (٣٥,٥×٣٠) سم، ئەم جۆرە بەردانە بەرگەی هۆیە سروشتییەکان دەگرێت وەکو باران، لەسەر ئەمەوە ریزێك خشتی (منجور) بەرزییەکەی (٥) سم، لەبان ئەوەوە ریزێکی تر خشت هەیە کە لەسەر شێوەی ئاسۆییە (کاز) بەرزییەکەی (٢٨)سم، ئینجا لێواری ئەفریزەکان دێت، ژمارەی هەشت یەکییە، پێوانەی یەکێکی (١٨١-٨٠)سم، بەڵام درێژی نەخشی لە بزینەیی (معینی) (١٤٠)سم، لەسەر جامییە نەخشییەکاندا ریزێك خشتی منجور دروستکراوە بەرزییەکەی (٢٨)سم، بە شێوەی ئاسۆیی (کاز) کە کەوتووەتە سەری هەشت یەکەی نەخشی لە هەرلایەکی رووەکانی هەشت گوومەتییە نەخشییەکە، کە شێوە لاکێشەییە، بریتییە لە چوارچێوەی شێوە لە بزینەیی، لەناویدا ئەستێرەیەکی چوار لایی هەیە. لەلای دووەمی شێوە لەبزینەییکی تر هەیە لە کاشانی شین، چوار چێوەیەکی تر هەیە دوای چوار چێوەی یەکەم، کە لەناویدا نەخشێکی گوڵی هەیە کە هەشت رووی هەیە، لەخشتی مەنجورو هەڵکۆڵراو دروستکراوە، درێژ دەبێتەوە، هەتا پێش سەرەتای راگیر بوونی گوومەتەکە.

لەنێوان هەر یەکەیەکی نەخشی ئەندازەیی، یەکەیەکی تر هەیە کە لە ناویدا نەخشی نووسین هەیە بەکاشانی تێکەڵاو



نەخشی یەکێك لە دیوارەکانی مەرقەدی (بوغدە خان)










**چەند ڕوویەكی مەرقەدی (بوغدە خان)**

به جۆرەها رەنگ كه ئەوەی لێی ماوه بەم جۆرەیە:

١. هذه تربة المرحومة السعيدة.

٢. المغضة في شبابها باشا بنت الحاجية بغدا.

٣. د. خاتون بنت المرحوم السيد مسافر (ابن) هند (مسافر هند ابن).

٤. بكا ثامر توفت في تأريخ ذي (.

٥. لعقده من سنة اثنين وستين وسبعما.

٦. يه وكانت تعيسة وكانت من العنر (وكان من العمر لها) (.

٧. ربعة وعشرون سنة وصلى الله على محمد،

ئەم جۆرە نەخشە نووسراوانە لەو شوێنانەیە كە پەنجەرەی لێیە، ئەم نەخشانە درێژ بۆتەوە لەسەرتای هەرە پەنجەرەیەك لە پەنجەرەكانی چینی دووەم وهەتا كۆتایی جامەكە، ئەم نووسراوانەی كە باسمان كرد هەندێكی تری بریتییە لە ئایاتی قورئانی وسەڵەوات وپاڕانەوە، بەڵام زۆوری ئەمانە تووشی داخوڕان و رووخاندن بووە، ئەویش بە هۆی هۆیەكانی ئاوو هەواوە لەسەر ئەو نەخشانەی كە باسمان كرد.

پێش سەرەتای راگیر بوونی گوومەتەكەی، ریزێك لە خشتی مەنجور هەیە، بەدانانی شێوە ئاسۆیی (كاذ) بەرزی (٢٨)سم، ئینجا ئەفریزێك لە نووسینی گەچی دێت بەدەوری بنكەی گوومەتەكە، كە بە پیتی گەورە نووسراوە لەوانەیە سەڵەوات و ئایاتی قورئانی بووبێت كە تووشی داخوڕاندن بووە تەنها دوو وشەی ماوە (الحمد لله).

لەدوای ئەفریزە نووسراوەكە گوومەتەكە دەست پێدەكات، هیچ پاشماوەیەكی نەماوە، تەنها لەناوەوە نەبێت كە لەوانەیە شێوە نووك تیژ بووبێت، بریتییە لە دوو گوومەتی لەسەر یەك كە یەكەمی گوومەتی ناوەوەیەتی و دووەمی گوومەتی دەرەوەیەتی[٧٩].

*** منارەكەی دانیال پێغەمبەر:**

ئەم منارەیە لەسەر قەڵایە، كۆنترین مزگەوتێكە كە تاوەكو ئێستا منارەكەی سەر كەشە، نزیكەی (١٠٠)م لەمزگەوتی گەورەوە دوورە، لەسەر قەڵا، مێژووی دروست كردنی ئەم منارەیە دەگەڕێتەوە كۆتایی سەردەمی مەغۆلی (٦٥٦-٧٣٨)ی كۆچی وسەرەتای ماوەی (تەیمور لەنگ) بیناكاری ئەم منارەیە بەناوبانگە بە دروستكردنی گرێ وكەوانەی جوانی تێدا[٨٠].

بنكەی ئەم منارەیە هەشت لاییە، شێوەی داڕێژراوە، چ لەباریكی ئاسۆیی یان ستوونی. هەروەها سەرەوەی منارەكە (مقرنصات)ی تێدا بەكارهێنراوە، لەگەڵ بوونی گوومەزێك لەسەر منارەكە وەكو وتمان بنكەی





چەند ڕوویەكی مەرقەدی (دانیال پێغەمبەر)

منارەکە هەشت لاییە کە منارەکەی لەسەر دروستکراوە وبەمزگەوتەکەوە نەلکێنراوە، لە خوارووی بنکەکەی دەرگای هەیە کە لە شێوەی کەوانەیەکی نووك تیژ دروستکراوە، بۆ سەرکەوتن بۆ سەر منارەکە، لاشەی منارەکە لوولەکییە کە بە پێنج یەکەیی خشتی دابەش کراوە لە تێکهەڵکێشی خشتەکان لەباری ئاسۆیی و ستوونیدا، کە هەر یەکەیەکی نزیکەی (٢٧) خشتی لە خۆ گرتووە لەباری ستوونی ئینجا ریزێك خشت دێت لە باری ئاسۆیی، کە یەکەی سەرەوەی نزیکەی (١١) خشتی باری ئەستونییە، خشتە ئەستوونییەکان یەکێکە لەسەر رووی ئەستوونییەکە دانراوە، ئەوەی تر لەسەر ئەم چینانەی کە باسمان کرد، سێ ریز مقرنصات دێت، کە بە شێوەی خشتەکان زۆر جوان داڕێژراوە وەك بەدەردەکەوێت خشتی مقرنصاتەکان چوار گۆشەییە بەڵام لەسەر رووی سێ گۆشەی سێ - سێ لەسەر یەکتری دەستیان دەرکردووەتە دەرەوە، لەسەر مقرنصاتەکەوە، ریزێك خشت دانراوە ئینجا چەند ریزێك خشت بازنەیەکی جوانی دروست کردووە لەسەر منارەکە پێشکەیشتن بە گومەزەکەی ئەم بازنەیەی رازاوەتەوە بە (١٦) ریز خشت لەسەر باری ئاسۆیی، لەنێو ئەو بازنەیەدا، کە قەبارەکەی زۆر لەلاشەی منارەکە بچووك ترە، لووتکەی گوومەتەکە تیژە.

*** مەرقەدی ئیمام ئیسماعیل:**



مەرقەدی ئیمام ئیسماعیل

ئەم مەرقەدە کەوتووەتە قەزای حەویجەوە، ئەو پاشماوەیەی کە ماوە لێی بریتییە لە گوومەتە کەوانەیەکەی زۆر رووخاوەو منارەکەی لەتەکیدا داکەوتووە، بەکەوانەییە تیژەکانی دەگەڕێتەوە تەرزی بیناکاری عەباسییەکان، منارەکە لوولەکی شێوەیە، دروستکراوە لە خشت و فەرشی، بەڵام کە سەیری شێوەی بیناکارییەکەی دەکەی، هەست دەکەی کە لە کاتی خۆیدا، زۆر بایەخ بە دروست کردنەکەی دراوە، بەڵام مێژووی بە پێی ئەوەی لەسەر یەکێك لەخشتەکان نووسراوە مێژووی (٦٧٠)ی کۆچی بۆ دانراوە، کە دەکاتە سەردەمی ئیلخانییەکان لە ماوەی عەباسی دواوە، تەرزی بیناکارییەکەی هاوشێوەیە لەگەڵ مەزاری (اربعین) لە تکریت کە دەگەڕێتەوە ساڵی (٦٦٠) ی کۆچی. باوەڕ وایە کە لەکاتی خۆیدا ئەمە قوتابخانەی ئایینی بووبێت و شێوە چوار گۆشەیی بووە[٨١].

لەزۆری بیناکارییەکەدا هونەری کراوە لە دانانی خشتەکانی و دروست کردنی کەوانەیی لە کۆڵەکەی مەرقەدەکەدا کە کەوانەییەکان درێژن و نووکەکانیان تیژەو، خشتی دوو جۆر بەکار هاتووە لە رازاندنەوەی تەرزی بیناکارییەکە.

*** دۆزینەوەی قەیسەریی ئاڵوویرکردنی خوری لەسەر قەڵا:**

دۆزینەوەی کۆنترین قەیسەری لەسەر قەڵا، کە ژمارەی (٣٤) دووکانی بچووك دەبێت، دابەش کراوەتە سەر دوو ریزی بەرامبەر یەکتری هەر (١٧) دووکانی لە ریزێکە، پێوانەی هەر ژوورێکی (٢,٣×٣,٦) مەترە لە نێوانیان ڕاڕەوێك (رواق)ی شێوە لاکێشەیی جیای کردووەتەوە کە پانی (٤,٥)مەترەو درێژی (٤٥) مەتری چوار گۆشەیە، رووی دووکانەکان گرێ (عقود) یەکی بچووکی لە مەڕمەڕ بەرز بۆتەوە، ئەم بازاڕە دروستکراوە لە بەردی سوورو گەچ، لە کۆتایی ڕاڕەوکە دەروازەیەك هەیە پەیژەکەی دیسانەوە لە مەڕمەڕ دروست کراوە[٨٢].

دەربارەی مێژووی تا ئێستا شتێکی سەلمێنراو نییە کە مێژووەکەی بگەڕێنێتەوە سەردەمێکی دیاریکراو، ئەوەی دۆزراوەتەوە لەسەر قەڵا کە لە نێوان (٧٠٠-٨٠٠) ی کۆچی بۆ دانراوە.

*** شوورەو بوورجی دۆزراوەی قەڵا:**

کەوتووەتە لای، دەرگای (تۆپ قاپی)یەوە، کە درێژی ئەو شوورەیە وبورجەکەی (٢٤) مەترە، وبەرزییەکەی (٨,٥) مەترە لەگەڵ لێوارەکانی کۆتایی، بەشی دۆزراوەی کۆنی دروست کراوە لە بەردی سپی وخشتی فەرش لەسەر شێوە (زگزاگ)، بەبەرزی (٧٠) سم، بە هۆی ئەو نەخشەی لە خشتەکە هەیە، دەتوانین مێژووەکەی بگەڕێنینەوە بۆ نێوان (٧٠٠-٨٠٠)ی کۆچی.

لەناوەڕاستی شوورەو بوورجەکەدا دەروازەی بارێك هەیە بۆ سەیر کردن لە ژوورەوە، کەژمارەیان لەشوورەکەدا (٨)ە، لە بورجەکەدا (٢)ە لە دیووی ژوورەوە بوورجەکە ژوورێك هەیە، کە شێوە چوار گۆشەییە، کە پێی دەچێت



قەیسەری ئالۆوێرکردنی خوری لەسەر قەلاّ



شوورەو بوورجی دۆزراوەی قەلاّ

شوێنی ئێشك گرتن بووبێت[٨٣].

*** زندان - گرتووخانە:**

بریتییە لە خانوویەکی چەند نهۆمی، کە یەکێکە لە بیناکارییە کۆنەکان، کەوتووەتە نزیك دەرگای (یەدی قزلەر) ەوە بریتییە، لە ژێر زەمینی تاریك و ژوور لەسەریەوە، کە ئەمە لە سەردەمە جیاجیایەکاندا بەکار هێنراوە وەکو بەندیخانەیەکی شاری کەرکوك[٨٤].

ئەوەی راستی بێت ئەم خانووە ئێستا لە ژێر چینی ژێرەوەیەو هەتاوەکو ئێستا هەڵکۆڵین نەکراوە، بۆ دۆزینەوەی پاشماوەی ئەم بیناکارییە.

لە بنەڕەتدا (زندان) خانووی (رەسول ئاغای) باپیرەی پێنجەمی (سەیید نورەددین) بووەو مێژووەکەی دەگەڕێتەوە پێش چوارسەد ساڵ لەمەوبەرو پێنج چینە، چینی ژێرەوە زیندان بووەو هەر کەسێ بووەتە دەسەلاّتدار گیراوەکانی لەوێدا بەند کردووە تا ناوی ئەو گەڕەکە بووە بە گەڕەکی (زندان)و لە کۆنەوە وتویانە: (گۆڕی حەوت کچەکە لە زینداندایە) بۆ ترساندنی خەڵك تا نەچنە ناوی.

(زندان) لە کاتی دەوڵەتی عوسمانیدا بەندینخانەی ئەو کەسانە بوو کە لە سێدارە دەدران، شەربەیەکی ئاوو سێ نانی دەدانە ئەو کەسەی حوکمی لە سێداردانی هەبووە، بینای (زندان) لە کۆندا قەلاّیەکی سەختی بلّند بووە[٨٥].

*** شوورەو کۆشکەکەی داقوق:**

سەرچاوەکان دەسنیشانی ئەوە دەکەن، کە شوورەیەك بە دەوری داقوقدا هەبووە لەکۆتایی سەدەی دووی کۆچیدا، هەروەها بوونی منارەیەکی جوان بەڵگەیە لەبوونی شارێکی ڕێك و فراوان.

خانووەکان لە قوڕو خشتی کاڵ دروست کراوە، کەمێکی لە خشتی سوورەوەکراوە، بەڵام هەندێك لە خانووەکان لە پاشماوەی ئەو شوێنەوارەدایە، کە لە داقوقدا هەبوو، کە بەڵگەی ئەوەیە خەڵکەکە خشتی ئەو شوورە وکۆشکەیان بەکار هێناوە[٨٦].

سەرچاوەکان باسی ئەوە دەکەن کە چۆن شوورەیەکی بەهێز هەبووە، کە دووژمن زەفەری پێ نەبردووە، لەکاتی هێرش کردندا بۆ سەر شاری داقوق، نەتوانراوە داگیر بکرێت تەنها بە ئاشتی دەرگای شوورەکە کراوەتەوەو بەس، کە هەردوولا، دوژمن و خەڵکی داقوق رێککەوتوونە.

ئەوەی گرنگە (داقوق) شوورەیەك بە دەوریدا هەبووە، چۆن بووە، فراوانییەکەی چەند بووە تاکوێ بووە، چەند جار چاککراوە، دروست کراوە بۆچی رووخاوە، ئەو کەرەستانەی کەپێی دروستکراوە چی بووە.

باسی بوونی کۆشکێکی فراوانیش لەسەرچاوەکاندا باسی لێوەکراوە، بەڵام هیچ شتێك دەربارەی نازانرێت کە سنوورەکەی و بورجەکەی وفراوانییەکەی چۆن بووە، تا چ رادەیەك بەهێز بووە، بەچی دروستکراوە و، نازانرێت شوورەکەی لە چواردەوری شار بووە یان لە دەرەوەی شار بووە، ئایا کۆشکەکە لەناوشوورەکە بووە یان لەدەرەوەی شوورەکە[٨٧].

*** شوورەی دەوری شاری پردێ-ئاڵتون کۆپری:**

سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە شوورە هەبووە لە دەوری ئاڵتون کۆپری، کە تا ئەم ساڵانەی دوایی پاشماوەی ئەم شوورانە مابوو، بریتی بوو لە دوو شوورە یەکێکی پێی وتراوە شوورەی گەورە. لە تەنیشتییەوە یەکێکی هەبوو، بەڵام لەوە بچووکتر پێی وتراوە شوورەی بچووك، بۆ پارێزگاری شوورە گەورەکە. تا کار گەیشتۆتە ئەوەی کە شوورەیەکی قایمی لێ دەرچووەو ترسی خستۆتە دڵی ئەوەی سەیری کردووە.

شوورە گەورەکەی ئاڵتون کۆپری پێك هاتبوو، لە چوار دەرگا، وەکو دەرگای سەرای، بریتی بووە لە دەرگایەکی پتەوو قایم، کەوتبووە لای رۆژهەڵاتی شارەکە لەلای بنکەی بەڕێوەبردنی، ناوچەکە، دەرگایەکی تر پێی دەڵێن، دەرگای رووبار (چای قاپسی) لەلای سەرووی شارەکەوە دەرگای سێیەم، دەرگای قەڵا، لە شوێنی پەڕینەوە بۆ لای رۆژئاوای شارەکە، دەرگای چوارەم پێی دەڵێن دەرگای (تلحدر)، لەلای خواروو، شوێنی ئەوانەی ئیش دەکەن بە کاری بازرگانی لەسەر رووبارەکە بە هۆی کەڵەکەوە بۆ پەڕینەوە[٨٨].

*** قەڵای چەمچەماڵ:**

بوونی گردێکی بەرز هەیە، کە لە کاتی ئاشووری و بابلییەکاندا، بنکەی بەڕێوەبەری بووە، نووسینێکی لێ دۆزراوەتەوە، دەگەڕێتەوە ناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پێش زایینی، باوەڕ وایە کە ئەم گردە پاشماوەی شاری (دورتالیتی)یە کە ئاشوورییەکان لە هێرشەکانی (ناسر پاڵی دووەم) لە سەدەی نۆیەمی پێش زایینی باسی دەکەن لە کاتی هێرش بۆ سەر وڵاتی (زاموا)[٨٩]. بەڵام لەوانەیە لەسەردەمە ئیسلامییەکاندا دووبارە ئاوەدان کرابێت و کرابێتە قەڵاو شوورەی بەدەوردا دروست کرابێت، سەرچاوەی پێویست بەدەستمانەوە نییە بۆ رووی بیناکاری ئەو قەڵایە[٩٠].

لەم ساڵانەی دواییدا چەند جارێك هەڵکۆڵین کراوە لەسەریدا لەلایەن تیمێکی بیانییەوە، لە چینی سەرەوەدا گەلێك پاشماوەی سەردەمی ئیسلامی تێدا دۆزراوەتەوە لە هونەری خانوو و گۆزەکاریدا، بەڵام تاکو ئێستاکە هەڵکۆڵینی تەواوی بۆ نەکراوە.

*** قەڵای کەڵاوقووت - کەڵا قووت:**

وای بۆ دەچم ناوی گوندەکەش لە قووڵی قەڵاکەوە ناوەکەی بەسەرەوە سەپێنراوە، چونکە وەکو باسی لێدەکەن، کە گوومەزێکی قووڵی هەبووەو تا ئەم ساڵانەی دوایی خەڵکی شتی لێدەرکردووە کە ژووری هەبووە بۆ



قەڵای چەمچەماڵ

چوونەتە ژوورەوە[*].

*** مێژووی هونەری بیناکاری ونەخش ونیگاری ناوچەی کەرکوك (سەردەمی عوسمانییەکان):**

دەوڵـەتی عوسمانی لە کۆتایی سـەدەی سیانزەهەمی زاینیدا دروست بـوو.. کە عـێراق داگیر نەکرا تا لە کاتی فەرمانڕەوایی سولّتان سلێمان قانونی نەبێت لە ساڵی (١٥٣٤)ی زاییـنی، لـەدوای زیاتر لـە دوو سـەدە لـەدوای دروست بوونیدا.

لەم ماوە دوورودرێژەدا ئەم دەوڵەتە تێپەڕ بوو بە جۆرەها تاقیکردنەوەی ئایینیو نا ئایینی، کە ئەمە وایکرد ببێتە خاوەن شێوەیەکی تایبەتی، جیاواز لە دەوڵەتە کۆنەکانو تازەکان[٩١].

لە سەدەی شانزەهەمدا، بەربەرەکانییەکی گەورە روویدا لە نێوان دەوڵەتی عوسمانیو سەفەوییەکاندا، کە تا بڵێیت لە بەهێزیو گووڕدا بوو، هەردووکیان بەرەو روو بوونەوە لە دەشتی (چاڵدێران) لە ساڵی (١٥١٤)ی زایینی، بەرهەمی ئەم شەڕە بووە سەرکەوتنی سولّتان (سەلیمی یەکەم) (١٥١٢-١٥٢٠)ی زایینی، بەسەر پاشای سەفەوی (شا ئیسماعیل) دا کە کار گەیشتە ئـەوەی، ژیـانو داگیرکردنـی (تەبرێز) ی پایتەختی دەوڵـەتی سـەفـەوی لـە دەسـت بـدات، بەڵام عوسمانییەکان دەسەڵاتیان فراوان بوو لە دواییدا بەسەر ناوچەی (جەزیرە)و (موسڵ).

بە هـۆی دەسـەڵاتـی عوسمانییەکان لـەسـەر سـەرووی عێراق توانییان دڵنیابن لە سنووری ڕۆژهـەڵاتی لەترسی سەفەوی[٩٢]. بەدرێژایی چەند سەدەیەك دەوڵەتی عوسمانی ئیمپراتۆرییەتێکی زۆر فراوانی پێکهێنا، وەك لە ڕۆژهەڵاتدا، وەهاش لە ڕۆژئاوادا چەندان ناوچەو میللەتانی خستە ژێر سایەی خۆیەوە، لەمەشدا تاقە دەوڵـەتی ئیسلامە ئەمەی لەدەست هاتبێت[٩٣].

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی زۆر فراوان بوو. لەوە گەلێك زیاتر بوو میللەتێکی کەم ژمارەو دواکەوتووی وەك تورك جڵەوی بگرێتو سەرکەوتوانەو هۆشیارانە بەڕێوەی ببات[٩٤].

کەرکوك یەکێك بوو لەناوچەکانی کوردستان کە کەوتە بەر شاڵاوی بەربەرەکانی (عوسمانی)و (سەفەوی)و (مەمالیك) کە لەگەڵ خۆیدا گەلێك ئاژاوەو گێچەڵو کاولکاری هێنا.

لە ساڵی (١٧٣٢)دا (نادر شا) هەوڵیدا بە گرتنی کەرکوك. بۆیە کەوتە دابەشکردنی سوپاکەی، چونکە لە باوەڕی ئەودا نەبوو، کە سەرووی عێراق بەربەرەکانی بکەن، بۆیە بەشێك لەسوپاکەی نارد بۆ گرتنی (قەڵا)ی کەرکوك بەسەرکردایەتی (نەرگزخان)، لەوێشەوە بۆ داگیرکردنی (موسڵ)، کە ژمارەیان هەشت هەزار شەڕکەر بووە، لەو گوندانەی کە لایاندا بووە هۆی بڵاوبوونەوەی بەد ڕەوشتی، بەڵام نەیان توانی قەڵای کەرکوك داگیر بکەن.

بەڵام (تەهماسب) لە شەوی (١٦)ی کانوونی یەکەمدا هاتە ناو کەرکوکەوە، ژمارەیەکی زۆر خەڵکی بەدیل گرت، بەڵام ئومێدی نەما لە داگیر کردنی (قـەڵا)، بۆیە بـەرەو گەڕەکی (قۆریە) ڕۆیی، بەزەبری شمشێر هەموو ماڵەکانیان رووخاندو بەرەو گوندی (بەشیر) بەڕێکەوتن.

ئینجا (نـادر شـا) بـە هـێـزەکـەیـەوە بـەرەو قـەڵا ڕۆیـیو بەدەوریدا شوورەو بورجی دروست کرد بۆ تۆپەکانیان، تا هەوڵی گرتنی قەڵا بدات، شەڕ چەند ڕۆژێکی خایاند، بەڵام لەدوایدا چۆکی داداو قەڵای بۆ داگیر نەکراو بەرەو هەولێر کەوتە ڕێگا[٩٥].

بۆیە هیچ بە سەیر نازانرێت کە ناوچەی کەرکوك هەردەم حیسابێکی وردی بۆ کراوەو لە تـەرازووی سیاسی نێوان عوسمانیو سەفەوییەکاندا، سەنگێکی تایبەتی هەبووە، چ لـەوەی شوێنێکی ستراتیـژی بەناو بانگی ناوچەکەو دەوروبەری بووە.

هەر لەبەر ئەم گرنگییە بووە کە دەوڵەتی عوسمانییەکان بـەرژەوەنـدی بەپێزیان هـەبووە لـە عـێراقدا، بۆیە چەکی (مذهب) یان کردووەتە بنکەی داگیرکردنەکانیان،[٩٦] هەردەم ئایینەکەیان کـردووەتـە دەسـکـەلایـەك بـۆ جێبەجێکردنی سیاسەتی بەتورك کردن کە ئەمە لەناوچەی کەرکوکدا زۆر بە ڕوونی ڕەنگی داوەتەوە.

ئەوەی کە لێرەدا مەبەستمە چوونە ناو باسێکی گرنگە کە ئەویش مێژووی هونەری بیناکاریو نەخشو نیگاری ناوچەی کەرکوکە لە سەردەمی عوسمانییەکاندا، هەوڵدان بۆ نیشاندانی ڕوویەکی ئەو سەردەمەی عوسمانییەکان.

هـەر لـەبـەر ئـەو بەربـەرەکـانـیـیـەی نـێـوان عوسمـانـیو لایەنەکانی تر، بۆیە بەشێکی گرنگی هونەری بیناکاری پێش عوسمانییەکان کەوتە بەر کاولکاریو رووخـانـدن، یان فەوتانی بنەما جوانکارییەکانی ئەو هونەرە. بۆ نموونە ئەگەر سەیری قـەڵای کەرکوك بکەین، کەوتە بـەر شاڵاوی هێزەکانو کاولکراو، لایەنە بیناکاری ونەخش ونیگارەکانی بەر فەوتاندن کەوتووە.

ڕژێمی باج گری، لە دەوڵەتی عوسمانیدا بەرەی سەدەها ساڵانی نـاتـەواویو کـەمو کـوڕی ڕژێمـێکی کۆمەڵایەتی وئـابـووری وچـیـنـایـەتـی بــوو، ئـەنجـامـی سـەدەهـا ئـەو فەرمانانە بوو کە سولّتانەکان بۆ سوودی خۆیانو دەستو پێوەندەکانیانو کاربەدەستە چڵێسەکانی دەوروبـەریـان دەریان ئەکردوو بە ئارەزووی خۆیان هێندەی تریان ئەنایە سـەری[٩٧]. جائیتر شتێکی سەیر نەبوو ئەو ناوچانەی، کە جاران ئاوەدان بوون یەك بەدوای یەکدا وێران ئەبوون.

خێزانی مستەر (ریچ)ی کونسوڵی بەریتانیا لە بەغدا، لەگەشتەکەیان بە کوردستاندا ئەنووسێت: - ئەملاو ئەولای دەشتی کفرییەوە، هەر شوێنێکمان هەڵدەکەنی، هەمووی ئێسكو کەل وپەل بوو، وادیارە لە ڕۆژانی خۆیدا کەسانی زۆر لەم ناوچەیەدا ژیابن کەچی ئەمڕۆ تاكو تەرا، جوتیاری هیلاكو پەك کەوتە بەدی ئەکرێو بە داسێکی کۆنو رزیو گژو گیا ئەبڕێ[٩٨].

ئەمانە هـەمـوویـان پـێـکـەوە ئـەبـوونـە هـۆی دواکـەوتـنی دۆخی ئابووری ودارایی کوردستانو میللەتی کورد. لەبەر ئـەوە سەیر نییە ئەگەر یەکێك لەبەگە کوردەکان بە (ریچ) بڵـێ:- بۆچی خـانـوو دروسـت بکەم کە نـازانم تـا سبەی بۆم دەمێنێتەوە، زەوی بۆ بکێڵم، کە نـازانم کێ بەرەکەی

دەخوات، ئەم دۆخە شڕو داڕزاوەی میرنشینی بابان بەشێك بوو لە دۆخە پەرێشان بووەکەی گشت کوردستانی عوسمانی وسەراپا ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی[٩٩].

هیچ بەسەیر نازانرێت کە گەلێك شوێنی وەکو (کفری) و (پردێ)، تووشی رووخاندن وکاولکاری بووبێت، وئەو ئاوەدانییەی بەخۆیەوە نەدیبێت، کە ئەمیش دیاردەی لایەنێکی گرنگی فەوتاندنی زۆری تەرزی بیناکاری ونەخش نیگاری بیناکاری ئەو سەردەمانەو ئەوەی لەوەو پاشی بێت.

لێرە بەدواوە هەوڵدەدەم وەسپێکی هونەری بیناکاری‌و نەخش‌و نیگاری عوسمانی بکەم‌و ئینجا هەوڵی باسکردنی ئەو شوێنە ئاوەدانانە بدەم، کە لەو سەردەمەدا دەستی بیناسازی عوسمانی پێوە دیارە، وەکو قشڵەی کەرکوك، سەرا، پردی ئاڵتون کۆپری، پردی بەردینە، بازاڕی قەیسەری، قوتابخانەکان، قەڵای شێروانە، کڵێسەی کاتدرایی (ام الاحزان)، مزگەوتی قشڵە، مزگەوتی حەسەن پاکیز، مزگەوتی عۆریان، دەرگای رۆژهەڵاتی قەڵا، دەرگای (یەدی قزلەر)، مزگەوتی ئیمام قاسم، قوتابخانەی شا غازی، قوتابخانەی سەرای، قوتابخانەی خانەقا، مەیدان، ئەیوب پاشا، سەهرانی، خانووی تەیفور، خانووی سەیید فاتیح، خانووی عەلی ئاغا، خانووی میکاییل.

هەروەها هەوڵدەدەم بکەومە شیکردنەوەی بابەتەکانی نەخش ونیگاری رووەکی‌و ئاژەڵی، ئەندازەیی، نووسراوی، کە لە چوار شێوەی کەرەستەی بەکار هێنراوی وەکو گەچ‌و شووشەو مەڕمەڕو دارو بەرد.

ئەگەر سەرنج بدەین لەو تەرزی بیناکاریانەی ماوەی عوسمانییەکان، دەبینین لەچوار چێوەی پێویستییە گرنگەکان، سەریان هەڵداوەو لەو قاوغە نەچۆتە دەرەوە، ئەوەی کە لە باری بەڕێوەبەری‌و سیاسییەوە گرنگ بووبێت، بنیات نراوە، تا لە خزمەتی ئەو لایەنەدا بووبێت، بۆ نموونە دروست کردنی قشڵەو پردو سەرای‌و شوورەی دەوری قەڵا، بەڵگەی ئەو راستییانەیە کە تەرزی بیناکاری‌و نەخش‌و نیگاری چەسپاوی، کۆمەڵێك هۆی کارگێڕی سیاسی بووبێت.

ئەو کارانەی کە سوڵتانە عوسمانییەکان بۆمانیان بەجێهێشتووە لە (عێراق)، ئەوە بەدەردەخەن، کە سروشتی باوەڕیان دەربارەی شار بەو جۆرە بووە، کە شار بریتییە لە موڵکە یان قەڵایەکە، کاری سەرەکی ئەو ئاقارە ئەوەیە کە پارێزگاری زەوییەکانی سەر بە سوڵتان دەکات، بۆ کۆکردنەوەی باج لەو زەوییانەو ناردنیان بۆ دەسەڵاتی سەرەکی لە پایتەخت[١٠٠].

ئەوەی بەناوبانگە لە بوونی شار لە سەردەمی عوسمانییەکان، بەتایبەتی لە کاتی مەمالیکەکاندا، بریتییە لە چەند تایبەت مەندییەکی روون کە هەڵگری پێویستی ئەو ژینگەیە دەدات لە رووی سەربازی‌و کۆمەڵایەتی وئابووری، روانگەی عوسمانی بۆ نەخشە کێشانی شار ئەوە بووە کە لەسەر بنەڕەتی سەربازی بەرگری بووە، هەر بۆیە ئەوە رەنگی داوەتەوە لە نەخشە کێشانی شوورەو قەڵاو بازاڕو سەرای‌و خانووبەرەی گشتی[١٠١].

عێراق لە رۆژگاری فەرمانڕەوایی (مەمالیك)دا، (١٧٤٨ – ١٨٣١)، دەوڵەتێکی نیوە سەرەبەخۆ بووە لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی، بەغداد پایتەختی هەموو وڵات بووە، ماوەی مەمالیك دادەنرێت بە سەردەمێکی ئاسوودەو ئارام، ئەگەر بە شێوەیەکی گشتی سەیر بکرێت، ئەمەی وایکرد فەرمانڕەواکانیان بایەخ بدەن بە ئاوەدانکردن ودروستکردنی مزگەوت وقوتابخانەو بایەخدان بە بوژاندنەوەی رۆشنبیری وزانست وپارێزگاری ئاسایش[١٠٢].

لە ماوەی فەرمانڕەوایی مەدحەت پاشا (١٨٦٩–١٨٧٢)دا، هەستا بە کۆمەڵێك کاروباری کارگێڕی گشتی و دروستکردنی ژمارەیەکی زۆر بیناکاری ئایینی وشارستانی وپەیمانگەی زانستی، ئەوەی بەناو بانگە لەسەدەی حەڤدەهەم‌و شانزەهەم بە دروستکردنی کۆمەڵێك خانی گەورەی جۆر بەجۆر[١٠٣].

هەندێك لە فەرمانڕەواییەکانی کە لە دوای (مەدحەت پاشا) کاروباری وڵاتیان گرتە دەست هەستان بە هەندێك چاککاری ودروستکردنی کۆمەڵێك بیناکاری ئایینی، لە ساڵی (١٨٧٤) دەست کرا بە دروستکردنی خانووی قشڵە، دروستکردنی پردەکەی سەرخاسە لە ساڵی (١٨٧٥ ز)[١٠٤].

لەدوای بڵاوبوونەوەی عوسمانییەکان بۆ ئەو ناوچانەی کە داگیریان کرد، هەستان بە گواستنەوەی تەرزی بیناکاری تورکی عوسمانی لە ئاقارەکانی ناوچە ئیسلامییەکان، بۆیە هەستان بە هێنان‌و بردنی کارمەند وهونەرمەندو بەناو نەخشکار بە هەموو پارچەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا. دەبینین لەسەرەتادا کە بیناکاری ئایینی عوسمانی ئەڵقەی پێکەوە بەستنی گواستنەوەی تەرزی بیناکاری سەلجوقی بوو بۆ تەرزی بیناکاری عوسمانی[١٠٥].

یەکێك لە بیناکارییەکانی تەرزی تورکی خانە، کە ئەمەیان لەسەر رێڕەوی شێوازی سەلجوقی نەڕۆیشتووە، بەڵکو گۆڕانە لە خانی پاشایانەوە، بریتییە لە حەوشەیەکی گەورە دەورە دراوە بە راڕەوی کۆڵەکە دراو، پێکهاتووە لە هۆڵی زۆر لەچەند چینێکدا، کە هۆڵەکانی چینی یەکەم بۆ ئازووقەو ئاژەڵانە، بەڵام هۆڵەکانی چینی سەرەوە بۆ دانیشتنە[١٠٦].

(لەکاتی پێویست دێمەوە سەر هونەری بیناکاری خانەکانی کەرکوك‌و بەراووردێکی ئەم هونەرە دەکەم).

ئەگەر سەرنج بدەین لە نەخش‌و نیگاری بیناکاری عوسمانی بەشێوەیەکی گشتی. ئەوەت بۆ دەردەکەوێت، لێبوونەوەیە. تا رادەیەکی چاك لە نەخش‌و نیگاری بیناکاری سەلجوقی، بەڵام گۆڕانی پێشکەوتنی تێدا زۆر روونە، دەبینین رووی بیناکاری عوسمانی، ئەو بایەخەی نییە کە لە تەرزی نەخش‌و نیگاری سەلجوقیدا هەبووە، هەروەکو کەمکردنی نەخشی هەڵتۆقی‌و (تجاویف) مەڕمەڕ لەدروست کردنی بانگۆو تاقی دیوارەکان، لەپێش ئەواندا بەدار دروست دەکرا، بایەخدان بە نەخش ونیگاری گەچی زۆر روون بووە، لەتەرزی بیناکاری عوسمانی.

تازە کردنەوەیەکی گەورە لە تەرزی نەخش‌و نیگاری بیناکاری بەکار هێنانی (قاشانی)یە، بووە بزر بوونی (فوسەیفیسا)ی خەزەف کە لە تەرزی بیناکاری سەلجوقی وبەکار هێنانی ئەستێرەی قاشانی بە رەنگی شینی‌و وێنەی ئاڵتوونی وپارچەی قاشانی رەنگاو رەنگ جێگەی گرتەوە.

دیاردەیەکی تریش ئەوەیە کارتێکردنی تەرزی بیناکاری ئەورووپی بەسەر تەرزی بیناکاری عوسمانییەوە ڕوونە، وەکو کارتێکردنی تەرزی (باروك) لە چەمانەوەی بنمیچەکاندا.

*** نەخش و نیگاری ڕووەکی:**

بەو جۆرە نەخش ونیگارانە دەڵێن کە لە کاتی وێنەکێشانیدا بایەخ دەدات بە بابەتی ڕووەکی وپارچەکانی وەکو لق وگەڵا وگوڵ وبەرە جۆربەجۆرەکانی وبەجۆرەها شێوەو وێنە، ئینجا یان بەوەی کەهەیە لە سروشت یان بە گۆڕینی ئەویش بە بەکارهێنانی هێمای جۆر بەجۆر، کە دوور لە سروشتی بنەڕەتییەکەی.

نەخش و نیگاری ڕووەکی نوێ نییە لەسەر هونەری ئیسلامی کە میللەتەکانی پێش ئیسلام زانیویانە، بەتایبەتی هونەری ئەغریقی وهیلینی وساسانی، بەڵام هەندێك نەخشی ڕووەکی ئیسلامی سیفەتێکی ئەندازەیی هەیە.

نەخشی ڕووەکی لەسەرەتادا، بەشێکی گرنگی هونەری ئیسلامی بووە، بەڵام کە وێنەی کێشراوە لەسەر شێوەیەکی گۆڕاو لە سروشت ئەویش لە ژێر کارتێکردنی ئیسلام بووە، هەندێك شێوەی نەخشی ڕووەکی بەناو بانگ بووە لە هونەرە کۆنەکاندا، وەکو گەڵای مێو، کە لە مێژووی هونەری ئیسلامیدا رابردوویەکی دوورو درێژی هەیە.

یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی نەخشی ڕووەکی، ئەوەیە کە شێوەکانی هاوتاییەو تووخمەکانی هاوبەرامبەر، وپێکهاتەکانی بەناو یەکتریدا چووە.

ئەوەی کە بەرچاو دەکەوێك لە تەرزی بیناکاری عوسمانی کە بەناو بانگە بە نەخشە ڕووەکییەکانی بە گۆڕینی ئەو شوێنەی کە لە سروشت هەبووە، کە ئەمە تایبەت مەندییەکی تەرزی عوسمانییە، گرنگترین ئەو ڕووەکانە، گوڵە گەنم، مرۆر، مێخەك، گوڵی هەنار، ڕێکخستنی لە هەندێك کاتدا تا ڕادەیەکی گەورە دەوەستێتە سەر پێویستییەکانی دروستکردنی[١٠٧].

یەکێك لەو نەخشی ڕووەکییانە، نەخشە لەسەر مەڕمەڕ، ئەوەی لەم جۆرە نەخشەدا بەناوبانگە، هاوجۆری گەورەو بایەخی ورد لە نەخشاندنی ماڵەکان، دیارترین جۆری مەڕمەڕی بەکارهێنراو لەکاری نەخشەکاندا، کە بەلای شینەوە دەڕوات، ئەویش زۆری بەکارهێنانییەتی لەلایەن خەڵکەوە. لەبەر ئەوەی لە ناوچەی کوردستاندا زۆرەو ئەوەی گرنگە کە لە ناوچەی موسڵەوە هاتۆتە هەولێرو کەرکوك[١٠٨]. دەبینین لەم نەخشانەدا کە نەخشکراوە بەلقی ڕووەکی لە نێوان جۆرەها لقدایە، هەروەکو ئەوەی لە خانووی (عەلی ئاغا) و (میکاییل)دا هەیە لە کەرکوك.

نەخشی ڕووەکی هەیە لەسەر گەچ: چونکە لەبەر ئەوەی گەچ کەرەستەیەکی گرنگە بۆیە زیاتر ئەمە بەکار دەهێنرێت، کە بە ناوبانگە بە ووردی و جوانکارێتی، کاری لێدەکرێت لەناو یەکەیا، یان لە شریتدا، کە کارمەندی لێهاتوو کاری لێدەکات.

دەتوانین ئەم نەخشانە بکەینە دوو بەشەوە، کە بەشێکی نەخشی دیاری هەیە، بەشێکی تری ڕەنگاورەنگە، کە بەشی دووەم زیاتر بەناو بانگە، بەتایبەتی لە ناوچەی کوردستان، کە زیاتر بنمیچی هەیوانەکانی پێدەڕازێتەوە، یان دیوارەکانی بەچەند نەخشێك ڕەنگ دەکرێت، وەکو لقی ڕووەکی بەناویەکدا چوو، بەکارهێنانی ڕەنگەکان بە وردی ورێکوپێکی، لە ناویدا گەڵای بچووك.. بچووك دەردەچێت هەروەکو خانووی (عەلی ئاغا) و (میکاییل).

کەرکوك دادەنرێت بە یەك لەو ناوچانەی کە زیاتر کەوتووەتە ژێر کارتێکردنی شێوازەکانی هونەری سەردەمی عوسمانییەکان.

هەموو ئەو نەخشانەی کە لە ماڵەکانی پێشوو باسمان کرد، دروستکراوە بە چەند ڕەنگێك لەسەر بنمیچێکی لووس، کە دیاریترینیان، درەختی سەرووی گۆڕاو لە سروشت، درەختی سوێنەڕمی، دەفری میوە، بێجگە لە لقی درەختی جۆربەجۆر، کە بە شێوەیەکی جیاواز دەیبینین، ئەمە بەڵگەی بەتوانای هونەرمەندە بۆ نەخشاندنی بە شێوەیەکی هونەری وورد.

نەخشی ڕووەکەی لەسەر خشتیش، یەکێکە لەو نەخشانەی کە زۆر بەکار دەهێنرێت لە نەخشاندنی خانووەکاندا، چونکە دادەنرێت بە کەرەستەیەکی سەرەکی لە بیناکاری و نەخش و نیگاردا، کە زۆر ئاسانە کەرت کردنی و پاککردنەوەو نەخشان بەڕەگەزەکانی نەخش و نیگار، هەروەها نەرمی ودەستە مۆیی لەژێر ئارەزووی بیناکاردا، ئەویش بەدامەزراندنی دژوارترین پێکەوەنانەوە، سووکی و بەتالی یەکێکە لە تایبەت مەندی بەکارهێنانی خشتی سوورەوە کراو بۆ دیاری کردنی جوانکاری خانووەکە.

دار دادەنرێت بە کەرەستەیەکی گرنگی بیناکاری و نەخش و نیگار، ماڵ زۆرترین شوێنە بۆ بەکار هێنانی دار، بەتایبەتی لە کاری ڕووی ناوەوەی شووشە ڕێژی کە جۆرەها نەخش و نیگاری هەیە، بێجگە لە بەکارهێنانی دەرگاو پەنجەرەو بنمیچ. هەرچەندە کە دار کەرەستەیەکی کەمە بەڵام تایبەتمەندییەکی گرنگی سەردەمی عوسمانییەکانە.

دار بەکار دەهێنرێت لەنەخشی ڕووەکیدا لەدەستەی شریتێکی دەورەدراو بە دیواری ژێرەوەی بنمیچ، یان دەورەدراوە بە بنمیچەکە، دابەشکراوەتە سەر سێ لاکێشەیی، کە نەخشەکانی گوڵی بچووك.. بچووکە بەشێوەو ڕەنگی جۆربەجۆر.

دەرگای دۆڵابەکان ڕازاوەتەوە بە لاکێشەیی، کە کۆتاییان هاتووە لە بەشی سەرەوەو خوارەوە بە گەڵای سێ لایی، هەروەکو ئەوەی لەهەریەکە لە هەولێرو کەرکوك بەرچاو دەکەوێت.

شووشە یەکێکە لەو کەرەستانەی کە بەکار دەهێنرێت لە نەخشی ڕووەکی، ئەویش بە بەکارهێنانی ڕەنگی جۆراوجۆر، کە لە زۆری کاتدا ڕەنگی سوورو گوڵی و زەردو پرتەقاڵی[١٠٩]. بەکارهێنانی شووشە لە ناوچەی کەرکوکدا لەهونەری (بوراق) دا زۆر بە جوانی بەکارهاتووە کە لەکاتی خۆی دێینە سەر ئەم باسە.

*** نەخش ونیگاری ئەندازەیی:**

مەبەست لە نەخش ونیگاری ئەندازەیی، بەكارهێنانی شێوەی ئەندازەیی روو تەخت یان قەبارەییە، نەخشە كێشراو بە پێوانەو یەكەی نەخشی لەسەر شتی ئەنتیكەو ماڵەكان.

نەخشی ئەندازەیی لە هەندێك جاردا تێكەڵ دەكرێت بە نەخشی رووەكی و ئاژەڵی یان نووسراوەیی، كە بە جۆرێكی وا دەرازێتەوە، تا بڵێیت دەگاتە ئاستێكی جوانكاری لەسەر ئاستێكی تەواو بوو.

ئەم جۆرە نەخشانە باو بووە لە هونەرەكانی پێش ئیسلام، شوێنێكی دیاریكراوی داگیر كردبوو لە زۆری تەرزی بیناكارییەكانیاندا، بەكار هاتووە وەكو چوار چێوە بۆ نەخشەكانی تر، بە تایبەتی ئەمە لە هونەری رۆمانیدا باو بووە، بەڵام بەكار هێنانی سنوور دار بووە، چونكە لەبەر ئەوەی وێنەكانی بەڵگەی بێ هێزی خەیاڵەكانی هونەركارە، بەڵام ئەم نەخشە لە هونەری ئیسلامدا پێشكەوتنێكی گەورەی بە خۆیەوە دیت، كە بووە بنەڕەتێكی گرنگی نەخش و نیگاری ئیسلامی و بووە جۆرەها هاوشێوەو زۆر بە فراوانی بڵاو بووە[110].

بەڵام ئەگەر سەیری ناوچەیەكی وەكو كەركوك بكەین دەبینین بڵاوترین شوێنی نەخشی ئەندازەییە، ئەویش بەتایبەتی لە نەخشەكانی كۆشكی نوزی لە سەردەمی (هوری-میتانی)یەكان.

هۆی زیاتری بڵاوبوونەوەی لە ئیسلامدا، دەگەڕێتەوە بۆ هۆكاری، كاریگەری ئایینی كەهەنگاو بەرەو نەخشی ئەندازەیی بنێت. لە هەمان كاتدا خۆی لە بنەماكانی دووركەوتن لە ئایینی ئیسلام بە دوور بگرێت.

### * نەخشی ئەندازەیی لەسەر مەڕمەڕ:

ئەم نەخشە ئەندازییە لەهەموو نەخشەكان زیاتر بەكار هاتووە لە كوردستاندا بە تایبەتی لەناوچەی كەركوك و هەولێر.

تەنها بەكاهێنانی نەكەوتووەتە سەر شریت بەڵكو جۆرەها شێوەی تری لێ دروست كراوە لەسەر شێوەی گۆچانی چەماوە هەروەها دروستكردنی گرێ لەسەر دەرگا و پەنجەرە، چوونە ژوورەوەی تیژو هەندێكی تر نیوەبازنەیی، لەهەندێك خانووی تر لە شێوەی گرێی سێ لایی كە لە هەردوو لاوە كۆڵەكەی بۆ كراوە بەهەمان نەخش و نیگار. هەندێك رەگەزی نەخشی تر بریتییە لەچوار گۆشەو شێوەی چوار گۆشەیی، كە هەندێك لەسەرەكانی لەم لاو لەولاوە هاتۆتە یەك و، بەهەمان نەخش رازاوەتەوە.

یەكێك لە رەگەزەكانی ئەم شێوانە، شێوەی پێنج لایی دیارو ئەستێرەی دوانزە سەرییە كە وەكو گوڵی بەیبوون وایە، شتێكی تر كە زۆر بەكار دەهێنرێت لە زۆری ماڵەكاندا، بریتییە لە بازنەی پارچە.. پارچە بوو.

لە شاری كەركوك ئەوەی سەرنج رادەكێشێت بوونی چەند شێوەیەكی ئەندازەیی كە هەندێك دەرگای رازاندووەتەوەو درێژ بۆتەوە بۆ سەرەوە، وەكو ئەو دەرگا ئاڵتوونییەی كە دەڕوانێتە سەر هەیوانەكەی ماڵی (عەلی ئاغا)، كە دەورە دراوە بە شریتێكی سێگۆشەیی كە دەوری دەرگاكەی داوە لە هەر سێ لاوە، بەردەوام بووە لە هەردوو لای نەخشەكە بەبەرزی دەرگاكە، لەنێوان ئەم نەخشانەدا، شێوەی چوار گۆشەیی لە ناویاندا ئەستێرەی چوار لایی بڵاوبۆتەوە، لەسەر ئەم نەخشەوە سەرنجی شریتێكی نەخشی دەدەیت لە سەرەوە بۆ خوارەوە بەگرێی نیوە بازنەیی، كە لە نێوانیاندا بازنەی بچووك هەیە، كە كەوتووەتە نێوان شێوەی ئەستێرەو دەستە گوڵی بچووك.. بچووك.

لەو نەخشە هەڵكەنراوانەی لە كەركوك بەرچاو دەكەوێت بازنەی بچووكە، كە لە ناویەوە شێوەی ئەستێرەیی و گوڵی بچووك هەیە یان شێوەی ئامانی هەیە بەبێ گۆیی، لە ناوەڕاستییەوە ئەستێرەی شەش لای هەیە، هەروەكو ئەوەی لە ماڵی عەلی ئاغا و سدیق عەلاف و میكاییل و هەندێك ماڵی تردا بەرچاو دەكەوێت،[111] بەڵام ئەگەر سەرنج بدەینە ماڵی جولەكەكانی كەركوك ئەم ئەستێرەی شەش لاییە زۆر بەرچاو دەكەوێت كە پێی دەوترێت ئەستێرەی داوود.

### * نەخشی ئەندازەیی لەسەر گەچ:

لە زۆری شوێنەكاندا بەرچاو دەكەوێت بە بوونی ژمارەیەكی زۆر نەخش ونیگار، كە نەخش كراوە بە جۆرەها رەنگ، هەیە ئەندازەیی و رووەكی نوسراوەییە. كە ئەندازەییەكانی لە شێوەی چوار گۆشەو لاكێشەو لە بزینەیی وسێ گۆشەیی وبازنەی پارچە پارچەیە، لەناوەڕاستییەوە شێوەی رووەكی و بازنەیی شەوقدار هەیە كە لە ناویەوە جۆرەها نووسراو هەیە. بێجگە لە شریتێ كە ناوەڕاستەكەی ئەستێرەی شەش لاییە، یان یەك لەو یەكەو ئەم لاو ئەولای گەیشتۆتە یەك، یان هەیانە بە تەنیایە، كە لەسەر گەچەكە بەڕوونی دیارە.

بەڵام ئەوەی لە كەركوكدا سەرنج رادەكێشێت ئەوەیە كە شێوەی رووەكی زیاتر زاڵە بەسەریدا، بەڵام شێوەی بەرچاوی كەمە، ئەگەر بەراوورد بكرێت لەگەڵ شێوەی نەخش كراوە بەرەنگ، كە هەندێك شێوە بڵاو بۆتەوە لە رازاندنەوەی زگی گومەتەكان كە لەسەر بەرزی چوونە ژوورەو پەنجەرەكان لە ناوەوەیە[112].

### * نەخش و نیگاری ئاژەڵی:

ئەوەی كە پێی بەناوبانگە لە هونەری كۆن لە رۆژهەڵاتی خواروو، وئاسیا بەگشتی، بەكار هێنانی وێنەی ئاژەڵە لە نەخش و نیگاردا. هونەری ئیسلام ئەم هونەرەی لە نەتەوەكانی پێش خۆیەوە وەرگرتووە بە تایبەتی لە رۆژهەڵاتی كۆن، موسڵمانەكان هەستان بە بەكارهێنانی، بۆ ئەوەی رزگاریان بێت لەوەی كە گوایە تا پابەند بن بە (حدیث)ەكانی پێغەمبەر دەربارەی قەدەغەكردنی وێنەكێشانی وێنە.

موسڵمانەكان لە نەخشەكانیاندا، وێنەی شێرو پڵنگ و فیل و ئاسكەو كەروێشك و باڵندەی بچووكیان كێشاوە، بەجۆرەها شێوەیەوە، لەگەڵ لقی رووەكەكان، دەنووكەكەی بۆ خوارەوەیە یان بەلای ملییەوە، یا وێنەی مارو نەهەنگ و باڵندەی باڵداریان كێشاوە.

زۆری بەكارهێنانی ئاژەڵ، لەنەخش و نیگاردا دەگەڕێتەوە

بۆ سەردەمی ئەو خانووانەی کە لە ماوەی عوسمانی دواوە دروستکراوە.. (کۆتایی)

بەڵام دەربارەی نەخشی ئاژەڵی لەسەر گەچ، ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت، لەکێشانی نەخشەکە لە کەرکوك بەرەنگی شین (نیلی) لەسەر ڕووی لووس، بەشێوەیەکی سادە یان بە شێوەی ئەوەی لە سروشت هەیە یان بە جۆری گۆڕاو، وەکو وێنەی باڵندە بە شێوەیەکی سەرەتایی، کە وەك وێنەی کێشانی دەستی منداڵ وایە، وەکو ماڵی (میکاییل). بەڵام ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت، کێشانی هەندێك بنەڕەتی ڕووەکییە بە دەستەی ئاژەڵان، وەکو مارو ماسی کە کێشراوە لە لقی ڕووەکان بە جۆرێکی ڕەمزی هەر وەکو ئەوەی ماڵی (عەلی ئاغا)و هەموو ئەو ماڵانەی کە لەو ماوەیەدا بنیات نراوە.

*** نەخش ونیگاری نووسراویی:**

بەکارهێنانی نوسراوی قورئانیی و یاداشت و پەندو نموونەو بە پێی شیعری، لەسەر دیواری خانوو، ودەرگاو پەنجەرەو لەکاتی پێویست لە ناوەڕاستی بنمیچی ژوورەکان، بۆیە هۆکاری ئەوە نییە کە هۆیەك بێت بۆ پیرۆزی ئایاتی قورئان و نوسراوی بە پڕوپاگەندەو یادی خەڵکان و دیاری کردنی مێژوو بە تەنها بەڵکو وەکو بەکارهێنانێکی نەخش و نیگارە، کە هونەرمەند توانای خۆی بەکار دەهێنێت و دەورێکی گەورەو گرنگی هەیەو بۆتە یەکێك لە تایبەت مەندییەکانی هونەری ئیسلامیی و خەتی عەرەبی، بابەتێکی گرنگی ئەم نەخش و نیگارەیە. ئەوەی کە گرنگە لێرەدا ئەوەیە کە نووسراو تەنها لە هونەری ئیسلامیدا بۆتە بابەتێکی گرنگی نەخش و نیگار.

لەناوچەی کەرکوك زۆری نووسراوی قورئانیی و شیعرو مێژووی دروست کردن و یادگاریی و یادی خەڵکەکان شوێنێکی گرنگی خانووی ناو شارەکەیە. زۆری ئەم نوسراوانە بەرەنگی شین نووسراوە، لە نێوان نەخش و نیگاری ڕووەکی گۆڕاو لە سروشت، هەروەکو ئەوەی خانووی (عەلی ئاغا)، کە مێژووی دروست کردنەکەی نووسراوە لە ناوەڕاست، لەسەر دەروازەی چوونە ژوورەوەی سەرەکی لای باڵای ڕۆژهەڵاتی، بەڵام لە پێشەوەی هەیوانەکە، نەخش و نیگار هەیە کە سەرنج لە نووسینی (توكلت علی الله) دەدەین.

لە ماڵی (سدیق عەلاف)یش لە پێشەوەی هەیوانەکە لەسەر نەخش ونیگارەکە، نووسراوێك هەیە ماشاءالله، جارێك بەشێوەی ڕاست وجارێك بەشێوەی پێچەوانە، ئەم جۆرە نووسراوانە لە گەلێك ماڵ وسەرقەڵا بەرچاو دەکەوێت[113].

*** وە سپی هەندێك لەو هونەری بیناکاریی و نەخش ونیگارانەی ناوچەی کەرکوکی سەردەمی عوسمانییەکان:**

لێرەبەدواوە هەوڵدەدەم بکەومە باسکردن ولێکۆڵینەوە لەسەر هەندێك لایەنی بیناکاری ئەو خانوو تەرزی بیناکارییانەی کە لەسەردەمی عوسمانییەکاندا باو بووەو هەوڵی بەراوردێکی ئەو نەخشانەو نەخشی سەردەمی عوسمانییەکان بدەمو تا چ ڕادەیەك کارتێکردنی عوسمانی وچێ پەنجەی خۆماڵی کوردی پێوە دیارە.

لەپێشدا دێمە سەر وەسپی تەرزی ناوەوەی بیناکاری خانوو لە ناوچەی کەرکوك بە شێوەیەکی گشتی وئینجا هەوڵی دەست نیشانی چەند خانوویەك بهێنمەوەو بیکەمە نموونەی باسەکەمان.

لەسەرەتادا خشتەیەك دەستنیشان دەکەم لەو

| ژ | ناوی بیناکارییەکە | ساڵ | دروستکەری بیناکارییەکە |
|---|---|---|---|
| ١ | سەرا | ١٨٣٣ | محەمەد پاشا ئینجە |
| ٢ | پردی بەردینی ئاڵتون کۆپری | ١٨١٦ | |
| ٣ | هەندێك لەماڵەکان | | |
| ٤ | مزگەوتی عەلی بەگ جەلالی | ١٦١٢ | |
| ٥ | مزگەوتی ئیمام قاسم | ١٦١٤ | |
| ٦ | مزگەوتی (دڵی باش) | ١٦٢٣ | |
| ٧ | مزگەوتی ئیبراهیم پاشا | ١٦٣٥ | |
| ٨ | قوتابخانەی خانەقا | ١٦٣٩ | والی محەمەد پاشا دروستی کردووە |
| ٩ | قوتابخانەی (شا غازی) | ١٦٥٦ | شا غازی شاسوار دروستی کردووە. |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٠ | مزگەوتی مەلا ئەحمەدی گردە | ١٦٨٢ | |
| ١١ | قوتابخانەی مەیدان | ١٧٠١ | کە حەسەن پاشا دروستی کردووە |
| ١٢ | مزگەوتی تەکێی تاڵەبانی | ١٧٠٦ | |
| ١٣ | قوتابخانەی ئەیوب پاشا | ١٧١٥ | کە والی ئەحمەد پاشا ئەم قوتابخانەیەی دروست کردووە. |
| ١٤ | مزگەوتی سۆرانی | ١٧١٥ | |
| ١٥ | مزگەوتی ئیمام حەمزە | ١٧٢٣ | |
| ١٦ | مزگەوتی عوریان | ١٧٢٩ | - |
| ١٧ | مزگەوتی نائیب | ١٧٣١ | |
| ١٨ | قوتابخانەی غوثیة | ١٧٥٩ | کە حاجی محەمەد غوث ئەفەندی لە گەڕەکی حەلواچی دروستی کردووە |
| ١٩ | مزگەوتی محەمەد غەوس | ١٧٨٠ | |
| ٢٠ | مزگەوتی ئەرسەڵان | ١٧٨٠ | |
| ٢١ | مزگەوتی مەلا سەعید - حاجی عەبدی | ١٧٨٩ | |
| ٢٢ | مزگەوتی ئیمام قاسم | ١٨٠٨ | |
| ٢٣ | قوتابخانەی حاجی ئەحمەد | ١٨٠٨ | حاجی ئەحمەد دروستی کردووە وەلە ساڵی ١٨٨٨ تازەی کردووەتەوە. |
| ٢٤ | مزگەوتی فەرهاد | ١٨١٨ | |
| ٢٥ | مزگەوت و خانەقای کەوسەر - حوسامەدین | ١٨١٨ | |
| ٢٦ | دەرگای قەڵا لەلای خاسەوە | ١٨٢٤ | |
| ٢٧ | دەرگای (یەدی قزلەر) | ١٨٢٤ | |
| ٢٨ | بازاڕی قەیسەری | ١٨٣٩ | |
| ٢٩ | قوتابخانەی سلێمانی | ١٨٤٠ | ئەحمەد بەگ لە نەوتچییەکان دروستی کردووە. |
| ٣٠ | مزگەوتی موسلم نەفتچی | ١٨٤٠ | |
| ٣١ | کاتدرائی (ام الاحزان) | ١٨٥٦ | |
| ٣٢ | مزگەوت و تەکێی سەیید ئەحمەد | ١٨٥٨ | |
| ٣٣ | مزگەوتی حاجی خدر | ١٨٥٩ | |
| ٣٤ | مزگەوت و خانەقای شێخ جەواد نەقشبەندی | ١٨٦٥ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٥ | قەڵای شێروانە | ١٨٦٦ | |
| ٣٦ | مزگەوت و تەکێی شێخ محێدین | ١٨٦٩ | |
| ٣٧ | مزگەوتی ئەنەس بن مالیك | ١٨٦٩ | |
| ٣٨ | قشڵە | ١٨٧٤ | |
| ٣٩ | پردی بەردین | ١٨٧٥ | |
| ٤٠ | مزگەوتی مەلا قاوون | ١٨٧٦ | |
| ٤١ | مزگەوتی دزدار | ١٨٧٨ | |
| ٤٢ | مزگەوتی خادم سوجادە | ١٨٧٩ | |
| ٤٣ | قوتابخانەی تۆقاتلی | ١٨٨١ | کە حاجی ساڵح مەلا عەبدوڵڵا دروستی کردووە. |
| ٤٤ | مزگەوت و تەکێی شێخ باقی | ١٨٨٢ | |
| ٤٥ | مزگەوتی مستەفا قیردار | ١٨٨٤ | |
| ٤٦ | مزگەوتی خانەقای نەقشەندی | ١٨٨٨ | |
| ٤٧ | مزگەوتی سەیید محەمەد نەجیب جەباری | ١٨٩٧ | |
| ٤٨ | مزگەوتی حاجی قادر | ١٩٠٥ | |
| ٤٩ | خانوی میکاییل | ١٩٠٦ | |
| ٥٠ | قوتابخانەی (الصنایع) | ١٩٠٨ | (عەونوڵڵا ئەلکازمی) دروستی کردووە |
| ٥١ | مزگەوتی ئیبراهیم بەگی تکریتی | ١٩٠٩ | |
| ٥٢ | مزگەوتی قشڵە | ١٩١٢ | |
| ٥٣ | مزگەوتی قشڵە | ١٩١٢ | |
| ٥٤ | پردی بەردینی داقوق لە ڕۆژهەڵاتەوە | ١٩١٤ | |
| ٥٥ | مزگەوتی بەگلەر | ١٩١٨ | |

بیناکارییانەو مێژووی دروست بوونەکەیان دیاری دەکەم.

خانووەکانی کەرکوك بە جۆرێك دروست دەکرا، کە بۆ ژیانی ڕۆژانە دەست بدا بەرگەی سەرماو گەرمای دەگرت. لە نەخشەکێشانییدا، سامان وگیان بە بەرچاوەوە دەگیرا، (قایە)و (گەچ)ی لە قایە دروستکراو لەو (کان) ی مەرمەڕانەوە دەردەهێنرا کە تەواوێك لە نزیك شارەوە بوو بینای پتەوو توندی پێ بنیاد دەنرا، خانووی لە قوڕ دروست کراویش هەبوو.

لەدەرگای سەرەکییەوە بە (طاق آلتي–ژێر تاق)دا دەچووە ناو حەوشەوە، دەرگا لەدارو تەختەی ئەستوورو پتەو دروست دەکراو بە مێخی (بزمار) ی سەر خڕو ئەستوور، کە ئاسنگەرەکانی کەرکوك دروستیان دەکرد، بزمارڕێژ دەکرا،




**کۆمەڵێك نەخشی نووسراوەیی**

کونێکی ئەوەندەی دەستێکی پێدا بچێو پێیان دەگوت کونی (حەلەق)و کلیلێکی سێ یان چوار (ددانی-دگانی) لە تەختە، یان لە ئاسن دروست کراوو (حەلەق)ێکی هەبوو.

(حەلەق) دارێکی ڕێکخراوی ئەستووری دوو خەتی بوو، نیوەی (تەکلە مەکلە) بەو کونەوە دەچوو، کەلە دیواردا ئامادە دەکراو بەمجۆرە، دەرگا دادەخرا. دەرگا، یەك (لا) یان دوو (لایی) دەبوو. گرێژنەی (تاپان)ی دەرگا بە زنجیری ئاسن بەزەویدا توووند دەکرا. لە خوارەوەو بەرامبەر بە (گرێژنە) مەستەری پێ دەگوترا. جگە لە (حەلەق)، (فەرەنگی) یش دەبوو.. کەلە کاتی داخستندا (درم درم) دەنگی دەردەکرد، بەسەر دەرگاوەو بەدیواردا، سەلکە مامز (ئاسك)، یان دوو (شاخ-قۆچ) توووند دەکرا، بەمەوە، خەڵکەکە لەو بڕوایەدا بوون کە لە (چاوەزار) دووریان دەخاتەوە. لەحەوشەدا بیری ئاو هەبوو (بەلووعەی) بۆ چڵکاو هەڵکەنراوو، ئاو دەستو تەویلەو کادان (کادێن)و جێ کوانوو (مەتبەق)و هەر لە مەتبەقدا (تەندوور)ی لێدەبوو. شەربەو جەڕەی لێدەبوو، ئەمانە کە (کەرخ) دەبوون دەگۆڕانو هەروەها لە حەوشەدا، باخچەی گوڵ وداری میوەی لێ دەبوو. باراناو وچڵکاو بەکونێکی ئاو دیواردا بۆ دەرەوەی ماڵ ڕەت دەبوو، کە بۆ ئەوەی ئامادە دەکراو پێی دەگوترا کونە ئاو، بیری ئاودەست لە دەرەوەی خانوودا هەڵدەکەندرا.

لە دەرگای ژوورەوە کە دەچوویتە ژوورەوە (عەتەبە)ی لێبوو کە لەوە دەچوو کە ئەمڕۆ (هۆڵ)ی پێدەگوترێ. لە بنمیچی عەتەبەدا (چەرخ)ێك بە (وەڕوەڕ)دا شۆڕ دەکرایەوە، لەلایەکی ئەو داو (دەزوو)ەدا کە سەرێکی چنگاڵی پێوە دەبوو گۆشتی پێدا هەڵدەوەسراو سەرەکەی دیکەی کە رادەکێشرا، گۆشت تا نزیکی بنمیچەکە بەرز دەبووەوەو لە دەمی پشیلە نەجاتی دەبوو.

لەبەرامبەردا بەلای چەپ وراستدا یەکەو مەرمەڕێکی یەك مەتری درێژی ونیو مەتر بەرزی کەبە نەخشی هەڵکەنراو رازێنراوەتەوە، دوو (دایانجاغ)، لە کاتی دانیشتندا پاڵی پێوە دەدرا، (دوێن)و (عەتەبە)ی لێك جیا دەکردەوە، (دوێن) لەماڵەکاندا وەکو ژووری نووستن وا بوو، دایكو باوك ومندالان لێرە دەنووستن. بەدرێژایی (دوێن)دا لەلای چەپ وراستدا بە دیوارەکاندا دوو ریزە تاق (تەرەجە)ی لێدابوو، کە ئەوانەی خوارەوە یان بوخچەی جل وبەرگی لەبەرکردن لێدادەنرا، ریزی سەرەوەیان، ئەو شتومەکانە دادەنرا کە لەوانە بوو هەموو دەمێك بەکار بهێنرێت. لەسەرووی ئەم تاقانەو فووتێك لەخوار میچەوەو، ڕەفەی لێبوو کە فووتێك لە دیوارەوە دەهاتە دەرەوەو فەخفووری‌و کاسەو (قاپ وسەرپۆش)و گوڵدان وقاپ وقاچاغی دیکەی لێ ریز دەکراو بە درێژایی (کەنار)ی ڕەفەکان (نەشلە)ی پێوە دەکرا، کە لە کالا (قووماش) ولە شێوەی (دۆعا) دروست دەکراو پارچە ئاوێنەی بچووكو بووکە شووشەو شتی دیکە، پێکەوە دەدوورا.

(ددانی گورگ) بەم نەشلەیەدا دەکرا کە ماڵەکەی لە چاوەزار دوور دەخستەوە، ئەمە لە باوەڕەکانی ناوچەکە بوو. لەبەرامبەری، لای خوارەوەی (دوێن)دا (شاقالات) دروست دەکرا، ئەمەش لە زەوییەوە بە بەرزی یەك مەترو بە پانیی یەك مەتر، وەکو مێزێك لە (گەچ) دروست دەکرا. دەرگای وەکو دەرگای دۆلابیشی بۆ دەکرا، پێخەف لەسەر (جاجم)، (ئەرحام)و سەرینی لە پەڕی مەل پڕکراو (چیبیبنلیح) شتێکی وەکو جاجم بووە، بەلام زۆر تەنك، بۆ خۆ لە مێش پاراستن، جا ریزی پێخەف بەمە دادەپۆشرا.

لەلای سەرەوەی دیواری بەرامبەردا، کە بە میچەوە دەنووسا، کە لە تاق (تەرەجە)ی بچووك بچووك دەچوو، بەلام رازاوەترو بە گەچ نەخشی قەبارەدار دەکراو دەکرایە چەند چاوێك (چاو چاو) دەبوو دەوترا (لۆقەندان)و شووشەی رازاوەو بە نەخش وئامرازی دیکە بەنرخو زیبوو تاقمی (مس)ی لێدادەنرا.

لە کۆتایی (دوێن)داو بەلای راستیەوە دەرگای (سڕخانە-نەهێنی خانە) هەبوو، ئەو شتانەی کە پێویستی نەدەکرد لەپێش چاودا بێ وبشاردرێتەوە، دەخرایە ناوەیەوەو پشتی (سڕخانە) لەگەڵ پشتی (خەزنە)دا یەکی دەگرتەوە، کەوا دوایی دێینە سەر باسیو تەنیا دیوارێکی (تەنك) یان لە نێواندا دەبوو لە دوێرداو لە نێوان (تەرەجە-تاق) ەکاندا قازووخی لە تەختە نەجاڕ دروست کردووی رازاوەو رەنگاو ڕەنگ دادەکوترا. کە ئەمانەش کەلو پەلیان پێوە هەڵدەواسی.

لە خانووی ژوورەوەداو بەلای راستی (عەتەبە)دا (بەردەمی پێش-خەزنە)ی لێبوو لەعەتەبە فووتێك بەرزتر دەبوو، دەرگای (خەزنە) لێرە دەبوو. (خەزنە)و (سڕخانە) پشتی ئەوەندەی درێژیی (دوێن) درێژدەبوو. لەسەر خەزنەو سڕخانەدا (کۆشك هەبوو)، بە چەند پلیکانەیەك بۆی سەردەکەوتن. کۆشك دەرگای هەبوو.. ئازووقەو (زەخیرە) ی زستانە لە خەزنە دەبوو، گەنم، جۆ، ساوەر، بروێش، گەنمە کوتاو، کەشكو هەڕشتە، نیسك، هەرتوومان، پاقلە، پیاز، سیر، سماق، برنج، دۆشاوی تەماتە، ترخێنە، ئارد، خوێو شتی دیکە. لەلای چەپی عەتەبەدا (بەردەمی ژووری تەنیشت)ی لێبووە کە ئەمە لەعەتەبە بەرزترنەدەبوو، بەڵکو لە ئاستیدا دەبوو لێرەوە دەچوونە (ژووری تەنیشت)و بە قالدرمە بەرەو (کۆشك بەسەر دەکەوتو بە قالدرمەیەکی دیکەش بۆ ژێر زەوی دادەبەزین، ژووری تەنیشت کۆشك ژووری نووستنی رۆڵە پێگەیشتووەکان بووە، لەهەر ماڵێکدا یەك یان دوو (چراغلیغ) هەبوو، خانوو لە کەرکوکدا، بە زۆری یەك نهۆم بوو، بەدوو نهۆمەکان دەگوترا (شانشین).

لە کۆلانادا (تاق)ی لەم لایەوە بۆ لایەکەی دیکە دروست کراویش هەبووەو دیوومانە، لەسەریاندا ژوور دروست دەکرا، لەگەڕەکی (مەیدان)ی قەلاداو لەگەڕەکی (حەمام)دا چەند تاقێکی وەهای لێبوو.

لەگەڕەکی (پریادی-پیریادی)دا (جووت تاق)و نزیك بە گۆڕی (مەزاری شا قولی)و لەو ڕێیەدا کە دەچێتە (موسڵلا) لەسەرەتای ڕێدا هەبووو لە ڕێی دیکەشدا هەبوو.

ئەگەر میچی خانووەکان بێ، یان ئەم (تاق) انە بن بە گەلێك جۆری وەك (کەمەرە)و (پشتی ماسی)و (سینی) قەپات دەکرا (دەگیرا)و سەربانەکان بە ستارە لە سەربانی

ماڵەکانی دیکە جوودا دەکرایەوە، بۆ ئەوەی باراناو بەسەر دیوارەکاندا نەیێتە خوارەوە لە راستایی سەربانداو لەژێر ستارەدا، بە درێژاییەك فووت دەهێنرایە دەرەوە پێیان دەگوت (گوێسەوانە) سەربان بە گڵە سوور تێکەڵ بە (کا) سواغ دەدرا.

خانووەکانی کەرکوك بە بۆیەی (بۆیاخی) رەنگاورەنگ نەخشی هەمە جۆر دەنەخشێنرا، سەر (لۆقەندان)و (تاق-تەرەجە)کان بە گەچی وبە شێوەی قەبارەدار دەنەخشێنراو بۆیاخ دەکرا[١١٤].

*** خانووی (ئەحمەد پەلاس):**

ئەم خانووە یەکسەر لە تەنیشتی باشووری بن تاقی گەورەیە لە رۆژهەڵاتی دەرگا تۆپ‌و بە بەردو گەچە بانی هەندێ لە دیوارەکانی رووخابوو لە (٢٠٠٣)دا وەستا (حەسەن کاك عەلی) نۆژەنی کردووە. خانووەکە بریتییە لە دوێرو خەزنەو کۆشك، خەزنەکەی زۆر جوانە کەوان‌و تاقی جوانی تێدایە، خانووەکە یەك قاتەو زۆر جوانە.

(حوسێن نەقاش) دەرگاکەی سەر لە نوێ دروست کردووەتەوە بە گەچ‌و هەروەها لۆقەندان‌و کەوان‌و تاق‌و نەخشەکانی دروست کردووە بە گوێرەی شێوەی ئەسڵی خۆیان، بەڵام تەواو نەکراوە دەنا نەخشکاری دەکرد.

مێژووی ئاواکردنی نازانین، ئەم خانووە سیفەتێکی تایبەتمەندی زۆر گرنگی خۆی هەیە کە دە باکێشی تێدایە لە هەر تەنیشتێکی هۆڵە گەورەکەدا پێنج باکێش هەیە، لە یەك ریزداو دەکەونە نێو کەوانە ئاقدەکان‌و سەرو ریزی تاقە گەورەکان، هەر باکێشەك وەك تاقێك‌و رووەکەی داپۆشراوە بە نەخشی کون کوناوی لە گەچ‌و لە ناوەوە کونە تا سەر بان وەك دوکەڵکێشێك ئیتر با لێیەوە هاتوچۆ دەکات‌و خانووەکە فێنك دەبێت لە هاوین چونکە هاوینی کەرکوك گەرمەو کاتێ دونیا فێنك بوو لە پێش ئەوەی باران بێت دەمی کونەکان لە سەربان بەخشت دەگرن تا ئاو نەیەتە ژوورەوە.

*** خانووی میکاییل (١٩٠٦):**

ئەم خانووە دادەنرێت بە یەکێك لە خانووە گرنگەکانی سەر قەڵا، کە رووبەرەکەی (٣٢٤)مەتر دووجایە، لە بنەڕەتدا ئەم خانووە بریتی بووە لە دوو نهۆم (چین)، کە بەشی یەکەم بریتی بووە لە حەوشەی دەرەکی‌و ناوەکی‌و چێشتخانە، بەشی دووەم پێك هاتبوو لە راڕەو ژوورو ژووری میوان‌و ژووری حەریم.

ئەم ماڵە دەکەوێتە گەڕەکی ئاغاکان لەلای رۆژهەڵاتی قەڵاوە کە لە بنەڕەتدا پێك هاتبوو لە دوو ماڵ، کە بەشی یەکەمی زۆر کۆن بووە رووخاوەو هەموو بیناکارییەکەی لەناو چووە، هیچ پاشماوەیەکی نەماوەتەوە تا شتێك دەربارەی بزانرێت.

دەروازەی سەرەکی (المدخل الرئيسي) دەکەوێتە لای سەرووی ماڵەکە کە پانتاییەکەی (٢) مەترو بەرزی (١,٥٠) مەترە، سەرەکەی لە شێوەی گووڵ دایە، بەپێوانەی (١,٥٠) مەتر، راستەو خۆ دەچێتە حەوشەی دەرەوە، حەوشەی دەرەوە، شێوەیەکی لاکێشەیی هەیە پێوانەکەی (٣٥) مەتر دوو جایە، زەوییەکەی بە خشتی سوورەکراو داپۆشراوە.

ژووری (حەریم)، دەکەوێتە لای خوارووی ماڵەکەوە، رووبەرەکەی (٣×٥) مەتر دوو جایە، پێکهاتووە لە چوار تاق







هێڵکاری نەخشەی خانووی میکایل لەسەر قەڵا

لەسەر دیواری رووی رۆژئاوای ژوورەکـە، سێ پەنجەرەی هەیە کە دەڕوانێتە سەر راڕەوەکە. ئەم بەشە، ژوورێکی تری لەخۆ گرتووە، کەوتووەتە سووچی خوارووی ماڵەکە، ئەویش ژووری خزمەتکارە، بەرامبەر چێشتخانەیە رووبەرەکەی (٣×٣)مەتر دوو جایە.

ژوورێك دێت کەوتووەتە لای سەرووی ماڵەکە، پێوانەی (٣×٤) مەتر دوو جایە، سێ پەنجەرەی تێدایە، دەڕوانێتە سەر حەوشەکە. تارمەکەی بریتییە لە سێ کەوانەی کە کەوتووەتە سەر دوو کۆڵەکە دەڕوانێتە سەر حەوشەکە، پێوانەکەی (٣٠)مەتر دوو جایە.

دەروازەی بەشی دووەم لە رێگای دوو دەرگاوەیە، یەکێکیان لە کۆتایی حەوشەکەیە لە سووچی رۆژهەڵاتی، ئەوی تری لەلای تارمەکەی بەشی یەکەمە لەلای خوارووی رۆژهەڵاتی خانووەکە، حەوشەی ناوەوە، لاکێشەییە، رووبەرەکەی (٩×٨) مەتر دوو جایە، زەوی حەوشەکە بە خشتی فەرشی خشتڕێژ کراوە، تارمەی ئەم بەشە، رووبەرەکەی (٣١,١٠) مەتر دوو جایە، پێك هاتووە لەسەر سێ کەوانەی نووك تیژ لەسەر دوو کۆڵەکەی دروستکراو بە مەڕمەڕ کۆتایی کەوانەکان راستەوخۆ بە دیوارەکانەوە لکێنراوە، بەڵام زەوییەکەی لە زەوی حەوشەکە بەرزترە بە نزیکەی (٣٠) سانتیمەتر، وداپۆشراوە بە گەچی سپی.

ژووری شوێنەواری:- بریتییە لە چوار ژووری شوێنەواری کە سیانی سەرەکی کەوتووەتە لای رۆژهەڵاتی خانووەکە، ئەوی تر کەوتووەتە لای سەرووە، ئەو سێ ژوورە بەیەکەوە بەستراونەتەوە، بریتییە لە ژوورێکی ناوەندی ودوو ژووری لەم لاو ئەو لایەوە لەلای رۆژهەڵاتو رۆژئاوای ژوورە ناوەندییەکە.

ژووری ناوەندی، لە هەموو ژوورەکانی تر گەورەترە، رووبەرەکەی (٨×٤)مەتر دوو جایە، دەڕوانێتە سەر تارمەیەك، دەڕۆیتە ژوورەوە بە هۆی دەروازەیەکی داپۆشراو بە مەڕمەڕ، رازاوەتەوە بە نەخشو نیگاری ئەندازەیی و رووەکی، رووەکەی بە شریتێکی، گەچی شێوە نەخش ونیگاری رووەکی ونەندازەیی و ئاژەڵی، لە هەردوو لای ژوورەکەوە، دوو پەنجەرە هەیە، داپۆشراوە بە مەڕمەڕ ونەخش کراوە بە نەخش ونیگاری ئەندازەیی ورووەکی، پەنجەرەیەکی تر هەیە لەسەر دەروازەکەوە، کە دەڕوانێتە سەر تارمەکە، ژوورەکە پێك هاتووە لە دە (تاق)، کە هەر پێنجی لە لایەکی دیوارەکەیە، نەخش کراوە، بە نەخش ونیگاری جۆر بەجۆر، وەکو ئاژەڵی و ئەندازەیی، دیواری ژوورەکە رازاوەتەوە بە شریتێکی نەخشو نیگار بە پانی (٣٠) سمو بنمیچی ژوورەکە دروست کراوە لە شێوەی گرێ.

بەڵام دوو ژوورەکەی تر، پێکهاتووە لە (عەتەبە)، (دن) بریتییە لە دە (تاق)، کە هەر پێنجی لەلای رووییەکی دیوارەکەیە رازاوەتەوە بە نەخش ونیگاری، ئەندازەیی ورووەکی وئاژەڵی رەنگاو رەنگ، رووبەکەی وەکو یەکە (٨×٣,٤٠) مەتر دوو جایە، رووی ژوورەکە هیچ جۆرە نەخش ونیگارێکی نییە، بێجگە لە دەروازەکە کە داپۆشراوە لە مەڕمەڕو رازاوەتەوە بە نەخش ونیگاری جۆراوجۆرو جیاواز، دوو پەنجەرە لەم لاو ئەو لایەوە هەیە، داپۆشراوە بە شریتێکی مەڕمەڕی نەخش کراو، لەسەر دیوارەکە شریتێکی نەخش ونیگارو وێنە هەیە، بە شێوەی رەنگاو رەنگی جیاواز.

ژووری سەکۆ:- ئەم ژوورە دەروازەکەی دەکەوێتە لای سەرووی ئەم خانووە، نزیك ئەو دەروازەیەی کە دەڕوات بۆ حەوشەی ناوەوە، دادەبەزێتە ناو ئەم ژوورە بە هۆی پەیژەوە، لە دیواری باڵی رۆژئاوای، بنمیچەکەی پێکهاتووە لە چوار گرێی یەك لە دوای یەك، کە شێوەی گومەتی وەرگرتووە، زەوییەکەی بە مەڕمەڕ داپۆشراوە، بوونی نافورەیەك ئاو (ئاوگن) لەناوەڕاستی سەردابەکە هەیە.

* کەرەستەی بیناکارییەکەی:

ئەو کەرەستانەی کە بەکار هێنراوە لە دروستکردنی ئەم خانووەدا بریتییە لە گەچ وبەردو مەڕمەڕو فەرشی وهەندێك کەرەستەی بەکار هێنراوی وەکو دار لە دروست کردنی دەرگاو پەنجەرەکاندا هەروەها بەکارهێنانی شووشەو رەنگ، بە تایبەتی رەنگی شین وسوورو سەوز وکایی (بنی).

* رەگەزەکانی بیناکاری وهونەری ئەم خانووە:

ئەم خانووە هەموو رەگەزەکانی بیناکاری وهونەری لە خۆی گرتووە وەکو: کەوان، کۆڵەکە، تیجان، مقرنصات، تاق-دایانجاغ.

بەکارهێنانی نووسراوەی وەکو رەگەزێکی نەخشی وبەکارهێنانی نەخش ونیگاری، ئەندازەیی ورووەکی وئاژەڵی، لەمەڕمەڕ وگەچ وبەرد ودار.[١١٥]

* خانووی سەید فاتیح لە گەڕەکی ئاغاکان:

ئەم خانووە لە بنەڕەتدا خانووی (سەیید فاتیح سەیید عومەر سەیید زەینەل)ە، ئەم خانووە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی مزگەوتی (عوریانە)وە بە دووری سەد مەتر یان پتر، هەروەها دەکەوێتە رۆژئاوای تەکیەی سەیید نەجیبی جەباری، وەلە نێوانیان لەوانەیە خانوویەك یان دووان هەبێتو لە نێوان ئەو و قەراغی رۆژهەڵاتی قەڵا قوتابخانەی سەرەتایی قەڵا بووەو زۆر گەورە بووەو حکومەت وێرانی کردووە، ئەوەی گرنگە لێرەدا بیڵێن کە ئەم خانووە لەلایەن (حوسێن نەقاش)ەوە دروست کراوەو دەستو پەنجەی لە نەخشاندنی ئەم خانووەدا هەبووە[١١٦].

ئەم ماڵە دەکەوێتە لای رۆژهەڵاتی قەڵای کەرکوکەوە، ئەم خانووە دادەنرێت بە سەرچاوەیەکی شوێنەواری گرنگ، چ لەرووی تەرزی بیناکاری ونەخش ونیگاری بەکارهێنراو لەسەر گەچی رەنگاو رەنگو کێشراو بە رەنگ، لە شێوەی رووەکیو ئەندازەیی، وشریتی نەخشدار بۆ رازاندنەوەی ژوورەکان ئەم خانووە نەخشە کێشانێکی ئەندازەیی رێکوپێکی نییە، رووبەری گشتی (٢٥٢) مەتر دوو جایە.

ئەم خانووە بریتییە لە دوو نهۆم: - نهۆمی ژێرەوە بریتییە لە دوو بەش، بەشی پێشەوەو بەشی دووەم.

دەروازەی ماڵەوە، بریتییە لە رووییەکی لاکێشەی شێوە (٢×١,٥٠) مەتر، لەدوایدا کەوانەیەکی شێوە تیژ، ئینجا چوارچێوەیەکی شێوە لاکێشەیی دێت، ئینجا دەرگای ماڵەکە

دێت لە شێوەی نیو بازنەیی، پێك هاتووە لە دارو رازاوەتەوە بە چوار ریز بزماری ئاسنی گەورە، لەسەرەوە مەدەگە (مدقە) یەکی ئاسنی هەیە دروستکراوە لە شێوەی دەستی مرۆڤ کە نووقا بێت، لە دەرەوەی دادەخرێت بە هۆی کلیلێکی داری گەورە.

لەدوای دەرگاکەوە تارمە دێت، راستەو خۆ رووبەرەکەی (٣,٥٠×٢,٩٠) مەترو بەرزییەکەی (٢٤٠) مەتر دەبێت، لەلای چەپی ناوەوە راستەو خۆ بوونی (حنیە)یەك هەیە، کەوانەییەکی نیو بازنەیی بەرزی دەکاتەوە، کە دەڕوانێتە سەری راستەوخۆ، لەلای راستی ناوەوە بوونی پەیژەیەك هەیە دەڕوانێتە سەر نهۆمی سەرەوە.

* ژووری ئاخوور:

کەوتووەتە لای چەپی ناوەوەی خانووەکە، کە دەروازەکەی دەڕوانێتە سەر تارمەکە راستەوخۆ، رووبەری (٥,٢٠×٣,٥٠) مەتر دوو جایە داپۆشراوە بە گومەتی نیوە بازنەیی و لەناوەڕاستی دیواری رۆژهەڵاتی دەروازەیەك هەیە دەڕوانێتە سەر ژووری کارەکەرەکەوە بۆیە بەم ناوەوە ناونراوە، لەبەر ئەوەی بەکارهێنراوە بۆ راگرتن و بەخێوکردنی ئاژەڵان.

ژووری کارەکەر، رووبەرەکەی (٢,٢٠×٥,٢٠) مەتر دوو جایە، بانەکەی گیراوە بە گومەتی نیوە کەوانەیی، هیچ جۆرە نەخش ونیگارێکی تێدا نییە، ئەم ژوورە بە ژووری ئاخوڕەوە بەستراوەتەوە بە دەرگایەك لە دیواری رۆژئاوای، دەرگایەکی سەرەکی هەیە دەڕوانێتە سەر حەوشەی خانووەکە راستەوخۆ، ئەم ژوورە لە لایەن کارەکەرەکەوە بەکار هێنراوە.

* ژووری حەریم:

لەدوای ژووری کارەکەرەوە دێت، رووبەرەکەی (٢,٤٠×٥,٢٠) م$^2$، سەری گیراوە بە گوومەتێکی نیوە بازنەیی، دیوارەکانی لای رۆژهەڵات ورۆژئاوای پێکهاتووە لە چوار تاقی نەخشێنراو بە نەخش ونیگاری رووەکی، لە لای چەپی ناوەوە، پەنجەرەیەکی فۆلکلۆری هەیە راستەوخۆ دەڕوانێتە سەر حەوشەکە.

بەشی دووەم: پێکهاتووە لە هۆڵێکی فۆلکلۆری گەورە، دەروازەیەکی جوانی هەیە، داپۆشراوە بە نەخشی مەڕمەڕی، بە نەخش ونیگاری رووەکی وئەندازەیی هەڵکۆڵراو، و بەشێوەیەکی رێکوپێك دابەشکراوە، پەنجەرەیەکی جوانی هەیە دەڕوانێتە سەر حەوشەکە، داپۆشراوە بە مەڕمەڕ، بەڵام نەخش ونیگاری نییە کەتیبەی پەنجەرەکە دروستکراوە لە ئاسنی حەلەزۆنی، دەرگایەکی فۆلکلۆری داری هەیە، نەخش کراوە بە چوار ریز بزماری ئاسنی، بەشێوەی ئاسۆیی، لەدەروازەی ماڵەکەوە لە بەشی سەرەوە، کەوانەیەك هەیە (حنیە)، کە دەڕوانێتە سەر (عتبە) کە راستەوخۆ، کە نەخش کراوە بە نەخش ونیگاری رووەکی زۆر جوان، کە لە ناوەراستەوە مێژووی دروست کردنەکەی تێدا دیاری کراوە، ساڵی (١٩٠٠–١٣١٨)، لە چەپی ناوەوە راستەوخۆ، پەنجەرەیەکی فۆلکلۆری هەیە، داپۆشراوە بە (رخام)، بەشی سەرەوە رازاوەتەوە بە نەخش ونیگاری رووەکی زۆر جوان، دەڕوانێتە سەر حەوشەکە راستەوخۆ. هەروەها لە راستی ناوەوە پەنجەرەیەکی تر هەیە، داپۆشراوە بۆ رووناك کردنەوەی ژوورەکە، دەڕوانێتە سەر حەوشەکە.

لەدوای دەرگای هۆڵە گەورەکەوە شوێنێکی دیاری کراو هەیە بۆ دانانی مۆم لە شەودا بۆ رووناك کردنەوە، پێی دەوترێت (چرادان).

بەشەکانی ئەم ماڵە پێکهاتووە لە (عەتەبە)، وهۆڵی گەورە، (سرخانە)، (هۆڵی تەنیشت)، (کۆشك).

(عەتەبە)، شێوە لاکێشەییە، رووبەرەکەی (٤,٨٠×٢,٨٠) م$^2$ لەلای رۆژهەڵاتییەوەپەیژەیەك هەیە دەڕوانێتە سەر ژێرزەمینێکی گەورە، بەڵام لەلای رۆژئاواوە، پەیژەیەك هەیە دەڕوات بۆ کۆشك. بەڵام لەلای خوارەوەی پەیژەکە چوار (کون) هەیە کە بەکار هێنراوە بۆ هەڵگرتنی کەرەستەی سووك، بنمیچی عەتەبەکە، نەخش کراوە بە نەخش ونیگاری رووەکی جوان لە شێوەی بازنەیی.

هۆڵی گەورە، رووبەرەکەی (٣×٥,٦٠) م$^2$ لە شێوەی لاکێشەییە، بنمیچەکەی پێکهاتووە لە پێنج گرێی تیژی پیفدراو، شێوەی گوومەتەکەی نەخش کراوە بە جۆرەها نەخش ونیگاری رووەکی، لە نێوان هەردوو گرێیەکدا کەوانەیەك (حنیە) هەیە، کەبەکار هاتووە بۆ هەڵگرتنی کەرەستەی ئارایشت، هەریەکە لە دیواری خوارووی رۆژهەڵات وسەرووی رۆژئاوای چوار (حنیە) ی هەیە، نەخش کراوە بە نەخش ونیگاری رووەکی زۆر جوان، لە کۆتایی دیواری سەرووی رۆژئاوای، دەرگایەك هەیە، دەڕوات بۆ ژووری (سرخانە).

دیواری بەرامبەر دەروازەی هۆڵە گەورەکە، رازاوەتەوە بە نەخش ونیگاری جوان لە شێوەی (مشکاە)، لەسەر چوار ریزی ئاسۆیی، ریزی یەکەم پێکهاتووە لە هەشت (مشاکی)، ریزی دووەم پێکهاتووە لە شەش (مشاکی)، ریزی سێیەم، شەش (مشاکی) ریزی چوارەم پێکهاتووە لە دوو (مشاکی)، لەنێوان ئەم دوو (مشاکە)دا، لەلای سەرەوە ئەمە نووسراوە (ماشاءالله)، دابەش کراوەتە سێ بەشەوە بە هۆی دوو کۆڵەکەی نەخشدار کە کۆتاییەکانیان تیژە.

لەسەر ئەم دیوارە چوار کون هەیە بەکار دەهێنرێت بۆ هەڵگرتنی شت وەمەك، شوێنێکی نەخشداری رووەکی دیواری ماڵە گەورەکەی داپۆشیوە، بە پانی (٢٥) سم، لە تەنیشتی دەروازەی ماڵەکەوە دوو (مسند) هەیە، یەکێکی لکێنراوە بە دیواری رۆژهەڵات، ئەوی تری بە دیواری رۆژئاوا دروست کراوە لە بەردی هەڵکۆڵراو بە نەخشی جوان.

(سرخان): رووبەرەکەی (٢,٥٠×٢,٢٠)مەتر دوو جایە، دەروازەکەی لە کۆتایی دیواری سەرووی رۆژئاوای ماڵە گەورەکەیە، کە ئەم ژوورە بەکارهاتووە بۆ دانانی شتومەك، بنمیچەکەی لە شێوەی گوومەتدایە، پەیژەیەکی هەیە بۆ (کۆشك).

(ژووری تەنیشت): شێوە لاکێشەییە (١,٣٠×٣) مەتر دوو جایە، بۆیە پێی دەوترێ ژووری تەنیشت، لەبەر ئەوەی کەوتووەتە تەنیشت ماڵە گەورەکەوە، بنمیچەکەی لە شێوەی گومەتە، بەڵام هیچ جۆرە نەخش و نیگارێکی تێدا نییە.

(کۆشك): شێوە لاکێشەییە (١,٩٠×٣)م$^2$، دەگەیتە لای بەهۆی پەیژەیەك، کە کەوتووەتە لای رۆژئاوای (عتبە)،

دەروازەکەی کەوتووەتە سەر کەوانەیەکی تیژ، بنمیچەکەی بەستراوەتەوە لەگەڵ یەکێك لە ژوورەکانی نهۆمی دووەم، بەهۆی دەروازەیەك، کە کەوتووەتە کۆتایی دیواری سەرووی ڕۆژئاوای.

(ژێـرزەمین): پێوانەکەی (٤٥) مەتر دوو جایە، چوونە خوارەوە بۆی بە هۆی پەیژەیەکەوە پێکهاتووە لە (دە) پایە، کەوتووەتە لای ڕۆژهەڵاتی (عتبە)، لە ناوەوەی ماڵی گەورە، ڕاستەوخۆ، ژێرزەمینەکە شێوەی ماڵە فۆلکلۆرییەکەی وەرگرتووە، چونکە ڕاستەوخۆ کەوتووەتە ژێری، پێکهاتووە لە گۆڕەپانێکی بەردەمی دەتوانین ناوی بنێین (عەتەبە)، ڕووبەرەکەی (٣,١٠×٥,٢٠)م$^{٢}$، بوونی هۆڵێکی گەورە هەیە لەسەر دوو کەوانەیی گەورە لە شێوەی گومەت، ڕووبەرەکەی (٣,٤٠×٦)م$^{٢}$، لە تەنیشتیەوە ژوورێکی لاوەکی هەیە، پێکهاتووە لەشێوەی لا نارێك، ڕووبەرەکەی بە نزیکی (٢,٥٠×٢)م$^{٢}$، ئەم ژێرزەمینە بێ بەشە لەهەموو جۆرە نەخش‌و نیگارێکی کە هەیە لە ماڵە فۆلکلۆرییەکە، ئەم ژێرزەمینە بەکار هێنراوە بۆ پاراستنی شتومەك وپشوو، خەو، لەوەرزی هاویندا.

(حەوشەی گەورە: حەوشەی دەرەوە، بەخشتی فەرشی داپۆشراوە، پێوانەی (٢٥سم × ٦سم)، لە ناوەڕاستییەوە باخچەیەکی چوار گۆشەیە، کە داری دارخورماو پورتەقاڵی تێدایە، لەبەشی ڕۆژئاوای حەوشەکە، ژوورێکی بچووك هەیە بەکار هێنراوە وەکو ئاودەست (پێشاو)، ڕووبەرەکەی (١,٨٠×١,٥٠)م$^{٢}$.

بەشی دووەم، نهۆمی دووەم:– دەتوانیت سەرکەویتە نهۆمی دووەم بە هۆی پەیژەیەکەوە، پێك هاتووە لە نۆ (عتبە)، ئەو ڕووبەرەی کە داگیری کردووە (١٠٥,٦٠) م$^{٢}$، پێکهاتووە لە تارمەیەك ژمارە (٧)ی پێك هێناوە بە ئینگلیزی، ڕووبەری گشتی (٣,٢٥)م$^{٢}$ دەڕوانێتە سەر حەوشەیەکی گەورە لە شێوەی پیتی (L) بە ئینگلیزی، ڕووەکەی بەردەمی کە دەڕوانێتە سەر حەوشە گەورەکە، بەدەوریدا شوورەیەکی ئاسنی شێوە. حەلەزۆنی بۆ دروست کراوە، تارمەکە ڕاوەستاوە لەسەر دوو کەوانەی نیوە بازنەیی، لەسەر کۆڵەکەیەکی مەڕمەڕی شێوە چەند لایی (پەل پەلاو)، پێك هاتووە لە هەشت چین یەکێك لە کەوانەکان دەڕوانێتە سەر حەوشە، ئەوی تریان بەسەر تارمەدا، دوو ژوور دەڕوانن بەسەر تارمەکەدا بە دوو لای جیاواز، یەکەمیان پێی دەوترێت ژووری ئاسۆیی، ڕووبەرەکەی (٢,٢٠×٤,٧٥) م$^{٢}$، دوو پەنجەرەی هەیە دەڕوانێتە سەر تارمەکە، لە دیواری سەرووی سێ تاق هەیە، کە ڕازاوەتەوە بە نەخشی ڕووەکی ڕەنگاو ڕەنگی زۆر جوان.

لە دیواری سەرووی دوو تاقی تر هەیە نەخش کراوە بە نەخش ونیگاری ڕووەکی لە ناوەوەیە، دەروازەیەك هەیە دەڕوات بۆ ژوورێکی بچووك کە پەنجەرەیەکی تێدایە دەڕوانێتە سەر گەڕەکی دەرەوە، بنمیچەکەی لە شێوەی گوومەتی نیوە بازنەییە.

*** ژووری نووستن:**

ڕووبەرەکەی (٣,٤٠×٥,٣٠)م$^{٢}$، دوو پەنجەرەی تێدایە دەڕوانێتە سەر حەوشەی ماڵەکە، سەرەوەی لە شێوەی



**خانووی سەید فاتیح**

گومەتی نیوە بازنەییە، لە کۆتایی دیـواری ڕۆژهـەڵاتی، دەروازەیـەك هەیە، دەڕوانێتە سەر (کۆشك)، کە کەوتووەتە نهۆمی سـەرەوە لە هۆڵی فۆلکلۆری، لەوێدا ژوورێـك هەیە لایەکانی ناڕێکە کە سەر دەکەوی بۆی بەهۆی (سڕخانەوە)، هۆڵی فۆلکلۆری هیچ جۆرە نەخشێکی تێدا نییە.

*** ئەو ڕەنگەزە نەخش ونیگارانەی کە بەکار هاتووە لەم خانووەدا:**

بریتییە لە نەخشی ڕووەکی بە هەموو جۆرەکانییەوە، لەسەر گەچ و بەرد، بەکارهێنانی نەخشی ئەندازەیی شێوە بازنەیی و ئەستێرەیی و قووچەکی، بەکارهێنانی نەخشی نووسراوەیی لەسەر گەچ. ئەو ڕەنگانەی کە بەکارهاتووە بریتییە لە نیلی و سوور و سەوزو زەرد.

بنەڕەتی نەخشەکان دەگەڕێتەوە بۆ هونەری بیناکاری‌و نەخش‌و نیگاری ئیسلامی، ئەویش بوونی (تەوریق)، هەروەکو ئەوەی باوبووە لە تەرزی نەخش ونیگاری (سامەڕا). [١١٧] بەڵام ئەگەر زیاتر ڕۆبچینە ناو نەخشکانەوە، بەووردی بەراوردێکی نەخشەکانی بکەین، دەبینین کارتێکردنی خۆماڵی زیاترە لە هونەری نەخشی ئیسلامییەکە.








نەخشێکی ناوەوەی خانووی سەید فاتیح

*** خانووی تەیفور:**

**ئەم خانووە بریتییە لە بیناکارییەکی دەگمەن وکەم وێنە، ئەویش لە تەرزی بیناکاری ونەخشەکانیدا، بەدەردەکەوێت، کە نموونەی چەندەها لەو جۆرە لە کەرکوکدا هەیە، ئەم خانووە لە سێ پارچەی یەك لەناو یەکدایە، یەکەمیان بریتییە لە کۆڵەکەی مەڕمەڕی شێوە دروست کراوی وردیین، ئەویش لە شێوەی دەروازەو نەخشی پەنجەرەو بەکار هێنانی مەڕمەڕی ڕەنگاوڕەنگ، بنمیچی هەمووی بریتییە لە نەخشی گەچی ڕەنگاوڕەنگی ئاڵتوونی یان بریقەدارە، بەڵام دووەم، بریتییە لە (مجان)و (میوانداری)و (سرخانە)و (کۆشك)، هیچی کەمتر نییە لەوی تر.**

**بەشی سێیەم پێی دەوترێت (ماڵی بووك)، بریتییە لە تارمەی بچووك وژووری لاکێشەییە، زۆر جوانە لە هونەری نەخشو نیگارو جۆرەها ڕەنگ.**

**ڕووەکەی دەڕوانێتە سەر حەوشەی ماڵەکە. وەکو سەکۆیەکی ئاهەنگ گێڕان وایە، لەوانەیە ئەم بەشە دیاری کراوبێت بۆ بووك وزاوای کەسو کاری ماڵەکە.. لەکاتی ژن هێنانیان، پێش ئەوەی بگوازرێنەوە سەر شوێنی تازەیان.**

**مێژووی دروستکردنەکەی دەگەڕێتەوە ساڵی (١٧٣٩) وەکو ئەوەی لە نێو نەخشەکاندا نووسراوە[١١٨].**

**ئەم خانووە لە پشت دەرگای (تۆپ)ەو لە نێوانیاندا خانوویەکی دیکە نییە، دەرگای باشوور بریتییە لە سێ بەش: بەشی پێشەوەو بەشی ناوەڕاستو بەشی ڕۆژهەڵات، ئەم خانووە لە سەدەی هەژدەیەمدا ئاواکراوە.**

**بەڵام نازانین ئایا ئەم نەخشانەی ئێستا تێدایە لە کۆنەوە** هەبووەو دەوری سەد ساڵێك لەمەوبەر یان زیاتر نوێ کراون یان نا؟ لە بانی بەشی پێشەوە شێلمان بەکار هاتووە کە نیشانەی ئەوەی پاش پەیدابوونی شێلمانی ئاسن لە کەرکوك لە بیستەکانی سەدەی بیستەمدا یان پاشتر خانووەکە ئاوەدانکراوەتەوە یان ئەم بەشەی خانووەکە هاتۆتە ئاواکردنو پێشتر نەبووە.

نەخشەکانی دەستکردی عەلی نەقاشە واتا نەخشە گەچەکانو ئاوییەکان، بەڵام نەخشاکانی هۆدەی سەرەوەو هەیوانەکەی بەشی ڕۆژهەڵات بە نەخشانی عەلی نەقاش ناچن، ڕەنگە نەخشەکانی بەشی ناوەڕاست دەستکردی عەلی نەقاش بێت چونکە بە نەخشەکانی ئەو دەچێت یان ئاوەدانیکردبێتو یان حوسێن خۆشی هەندێ لە نەخشەکانی بەشی ناوەڕاستی ئاوەدانکردبێتەوەو لە ساڵی (١٩٨٣)دا ناوی (حوسێن غەنی تێدا نووسراوە.

لە بەشی یەکەمو باشوور لە خانووەکە چەند ئەستونێکی مەڕمەڕی تێدایەو دەرگاو پەنجەرەکانی لە بەردی مەڕمەڕەو لەسەر هەر یەك لە دەرگای هەر دوو هۆدەی بەرامبەر بە یەك لە قاتی ژێرەوە وێنەی سەعاتێك دروست کراوە لە نێو چوار چێوەیەکی نەخشدار، هەروەها وێنەی ئاسکێك لە هەر لایەك لەگەڵ پتر لە جۆرە نەخشێکی گیایی لە ژێر ئەوانە لە هەر لایەك وێنەی باڵندەیەك لەسەر مەڕمەڕ هەڵکەنراوە سەعاتی سەر دەرگای باکوور **سەعات** شەشو **دە** دەقیقەیەو هی **باشوور سەعات دە کە دە دەقیقەیە لە هەر تەنیشتێکی دەرگا نیو ئەستونێکی مەڕمەڕی بادراوی بە (تاج)ی ئینجانەیی هەیە.**

**بەشی ناوەڕاست لە خانووی حاجی تەیفور لە بەشی (دوێــر)و لۆقەندان پێنج کەوانە ئاقد هەیەو لە نێوان هەردووکیاندا تابلۆیەك هەیەو سەرو نەخشێکی ئەستێرەیی بازنەیی یان جۆرە گولێك لە نێو بازنەیەکدا هەیەو سەروتر جۆرە نەخشێکی دیکە بە شێوەی تاجیی تەواو دەبێ، لە سەرو ئاقدەکان درەختی سەرو هەیە کە سەرەکەی وەك تاجێکەو سەرو ئەو وێنەیەی قەندیلی هەیە کە شۆڕبۆتەوە** بە نەخشێکی تیرۆژییەوەو لای دیکەی کەوانە **ئاقدەکانی** بەرامبەر هەمان جۆری نەخش هەیە.

لە ژێر ئاقدەکان لە هەردوو تەنیشتی هۆدە دوو کەمرە نەخش لە سەرانسەری دیواری هەیە بە ئاسۆیی و لە ژێر ئەوانە ریزە تاقە نەخشدارەکانەو دیواری بەرامبەریش هەمان جۆرە کەمەرو تاق هەیە.

لە بەشی ڕۆژهەڵات لە قاتی دووەم هەیوانو هۆدەیەك هەیە، نەخشەکانی چوار چێوەی دەرگاکەی نوێ کراوەو لەوانەیە لە ئاوەدانکردنی حوسێن نەقاش بێت.

لە هەیوانە گومەزیەکەی ئەم هۆدەیەدا دوو جۆر نەخشی نایاب هەیە، کە ئەمانەن:

١. لە گومەزی هەیواندا نەخشێکی ئەندازەیی هەشت گۆشە (مثمن)و مەکوکی (اهلیلیجی) هەیەو بە چەند شێوە دانان دوو بارە بووە بە ئاسۆیی و ڕاستەوڕاستو بە پاڵکەوتویی بە یەکترەوەو بە تاکە نەخشە لەبزینییەکان (معینی)یەکان بەستراون، بەم هۆیەوە نەخشەکانی ئەستێرەیی پێنج سووچی لە ناوەڕاستەکاندا دروست بووە، بۆشاییەکان هەموویان پڕ کراوە لە نەخشی گیایی و لە خاڵە خڕەکان نەخشەکە ئاوییە لە ڕەنگەکانی نیلی و زەردو قاوەیی بەڵام زەوی گومەزەکە بە ڕەنگی پرتەقاڵی ڕەنگ کراوەو لە گەچ هەڵکەندراوە، لە ناوەڕاستی گومەزدا ئەستێرەی هەشتی گەورە بە ڕەنگی پیرۆزی (فەیروزی) لە نێو بازنەیەکدا هەیە لە چواردەوری گومەز کەمەرەیەکی نەخشداری باریکی چڕوپڕ هەیە.

٢. لە دەورووبەری گومەزو ئەو کەمەرەی پێشوو کەمەرێکی پان هەیە لە نەخشێکی زۆر جوانو لە گەچ هەڵکەندراوە نەخشەکەی پێکهاتووە لە دووبارە بوونەوەی نەخشێکی گەورەیی لەبزینەیی و زەوییەکەی لەبزینەیەکان پڕکراوە بە نەخشێکی گوڵو گیا و زنجیرەیەك لە شێوەی بچوکی مەکوکی لە ناوەڕاستدا بە شێوەی ئەستوونی **لە** ناوەندی لەبزینەییەکان لە ڕاستو چەپ گیای گوڵدار **لە ئینجانەی مەکوکی** هێڵدار سەوز بووەو لقی داوەو **ناوەندەکەی بووەتە خاچی شێوە** (زائد) لە هەر تاکێك لە نەخشە لەبزینەیەکان **لە نێو دوو هێڵی** مەیلەو زکزاکی دایە کە بۆی دەبێتە چوارچێوەیەکی **جوان.**

بە گەیشتنی هەردوو تاکێك لە شێوەکانی **لەبزینەیی** لەسەرو خوارو بۆشاییەکی شێوە **میحرابی هێلکەیی** پەیدابووەو پڕکراوە لە نەخشی گیایی دوو **پەلکەو سێ** پەلکەیی.

نەخشی **ئەم** کەمەرە **جوانو** نایابە **بیرم** نایەت **ئەم دوو**

جۆر نەخشانەم دیبێت لە نێو نەخشەکانی عەلی نەقاشداو لەوانەیە دەستکردی نەقاشێکی دیکە بێت کە لە عەلی بە توانا تربێت لە نەقاشیدا، یان لەو کەمتر نەبێت.

لە هەردوو تەنیشتی هۆدەی پشت هەیوانی، تاقە نەخشدارەکان هەیەو سەرووی ئەو کەمەرە نەخشەی چوار دەوری هۆدەکە هەیەتی و بانەکەشی دابەش کراوە بۆ سێ ریز کەمەر (افرین)ە نەخش لە ناوەڕاستی دایەو لە هەرلایەکی کەمەرەکان داپۆشراوە بە نەخشی ئەندازەیی کە پێکهاتووە لە شکڵەکانی شەش گۆشەیی مەیلەو مەکوکی و لەبزینەیی (معینی)و ئەستێرەکان و بنچینەی هەموویان نەخشە شەش گۆشەیەکەو دووپات بوونەوەیەتی چونکە بە یەکتربڕینی هەر حەوت تاکێك لە شەش گۆشەییەکە نەخشە لەبزینەیی و ئەستێرەکانی پێنج تیرۆژی دروست دەبن لەسەر زەوی سپی.

سەری هۆدە دابەش کراوە بۆ دوو کێڵگە نەخشی جوان کە باس کردنیان زۆر دەخایەنێت، لەوانەیە کێڵگەی ژێری لە جۆرە خشڵێکی ژن وەرگیرابێت، بەهۆی پرسیارە زۆرەکانمەوە زانیومە جار هەبووە نەقاشێك نەخشێکی جوان لەسەر قوماشێك جا قوماشی هەر دەوڵەتێك بێت یان لەسەر شتێکی دیکەی دیوەو لە خانوویەکدا هەمان نەخشی دروست کردووە[١١٩].







خانووی تەیفور

*** خانووی (عەلی ئاغا):**

خانووی کەلەپوری عەلی ئاغای مستەفا ئاغا دەکەوێتە نزیك باکووری مزگەوتی عوریان لە ناوەندی قەلاَ، لە نێوانیان یەك دوو خانوو هەیە، مێژووی دروستکردنەکەی ساڵی (١٩١٠)ی لەسەر (سەردەری)یەکەی لە ناوەوە لە نێو نەخشەکاندا نوسراوە.

خانوونی عەلی ئاغا لە بەردو گەچ و دوو قاتە دەرگاکەی لە رۆژئاوایەوە (راڕەو)ی هەیە بە پانی دەوری (٢)م لە نێوان دەرگای یەکەم و دەرگای دووەم. لە دەرگای دووەم مرۆڤ دەچێ بۆ حەوش کە بیری ئاو یان بیری زێرابی تێدایە حەوشەکەی زۆر گەورە نییە، لە دیواری باشووری حەوش چەند تاقەکی گەورەو کاڵ هەیە کە لە سلێمانی بەم جۆرە تاقانە دەبێژن (نمە)و هەموو پێکەوە دیکۆرێکە بۆ حەوش.

ئەم خانووە بریتییە لە دوو بەش:

بەشی یەکەم: یەك هۆدە لە قاتی یەکەم و یەك هۆدە لە قاتی دووەمەو ئەستونێکی مەڕمەڕ لەگەڵ دوو کەوان لە قاتی دووەمە. سەر پەنجەرەکانی هەردوو قات نەخشدارن دەرگاو پەنجەرەکان مەڕمەڕی نەخشدارە.

بەشی دووەم، لە تەنیشتی باکووری حەوشەیەو دەرگایەکی فراوانی (٢×٢)م دەچێت بۆ حەوشی بەشی باکوور کە دوو هەیوانی بەرامبەر بە یەکتری تێدایە لە هەیوانی رۆژهەلاَت سێ کەوان لەسەر دوو ئەستونی مەڕمەڕ لەگەڵ چەند تاقەکی نەخشدار لە دیواری پشتەوە هەیە، دەرگایەکی تایبەتیش لە نێوان ئەم هەیوانەو بەشی یەکەمی خانووەکە هەیە.

لە پشت هەیوانی رۆژهەلاَت هۆدەیەکی لاکێشەیی هەیەو تاقەکانی نەخشدارە، لە تەنیشتی باکووری حەوش دەرگایەکی دیکە دەچێ بۆ قاتی دووەم، هەیوانی دووەمی حەوش لە رۆژئاوایە لە بەرامبەر هەیوانی رۆژهەلاَت دوو کەوان لەبەر ئەم هەیوانەیە.

هەردوو هەیوان بلَندترن لە حەوش بە دەوری (٤٠) سم، ئەم هەیوانەی رۆژئاوا کەوتووەتە سەرپشتی ژێرزەمینی خانووەکە هەر دوو کونی باکێشی ژێرزەمین لە قەراغی پێشەوەی هەیوانەکەیەو لە هەمان کاتیشدا دوو پەنجەرەیە بۆ رووناکی ژێرزەمینەکە هەر دوو هەیوان، کەوانیان جوانە.

لە تەنیشتی باکووری حەوش دەرگایەکی مەڕمەڕ دەچێ بۆ دوێرو خەنزە دەرگاکە نەخشی جوانی لەسەرە، کەوانی دەرگا لە چەشنی کەوانی بڕواییە (مقصوص)ەو ددانداره کە یازدە شکلَی مەڕمەڕی وەك سەرەڕم یان هەروەك دەمە شانە پێدا شۆڕ بۆتەوە پەنجەرەیەکی مەڕمەڕیش لە هەنداوی دەرگاکەیە کە جوانکارییەکی دیکەی تەلارسازی دەبەخشێت.

لە بەردەم هەردوو هۆدەی (دوێن)و (خەزنە) راڕەو هەیەو لە بانی خانوو لە راسەری راڕەو (گومەزە چەترێك) هەیە بەلاَم مخابن نەخشەکانی لە نێوچووە ئەمەش وەك هی خانووی (سەیید فاتیح)ە لە چوار دەورەکەی وەك هەموو ئەم جۆرە (گومەزە چەتر)انە سێ چوارچێوەی باریکی لە گەچ لە چواردەوری هەیە دوانی یەکەم شێوە زکزاکین. لە ساڵی (١٩١٨)دا (عەلی نەقاش) گومەزە چەترێکی لەم چەشنە بەلاَم چوارگۆشە لە خانووی (عەبدوللاَ بەگ زادە)دا دروست کردووە لە شاری کۆیە.

دوو (داینجان) لە مەڕمەڕی نەخشدار لە هەردوو تەنیشتی دەمی (دوێن)دا هەن لە دوێرەکەدا پێنج کەوانە (عەقد) هەیەو لەسەر هەر یەکەیان نەخشی درەختی سەرو هەیە کە بە



**خانووی عەلی ئاغا**

وێنەی تاج کۆتایی پێ دێت‌و هەڵدەگەڕێن بەرەو ناوەندی کەوانەکان، لە ناوەڕاستی کەوانەکانیشەوە نەخشێك هەیەو بە هەردوو لای نەخشەکەدا وێنەی قەندیلی شۆڕ بۆتەوە.

لە دیواری دەستە راستی دوێر دوو ریزە تاق هەیە، ریزی سەرەوە چوار تاقە لە نێوان کەوانەکانداو ناو تاقەکان بێ نەخشە، ریزی خوارەوەش چوار تاقی گەورەترە کە نەخشی جوانیان تێدایەو لە دیواری دەستە چەپیش هەمان دوو ریزە تاق هەیە، هەر تاقێك لە تاقە گەورەکان لەگەڵ تاقی بەرامبەرەکە یەك جۆرە نەخشی هەیە لە نێوان هەردوو ریزە تاق‌و لە ژێر دەست پێکردنی کەوانە ئاقدەکان دوو کەمەر (ئیفرین)ی نەخشداری بەرز لە هەردوو تەنیشتی دوێر هەیە، لە کۆتایی دیواری دەستەڕاست دەرگایەك دەچێت بۆ (سرخانە) لە هەمان شێوەو قەبارەی تاقەکانی دیکەیدایەو لە باتی تاقی چوارەمی ئەم دەستە راستەیە.

لۆقەندان لە سەرەوەی دوێرەکەدایە بەڵام پاش ئەوەی (حوسێن نەقاش) نۆژەنی کردوە جارێك دیکە کەسانی ناپاك شکاندوویانە، خانووی کەلەپووری ئەگەر خێزانی تێدا نەبێت‌و یان کارێکی بەردەوام بەکار نەهێنرێت وەك کاری هونەرو رۆشنبیری وێران دەبێت.

لە ژێر لۆقەندان (شقلە) هەیە بۆ دانانی لێفەو دۆشەك‌و ئەمەشیان شکاندووە خەزنەو کۆشك لە تەنیشتی دەستە چەپی دوێرەکەن، لە بەرامبەری دەمی هۆدەی (خەزنە) دەرگای ژێرزەمینەکەیە، ژێرزەمینەکە قووڵە بە دەور (٣)م رێگاکەی بریتییە لە کۆمەڵە پلەی رێك‌و پێك لە نێو ژێرزەمینەکەدا دوو کەوان هەیەو دوو کونە باکێش (پەنجەرە) لە دیواری رۆژهەڵاتدا هەیە بۆ هاتووچۆی باو رووناکی.







خانووی عەلی ئاغا

*** خانووی (سدیق عەلاف):**

لە خانووی کەلەپووری (سدیق عەلاف) لەسەر قەراغی رۆژئاوای قەڵاو راسەری چەمی خاسەیەو لە نێوان ئەو و (دەرگای تۆپ)دا خانووی کەلەپوری (تۆما) هەیە، دیمەنی لە دەرەوەی قەڵایش، لە پشتەوە جوانە کە لەسەر بەرزی قەڵاوە دلگیرە.

دەرگای خانووەکە لە رۆژهەڵاتە، ئەم خانووە لە ووردە بەردو گەچە وەك خانووەکانی دیکەی قەڵاو بریتییە لە دوو بەش:

بەشی یەکەم دەکەوێتە پێشەوەی حەوشەکە، پێکهاتووە لە دالانێکی گەورە لە نێوان دوو دەرگاداو لە هەر تەنشتێکی هۆدەیەك هەیەو یەك قاتە.

پاش ئەم بەشە حەوش دێت کە بە نسبەت حەوشەکانی خانووەکانی قەڵا بە گەورە دەژمێردرێت چونکە زەوی بۆ خانوو لە قەڵادا کەم بووە، لە حەوشەکەدا حەوزی ئاوی هەیە.

بەشی دووەم لە رۆژئاوای حەوشەو دوو قاتە، لە قاتی یەکەم چوار هۆدە هەیەو روویان لە رۆژهەڵاتەو دەرگاو پەنجەرەکانی لە مەڕمەڕی نەخشدارە، نەخشی جوان لەسەریانە.

دوێر بریتییە لە هۆدەی باکووری ئەم بەشە لە قاتی یەکەمو بێ نەخشەو خەزنەو کۆشکی نییە لەوانەیە لە کۆندا نەخشێکی زۆری تێدا بێت و تێك چوبێت پاشا سواخ کرابێت بۆ ئەوەی سەر لە نوێ نەخشەکانی دروست بکرێت بەڵام نەکراوە، لۆقەندان و شوقلەکەی تێکچوونە، دەرگا مەڕمەڕی ئەم هۆدەیە زۆر جوانە چوارچێوەی خۆی هەیەو دوو چوارچێوەی دیکەی پان لە گەچ لە دەورەکەی هەیە لەگەڵ پەنجەرە لەسەرووی دەرگاکە.

قاتی سەرەوە بریتییە لە هۆدەی گەورەی ناوەڕاست (تاق) و دمەکەی فراوانە وەك هەموو ئەو هۆدە ناوەڕاستانە شێوەی (تەلارسازی کەڵەکی) لە سەرەکەیدا سێ پەنجەرەی گەورە هەیە پەنجەرەی ناوەڕاست گەورەترە.

لە هەر دەستێکی هۆدەکە هۆدەیەکی لاکێشەیی گەورە بە قەد درێژی هۆدەی ناوەڕاستی هەیەو هەر یەکەییان سێ پەنجەرەی کەوتووەتەوە سەر هۆدە گەورەکەو لە سەری هەریەکەیشدا دوو پەنجەرە هەیەو لە تەنیشیت پێشەوەی رۆژهەڵاتیش دوو پەنجەرە بەڵام لە هۆدەی باشووردا لە تەنیشتی باشووری ژوورەکە سێ پەنجەرەی دیکە هەیە واتە دە پەنجەرە لەم هۆدەیەدا هەیە پەنجەرەکانی هەموویان گەورەن.

لەبەر هەیوانە باریکەکەی ئەم کۆشکە جوانە سێ کەوان هەیە، بەڕاستی خانووی (سدیق عەلاف) نموونەیەکی زۆر جوانی شێوەی تەلارسازی (کەڵەك)یە بە عەرەبی پێی ووتراوە شێوەی (سدلی-حیری)(١٢٠).







خانووی سدیق عەلاف

*** خانوونی (عەلی ئۆتراقچی):**

ئەم خانووە لە گەڕەکی پیریادی لە ساڵی (١٨٨٥) دروست کراوە، بەڵام لە دوایی دووبارە ئاوەدانکرداوەتەوەو گەلێك لە بنەماکانی تەلارسازی لە دەست داوە، ئەوەی بەرچاو دەکەوێت لەم خانووەدا دوو هۆڵی گەورەی تێدایە بە بێ ئەوەی ژووری تەنیشتی تێدا بێت.










خانوونی عەلی ئۆتراقچی

*** خانووی (قادر حاجی عەبدوڵلا):**

ئەم خانووە لە ساڵی (١٨٨٩) لە گەڕەکی (موسەڵلا) دروست کراوە لەسەر بنەمای دوو ژوور لەخانوویەکدا، بەڵام لە رووی هونەری نەخش و لۆقەنداندا دەستڕەنگینی پێوە دیارە.

*** خانووونی (مستەفا ئاغا):**

ئەم خانووە لە ساڵی (١٩١٠) لە گەڕەکی (مەیدان) لەسەر قەڵا دروست کراوە، ئەوەی تەنها لە پاشماوەی ئەم خانووە ماوە تەنها ژووری حەریمە، ئەم خانووە پێك هاتووە لە سێ ژوور کە ژووری تەنیشتی دەڕوانێتە سەر هەیوانەکەو ژووری (سرخانە) کەوتووەتە دوای ژووری تەنیشتەوە.

ئەوەی بەرچاو دەکەوێت لەم خانووەدا هونەری نەخش و نیگارو کەوانەیە بە شێوەی جۆرەها نەخشی رووەکی.

*** خانوونی (عەبدولڕەحمان نافیز ئەفەندی):**

ئەم خانووە لە ساڵی (١٨٨٤) لە گەڕەکی (حەمام) لەسەر قەڵا دروست کراوە، کە لەلایەن (عەبدولڕەحمان نافیز ئەفەندی) یەوە (١٨٨٥-١٩٢١) کە لە کاتی خۆیدا فەرمانبەر بووە لە بەڕێوەبەرایەتی تەحریراتی کەرکوك بنیات ناوە.

ئەم خانووە لە سێ ژوور پێك هاتووە، بەڵام لە دواییدا گەلێك گۆڕانکاری بەسەردا هاتووەو شێوەی بنەڕەتی خۆی لە دەست داوە.





**خانووی قادر حاجی عەبدوڵڵا**





**خانوونی مستەفا ئاغا**



خانوونی مستەفا ئاغا



خانوونی عەبدولڕەحمان نافیز ئەفەندی










**خانووی عەبدولڕەحمان نافیز ئەفەندی**

*** خانووی (سەیید ئەحمەد تسنلی):**

بە پێی سەرچاوەکان ئەوە دەردەخات کە ئەم خانووە لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا دروست کراوە بە قوڕو خشتی کاڵ، ئەم خانووە پێکهاتووە لە سێ ژووری دروستکراو لەگەڵ شوێنی تایبەت بە خێوکردنی ئاژەڵ، هەیوانی خانووەکە دەڕوانێتە سەر حەوشەیەك کە هاوپەیوەستە بە یەکێك لە ژوورەکان کە تایبەتە بە تەونکاری، بەڵام بوونی ئەم خانووە نەماوەو بە تەواوەتی رووخاوە.

*** خانووی (گوڵخانی):**

ئەم خانووە کەوتووەتە گەڕەکی (ئاوچی) لە پشت مزگەوتی منارە نەخشینە، مێژووی دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٠٠)ی زایینی، ئەم خانووە پێك هاتووە لە دوو دوێرو خەزنەی گەورەو دوو ژووری هاوتەنیشت، لە رووی بیناکارییەکەوە هەر یەکە لە (بەندە غەفور)و (عەلی نەقاش) کاری نەخشسازییان تێدا کردووە، هەروەها ئەم خانووە دوو هەیوانی تێدایە کە بەسەر حەوشەکەدا دەڕوانێت[١٣١].

بێجگە لەم خانووانەی باسمان کرد گەلێك خانووی تر هەیە، کە جۆرەها تەرزی بیناکاری‌و نەخش ونیگاری تێدا هەیە وەکو ماڵی عەلی ئۆتراقچی، شێخ عەلی تاڵەبانی، مەلا قادری ئیمام[١٣٢] جۆرەهای دیکە، کە هەریەکەیان کتێبێك هەڵدەگرێت کە لەسەری بنووسرێت[١٣٣].







**خانووی سەیید ئەحمەد تسنلی**







خانووی گوڵخانی

*** سەرنجەکانمان دەربارەی هونەری دروست کردنی خانوو لە کەرکوك لە ڕووی بیناکاری و نەخش و نیگارەوە:**

١. ئەوەی سەرنجمان دەدات لەم خانووانەدا، وردبینی ودەست ڕەنگینی و کارامەیی بیناسازەکان بەدەر دەخات، لە توانای نواندنی ئەو تەرزی بیناکاریانەدا، سازدانی شوێنەکان وادانانی لە شوێنی پێویستی خۆیدا، وەکو گرێ، گوومەت، کۆڵەکە، دەرگا، پەنجەرە، تاق، سەکۆ.

٢. وردبینی بەکار هێنانی ڕەگەزەکانی بیناکاری بۆ پێویستییەکانی مرۆڤ، شتێك نابینین، کە بۆ پێویستی مرۆڤ دروست نەکرابێت، ئەوەی کەسەکان بیریان لێ کردبێتەوە، بیناسازی بەدەستی هێناوە. ڕازاندویەتەوە بە شێوەیەکی

ئەوتۆ کە جوانکارییەکی بیناکاریداوە بە ژوورەکان.

٣. بڵاوبوونەوەی هونەری بیناکاری عوسمانیو موتوربەکردنی بە تەرزی بیناکاری ئیسلامی وخۆماڵی ناوچەکە، ئەگەر سەرنجێکی هونەری ماڵەکان بدەین دەبینین لە چوار چێوەیەکی ئیسلامی ساز دراوە، بەڵام گەلێك تایبەتمەندی خۆی وەرگرتووە لە هونەری بیناکارییەکانی پێش ئیسلامەتیو ماوەی گەشە بووی ئیسلامەتی، بۆیە هەر چەند تەرزی گشتییە ئیسلامەتییەکە هەوڵی داوە، نەیتوانیوە زاڵ بێت بەسەر تەرزی بیناکاری خۆماڵییەکە، ئەویش لە داڕشتنی رەنگ وجۆری نەخشەکان، وقەبارەی کەرەستە بەکار هێنراوەکان.

ئەوانەی کە لە کاری بیناسازییەکەدا کاریان کردووە، هەموویان سەر بە ناوچەکانی کەرکوك وکوردستان بوونە بە گشتی، ناوێکی بێگانەمان بەرچاو ناکەوێت کە دەستیان هەبووبێت لە کاری بیناکاریەکەدا، ئەمەیش هۆیەکی گرنگە کە ئەو بیناکارە، پەروەردەی ئەو ژینگەیە دەستو پەنجەکانی راهاتووە لە سەری، هەستێت بەوەی بە چاوێکی خۆماڵیانە کارەکەی بکاتو نشونماو جوانکاری خۆی تێدا بە دەست بهێنێت.

بۆ راستی ئەم بۆچوونەمان نموونەمان زۆرە وەکو: (عەلی نەقاش) لە بنەڕەتدا خەڵکی (دیاربەکر)ە هەر لە زووە هاتۆتە کەرکوك کە کوڕی (محەمەدیە)، (حەسەن نەقاش)، دایك برای (عەلی نەقاشە)، ئەویش لە دیاربەکرەوە هاتووە[١٢٤].

بۆیە هیچ بەسەیر نازانرێت نەخشی ماڵێك لە کەرکوك دووبارە بۆتەوە لە کۆیە وهەولێر وسلێمانی وخانەقین ودیاربەکر وسنە بەهەمان پێوانەو مەودای نەخشکاری.. هەر لەبەر ئەمەیشە کە بەم ناوچانەدا دەسوڕێیتەوە هەست بە هەمە چەشنی وهاوگونجاوی رەنگ وتەرزی بیناکارییەکەی دەکەیت.

٤. یەکێك لەو هونەرانەی کەلە سەردەمی عوسمانییەکاندا باو بووە هونەری دروست کردنی خانووە لەسەر شێوەی کەڵەگی (دوێرو خەزنە) کە بنەڕەتی ئەم بیناکارییە لەلایەن ساسانییەکانەوە بووە، بەڵام لەسەردەمە ئیسلامییەکان گەشەی پێکراوەو تایبەت مەندییەکی خۆماڵی وەرگرتووە، بەڵام بنەڕەتییە ساسانییەکەی تێدا بەدەردەکەوێت.

ئاواکردنی خانوو لەسەر شێوەی (کەڵەگی- سهدلی- حیری) لە کوردستاندا هەبووەو هەیە بە تایبەتی لە کوردستانی باشووردا، مێژووی ئەم (کەڵەگی)یە دەگەڕێتەوە نزیکەی دوو هەزار ساڵ.

(کەڵەگی) ئەو شێوە خانوویە کە هەیوانێکی تێدا هەبێتو هۆدەیەك لە دەستی ڕاستی بێ وهۆدەیەکی تر لە دەستی چەپ هەبێ، یانی هەیوانێك لە بەینی دوو هۆدەدا بێت، ئەمە بەناوبانگترین شێوەی (کەڵەگی) یە، وەکو گوتراوە ئەم شێوەیە لەسەر شێوەی جەنگە: نیوەڕاست کە سنگەو قراڵ یان سەرکردایەتی تێدایەو لە دەستی راستی هێزێکەو لە دەستی چەپی هێزێکی ترە.

ساسانییەکان بە ئەم شێوەیە بیناکارییان گوتووە (سهدلی)، لەشاری کەرکوك لە شێوەی (کەڵەگی) گوومەزی دەبینین، کە کەرکوك پێی دەڵێن (دوێرو خەزنە)، (دوێر)، هەیوانەکەیەو (خەزنە)کەیش هۆدەکانی تەنیشتی هەیوانە، شێوەی (کەڵەگی) لە خانووە نەخشدارەکانی شاری (کەرکوك) کەمن.

کەڵەگی کەرکوك، بە شێوەیەکی گشتی جێگەکەی نزمە، بۆ ئەوەی هاوین فێنك بێتو زۆربەی ئەو خانووانەش یەك قاتن یانی (کەڵەگی) لە خارەتییە (خوارتییە).

تارمە یان راڕەوی بەردەمی هەیوان وهۆدەکان دیوار کراوەو دەکەوێتە پشت قاپی، لەبەر ئەمە هەیوان وهۆدەکان دەکەونە خانووەوەو یەکسەر ناکەونە سەر حەوش، هەروەکو هی (کۆیسنجق) رووناك نین.

بانی هەندێکیان یان بلێین، زۆربەی هەیوانەکان چەند پەرەسوو وەکو کەوان (قوس)ی لێکراوە، بۆ نموونە خانووی (شێخ عەلی تاڵەبانی) (٧) کەوانو (خانووی حاجی تاها) (٣) کەوانەی هەیە،ئەم کەوانانە لە هەندێك خانوودا، نەخشکراون بە نەخشێکی ئیسلامی زۆر جوان وهەڵکەنراون لە گەچ، وەکو هی هەردوو خانووی پێشوو.

لە تەنیشت هەیواندا تاق هەیە. زۆر گەورە نین، بەڵام تاقەکان وەکو سمی هەسپ (ئەسپ) هەڵکەوتوون وجودان لەگەڵ (کۆیسنجق)، ئەم تاقانەش لە زۆر خانوودا نەخشکراون بە نەخشێك وەکو پڕنگی کلکی کەڵەشێر یان بلێین بادەمییەکی درێژە، لەسەر هەیوانی کەڵەگی کەرکوکدا، لە بەشی سەرەوە کە گومەزییە، نەخشی (لۆقەندان) هەیە.

کەڵەگی (کەرکوك)، دەستکاری کراوە، لە شێوەی ئەسڵییەکەی، کە هەندێك شتی لەسەر زیاد کراوە، وەکو هۆدەیەکی زیاتر، یان هۆدەیەك وەکو خەڵوەتێك لەسەر یەکێك لەسەر هەردوو هۆدەکان وەکو خانووی (کەڵەگی) (حاجی مەردان) لە گەڕەکی (بولاق).

ئەو خانووە بریتییە لە سێ هۆدە لەناو یەکدا، لەلای راستی هەیوان وراڕەو هەیەو دوو هۆدە لەلای چەپ، هۆدەیەکیش لەسەر هەردوو هۆدەی دەستە چەپ هەیە بە پەیژە لە راڕەوەکەیدا، وەکو (مەخزەن) بەکار دەهێنرێو دوور نییە بیری دروست کردنی ئەم هۆدەیە لە (شەخیم) هاتبێ، ئەوەی بابەتی گووتنە لەسەر هەردوو یان سێ هۆدەی دەستە راستی هەیوان، هەیوانێك هەیە بەڵام لە دەرەوەیە نەك لە ناو ئەم بەشەدایە.

دیسان هەر لە خانووی (حاجی مەردان)دا هەیوانێکی گومەزی لە بەینی دوو هۆدەدان، دەکەوێتە سەری حەوشەکە لە قاتی سەرێ بەرامبەر بەشی باشووری.

خانووی (مەلا قادری ئیمام) بەرامبەر مزگەوتی (ئیمام قاسم)ە، خانووی (شێخ عەلی تاڵەبانی) کە دەکەوێتە رۆژئاوای تەکیەی تاڵەبانی، لە ساڵی (١٨٨٧-١٨٨٨) دا ئاواکراوەتەوە، بەڵام ئێستا هیچ پاشماوەیەکی نەماوە، خانووی (حاجی تاها)، دەکەوێتە گەڕەکی (بولاق)، ژمارە ٣٥/١٩ دەڵێن مێژووی (١٣٠٢)ی کۆچی بەرامبەر (١٨٨٤-١٨٨٥)ی زایینی، خانووی (حەمید حاجی واحید) دەکەوێتە سەر (بن تاق)ێك لە باشوورو نیزیك مزگەوتی نوعمان، لە گەڕەکی ناوچی لە باشوور قەڵا، درێژایی بن تاق (٢٠)

هەنگاوە، نمرەی خانووی ئاوچی (٢٩/١/٢١).

هەیوانی کەڵگییەکەی کە لەسەر بن تاقە (١٤) پەنجەرەی تێدایە کە هەیوانێکی گەورە لەهەر تەنیشت (٥) پەنجەرەی هەیە لە بەینی هەیوان وهەر یەك لەهەردوو هۆدەی تەنیشتی و هەروەها (٤) پەنجەرەی تر دەکەوێتە راستە کۆڵانی رۆژئاوا، ئەم خانووە نەخشدار بووە بەڵام نەخشەکانی بەگەچ سواغ دراون.[125]

٥. زۆری ئەو پاشماوە بیناکاری ونەخش ونیگارانەی کەبە دەسمان گەیشتووە دەگەڕێتەوە بۆ ماوەی دوواوەیی سەردەمی عوسمانییەکان، بەشێکی کەمی دەگەڕێتەوە سەرەتاکانی عوسمانییەکان ئەویش هیچ بەلگەیەکی بیناکاریمان بۆ نەماوەتەوە، وەکو هونەری هەندێك لە قوتابخانەکانی سەردەمی عوسمانییەکان، بەڵام بە دەماو دەم باسکراوە کە گوایە بەلگەی ئەوە هەیە لایەنی بیناکاری ونەخش ونیگاری تێدا هەبووە. بۆیە ئەوەی ئێمە زیاتر بایەخدانە بە ماوەی دواوەی سەردەمی عوسمانییەکان.

٦. بەکار هێنانی رەنگی شین، سەوز، سوور زەرد، کایی یەکێکە لەو رەنگە سەرەکییانە کە بەرهاتوو، کە دوو رەنگی شین وسەوز دوو رەنگی پیرۆزن لە ناوچەکە، کە ئاخی رەگێکی زەردەشتییان هەیەو لە لایەن خەڵکەکەوە زۆر پیرۆزن، زۆر بەکار دەهێنرێن لە هەموو سەردەمەکاندا.

٧. بەکار هێنانی گەچ وەکو کەرەستەیەکی سەرەکی، لە بیناکاریدا، دەورێکی کاریگەری بینیوە لە هونەری بیناکاریدا، هەروەها بەردو ئینجا مەرمەڕو خشت، دەوریان بینیوە بە تایبەتی بەرد بە رێژەیەکی زۆر هەیە لە ناوچەکانی دەورو بەری کەرکوك.

زۆری بەکارهێنانی بەرد لە بیناکاری کەرکوکدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو چاڵە بەردانەی (مەعدەنەکان) کە لەنزیك شاخەکانی کەرکوکدا هەیە کە بەناوبانگە بە (بەردی سپی) و لە سەرەتادا بە پارچەی گەورە گەورە دەردەکرێ و لە دواییدا وورد وورد دەکرێت، لە هەمان کاتدا جۆری سووری هەیە لەم بەردانە کە ئەمە زیاتر لە بنەڕەتی خانووەکاندا بەکاردەهێنرێت.

٨. خانوو لە کەرکوکدا چەند تایبەتمەندیی و نەخشەسازییەکی هەیە هاوپەیوەستە بە چەند نموونەیەك لەو خانووانە:

نموونەی یەکەمان: بریتییە لەو خانووانەی کە قەبارەی بچووکەو پێك هاتووە لە یەك ژوور لە شێوەی دوێردا کە لە حەوشەکەوە هاوپەیوەست بووە بە چەند پەیژەیەکەوە بۆ چوونە ژوورەوە لە دەرگای نێوان حەوشەکەو عەتەبەدا.

نموومەی دووەمان: بریتییە لە دروست کردنی ژوورێکی تەنیشت لە ژووری دوێرەکە، ئەم خانووانە پێك هاتووە لە دوو چین و سەرکەوتن بۆ چینی دووەم بە چەند پەیژەیەك دەبێت کە لە عەتەبەوە بۆی دەچێت.

نموونەی سێیەم: بوونی دوو ژوور لە هەر دوو لای ژووری دوێرەوە، کە عەتەبەی ماڵەکە بەسەر هەموو ژوورەکاندا دەڕوانێت، ئەم جۆرەیان لە هەموو جۆرەکان بڵاوبۆتەوە.

نموونەی چوارەم: بریتییە لە دوو دوێرو دوو ژووری تەنیشت، کە عەتەبەی ماڵەکە بەسەر هەموو ژوورەکاندا دەڕوانێت.

٩. دروستکردنی (بن تاق-کەوانە لە نێوان دوو گەڕەك): یەکێکە لەو هونەری تەلارسازیانەی دەکەوێتە سەر هەدوو لای کۆڵان و خەڵك لە ژێرییەوە هاتوچۆ دەکات، هەندێك جار لە هەر تەنیشتی کەوانی بن تاق (دوشك-کۆسپە-دەگە) هەبووە بۆ دانیشتن لەسەر بن تاق یان هۆدە هەبووە. بن تاق لە شێوەی تەلارسازییەکەیدا زۆر جوانەو لە چەند گرێیەك پێك هاتووەو گەلێك نەخشی ئەندازەیی و ئاژەڵی تێدایە.

بن تاق دیمەنێکی جوان بوو لە قەڵای کەرکوك پتر لە دە بن تاق لە قەڵادا هەبوو، کە یەکێك لەو بن تاقانە بناوبانك بووە بە ب(بن تاقی گەورە) لە پشت دەرگای (تۆپ) و لەتەنیشت ماڵی (ئەحمەد پلاس) کە درێژییەکەی (٩,٥٠) مەتر فراوانی (٥,٥٠) مەتر.

لە باشووری (بن تاقی گەورە) بن تاقێکی دیکە هەیە لە تەنیشتی باشووری خانووی (ئەحمەد پلاس)، واتا خانووەکە لە نێوان هەردوو بن تاقدایە.

زۆرترین ئەو بن تاقانە ئەو کاتە دروست کراوە کە کەسێك دوو خانووی بەرامبەر یەك هەبووبێت بۆ ئەوەی سوود لە نێوان ئەو دوو خانووە وەربگرێت هەستاوە بە دروستکردنی بن تاق بەستنەوەی بە یەکترییەوە.

ئەوەی لێرەدا گرنگە بیلێن رێگەدان بە دروست کردنی ئەم بن تاقانە ماوەیەکی دیاریکراو بوو کە لە نێوان ساڵی (١٨٦٨-١٩٥٣) بەردەوام بوو، بەڵام لە دواییدا رێگە نەدرا بەم جۆرە بیناکارییە لەبەر ئەوەی گەلێك کێشەی دروست کرد لە نێوان گەڕەکەکان بە تایبەتی لەو کاتەی هاتووچۆی ئۆتۆمبیلی لە گەڕەکەکان پەك دەخست.

ئەم بن تاقانە هیچ پاشماوەیەکی ئەوتۆیان لە کەرکوك لێ نەماوە، لە ساڵی (١٩٥٨) بن تاقی (حەسەن ئاغا) هەبوو لە گەڕەکی (پیریادی) رووخێندرا لەبەر فراوانکردنی شەقامەکەو گەورەیی بن تاقەکە کە دوو کەوانەی هەبوو لە ناوەڕاستدا کۆڵەکەی بۆ کرابوو[126].







خانووی (تۆما) لەسەر قەلاّ







**كۆڵەكەو نەخشی خانووی (تۆما)**



**خانووی (نازم بەگ) لە كەركوك**

*** وەستاو نەقاشەکانی بواری تەلارسازی لە کەرکوك:**

*** وەستا (ئیلیاس):**

لە ساڵی (١٨٧٠) لە کەرکوك لە دایك بووەو لە ساڵی (١٩٤١) کۆچی دوایی کردووە. ئەم وەستایە لە بنەڕەتدا مەسیحی بووەو لە دواییدا بۆتە موسڵمان و دوان لە برازاکانی لە ڕووداوی (٤)ی ئاداری ساڵی (١٩٢٤)دا بە کارەساتی (لیڤی) کە هێرشیان کردووەتە ناو بازاڕی کەرکوك کوژراون.

وەستا (ئیلیاس کەرکوکی) لە وەستا بەنا چاکەکانی سەدەی نۆزدەیەم بووە لەبەر ئەوەی لە شاری کۆیە کاری کردووە، مامۆستای وەستا عەباسی خدری قوولەبەگی بوو لە هەمەوەند کە وەستا عەباس لە کۆیە ماوەتەوە. وەستایەکی گەورە بووە خانووی کەلەپووری (ڕەسوڵ ئاغا) ی لە ساڵی (١٨٨٤)دا ئاوا کردووەو پێشتر قاتی ژێرەوەی لە خانووی کەلەپووری (جەمیل ئاغا) لە کاتی (ئەسعەد ئاغا) ی باوکیدا ئاواکردووەو ناوی لەسەر مزگەوت (بایز ئاغا) هەیەو لە ساڵی (١٨٩٣)دا (تەکیەی شێخی چۆلی) لە هەولێر ئاواکردووە، وەستا عەباس لە ساڵی (١٨٩٣)دا کۆچی دوایی کردووە بەڵام مێژووی کۆچی دوایی وەستا (ئیلیاس) م نەزانییوە، جاری وا هەبووە وەستاو بەناکانی کەرکوك لە کۆیەش ئیشیان کردووەو خانووی کەلەپوری (حاجی تەها) لە ساڵی (١٨٨١) ئاوایان کردووە لەگەڵ وەستا (شاکر سەمین ئیبراهیم کۆیی).

*** وەستا (خورشید):**

وەستا خورشیدماڵی لە قەلا بوو لە ساڵی (١٩٢٤) لە تەکیەی (سەیید نەجیبی جەباری-تەکیەی نەقشبەندی) لە قەلا ئیشی کردووە، وەستا خورشید لە ساڵی (١٩٣٩) لەگەڵ هەندێ وەستا بەشداری کردووە لە ئاواکردنی تەکیەی (سۆڵە) لە ناوچەی قەرەداغ، کە ئەم تەکیە گەورەو گرنگە لەلایەن شێخ قادری شێخ حوسێنی چرچە قەڵاوە ئاواکراوە بە پێنج ساڵ پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات لە ساڵی (١٩٤٣)دا.

*** وەستا (حوسێن عەبدولغەنی ساقی):**

لە ساڵی (١٩٢٩) لە کەرکوك لە دایك بووە، بێجگە لەوەی دەستێکی باڵای هەبووە لە بواری بیناکاری و گرێ و کەوانەدا، هەروەها لە باپیرەو باوکێوە لە بواری هەڵکەندنی کارێزدا شارەزابووە، لە دوای بیست ساڵ لە بواری ڕازاندنەوەی گەچیشدا دەستێکی باڵای هەبووەو لە هەڵکۆڵین لەسەر بەرد شارەزا بووە، لە نۆژەنکردنەوەی شوێنەوارە کۆنەکاندا بە توانا بووە، بە تایبەتی لە پاراستنی مۆرکی بنەڕەتی ئەو شوێنەوارە.

لە کارەکانی لە مزگەوتی (ئۆلۆ جامیع)و (نەبی دانیال)و (بوغدە خان)دا دەستێکی باڵای هەبووە لە چاککردنەوەیدان هەروەها دەوری هەبووە لە نۆژەنکردنەوەی بنمیچی (قەیسەری گەورە)و (خانی گاوران)و (قاپی بازاڕ)و (ماڵی تەیفور)و (محەمەد تۆپنەچی).



وەستا حوسێن عەبدولغەنی

*** وەستا (حاجی مستەفا محەمەد قاپەچی):**

لە ساڵی (١٩٣٠) لە گەڕەکی (ئاوچی) لە دایك بووە، لە سەرەتادا لە هونەری بیناکاری کۆندا کاری کردووە، بەڵام لە دواییدا لە هونەری بیناکاری نوێدا ئیشی کردووە، هەروەها جێ پەنجەی دیارە لە هونەری بیناکاری مزگەوتی (کەرکوك) و مزگەوتی (خولەفا)و سینەما (ئەتلەس)و سینەما (حەمرا) و نەخۆشخانەی (کەرکوك).

*** وەستا (ئیحسان ئیبراهیم ئەمین قاپەچی):**

لە ساڵی (١٩٤٠) لە کەرکوك لە دایك بووەو لە ساڵی (٢٠٠٩) کۆچی دوایی کردووە، دەستێکی باڵای هەبووە لە هونەری دارو دارسازیدا.

*** وەستا (محەمەد عەلی ئیبراهیم):**

لە ساڵی (١٨٩٨) لە کەرکوك لە دایك بووەو لە ساڵی (١٩٧١) کۆچی دوایی کردووە، ئەم وەستایە بە ناوبانگ بووە بە (وەستا قازی)، تاوەکو ساڵی (١٩٦٥) لەم پیشەیەدا کاری کردووە.



وەستا محەمەد عەلی

*** وەستا (عیزەت مەحمود بەهرام):**

لە ساڵی (١٩٢٢) لە کەرکوك لە دایك بووە، لە ساڵی (١٩٨٤) کۆچی دوایی کردووە، یەکێکە لە وەستا بەناوبانگەکانی کەرکوك کە لە بواری ئەدەب و شیعریشدا دەستێکی باڵای هەبووە، بە ناوبانگ بووە بەوە کە یەکێك لە پەنجەکانی لە بواری کاری بیناکاریدا لە دەستداوە.



وەستا عیزەت مەحمود

*** وەستا (تۆپاڵ فایق):**

لە ساڵی (١٩٧٢)دا کۆچی دوایی کردووە، یەکێکە لەوانەی کە لە بواری دروستکردنی بنمیچی گەورەو بەرزدا بە شێوازێکی کەلەپوری بە ناوبانگ بووە.

*** وەستا (سەیید فەتاح):**

وەستا سەیید فەتاح لە ساڵی (١٩٢١)دا خانووی نەخشداری (مەلا قادری ئیمام)ی بەڕێوەبەری ئەوقافی کەرکوکی ئاواکردووە بە شێوەیەکی جوان و (عەلی نەقاش) نەخشکاری کردووە.

*** وەستا (ئیبراهیم عەبدوڵڵا):**

وەستا ئیبراهیم باوکی وەستا (خەلیل)ەو ماڵی لە قەڵا بووە، لە ساڵی (١٨٦٤) لە دایك بووەو لە ساڵی (١٩٢٩) کۆچی دوایی کردووە.

لە وەستا بەنا هەرە باشەکان بووەو وەستا خەلیل کوڕی لەوێوە فێری بەنایی بووە. یەکێك بووە لەوانەی کە بورجی (قولە)ی لە خوارووی کەرکوك لەسەر ڕێگای سەرەکی بەغدا دروست کردووە کە لە شەستەکانی سەدەی بیستدا ڕووخێندراوە، هەر یەکە لە قشڵەی کفری و گەلێك خانووی ماڵان لە (قەسر شیرین) لە کارە جوانەکانی ئەم وەستایە بوونە. هەر یەکە لە (محەمەد سوبحی) و (مستەفا شەنگوڵ)ی کوڕی لە بواری دارسازیدا ناوبانگیان دەرکردووە.

*** وەستا (فەتوش-فەتحوڵڵا کەرکوکی):**

لە دوای نیوەی سەدەی نۆزدەهەم و لە چارەکی یەکەمی سەدەی بیستدا لە کەرکوك ژیاوە، یەکێکە لەوانەی کە بەناوبانگ بووە بە دروست کردنی پردی (داقوق)دا پێش شەڕی جیهانی یەکەم بۆ گواستنەوەی هێڵی شەمەندەفەر بۆ پارێزگای کەرکوك.

*** وەستا (حاجی ئەمین):**

حاجی ئەمینی بەنا وەستایەکی زۆر باش بووە، قشڵەی عەسکەری کۆن بەرامبەر نادی عەسکەری ئاواکردوە بە پێی زانیارییەکانی وەستا محەمەدو وەستا حەسیب، ئەم قشڵەیە لە نێوان قشڵەی گەورەو خانەقادا بووەو پێی ناچێ (دەبۆی عەسکەری) بێت چونکە دەبۆو قشڵەی گەورە لە ساڵی (١٨٧٤)دا ئاواکراوە وەك (عەباس ئەلعەزاوی) نوسیویەتی لە (العراق بین احتلالین).

حاجی ئەمینی بەنا لە دەوروبەری ساڵی (١٩٣٦)دا کۆچی دوایی کردووە، حوسێن نەقاش دەڵێ: زوو مردووەو ئەم بینیووەو زۆربەی کارەکانی لە گەڕەکی جولەکەکان بووەو کارە دەستکردەکانی دەناسم.

گەڕەکی جولەکەکانیش بەشی ڕۆژئاوا بووە لە گەڕەکی (پیریادی) و گەڕەکی (موسەڵڵا) لە ڕۆژئاوای بووەو گەڕەکی بوڵاق لە باکووری بووە.

*** وەستا (حەمە مچاو- محەمەد مستەفا):**

لە نێوان نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم و چارەکی یەکەمی سەدەی بیست ژیاوە، لە دوای خۆی هەر یەکە لە (عەزین) و (محەمەد)ی کوڕی ناوبانگیان دەرکردووە لە پیشەکەیدا.

*** وەستا (محەمەد تەها):**

لە ساڵی (١٨٩٥) لە کەرکوك لە گەڕەکی (پیریادی) لە دایك بووەو لە ساڵی (١٩٥٠) کۆچی دوایی کردووە.

وەستا (محەمەد تەها) لە دروستکردنی گومەزو کەوانەکاندا زۆر زیرەك بووەو دەڵێن کەسی وەك خۆی نەبووە، (خانی ماست)ی ئاواکردووە کە (٣٣) هۆدەیەو خانی عەلی ئۆتراقچی بووە، هەروەها (خانی حوسێن ئاڵتون)یشی ئاواکردووەو ئاشی دروست دەکرد، دەستی هەبووە لە دروست کردنی کۆڵەکەی چایخانەی مەجیدییە)دا، هەروەها دەستێکی باڵای هەبووە لە هونەری نەخش لەسەر بەرد بە هەڵکۆڵیندا، کە (حوسێن عەبدولغەنی ساقی) یەکێك بووە لە قوتابییەکانی.

وەستا (جەلیل حەمدی) ووتی: من شاگردی ئەوم و بۆ کارکردن دەچوو بۆ سلێمانی و هەولێرو فڕنی نانیشی دروست دەکرد.

*** وەستا ( محەمەد زەینەلْ ):**

ماڵی وەستا محەمەد لە قەڵا بوو دەوروبەری ساڵی (١٩٤٢) کۆچی دوایی کردووە، گومەزەکانی حەمامی (حاجی باقی) ئاواکردووە هەروەها گومەزەکانی حەمامی (حاجی حەسەن) لە ژێر قەڵا لە تەنیشتی ڕۆژهەڵات، ئەمەی دووەم (ئەحمەد بەگی باباجان) ئاوای کردووە، وەستاو ئەندازیاری هەردوو حەمام وەستا (ئیسماعیلی سنەیی) بووە کە کاری زۆری لە قەڵای هەولێر کردووەو دەرگای قەڵای ئاواکردبوو لە پێش جەنگی یەکەمی جیهانی گومەزی ساڵۆنە گەورەی هەریەکیان لەسەر هەشت ئەستون ئاوایکردووە بە ئەندازەیەکی زۆر جوان.

ئەوەندە وەستا محەمەد زەینەڵ لە گومەزدا شارەزابووە وەستا ئیسماعیل ووتوویەتی ئەگەر ئەمم لەگەڵدا نەبێ ناتوانم حەمامەکە ئاوا بکەم، بە پێی زانیاریەکانی وەستا محەمەد جۆکەرو وەستا حەسیب ناوی وەستا ئیسماعیلو ئەحمەد بەگ لەسەر دەرگای حەمام بووە بەڵام بە هۆی فراوانکردنی شەقام هەندێ لە حەمامەکە هاتۆتە بڕینو نووسینەکە لە نێوچووە.

*** وەستا ( ڕەفیقی کەرکوکی ):**

لە وەستا بەناوبانگەکانی کەرکوك بووە لە کاتی (مەلیك غازی)دا لە ساڵانی (١٩٣٣-١٩٣٩)، تەلاری کۆنی شارەوانی کەرکوکی ئاواکردووە بە پێی زانیارییەکانی (حوسێن نەقاش) کە ئێستا نەماوەو ڕووخاندوویانەو وەستا ڕەفیق وەستایەکی زۆر بە توانا بووە، بە تایبەتی لە دروستکردنی کەوانەکاندا.

*** وەستا ( حەسەن ڕەسوڵ نەقاش ):**

لە ساڵی (١٨٩٥) لە دایك بووەو لە ساڵی (١٩٨٠) کۆچی دوایی کردووە.

حەسەن نەقاش (حەسەن ڕەسوڵ محەمەد) لە دایکەوە برای (عەلی نەقاش) بووەو لەوەوە فێری نەخش بووە بەڵام



وەستا حەسەن ڕەسوڵ نەقاش

پتر بەنا بووە لەوەی نەقاش بێت، وەستا بەنایەکی زۆر بە توانا بووە بە فەرمی (وەستا باشی) شارەوانی کەرکوك بووەو بەڵێندەریش بووە، ئۆتێلی (سەیید شاکر)و (خانی سپی) لە نزیك دەرگای حەلواچییەکان لە دامێنی ڕۆژهەڵاتی قەڵاو (حەمامی ئەتڵەس)و (حەمامی عەزیز ئەفەندی)و (حەمامی محەمەد ئەمین)ی ئاواکردووەو هەروەها (خانی حاجی سادق) (١٩٣٩-١٩٤١) هەمووی کاری دەستی (حەسەن نەقاش)ە، هەروەها ئۆتێلی (سلێمان حاجی سادق) لە پێش ساڵی (١٩٤١) بە دوو ساڵێك ئاوای کردووە بەرامبەر نەخۆشخانەی (جمهوری)، کەوانەکانی ڕەواقی (مزگەوتی نوعمان) دەستکردی ئەوە.

لە ڕۆژئاوای مزگەوتی (حاجی عەبدولڕەزاق) ئۆتێلێك هەبوو چەند کەوانێکی جوانی لە قاتی دووەمدا هەبوو لە دەستکردی حەسەن نەقاش بوو ئێستا ئەو ئۆتێلە نەماوە.

حەمامی (محەمەد ئەمین) لەسەر شێوەی حەمامی (حاجی باقی) ئاواکردووەو گومەزی سەرەکی لەسەر هەشت ئەستونی مەڕمەڕەو ئەستونو کەوانە مەڕمەڕەکان دەستکردی بەنا موسڵاییەکانە، وەستا (حەسیب عەبدوڵڵا) ووتی: کاتێ خانی (حاجی سادق)ی ئاواکرد من خەلفەی بووم (خەلفە پلەیەکە لە نێوان وەستاو شاگرد)و ئاواکردنی سێ ساڵی خایاندو ڕۆژانەم چوار درهەم بوو، بەڵام کۆتایی ساڵی (١٩٤١) بوو بە پێنج درهەم.

(حوسێن نەقاش) بە منی ووت: حەسەن لە قەڵادا کاری دەکرد، حەسەن لەگەڵ عەلی نەقاش لە شاری (کۆیسنجاق) کاری نەقاشیی کردووەو ناویان لە نێو تەمەندارەکانی کۆیە زۆر هەبوو، هەروەها ووتی: حەسەن نەقاش مرۆڤێکی لاواز بوو پشتی چەمابوو وەستا محەمەد جۆکەر کە لەبەر دەستی کاری کردووە ووتی: کەوانی جوانی دەزانی.

حەسەن مرۆڤێکی سەخی بووەو هەر وەك عەلی نەقاش پاش خۆی تەنیا دوو کچی بە جێ هێڵاوەو لە (٢٢)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٧٧) کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی (ئیمام قاسم) بە خاك سپێردراوە.

*** وەستا ( سابیر وەلی ):**

لە بیستەکاندا وەستایەکی چاك بووەو ماڵی لە قەڵا بوو لە قەڵایش نیشی کردووە لە ساڵی (١٩٦٤) یان ساڵی (١٩٦٥) کۆچی دوایی کردووە، هەر یەك لە (حوسێن نەقاش)و وەستا (حەسەن کاك عەلی) لەبەر دەستی ئەو فێری بەنایی بوون.

*** وەستا ( ئیسماعیل کەرکوکی ):**

یەکێك بوو لە بەناکانی کەرکوك، لە دەوروبەری ساڵی (١٩٧٥) کۆچی دوایی کردووە.

*** وەستا ( بەندە غەفور ):**

ساڵی (١٨٦٠) لە گەڕەکی (پیریادی)ی کەرکوك لەدایك بووە، لە ساڵی (١٩٢٣) کۆچی دوایی کردووە، یەکێکە لە وەستا بەناوبانگەکانی بیناکاری لە کەرکوکو هاوپەیوەستی سەردەمی بیناکاری سوڵتانی بووە لە دەوڵەتی عوسمانی،

هەر یەكە لە كوڕەكەی (ڕەئوف)و كوڕەزاكەی (سدیق) یەكێك بوونە لە وەستا بەناوبانگەكانی بیناكاری.

هەر یەكە لە خانووی (گوڵخانلەر)و (عارف چەلەبی)و (قیردار)و (سلێمان خانچی) لە كارە چاكەكانی (بەندە غەفور) بووە، هەروەها بەشێكی زۆری نەخشەكانی ئەم خانووانەش لەلایەن (عەلی نەقاش)ەوە ڕازاوەتەوە.



وەستا بەندە غەفور

*** وەستا (بەندە ڕەئوف):**

لە ساڵی (١٨٨٠) لە كەركوك لە دایك بووە، لە ساڵی (١٩٤٢) كۆچی دوایی كردووە.

یەكێكە لە كوڕەكانی وەستای بەناوبانگ (بەندە غەفور)، بەڵام لە دوادواكانی ژیانیدا لە بواری بازرگانی بە گەچ كاری كردووە.

*** وەستا (سدیق بەندە غەفور):**

لە ساڵی (١٩١٤) لە گەڕەكی (پیریادی) لە دایك بووە، لە ساڵی (١٩٨٧) كۆچی دوایی كردووە، بەنایەكی زۆر باش بووە، لە كاتی خۆیدا لە گومەزو كەوان لەو باشتر لە كەركوك نەبوو، لە ساڵی (١٩٨٥) تەمەنی حەفتا ساڵ دەبوو، لە (محەمەد تاهیر)ەوە فێر بیناكاری بووەو نەخشیشی دەزانی، هەروەها دەستێكی باڵایشی هەبووە لە خوێندنی مەقاماتدا.

*** وەستا (عەلی ڕەسوڵ نەقاش):**

لە ساڵی (١٨٧٠) لە كەركوك لە دایك بووە، لە ساڵی (١٩٣٦) كۆچی دوایی كردووە، یەكێك بووە لە قوتابییەكانی وەستا (خدر)، دەستێكی باڵای هەبووە لە ڕازاندنەوەو نەخش و دیكۆری گەچیدا، بە تایبەتی لە بواری ڕەنگدا.

هەر یەكە لە چایخانەی (مەجیدیە)و خانووی (گوڵخانلەر)و (سلێمان خانچی)و (قیردار) لە كارە جوانەكانی نەخشداری‌و ڕەنگ بووە لەلایەن (عەلی نەقاش)ەوە.

هەر لە ژێر دەستی ئەمیش براكەی (حەسەن نەقاش) فێری هونەری نەخش‌و ڕەنگ بووە.

*** وەستا (حاجی عوسمان):**

هاوسەردەمی وەستا (بەندە غەفور) بووە، كە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا ژیاوە، لە سەردەمی خۆیدا یەكێك بووە لە وەستا بەناوبانگەكانی ئەو كاتە.

*** وەستا (عوسمان ئیبراهیم):**

لە ساڵی (١٨٩٥) لە كەركوك لە دایك بووەو لە ساڵی (١٩٧٣) كۆچی دوایی كردووە، لە دوای ساڵی (١٩٦٠)ەوە وازی لە وەستایی هێناوەو منداڵان پێیان ووتووە (مامە نەعناع) لەبەر ئەوەی بە زۆری شیرەمەنی (نەعناع)ی خواردووە.



وەستا عوسمان ئیبراهیم

*** وەستا (قوڵی):**

لە پەنجاكاندا وەستایەكی باش بووەو ماڵی لە قەڵا بووە، دەووری ساڵی (٢٠٠٣) كۆچی دوایی كردووەو حوسێن نەقاش لەگەڵی ئیشی كردووە لە ناو قەڵاو دەرەوەی، (سەیید نوری سەمەدی بەننا) لە دایك بووی ساڵی (١٩٢٠)ە.

*** وەستا (حاجی ڕەشید شەریف):**

لە وەستا باشەكانی كەركوك بووەو یەكێك بووە لەو

وەستایانەی کە (حوسێن نەقاش) شاگردیان بووەو لەگەڵی ئاوەدانی (بن تاقی گەورە)یان کردووە کە هەندێکی لێ رووخا بوو لە هەشتاکانداو دوای ساڵی (٢٠٠٠) کۆچی دوایی کردووە.

*** (مەلا ئەحمەدی حاجی تۆفیق بەگی بەنا):**

لە دایکبووی ساڵی (١٩٣١)ە، ماڵی لە قەڵا بوو، کۆچی کردووە.

*** وەستا (خەلیل ئیبراهیم عەبدوللا):**

لە ساڵی (١٨٨٤) لە کەرکوك لە دایك بووەو لە ساڵی (١٩٤٧) کۆچی دوایی کردووە، وەستایەکی زۆر چاك بوو لە وەستا (ئیبراهیم)ی باوکیەوە فێری بەنایی بووە، لەساڵی (١٩٤٦)دا مزگەوتی (حاجی عەبدولرەزاق مەحمود)ی ئاواکرد بەڵام کاتێ خەریکی دانانی موزاییەکەکانی ئایەتەکانی قورئان بوو لەسەر ئەسکەلەکەی بەربووەو مردو کورەکەشی پشتی شکا، مزگەوتەکە جوانەو بەناوبانگە لە تەنیشتی باشوور لە کۆتایی رۆژئاوا لە پردی خاسەی نزیك کۆتایی باشووری رۆژئاوای قەڵادایە.

(حوسێن غەنی نەقاش) ووتی: ئەو تەلارسازییە جوانەی مزگەوتی قادر کەرەم نەخشەی وەستا خەلیلەو بە سەرپەرشتی ئەو ئاواکراوەو گومەزی شێخ حوسێنی قەرەچێوار لە قادر کەرەم کاری دەستی ئەوە.

هەروەها سەرۆکی وەستاکان بووە لەگەڵ ئەندازیار (مستەر مینۆن) لە دروستکردنی پردی داقوقدا، بەناوبانگ بووە لە بواری گومەت دروستکردنداو گەلێك ئیشی بە ناوبانگی کردووە لە ئێران



وەستا خەلیل ئیبراهیم عەبدوللا

*** وەستا (شوکر پالەوان):**

(شوکر وەلی سالح) خەڵکی گوندی (ساقزلی)یە لە ناوچەی (شوان) لە ساڵی (١٩١٠) لە دایك بووەو لە (٦)ی شوباتی ساڵی (١٩٨٠) کۆچی دوایی کردووە.

وەستا (شوکر) لە چەند بوارێکدا زۆر زیرەك بووە لە بەنایی و بەردتاشی و نەخشکاری و لە دروست کردنی وێنەو پەیکەر ئەگەر چی خوێندەوایش نەبوو، مرۆڤێکی رەقەڵە بوو بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر بەهێز بوو لە کەرکوك خەریکی زۆرانبازی بوو ئیتر پێیان ووتوە (شوکر پاڵەوان)، وێنەی هەندێ خانووی دەستکردی ئەو تاکوو ئێستاکە ماوە، لەگەڵ ئەو کێلە هونەرییەی کە بۆ قەبری (سەعادەت)ی کچی دروستی کردبوو لە بەشی رۆژئاوا لە قەبرسانی ئیمام قاسمو لە نزیك ماڵی خۆی، وێنەکانی موجەسەمی کۆترو بولبول و نەخشی گیایی لە سەرکێل و تەنیشتەکانی دروست کردووە بە شێوەیەکی هونەری جوان کە لە ساڵی (١٩٥٦)دا (سەعادەت)ی کچی کۆچی دوایی کردووە.

خانووی (شوکر پاڵەوان) لە ئیمام قاسم بوو لە تەنیشتی رۆژئاوای قەبرسانەکە دەستکردی خۆیەتی، هەروەها کێلە قەبری (محەمەد پیرۆزخان)یشی بەهەمان شێوە دروست کردووە.



وەستا شوکر پاڵەوان

*** وەستا (محەمەد عەبدوللا جۆکەر):**

لە ساڵی (١٩١٨) لە کەرکوك لە دایك بووەو لە ساڵی (١٩٨٨) کۆچی دوایی کردووە.

وەستا (محەمەد) وەك وەستا (حەسیب) و وەستا (جەمیل) لە وەستاییدا لە وەستاکانی کەرکوك بووەو ماڵی لە قەڵا بوو، مرۆڤێکی رەقەڵە بوو، لە قەڵادا کاری کردووە وەك زۆربەی بەناکانی دیکە، شاگردی (عەلی نەقاش) و (حەسەن نەقاش) بووەو چەندین ساڵ لەگەڵ (عەل نەقاش) ئیشی کردووە.



وەستا محەمەد عەبدوللا جۆکەر

وەستا (محەمەد) لە قەلاو دەرەوەی کاری بەنایی و بۆیاغچێتی کردووەو خۆی بۆیاغی دروست دەکرد، لە مانگی ئاداری یان نیسانی سالی (١٩٨٤) کۆچی دوایی کردووە.

*** وەستا (حەسەن کاك عەلی):**

وەستایەکی باش بووە لە وەستا (سابیر وەلی) فێری بەنایی بووە، لە سالی (٢٠٠٢)دا خانووی کەلەپووری (ئەحمەد پلاس)ی لە قەلای کەرکوك ئاوەدانی کردووەتەوە کە هەندێکی لێ رووخابوو، لە هەمان کاتدا (حوسێن نەقاش) یش نەخشەکانی نوێ کردووەتەوە.

وەستا (حەسەن) لە سالی (١٩٣٣) لە دایك بووەو لە سالی (٢٠٠٣) کۆچی دوایی کردووە.

*** وەستا (مستۆ-مستەفا):**

لە سالی (١٩٢٨) کۆچی دوایی کردووە، هەر یەکە لە (حەسەن)و (محەمەد) کە کوڕی ئەو بوونە ناودارییان لە بواری بیناکارییان دەرکردووە.

*** نەقاشەکان:**

*** (خدر نەقاش):**

ئەم وەستایە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزەهەمدا لە دایك بووەو وا پێ دەچێت لە کۆتایی هەمان سەدەدا کۆچی دوایی کردبێت.

دەستێکی بالای هەبووە لە دیکۆری گەچیدا، مامۆستای (عەلی نەقاش) بووە، لەو نەقاشتر بووەو لە زووەوە کۆچی دوایی کردووە، هەندێ لە کارەکانی لە کەرکوك ماوە، وەستا دەروێشی کوڕیشی بەناو نەقاش بوو بەلام لە (عەلی)یەوە فێری نەخشکاری بوو.



خدر نەقاش

*** (عەلی سۆفی محەمەد عەبدولڕەحمان):**

باپیری لە دیاربەکرەوە هاتۆتە کەرکوك و ژنی هێناوە، (عەلی) لە دەوروبەری سالی (١٨٨٤) لە دایك بووەو لە مانگی حوزەیرانی سالی (١٩٦٤) کۆچی دوایی کردووە، وەك ئەو مێژووەی لەسەر کێلە قەبرەکەی نووسراوە، لە پشت دیواری تەکیەی تالەبانی لە گۆڕستانی ئیمام قاسم.

نەقاشێکی مەزن و لە ریزی هونەرمەندە نەقاشە هەرە گەورەکانی کاتی خۆی بووە وەك (ئیسماعیل)و (عەلی ئەکبەری سنەیی)و (وەستا عەبدوللای شیرین دەست)و (گولێ محەمەد) لە نەقاشە کوردەکانی سنە.

نەخشەکانی ئەو بە هەلکەندن لەسەر گەچ و هەروەها بە بۆیاغ لەسەر گەچ بووە، لە قەلای کەرکوك نەخشەکانی خانووی (عەلی ئاغا)و خانووی (سەیید فاتیح سەیید عومەر سەیید زەینەل) دەستکردی (عەلی نەقاش)ەو هەروەها وەستای بەنای هەردوو خانووەکەشی بووە.

نەخشەکانی خانووی (مەلا قادری ئیمام) لە گەڕەکی ئیمام قاسم ئەوەش دەستکردی (عەلی نەقاش)ە کە لە سالی (١٩٢١) ئاواکراوە لەلایەن وەستا (سەیید فەتاح) ەوەو هەروەها نەخشەکانی خانووی (عەلی مەلا عابد)یش لە گەڕەکی بولاق، نەخشەکانی خانوویەکی دیکەش هەر لە نزیك خانووی (مەلا عابد)و نەخشەکانی خانووی (حاجی تاهای بازرگان)و پاشتریش خانووی (ئەنوەر سالح) لە نزیك خانووە نەخشداری (شاکر کەهیەچی) لە بولاق دەستکردی

ئەوە.

نەخشی لۆقەندانی خانووی (مەلا مەردانی مەلا محەمەدی قوتب) لە بولاٌق‌و نەخشە جوانەکانی (مزگەوتی نائیب) لە نزیك قەلاٌ لە ڕۆژهەلاٌتەوە دەستکردی ئەو بووە لەسەر کۆڵەکەیەك تابلۆ نەخشێکی زۆر جوان‌و سەختی لە گەچ هەلٌکەندووە کە پێی دەبێژن (نەخش سجاد).

لەسالٌی (٢٠٠٩) (حوسێن نەقاش) شاگردی (عەلی نەقاش) ووتی: نەخشەکانی خانووی (حاجی تەیفور) دەستکردی (عەلی نەقاش)ەو بیرم دێت نەخشی دەکردو زۆر گەورە نەبووم، بە پێی قسەی ئەو لە سییەکانی سەدەی بیستەمدا بوو، هەروەها ووتی: زیان بە نەخشەکانی خانووەکە کەوتبو من ئاوام کردەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری کەرکوك، دیسان ووتی: (عەلی نەقاش) نەخشەکانی خانووی (مەلا سەرسپی) لە قەلاٌ دەستکردی ئەوە، بەلاٌم (حوسێن) ووتی ئێستا خانووی (مەلا محەمەدی سەرسپی) ناناسم.

نەخشەکانی خانووی (عەلی ئۆتراقچی) لە بولاٌق هەندێك کەس ووتوویانە دەستکردی (عەلی نەقاش)ە، بەلاٌم (حوسێن) دەلٌێت دوو جار لەگەلٌ (عەلی نەقاش) ئاواکردنی نەخشەکانی خانووەکەمان کردووەو بەشی پێشەوەی خانووەکە لەلایەن (عەلی نەقاش)ەوە ئاواکراوە بۆ (عەلی ئۆتراقچی)و خانووەکە زۆر لەو مێژووە کۆنتر بووە تا هەندێ کەس ووتوویانە مێژووی (١٨٨٧) لەسەر بووەو نەماوەو ئۆتراقچییەکان کڕیوەیانە نەك ئاوایان کردووەو (حاجی حەمید مستەفا)ش لە ئۆتراقچییەکانی کڕیوە.

*** (حاجی سادقی نەقاش):**

یەکێك بووە لە نەقاشەکانی کەرکوك، بەلاٌم زانیاریمان دەربارەی ژیانی نییە.

*** وەستا (عەباسی مەڕمەڕچی):**

وەستا (عەباس) لە گەڕەکی پیریادی نەخشی لەسەر مەڕمەڕ دەکردو لە کەرکوك کەس وەك ئەو لە مەڕمەڕی نەدەزانی، دەرگاو پەنجەرەی مەڕمەڕ لە هەندێ خانووەکانی قوتابخانەی قەلاٌیش کاری ئەو بووە، وەستا (عەباس) دەرگا مەڕمەڕە نەخشدارەکانی خانووی (عەلی ئۆتراقچی) دروست کردووە.

مالٌی لە پیریادی بوو، زۆر لە قەلاٌ ئیشی کردووەو لە (عەلی نەقاش) بە تەمەنتر بوو، کاتێ وەستا (عەباس) لە کانەبەردی مەڕمەری شۆریجە کاری دەکرد تا بەردی مەڕمەڕ بۆ عەلی ئۆتراقچی بێنێ بۆ خانی ماست بەردێك دای بەسەریدا کەوت‌و مرد، ئەوەش لە چلەکانی سەدەی ڕابردوو یان لە سەرەتای پەنجاکاندا بوو.

*** وەستا (کەریم مەڕمەڕچی):**

پێشیان دەووت (دەروێش کەریم) کاری مەڕمەڕی دەکردو دەرگاو پەنجەرەی مەڕمەڕی نەخشداری دروست دەکرد لە قەلاٌو دەرەوەی وەك خانووی (محەمەد ڕەئوف)ی گۆرانی بێژ لە گەڕەکی بولاٌق‌و هەروەها کێلی مەڕمەڕیشی زۆر دروست کردووەو دەوری (٣٠) سالٌە کۆچی دوایی کردووە.

*** (حوسێن نەقاش):**

(حوسێن غەنی ساقی محێددین) خەلٌکی گوندی (ترکەلاٌن، یۆرغان تەپە، نوزی)یەو لە عەشیرەتی (وەیسی) یە لقێکە لە عەشیرەتی زەنگەنە، لە سالٌی (١٩٢٩) لە دایك بووەو لە وەستا (محەمەد تەها)و وەستا (سابیر وەلی) و وەستا (حاجی ڕەشید شەریف) فێری بەنایی بووەو لە (عەلی نەقاش) فێری هونەری نەخشی کەلەپوری بووەو بووەتە نەقاشێکی لێهاتوو، نەقاشی‌و بەنایشی زانییوە، نەخشی مزگەوتی (منارە نەخشینە)ی لە نزیك بازاڕی قەیسەری ئاواکردووەتەوە.

لە تەمەنی بیست سالٌیدا یەکەم ئیشی لەگەلٌ (عەلی نەقاش) کردووە کە ئەویش ئاواکردنی نەخۆشخانەی گەورە، خانووی کەلەپوری‌و نەخشەکانی مزگەوتی (عوریان) ئاواکردووەتەدووەتەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی شوێنەوار لە قەلاٌداو لەگەلٌ خانووەکانی (سەیید فاتیح)و (عەلی ئاغا)و (حاجی تەیفور)و (ئەحمەد پلاٌس)و (سدیق عەلاف).

*** وەستا دارتاشەکان:**

*** وەستا (سەفەر):**

دارتاشێکی زۆر بەتوانا بووە لە کەرکوك‌و لە سەدەی نۆزدەهەمدا وەستا (ئەحمەد)ی کوڕی لە شاری کەرکوکەوە هاتووە بۆ کۆیەو لەوێ نیشتەجێ بووەو باشترین وەستا بووە لە کۆیە، ناوبانگێکی زۆری بەجێ هێشتووە، ئێستا لە کۆیە کۆمەلێك ئەستونەدار لە دەستکردی ئەو ماوەو (کاسەبەند–تاج)ەکانیان زۆر جوانەو بریتییە لە چەند ڕیزێك لە قوڕنەکان (مقرنصات)، لە سالٌی (١٩٢٠) کۆچی دوایی کردووە، لە کاتی خۆیدا باشترین دارتاشی کۆیە بووەو دەرگا گەورەکانی قەیسەری کۆن‌و قەیسەری نوێ کاری دەستی ئەون‌و تا ئێستاش بنەمالٌەی وەستا (سەفەر) دارتاشی دەکەن.

*** وەستا (عیزەت ئیسماعیل ئیخوان):**

لە دارتاشەکانی کەرکوك‌و دەوروبەری سالٌی (١٩٣١) لە (ئۆتێل فەرەح) لە سلێمانی شەناشیلی ئۆتێلەکەی دروست کردووە لەگەلٌ سیانزە نەخشی لە دار هەلٌکەنراو بە شێوەی کون کون (تخریم)ی گەورەکە بۆ سەر دەرگاکان دروست کردووە لەگەلٌ بنمیچی فەرەنگی بە چینکۆو بە نەخشی (ترونجی) لە دار هەلٌکەنراو ناوی خۆی لە نێو نەخشێکی تورنجی بە تەخریم نوسیوە لەبنمیچی سالۆنەکەدا.

*** وەستا (جەلالی دارتاش):**

لە هەرە وەستا دارتاشە باشەکانی کەرکوك بوو ئەستونەدارو شەناشیلی دروست دەکرد، دەوروبەری سالٌی

(١٩٥٥) کۆچی دوایی کردووە.

*** وەستا ( محەمەد دارتاش ):**

برای وەستا (خەلیلی وەستا ئیبراهیم) بووە، دەرگای مزگەوتی (حاجی عەبدولڕەزاق)و نەخشەدارەکانی تارمەکە دەستکردی ئەون، وەستا (محەمەد جۆکەر) ووتی: دارتاشێکی زۆر چاكو زیرەك بوو، جارێك سەندوقێکی بچوکی دروست کردو لە بەردەم بەڕێوەبەری کۆمپانیانی نەوتی کەرکوکی داناو پێی ووت سەندوقەکە بکەرەوە چەند هەوڵی دا نەیزانی بیکاتەوە پاشان وەستا محەمەد لێ وەرگرتو یەکسەر کردییەوەو بوو بە چوار پارچە.

*** وەستا ( ئەمینی دارتاش ):**

لە تەکیەی (رەفاعی نەعیمی)یە سندوق قەبری (سەیید عەبدوڵڵا حەنتاوی)و (سەیید سوڵتان کوڕی سەیید حەنتاوی) دروست کردووە، هەندێك لە سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە لە بنەڕەتدا لە میسرەوە خێزانەکەیان هاتوونەتە کەرکوك.

*** وەستا بۆیاغچییەکان:**

*** وەستا ( بەکری سەباغ ):**

لە کاری بۆیاغ کردن زۆر شارەزا بووە، مزگەوتی (حاجی عەبدولڕەزاق)ی بۆیاغ کردووەو نەخشەکانی رەنگ کردووەو دەورووبەری ساڵی (١٩٥٥) کۆچی دوایی کردووە[١٢٧].

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

(١) (الفنون الاسلامية)، م. س. ديماند، وەرگێڕانی: ئەحمەد محەمەد عيسا، بەدواداچوونەوە: د. ئەحمەد فيكرى، (دار المعارف) لە ميسر، چاپی دووەم، ساڵی (١٩٥٨)، لاپەڕە (٢٤).
(٢) (بانگەوازێك بۆ ڕووناكبيرانی كورد)، عەبدولڕەقيب يوسف، لاپەڕە (٥٧).
(٣) (الفنون الاسلامية)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٤).
(٤) گۆڤاری (الفنون العربية)، ژمارە حەوت، جڵدی دووەم، ساڵی (١٩٨٢)، لاپەڕە (١٦٥)، لێكۆڵینەوەیەكە بە ناونیشانی:
(القيم الجمالية في العمارة الاسلامية)، د. سەروەت عوكاشە.
(٥) گۆڤاری (شمس كردستان)، ژمارە ٨، مايس ١٩٧٢، لاپەڕە (١٥)، لێكۆڵینەوەیەكە بە ناونیشانی:
(الطرز المعمارية في كردستان)، د. مونزر ئەلبەكر.
(٦) گۆڤاری (الفنون العربية)، ژمارە حەوت، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٦٦).
(٧) (الفنون الاسلامية)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٥ - ٢٤).
(٨) (بانگەوازێك)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٨٦).
(٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٨٧).
(١٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٨٧ - ٨٨).
(١١) (زمن لكل الازمنة، نظرات وآراء في الفن)، بلّند ئەلحەيدەری، ساڵی ١٩٨١، چاپی يەكەم، بەيروت، (المؤسسة العربية للدراسات والنشر)، لاپەڕە (٢٤).
(١٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٥).
(١٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٦).
(١٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٦).
(١٥) (الفنون الاسلامية)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٥ - ٢٤).
(١٦) (بانگەوازێك)، عەبدولڕەقيب يوسف، لاپەڕە (٨٦).
(١٧) (لمحات عن الفن العراقي)، د. خاليد ئەلجادر، لاپەڕە (٤١-٤٢).
(١٨) (التصوير في الاسلام عند الفرس)، زەكی محەمەد حەسەن، چاپی يەكەم، چاپخانەی (لجنة التأليف والترجمة والنشر)، ساڵی (١٣٥٤-١٩٣٦)، لاپەڕە (٢٦).
(١٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٧).
(٢٠) (زمن لكل الازمنة)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٩).
(٢١) (التصوير في الاسلام عند الفرس)، لاپەڕە (٢٦-٢٧).
(٢٢) (زمن لكل الازمنة)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٨).
(٢٣) (التصوير في الاسلام)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٨).
(٢٤) (المدينة الاسلامية)، د. محەمەد عەبدولستار عوسمان، لاپەڕە (٢٩)، (سلسلة عالم المعرفة)، كوێت.
(٢٥) گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە ٧ ساڵی دووەم، ساڵی ١٩٧٧، لاپەڕە (٢٢-٢٣).
(٢٦) گۆڤاری (رواق)، ژمارە ١١، ساڵی ١٩٨٠، لاپەڕە (١٠-١٣)، لێكۆڵینەوەیەكە بە ناونیشانی:
(تموز الحروفية في الفن الاسلامي)، عيمران ئەلقەيسی.
(٢٧) گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە ٣، ساڵی ١٩٨٤، تشرين دووەم، لاپەڕە (١٥٦-١٥٧)، لێكۆڵینەوەیەكە بەناو نيشانی:
(جمالية الفن العربي الاسلامي في الخط والزخرفة)، محەمەد حوسێن جودي.
(٢٨) گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە ٢، ساڵی ١٩٨٤، ساڵی دەيەم، لاپەڕە (٦٤)، لێكۆڵینەوەیەكە بە ناونيشانی:
(التناسب في العمارة الاسلامية)، عەوف عەبدولڕەحمان خزر).
(٢٩) گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە ٥، ساڵی ١٩٩٤، مايس، لاپەڕە (٤٦-٤٧)، لێكۆڵینەوەیەكە بەناو نيشانی:
(جدلية الشكل في العمارة العربية، تأثير مواد البناء المحلية في شكل العمارة العربية)، عەلا ياسين، عەبدولموحسن.
(٣٠) گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە ٧ ساڵی دووەم، ١٩٧٣، لاپەڕە (٢٢-٢٣).
(٣١) گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە ٨ ساڵی دوانزەهەم، ١٩٨٧، لاپەڕە (٧٠-٧٨)، لێكۆڵینەوەیەكە بە ناونيشانی:
(العناصر التشكيلية في العمارة)، ناوی نووسەرو وەرگێڕەكەی ديار نييە..
(٣٢) گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە ٧- ٨ ، ساڵی نۆزدەهەم، تەمموز، ١٩٩٤، لاپەڕە (٤٥)، لێكۆڵینەوەیەكە بە ناونيشانی:
(جدلية الشكل في العمارة العربية، اثر المناخ في شكل العمارة العربية)، عەلا ياسين عەبدولحوسێن.
(٣٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٦).
(٣٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٦ - ٤٧).
(٣٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٧).
(٣٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٧ - ٤٨).
(٣٧) گۆڤاری (رواق) ژمارە ٤، ساڵی ١٩٧٨، ئەيلول، تشرينی يەكەم، لاپەڕە (١١)، لێكۆڵینەوەیەكە بە ناونيشانی:
(المعالم الجمالية في البيت في شمال العراق)، زوهێر ئەلعەتيە.
(٣٨) گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە ٧- ٨ ، ساڵی، ١٩٩٤، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٥).
(٣٩) گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە (١١) ، ساڵی، ١٩٨٧،

لاپەڕە (٨٦-٨٧).
(٤٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٨٨).
(٤١) (حضارة العراق)، بەرگی نۆیەم، چاپخانەی (الحرية)، لاپەڕە (٤٥).
(٤٢) (المساجد)، د. حوسێن مونئس، (عالم المعرفة)، کوێت، ١٩٨١، چاپخانەی (الاتباع)، لاپەڕە (٣٣).
(٤٣) (مراكز ثقافية معمورة في كردستان، دراسة اهم المراكز الثقافية التي برزت في شمال العراق خلال القرون المتأخرة)، د. عیماد عەبدولسەلام رەئوف، بەغدا، ١٩٩٧، (دار الثقافة والنشر الكردية).
(٤٤) گۆڤاری (الاخاء التركمانية)، ژمارە (١٠)، ١٩٨٣، لاپەڕە (٦)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(قصة الزمن فوق القلعة).
(٤٥) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢٧-٢٨).
(٤٦) گۆڤاری (الف باء)، ژمارە (١٥٣٤)، ساڵی ١٩٩٨، لاپەڕە (٤).
(٤٧) گۆڤاری (الاخاء)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٨).
(٤٨) (الفنون الاسلامية في العصر الاسلامي)، د. زەکی محەمەد حەسەن، چاپی دووەم، قاهیرە، چاپخانەی (الكتب المصرية)، ١٩٤٦، لە چاپکراوەکانی (دار الآثار العربية)، لاپەڕە (١٩).
(٤٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٣).
(٥٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣١).
(٥١) (القباب المخروطية في العراق)، عەتا ئەلحەدیسی، هەنا عەبدولخالق، بەغدا، ١٩٧٤، چاپخانەی (الحرية)، لاپەڕە (٩).
(٥٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٢).
(٥٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٤).
(٥٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٥).
(٥٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٩-٥٠).
هەروەها بۆ زانیاری بڕوانە:
(المشاهدات ذات القباب المخروطي في العراق)، عەلائوددین ئەحمەد ئەلعانی، (دار الحرية للطباعة)، لاپەڕە ٩٥.
(٥٦) گۆڤاری (الحكم الذاتي)، ژمارە(٣)، ساڵی نۆیەم، ١٩٨٥، لاپەڕە (٢٦).
(٥٧) (تاريخ فن العمارة العراقية في مختلف العصور)، شەریف یوسف، لاپەڕە (٤١٩).
(٥٨) (مرشد الى مواطن الآثار)، بەرگی چوارەم، لاپەڕە (٥).
(٥٩) گۆڤاری (سومر)، بەرگی یەکەم و دووەم، جلدی دوانزەهەم، ساڵی (١٩٥٦)، لاپەڕە (٥٢)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(داقوق تاريخها، التنقيب والصيانة فيها)، وائیل ئەلروبەیعی.
(٦٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٥٣).
(٦١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٥٤).
(٦٢) گۆڤاری (الاخاء التركمانية)، ژمارە (٣ و٤)، ساڵی سیانزەهەم، لاپەڕە (١٤).
(٦٣) (العمارات العربية الاسلامية في العراق)، بەرگی یەکەم، نووسینی هەر یەکە لە: د. عیسا سەلمان، نەجلە ئەلعیزی، هەنا عەبدولخالق، نەجاە یونس، ساڵی (١٩٨٢)، لاپەڕە (٣٢).
(٦٤) گۆڤاری (سومر)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٥٩).
(٦٥) (تاريخ فن العمارة العراقية عبر العصور)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٤٣).
(٦٦) (تاريخ فن العمارة العراقية عبر العصور)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٥٩).
(٦٧) (حضارة العراق)، بەرگی نۆیەم، لاپەڕە (٧٥).
(٦٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٧٥).
(٦٩) (تاريخ فن العمارة العراقية)، لاپەڕە (٤٤٤).
(٧٠) گۆڤاری (سومر)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦٤).
(٧١) گۆڤاری (سومر)، لاپەڕە (٦٠ - ٦١).
(٧٢) (العراق في التاريخ)، لاپەڕە (٥٤٥).
(٧٣) گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە (٥)، ١٩٥٦ لاپەڕە (١١٠).
(٧٤) گۆڤاری (آفاق عربية)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١١٢- ١١٣).
(٧٥) گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە (٧)، ساڵی ١٩٧٧ لاپەڕە (٢٠-٢٧).
(٧٦) گۆڤاری (تراث شعبي)، ژمارە (٢)، ساڵی سیانزەهەم ، شوبات، ١٩٨٢ لاپەڕە (١٨)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:
(الابنية التراثية في قلعة كركوك)، جەرجیس محەمەد ئەلرەملاوی.
(٧٧) گۆڤاری (الاخاء)، ژمارە ١٠، شوبات، ١٩٨٣ ساڵی بیست و سێ، لاپەڕە (٢٧)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:
(بمناسبة تطوير قلعة كركوك)، رۆفائیل میناوس.
(٧٨) گۆڤاری (تراث شعبي)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٨ - ٢٤).
(٧٩) گۆڤاری (الاخاء) هەمان سەرچاوەی پێشوو.
هەروەها بڕوانە:
گۆڤاری (الفيصل)، ژمارە(١٣٤)، ساڵی دوانزەهەم، ئادار، نیسان، ١٩٨٨، لاپەڕە (١٧)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:
(كركوك مدينة الذهب الاسود)، عەبدولجەبار مەحمود ئەلسامەرائی.
(٨٠) (الكشاف الاثري في العراق)، د. قەحتان رەشید، لاپەڕە (١٩٥).
(٨١) گۆڤاری (الف باء)، ژمارە (١٤٦٩)، ساڵی بیست و نۆیەم، ٢٠ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٩٦، لاپەڕە ٥، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:
(الحويجة وفاق الانهار وخصوبة الاراضي)، عەبدولستار ئەلبەیزانی.
(٨٢) رۆژنامەی (الاتحاد العراقية)، ژمارە (٢٧٥)، ٢٠

تەمموز ١٩٩٩، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:
(العثور على اقدم الاسواق الشعبية في قلعة كركوك)، یەحیا قاسم.
هەروەها بڕوانە:
رۆژنامەی (الاتحاد العراقية)، ژمارە (٣١١)، ٤ی نیسانی ٢٠٠٠، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:
(صيانة سوق قلعة كركوك التأريخية)، یەحیا قاسم.
– گۆڤاری (الاخاء)، ژمارە (١٠)، ساڵی بیست وسێ، ١٠ی شوبات ١٩٨٣، لاپەڕە (٣٣).
(٨٣) گۆڤاری (الف باء)، ژمارە (١٥٣٤)، ١٨ی شوبات ١٩٩٨، لاپەڕە (١٥)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:
(قلعة كركوك المخفي والمعلن من تاريخ المدينة)، عەبدولستار ئەلبەیزانی.
(٨٤) گۆڤاری (الاخاء)، ژمارە (١٠)، شوبات ١٩٨٣.
(٨٥) (وێرانکردنی قەڵای کەرکوك‌و هەوڵدانم بۆ رزگارکردنی)، عەبدولرەقیب یوسف، هەولێر، ٢٠١٠، لاپەڕە (٢٢-٣٠-٣١-٣٢).
(٨٦) گۆڤاری (سومر) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٠).
(٨٧) گۆڤاری (سومر) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٥٠-٥١)
(٨٨) گۆڤاری (الاخاء)، ژمارەکانی (١٦٩ -١٧٠)، مایس، حوزەیران، ١٩٧٥، لاپەڕە (١٤)،لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:
(ناحية التون كوبري).
(٨٩) (مرشد الى مواطن الاثار)، بەشی چوار، لاپەڕە ١٤.
(٩٠) (مرشد الى مواطن الاثار)، هەمان سەرچاوە.
(*) ئەم زانیاریەم لە محەمەد سەید کەریم وەرگرتووە.
(٩١) (لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث)، بەشی یەکەم، د. عەلی ئەلوەردی، چاپخانەی (الارشاد)، ١٩٦٩، لاپەڕە (٣٣)
(٩٢) (تاريخ في العهد العثماني ١٦٣٨ز – ١٧٥٠ز، دراسة في احوالة السياسية)، چاپی یەکەم، ١٩٨٤، لاپەڕە (٣٠).
(٩٣) گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١٤٠)ی ساڵی (١٩٩٧)، لاپەڕە (٥٧)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناو نیشانی:
(باجگری‌و دۆخی ئابووری ناوچەکانی کوردستان)، دکتۆر کاوێس قەفتان.
(٩٤) گۆڤاری (بين النهرين)، ژمارە ٢٦ جلدی ٩، ١٩٨١، لاپەڕە (٣٠٦).
(٩٥) (حضارة العراق)، کۆمەڵێك مێژوونووس، بەرگی (١٠)، لاپەڕە (٢٤٩).
(٩٦) گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە ١٤٠، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٥٧).
(٩٧) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٥٨).
(٩٨) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٥٩).
(٩٩) (المدينة والحياة المدنية)، کۆمەڵێك مێژوونووس، بەشی سێیەم، بەغدا، لاپەڕە (٩).
(١٠٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٥).
(١٠١) (حضارة العراق)، بەشی (١٠)، لاپەڕە (٥١).
(١٠٢) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢٥٣).
(١٠٣) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢٥٤).
(١٠٤) (فنون الاسلام)، د. زەکی محەمەد حەسەن، چاپی یەکەم، ١٩٤٨ (مكتبة النهضة المصرية)، قاهیرە، چاپخانەی (لجنة التاليف والترجمة والنشر)، لاپەڕە (١٣٦) لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(الضمائر في الطراز العثماني).
(١٠٥) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (١٤٠).
(١٠٦) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (١٤٣).
(١٠٧) گۆڤاری (سومر)، جلدی ٤٥، لاپەڕە (٢١٨).
* مرۆر:-
گیایەکە لەناو گەنمدا دەڕوێت، بەرەکەی رەش وتاڵە، ئەگەر بخورێت دەبێتە هۆی سك چوون.
بڕوانە:
(القاموس العلمي)، کەمال جەلال غەریب، بەشی دووەم، لاپەڕە (٢٨٠).
(١٠٨) گۆڤاری (سومر)، جلدی ٤٥، هەمان سەرچاوەی پێشوو،لاپەڕە (٢١٩ – ٢٢٣).
(١٠٩) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢٢٦).
(١١٠) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢٢٦).
(١١١) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢٣٠).
(١١٢) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢٣٢ – ٢٣٤).
(١١٣) هەمان سەرچاوە.
(١١٤) (کرکوکدە اجتماعی حیات)، شاکر سابیر خەیات، بەغدا، لاپەڕە (٦٥-٦٩).
زۆر سوپاسی بەڕێز ئەحمەد تاقانە دەکەم کە بۆمی وەرگێڕایەوە سەر زمانی کوردی لە تورکییەوە.
(١١٥) گۆڤاری (سومر)، جلدی چلو پێنجەم، بەشی یەکەم‌و دووەم، لاپەڕە (١٩٢-١٩٧)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:
(بيت ميكائيل التراثي في قلعة كركوك)، نووسینی محەمەد عەبدوللا ساڵح.
(١١٦) (وێران کردنی قەڵای کەرکوك‌و هەوڵدانم بۆ رزگارکردنی)، عەبدولرەقیب یوسف، چاپی یەکەم، ٢٠١٠، لاپەڕە (٢٤٣).
(١١٧) گۆڤاری (سومر)، بەشی یەکەم‌و دووەم، جلدی چل شەشەم، (التراثية ١٤٦ اغالق)، ئەکرەم فاتیح، لاپەڕە(٢٦٨-٢٧٥).
(١١٨) بڕوانە ئەم سەرچاوانە:-
– گۆڤاری (الف باء)، ژمارە (١٥٣٤)، ١٨ی شوبات ١٩٩٨، لاپەڕە (٤، ٥).
– رۆژنامەی (الجمهورية)، ژمارە (٨٢٢٥)، (٢٢)ی حوزەیران، ساڵی ١٩٩٢.
– (كركوك المدينة التي تفعو على اديمها ذكره التأريخ)، جیهاد زایر، محەمەد جەبیر، لاپەڕە (٢).
– گۆڤاری (صوت الاتحاد)، ژمارە (٥٢)، ساڵی ١٩٩٥، (كركوك في التاريخ)، عەبدولعەزیز سەمین ئەلبەیاتی،

لاپەرە (٣٠).
- گۆڤاری (هاواری كەركوك)، ژمارە ٤، ١٩٩٩، لاپەرە (٢٢١-٢٢٢).
(١١٩) (وێـران كـردنـی قـەڵای كـەركـوكو هـەوڵـدانم بۆ رزگاركردنی)، عەبدولڕەقیب یوسف، چاپی یەكەم، ٢٠١٠، لاپەڕەكانی (٣٣٠-٣٣٦).
(١٢٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەكانی (٢٥٧-٢٧١).
(١٢١) (كركوك وهويتها العمرانية)، سوبحی سەعاتچی، ٢٠١٠، لاپەڕەكانی (١٠٢-١٢٤).
(١٢٢) (باگەوازێك بۆ رووناكبیرانی كورد)، عەبدولڕەقیب یوسف.
(١٢٣) گۆڤاری (كـاروان)، ژمـارە (٢)، تشرینی دووەم، ساڵی ١٩٨٢، لاپەڕە (٢٠).
(١٢٤) گۆڤاری (فیصل)، ژمـارە (١٣٤)، ساڵی ١٩٨٨، لاپەڕە (١٧).
هەروەها بڕوانە:
(الكشاف الاثري في العراق)، د. قەحتان رەشید ساڵح، بەغدا، ١٩٨٧، لاپەڕە (٩٤-٩٥).
(١٢٥) گۆڤاری (فیصل)، هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (١٧).
(١٢٦) (كركوك وهويتها العمرانية)، سوبحی سەعاتچی، ٢٠١٠، لاپەڕەكانی (٧٠-٧٦).
هەروەها بڕوانە:
(وێران كردنی قەڵای كەركوكو هەوڵدانم بۆ رزگاركردنی)، عەبدولڕەقیب یوسف، چاپی یەكەم، ٢٠١٠، لاپەڕەكانی (٢١٠-٢١٩).
(١٢٧) (كركوك وهويتها العمرانية)، سوبحی سەعاتچی، ٢٠١٠، لاپەڕەكانی (١٤٤-١٥٢).
هەروەها بڕوانە:
(وێران كردنی قەڵای كەركوكو هەوڵدانم بۆ رزگاركردنی)، عەبدولڕەقیب یوسف، چاپی یەكەم، ٢٠١٠، لاپەڕەكانی (٢٨٣-٣١٦).

## بەشی چوارەم

# چەند هونەرێکی بیناکاری هاوسەردەمی عوسمانییەکان

*** دەرگاکانی قەڵای کەرکوك:**

قەڵا ئێستا چوار دەرگای هەیە، هەر یەکە لەم دەروازانە شوێنێکی سەرەکی قەڵای گرتووە، کە دەرگاکان بەم جۆرەیە دوو دەرگا لەلای رۆژئاوای قەڵا، بەرامبەر رووباری خاسە، یەکێکیان کۆنە پێیان دەوترێت، (تۆپ قاپی)، کە تاکو ئێستاکە ماوەتەوە، دەرگای دووەم پێی دەوترێت (باش قاپی)، کە بەناوبانگە بە دەرگای حەمام (گەرماو)، لەبەر ئەوەی کەوتۆتە هەمان شوێنی حەمامەکەوە، هەر بۆیە گەڕەکێك بە ناو ئەم حەمامەوە ناونراوە، ئەویش گەڕەکی حەمامی مەسیحییەکانە.

هەروەکو ئەوەی لە رۆژنامەی کەرکوك ژمارە (١٤٣)ی ساڵی (١٩٥٣)دا هاتووە، بە ناونیشانی حقائق عن تاریخ کرکوك نووسینی (مامۆستا عەتا تەرزی باشی) بەم جۆرە:

بەهۆی قەڵەباڵغی لەلای رۆژهەڵاتی قەڵا، بووە هۆی دروست کردنی دەرگایەکی تر لە ناوچەی رۆژئاوای لە ساڵی (١٢٤٠)ی کۆچی بەرامبەر (١٨٢٤)ی زایینی، لەگەڵ ژمارەیەك لە دوکان لەسەر رووی. لەلای رۆژهەڵاتی قەڵا دوو دەرگا هەیە یەکێکیان دەرگای (یدی قزلر)، ئەوی تر بە ناوی دەرگای (حەلواچییەکان)ەوە وا بەدەردەکەوێت کە ئەو دەرگایەی کە لە ساڵی (١٢٤٠)ی کۆچی دروست کراوە، دەرگای (یدی قزلر) لەو کۆنترە[١].

دەرگای (تۆپ قاپی) یەکێکە لەو دەرگا بەردییانەی کە زۆر شێوەی دەگمەنە، کە بریتییە لە تەرزێکی بیناکاری لە شێوەی کەوانەی تیژو نیوە بازنەیی وگومەتێکی شێوە نیوە هێلکەیی[٢]. لە هەندێ لە سەرچاوەکاندا هاتووە کە (سوڵتان سلێمانی کوڕی سوڵتان سەلیم) ئاوایکردووە لە سەدەی شازدەهەمدا، بەڵام لەبەر ئەوەی لە ڕاستی دەرگای حەلواچییەکانە پێدەچێت لە بنەڕەتدا هەبووبێت و دوو باره (سوڵتان سلێمان) نۆژەنی کردبێتەوە.

لە نزیك دەرگای حەلواچییەکان بەرەو باکوور واتا هەر لە بەشی رۆژهەڵاتدا رێگایەگ هەیە بۆ تەنیشتی باشووری تەکێی نەقشبەندی بۆ نێو قەڵا، بەڵام بۆ قەڵا تەسك و سەرەکی نییە و نازانم لە کۆنەوە هەبووە یان نا[٣].



نەخشەیەکی کۆنی یەکێك لە دەرگاکانی قەڵا




**نەخشەیەكی هێلكاری دەروازەكانی قەڵای كەركوك**



**دەروازەكانی قەڵای كەركوك**

هەندێك لە سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئەم دەرگایە (تۆپ قاپی) لە ساڵی (١٨٨٢)ی زایینیی دروست کراوە کە یەکێك لە بەڵگەنامەکان واژووی جێگری والی موسڵی لەسەرە، ئاماژە بە (١٤)ی کانوونی دووەمی هەمان ساڵ دەکات، ئەویش لە پای ئەوەی کە خەڵکەکە بەتایبەتی لە وەرزی زستاندا تووشی ناخۆشی هاتووچۆ دەبوون بۆ گەیشتن بۆ سەر قەڵا، بۆیە هەستان بە کردنەوەی ئەم دەرگایە بۆ ئەوەی پێویستی خەڵکەکە جێبەجێ بکرێت و لە هەمان ساڵدا دروستکردنی تەواو بووە[٤].





دەروازەکانی قەڵای کەرکوك

*** قشڵەی کەرکوك:**

ئەم بینایە کەوتۆتە ناوەندی شارەوە. کە رووبەرەکەی بە گشتی بریتییە لە پێنج دۆنمو پێنج ئوکماتو شانزە مەترو سەد سانتیمەتر چوار گۆشەیە، کە نەخشەی بنەڕەتی شێوە لاکێشەیی بووە، لاکانی (١٠١ ×١٢٤)م٢ بووە، لەناوەندی هەر لایەك لە لاکانی دەرگای هەبووە، ئەو کەرەستانەی کە بەکار هاتووە بریتی بووە لە گەچ وبەردو بەردی حەللان (مەڕمەڕی موسڵ) کە ئەویش بەکار هاتووە لە گرێو کۆڵەکەکانی.

ئەم قشڵەیە لە کاتی ئێستادا بریتییە لە دوو باڵ، لە شێوەی پیتی (L)، درێـژی لای خـوارووی (١٠١) مەترەو درێـژی لای رۆژئـاوای (٦٢)م، بـەرزی گشتی دیوارەکانی قشڵە لە دەرەوە نۆ مەترە. کە دوانزە بەرگرە لەلای رۆژئاوای رایگرتووە.

دەرگای سەرەکی لە ناوەندی لای خوارەوەیەتی، هەتاکو ئێستا ئـەم دەرگـایـەی مـاوە، کـە بـەرزییـەکەی (٣,٣٠)م وپانییەکەی (٣,٢٠)مەترە، کە گرێی نیوە بازنەیی بە بەردی حەللانی جوان داپۆشیوە، کەلەسەر دوو کۆڵەکەی لوولەی بەردی (حەللان)ی راوەستاوە.

لەسەر دەرگاکەوە (ئەفرین)ێکی شێوە لاکێشەیی هەیە لەبەردی حەللانی، کە لە سەری بەخەتی عوسمانی نووسراوە، کە بریتییە لە چەند کۆپلەیەکی شیعری کە مێژووی دروست کردنەکەی دیاری دەکات، دەکاتە (١٢٨٠)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٨٦٣)ی زاینیی، لەملاو ئەولای گرێکەوە ئەستێرەیەکی تر هەیە کە هیلالێك دەوری داوە.

لەسەر دەرگـاکـەوە سەیوانێکی جـوان هەیە، کەلەسەر هـەشـت کـۆڵـەکـە راوەسـتـاوە، کـە قـەبـەو کـورتو شـێوە لوولەکین، دابەش بوونە لە دوو بەشی بەرامبەر، کەمەرەی هەر کۆڵەکەیەك (٥,٤٠) مەترە. لە کۆتایی هەر کۆڵەکەیەك دوو ئەفریز هەیە دەوری لاشەی کۆڵەکەکەیان داوە، بوونەتە بنکەی تاجی کۆڵەکەکان، تیجانی کۆڵەکەکان شێوە چوار گۆشەییە گەورەو ئەستوورە، وا دروست کراوە تا بەرگەی قورسی بگرێت بۆ توانای سێ تا چوار سەری کەوانەیی شێوە جۆراوجۆر، بەڵام تیجانی کۆڵەکەکان لە ژێرەوە رازاوەتەوە بە نیوە کەوانەیی هەڵکەندراو لە لاکانییەوە.

وا باوەڕە کە لە بنەڕەتدا تیجان وکەوانەو کۆڵەکەکان لە بەردی مەڕمەڕ دروست کرابێت، بەڵام لە دوایدا داپۆشراوە بە چینێکی دیاری کراو لە گەچو چیمەنتۆ.

لەسەر ئەم کۆڵەکانەوە لەلای دیواری خوارووی سەرەکی قشڵە، حەقدە کەوانەی جۆر بەجۆری پێچەوانەو جیاواز هەیە، ئـەو کـەوانـانـەی کە بـەرەو رووی دیـواری قشڵەکان گەورەترن لە کەوانەییە پێچەوانییەکان، کەوانەی دەروازە سەرەکییەکە گەورەترە. لە کەوانەکانی ئەوەی کەوتۆتە لای راست وچەپییەوە، ماوەی نێوان دوو کۆڵەکە ناوەندییەی کە کەوانە تیژەکە کەوتۆتە سەری (٤,٨٠)مەترە، ماوەی نێو دوو کۆڵەکەکەی تەنیشتی کەوانەی دەروازەکانی (٣,٥٠) مەترە.

لەسەر کەوانە سەرەکییەکە (ناوەندی) کە لە نهۆمی یەکەم، ژوورێکی بچووك هەیە لە سێ لاوە پەنجەرەی هەیە بەکار هاتووە بۆ وەستانی سەرۆکی سوپا لە کاتی وەرزی زستان بۆ بینینی نمایشی سوپایی. دوو ژووری تر لە راستو لە چەپ دروست کراون بۆ هەمان جۆر لە وەرزەکانی تری ساڵ ئەم کەپرە دیارە لەسەر دیواری قشڵەکە بە ماوەی (٨,١٠) مو (١٨,٦٠) م بە هاوتەریبی دیواری قشڵەکە، کۆڵەکەو کەوانە گەورەییو بچووکەکانی دادەنرێت بە دەگمەنێکی بیناکاری.

لە دوای دەرگـای دارەکـەوە، گومەتی دەروازەکـە دێت، کە لەسەر دوو کەوانەی گەورەی نیوە لوولەکی راوەستاوە، کە درێژییەکەی (١٣,٩٠)م، کە کۆتایی دێت لە گۆڕەپانە ناوەندییە گەورەکە، ئەم گومەتە لە دیواری ناوەوەی قشڵەکە دیـارە بـە مـاوەی (٣,٥) م کـە بۆتـە بنکەیەك بۆ هـەردوو پەیژەکانی ئەم لاو ئەولا بەسەر گۆڕەپانە ناوەندییەکەوە.

کۆمەڵێك هەیوان دەڕوانێت لە شێوەی کەوانەیی گەورەی تیژ لەسەر دوو بنکەی دروست کراو لە بـەردی (مهندم)، یـەك لەسەر ئـەوی تـر، لە هـەر لایـەك، بنکەی یەکەم شێوە لاکێشەییە، بەڵام ئەوی تر چوار گۆشەییە.

ژمارەی ژوورەکانی چینی ژێـرەوە زیاتر لە (٥٠) ژوورە بەڵام سەرکەوتن بۆ نهۆمی یەکەم بە هۆی دوو پەیژەیە کە کەوتۆتە کۆتایی دالآنـی دەرگـا گشتییەکەوە، دەڕوانێتە سەر حەوشەیەکی ناوەندی، کە دالآنەکەی دیارە لە پێش ژوورەکانی نهۆمی یەکەم لە باڵی لای خوارووو ورۆژهەڵاتی.

ئەم دالآنـە لەسەر کۆڵەکەیەکی لوولەکی راوەستاوە کە بنکەی هەیە، بریتییە لە (٣٦) کۆڵەکە، لەسەریدا (٣٥) گرێی تیژ هەیە کە دەڕوانێتە سەر گۆڕەپانە ناوەندییەکەو پێچەوانەیە لە گەڵیدا، لەسەر هەمان کۆڵەکە (٣٦) کەوانە هەیە[٥].

ئـەم قشڵەیە پێك هاتووە لە (٧٣) ژوور، کە دوو ژوور زیادکراوە لە نهۆمی سـەرەوە لە بەرامبەر لەسەر دەرگـای سەرەکی کە دەڕوانێتە سەر شەقامە گشتییەکە، هەروەها بێجگە لەوەی کە ژووری تر هەیە بەناو یەکدا چووە، بۆیە کۆی گشتی هەشت ژوور دەبێت، هەروەها، بۆ هۆڵی گەورەو حـەوشو شـوێـنی تایبەتی هەیە کە لـەبەر چاو نییە، بۆ ژمارەی ژوورەکانی دەگاتە سەد ژوور.

قشڵـە سـێ دەرگـای هـەیـە، یـەکێکیـان کـە دەروازەی سەرەکییە کەوتۆتە سەر شەقامی گشتی، لەلای خوارووییەوە. بەڵام دوانەکەی تر کەوتوونەتە لای رۆژئـاوای قشڵەکەوە، ناوی ئەم دەرگایانە بەم جۆرەیە، (پیادە قپوسی–دەرگای پیادە)، (سواری قپوسی–دەرگای سوارە)، (ارقە قپوسی–دەرگای دواوە).

هەندێك لە خەڵك ئەوە باس دەکەن کە گوایە ئەم قشڵەیە بریتی بـووە لە تونێلێکی (نفق) گـەورە، درێـژ بۆتـەوە بۆ گەڕەکی (شاترلو) لەو شوێنەی خانووی سەرکردەی (فرقە) کـەی لێبـووە، سـەرکردە بـەم تونێڵەدا رۆیشتووە لەسەر وڵاخ بۆ خانووەکەی، بەڵام تاکو ئێستاکە بەڵگەی وا نییە بەدەستەوە کە ئەو رایە بسەلمێنێت، ئەمە لەوانەیە گۆڕینی ئەو بـاوەڕە بێت، کە تونێلێك هەیە لە ژێر (سـەرای قەڵا)ی کۆن لە گەڕەکی (زیندان) نزیك دەرگای (یدی قزلر)، کە درێژ دەبێتەوە بۆ دەرەوەی قەڵا لە دووری چەند کیلۆ مەترێك

لەلای رۆژهەڵاتەوە، کە سوودیان لێ بینیبێت بۆ چاودێری کردنی دووژمن.

هەروەها سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە گوایە مزگەوتێك هەبووە، لە ساڵی (١٩١٢) بە کۆکردنەوەی بار بووی خەڵك دروست کراوە، ئەمەیش لە رۆژنامەی (حوادث)ی کەرکوکیدا باسی هاتووە لە (٩)ی حوزەیرانی ساڵی (١٣٢٨) ی رۆمی، بەڵام ئێستا پاشماوەی نەماوەو لەدوای شەڕی جیهانی یەکەم رووخێنراوە. هەروەها هەندێك بەڵگە دەڵێن گوایە پێنج دەرگای هەبووە بەڵام لە دوایدا کەمکراوەتەوە.

ئەم قشڵەیە بە شێوەیەکی گشتی دروست کراوە لە گەچ وبەرد، بنکەی ئەم قشڵەیە لە نوورەو بەردی سوور دروست کراوە کە بەرگەی شێ دەگرێت، کەرەستەی نوورە بریتییە لە بەردی کلسی سووتێنراو کە لە پاشماوەی کورەکە ماوەتەوە، ئەویش بۆیە نوورە بەکار هاتووە چونکە زۆر بە هێزەو دەبێتە پارچەیەکی بەهێز لەگەڵ بەردە سوورەکەدا[٦].

لەدوای شەڕی جیهانی یەکەم کرا بە بنکەی یەکێك لە بنکەکانی سووپای عێراقی و گەلێك دەزگای سەربازی تێدا بەکار هێنرا[٧].



قشڵەی کەرکوك



*** سەرای کەرکوك:**

**لە پاش ئەوەی کە گەڕەکی قۆریە فراوانبوونی بە خۆیەوە دی بە تایبەتی لە بواری تەلارسازی گشتیدا، موتەسەڕفی کەرکوك (محەمەد پاشا ئینجە بیراقدار) هەستا بە دروست کردنی کۆشکێکی گەورە لەسەر شوێنێك کە دەڕوانێتە سەر گەڕەکی (شاترلو)[٨]، لە ماوەی دانانی وەکو موتەسرفی کەرکوك لە سالّی (١٨٣٣)دا لە ماوەی ئەو دوو سالّەی کە لە کەرکوك بوو هەستا بە دروست کردنی (سەرای حکومی) بە ناوی (ئینجیلی سەرای) لەسەر لێواری شاترلو لە پشت تەکێی (شێخ باقی) کردیە کۆشکی حکومەت.**

**بەلاّم (عەلی پاشا) کاتێك لە نێوان سالاّنی (١٨٥٣–١٨٥٤) بوو بە موتەسەڕفی کەرکوك دەورێکی بالاّی بینی لە ئاوەدانکردنەوەی شارەکە، هەستا بە بنیاتنانی (سەرای مەجیدیە) بە ناوی (سولّتان عەبدولمەجید)ەوە.**

**ئەم سەرایە تا ماوەیەکی زۆر پێکهاتبوو لە دیوانی موتەسەڕفیەو دارایـیو دادوەریو تاپۆو بەندینخانەو یەکەی تەجنید، بۆیە کاروبارێکی زۆری شارەکەی گرتبووە ئەستۆی خۆی.**

**ئەم سەرایە بریتییە بووە لە بیناکارییەکی دروستکراو لە بەرد کە پێك هاتبوو لە (٧٠) ژووری گەورە، مێژووی دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ سالاّنی (١٨٥٤–١٨٥٥)، بنەڕەتی دروستکردنی لەسەر پاشماوەی مزگەوتی (ئەمیر محەمەد)ە لە باشووری سەراکەوە[٩].**

**هەندێك سەرچاوە ئاماژە دەکەن بۆ ئەوەی کە سەرای کەرکوك پێش قشلە دروست کراوە، کە دەکاتە (١٢٧٠)ی کۆچی، (١٨٥٣)ی زایینی، لە سالّی (١٩٧٠)دا رووخێنرا[١٠].**



**سەرای کەرکوك**



*** بازاڕی قەیسەری:**

دەربارەی بنەڕەتی ناوی (قەیسەری) گەلێك راوبۆچوون هەیە کە ناوەکە (قەیسەری) لێبوونەوەیە لە ناوی بێژەتی سۆمەری (کی-سار)، مانای (شوێن یان جێگەی فرۆشتن)، کە لە شارەکانی عێراقدا گەلێك لەم قەیسەرییانە هەیە بە شێوەو قەبارەی جیاواز.. جیاواز، کە قەیسەری کەرکوك یەکێکە لەو قەیسەرییانە.

ئەم قەیسەرییە کەوتۆتە بەشێکی گەورەی شارەکە، لەدووری (١٠) مەتر لەلای خوارووی ڕۆژهەڵاتی قەڵاوە، لەنزیك دەرگای (یەدی قزلەر)، مێژووی دروست کردنی دەگەڕێتەوە زیاتر لە (١٧٠) ساڵ، کە دەکاتە دەوری (١٨٢٨)ی زایینی، ئەویش بە کۆکردنەوەی ژمارەیەکی زۆری خاوەن پیشەکان، بازرگان وعەتاری رەنگکەری قوماش وخوری وپیشەکانی تر بریتییە لە (٣٦٦) دوکان، لەگەڵ چەند هۆڵێك لەسەر دوکانەکان کە لە رابردوودا بەکار هاتووە وەکو کۆگاو شوێنی خەوتنی ئەو بازرگانانەی کە لە شارەکانەوە هاتوون.

قەیسەرییەکە دابەشکراوە لە شێوەیەکی فەلەکی رێکوپێك کە (٣٦٦) دوکانی تێدایە بە پێی ڕۆژەکانی ساڵ، بوونی دوانزە شقە (شتە) لەسەر قەیسەرییەکە بەڵگەی مانگەکانی ساڵە، بازاڕەکە دابەشکراوەتە سەر بیست و چوار راڕەو ئەمیش بە ژمارەی ڕۆژو شەو، حەوت دەرگای هەیە بەڵگەی ڕۆژەکانی هەفتەیە، یەکێك لە دەروازەکان، پێشوازی خۆر دەکات کاتێك هەڵدێت، ئەوی تر ماڵ ئاوایی لێدەکات کاتێك ئاوا دەبێت.

ئەم بازاڕە دادەنرێت بە تەرزێکی بیناکاری گرنگ ودەگمەن ئەویش بەو شێوەی دروست کردن و بانگیرانەی لە شێوەی گومەت و کەوانەو کەوانەی تیژو مەرمەڕی ونیوە بازنەیی ونەخش ونیگاری گەچی ڕووەکی، ئەندازەیی، کە چینی یەکەمی رازاندۆتەوە.

لەساڵی (١٩٧٨) دووبارە دەستکرا بە چاککردنەوەی ئەم قەیسەرییەو وەکو خۆی لێکراوە، دەستکرا بە چاککردنی راڕەوی خوارووی، کە درێژی (٢٢)مەترەو پێکهاتووە لە (١٤) دوکان، توانرا نزیکەی (١٦٥٠) م٢ پاشماوەی لێ فڕێ بدرێت و دووبارە دەست کرا بە هەڵکەندنی بنکەکەی، دەست کرایەوە بە دروست کردنی بە پێوانە کۆنەکان، بە بەرزکردنەوەی راڕەوی هۆڵە لاکێشەییەکە، بە درێژی (٣٣) م مەرمەڕی وپانی (٢,٥)م کە داپۆشراوە بە گومەتی نیوە بازنەیی، دووبارە گەڕانەوەی گرێکانی ئەم راڕەوە، هەروەها دروست کردنی دوو گومەت لەسەر دەروازەکانی ڕۆژهەڵات وڕۆژئاوای، چاککردنی هەموو دوکانەکانی چینی یەکەم لە راڕەوی ڕۆژهەڵات و گومەتەکەی، گەڕانەوەی (١١) کەوانەی دەروازەکانی ئەم دوکان و سپیکاری تێدا کرا، بازاڕەکە حەوت دەروازەی هەیە، یەکێکی لەلای سەروو، سیانی لەلای ڕۆژهەڵات، وسیانەکەی تر لەلای خواروو، ڕووەکانی ئەم دەروازانە رازاوەتەوە بە مەرمەڕ ونەخشی ئەندازەیی و ڕووەکی.



**بازاڕی قەیسەری**

*** رەگەزە بەکار هێنراوەکانی کە لەم قەیسەرییەدا بەکار هێنراوە:**

١. گوومەت: یەکێکە لە رەگەزەکانی بیناکاری، کە بنەڕەتی دەگەڕێتەوە سەر هونەری (ئەرەج)، کە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی بیناکاری (میزۆپۆتامیا)، تایبەتمەندییەکی ئەندازەیی وهونەری زۆر گرنگی هەیە یارمەتی بڵاوبوونەوەی پاڵە پەستۆی بنمیچەکە دەدات بۆ تەنیشتەکانی بیناکە بە رێکوپێکیو وەکو یەك، ئەگەر هاتوو بنمیچەکە گوومەت بوو، هەروەها پاڵەپەستۆ لەسەر دیواریش کەم دەکاتەوە.

لەسەر رووی قەیسەرییەکە گومەتی تەخت هەیە کە لە سەرەوە دەکرێتەوە بە هۆی کرانەوەیەکی بنمیچی (المناور)، بۆ رووناك کردنەوەی قەیسەرییەکە.

٢. کەوانە: کەوانەش زۆر بەکار هاتووە لە قەیسەرییەکەدا، کە دەروازەی هەموو قەیسەرییەکە بەمە بنیاد نراوە، هەروەها رووی دووکانەکان زۆری بەکار هێنانی ئەم کەوانانە لەسەرەوە بۆ خوارەوە، وەکو یەك بەکار هێنراوە، کەوانەکان یان تیژە یان نیوە بازنەییە یان لە شێوەی ناڵە، یا کەوانەیی بەڵام شێوەی باوی بەکار هێنراو کەوانەی تیژە.

٣. گرێ (عقدة): بەزۆری بەکار هاتووە لە قەیسەرییەکە، کە شێوەی باوی تیژە لە هەندێك شوێندا، رەگەزی نەخش ونیگار بەکار هاتووە، رووەکی وئەندازەییو وێنەو شریتی نەخشدار (ئەفارین).

رووی دەروازەکان داپۆشراوە بە چوار چێوە لە مەڕمەڕو نەخشێنراوە بە نەخشی رووەکی وئەندازەیی، رووی دووکانەکان داپۆشراوە بە مەڕمەڕ کە ریز کراوە لەسەر یەکتری.

بەکار هێنانی دەرگای داری گەورە رازاندنەوەی بە بزماری گەورە، بۆتە هۆی رازاندنەوەی بە شێوەیەکی جوان[11].

*** قشڵەکەی کفری:**

دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵی (١٣٠٠)ی کۆچی، (١٨٨٢)ی زایینی سەربازگە (قشڵە)یەکیان لە پانیی شاخی (باوە شاسوار) دروستکرد کە (٤٠) ژوورو داڵانو حەوشەیەکی گەورەو تەویڵەیەکی تێدا بوو.

لەسەر بەردە مەڕمەڕی دەرگای ئەم قشڵەیە بە چەند شیعرێکی تورکی مێژووی دروستکردنی تیادا نووسراوە[12].



قشڵەکەی کفری

*** قەیسەرییەکەی کفری:**

یەکێکە لە قەیسەرییە گەورەو گرنگەکانی کوردستانی باشوور، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی نۆدەهەم.

لەساڵی (١٨٥٠)دا لە کفری دروست کراوەو نزیکەی سەدو پەنجا دوکانی تێدا بووە، ئەوسا ئەو قەیسەرییە پڕ بوو لە دوکانی بازرگانیو وردە واڵا فرۆش وجل دروو سەڕاجو کەوش دروو مزگەرو هەلاج وپاڵان دروو[13].

قەیسەرییەکە کۆمەڵێك یەکەی بیناسازی ناوازەو جوانی بۆ کراوە، وەکو گومەزو تاقی کەوانەیی جۆراوجۆرو دەروازەی فراوانو تونێڵو بەکارهێنانی سیستەمی خانو بینای دوو نهۆمی سەرنج راکێش.

*** کۆشکەکەی مەجید پاشا لە کفری:**

دەکەوێتە رۆژئاوای شاری کفری کە لەلایەن (مەجید پاشای قادر بەگ) دروست کراوەو مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی سەدەی نۆدەهەم، کۆشکەکە پێکهاتووە لە دوو نهۆم، کە نهۆمی سەرەوە پێکهاتووە لە شەش ژوورو دوو داڵان، گەلێك نەخشی رووەکیو ئاژەڵیو مرۆڤی تێدا رازاوەتەوە.

کەرەستە بەکارهێنراوەکانی ئەم کۆشکە بریتییە لە: (بەرد، گەچ، دار، ئاسن، خشتی سوورەوەکراو)، لە پاڵ بەکارهێنانی کۆڵەکەی جۆراوجۆرو کەوانەی نووك تیژو کراوە.

وا پێدەچێت کە چینی ژێرەوەی بۆ سازاندنی خان دروست کرابێت، یان وەکو کۆگایەك بۆ هەڵگرتنی خواردن بەکارهێنرابێت.



**قەیسەرییەکەی کفری**





**کۆشکەکەی مەجید پاشا لە کفری**









**کۆشکەکەی مەجید پاشا لە کفری**

*** قوولەکانی سەردەمی عوسمانی لە ناوچەی گەرمیان:**

عوسمانییەکان لە ماوەی فەرمانڕەواییان لە کوردستان بە تایبەتی لە ناوچەکانی کەرکوك‌و گەرمیان بایەخێکی زۆریان داوە بە بواری سەربازی‌و سازدانی گرنگییە سەربازییەکان بۆ پاراستنی سنوورەکانیان لەگەڵ سەفەوییەکان، بۆیە گەلێك قشڵە‌و پێگە‌و قوولەیان لە ناوچە جیاجیاکان دروست کردووە بەتایبەتی ئەو ناوچانەی کە کەوتبوونە سەر سنووری عوسمانی‌و سەفەوییەکان لە ئێران.

یەکێك لەو ڕووە سەربازییانەی عوسمانییەکان دروستکردنی قوولەکان بوو لە ناوچەکانی سەر سنووری کەلار‌و کفری‌و خانەقین، لەبەر ئەوە لە کاتی خۆیدا گرنگی تایبەتی خۆی هەبووە بۆ پاراستنی سنوورەکان لە هێرشە دەرەکییەکانی سەفەوییەکان بۆ ناوچەکانی کوردستان بە تایبەتی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکان.

"مێژووی دروستکردنی ئەم قوولانە بەپێی هەندێ لە سەرچاوەکان بۆ سەردەمی عوسمانییەکانی دەگێڕنەوە بە بێ دیاری کردنی ساڵەکە، لە سەرچاوەی تر باس کراوە مێژووەکەی بۆ کۆتایی عوسمانی دەگەڕێتەوە.

ئەوەی لە شێوازی بیناکە دەرکەوتووە لە ڕووی هەڵبەستن‌و بەکار هێنانی مادەکان، مێژوویەکی زۆر کۆنمان بۆ دەر ناخات، نابێ ئەوەشمان لە بیر بچێت ئەم ناوچانە بەتایبەت کەنارەکانی ڕووباری سیروان دوورو نزیك سنوورێك بووە لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی‌و دەوڵەتی سەفەوی‌و پاشان قاجاری لە ئێران هەروەها ناوچەیەك بووە کە شەڕی رووسەکان تیایدا رووی داوە.

لە ڕووی بازرگانییەوە شوێنێکی گرنگی هەبووە لە نێوان ئەم دوو دەوڵەتەدا، هەمیشە ناوچەیەك بووە کە جێی سەرنج بووە لەلایەن هەردوو دەوڵەتەکەوە، بۆیە پێدەچێت هۆکاری دروستکردنی قوولەکان لەلایەن عوسمانییەکانەوە دروستکراوە بۆ چاودێری کردنی ئەم هێڵانە بووە.

*** شوێنی قوولەکان:**

ژمارەیەك قوولە لە کەنار ڕووباری سیروان دروستکراون، ئەم قوولانە لە شاری کەلارەوە دەست پێ دەکات، یەکێك لەوانە دەکەوێتە بەرامبەر گوندی بەرلووت کە پێنج کیلۆمەتر لە شارەکەوە دوورە‌و قوولەیەکی تر لە گوندی تازەدێ هەشت کیلۆمەتر لە کەلارەوە دوورە، کە تەنها بەشێکی کەمی لێ ماوەتەوە، لە گوندی (سەیید مەحمود) بیست‌و هەشت کیلۆمەتر لە شاری کەلارەوە دوورە، لە دیوی چەپی ڕێگای سەرەکی (کەلار–دەربەندیخان) لەسەر تەپۆڵکەیەکی بەرزی سروشتی قوولەیەك دروستکراوە، لەو دیو ناحیەی پێباز قوولەیەکی تر هەیە لە گوندی (ئەحمەد قادر) سی‌و سێ کیلۆمەتر لە کەلارەوە دوورە.

دوا قوولە دەکەوێتە نێوان سنووری گوندەکانی (پوڵنگە‌و پساکان‌و بانی خێڵان) لەسەر گردێکی سروشتی کە نزیکەی (٣٠) مەتر بەرزە‌و دۆڵی باوە عەمرە دەکەوێتە لای باکووری‌و لای چەپی ڕێگای سەرەکی (کەلار–دەربەندیخان) بە دووری (٣٠) کیلۆمەتر، ئیتر لێرەوە چیای بەمۆ ئەم سنوورە پڕ دەکاتەوە.

هەڵکەوتنی شوێنی قوولەکان جگە لە قوولەکەی گوندی سەیید مەحمود‌و دوا قوولە ئەوا قوولەکانی تر لەسەر زەوییەکی تەخت‌و ئاسایی دروستکراون، ڕووی قوولەکان بە یەك ئاراستە بنیاد نراون بە شێوەیەك کە تاکە دەرگاکانیان ڕووی لە باکوورە.

*** پێکهاتەی قوولەکان:**

تا ڕادەیەك هەموو قوولەکان بەیەك شێوە بنیاد نراون‌و پێکهاتوون لە دوو نهۆم‌و بە شێوەیەکی بازنەیی یان لوولەیی دروستکراون تەنها یەك دەرگای سەرەکییەکان هەیە، دیواری نهۆمی یەکەمی قوولەکان زۆر ئەستور ترە لە نهۆمی دووەم، ئەگەر چی ئەم دوو نهۆمە تا ڕادەیەك یەك ڕووبەریان هەیە، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە قوولەکان تاکو بەرەو سەرەوە بڕوات هەندێك تەسکتر دەبنەوە، بە شێوەیەکی گشتی لە نهۆمی یەکەمیاندا پلیکانەیەك‌و دوو ژووری بچووك‌و دە کونەمەتەرێزی بۆ کراوە جگە لە ئاگردانێك‌و دەرگایەك کە دەمانباتە نهۆمی دووەمی ڕێڕەوەکە، لە نهۆمی دووەمدا چەند تاقێکی کراوەی شێوەی لاکێشەیی هەیە لەگەڵ ئەو دەرگایەی کە دەمانباتە سەر ڕێڕەوەکە.

ئەو کەرەستە‌و مادانانەی لە قوولەکاندا بەکارهاتوون بریتین لە (داروو قسڵ‌و بەردی ئاسن (Bolder)‌و بەردی لمین (Sand stone)‌و بەردی گەچین (Calcite)، ئەم بەردە تێکەڵ کراوە بە مادە قسڵەکە، هەروەها خشتی سوورەوەکراو لە هەندێ لە قوولەکان بەکار هاتووە).

جگە لە بنمیچەکانی کە داری ئاسایی بۆ بەکارهاتووە پێدەچێت هەردوو دەرگاکان لە دار دروستکرابێت کە ئێستا نەماون، هەموو دیواری قوولەکان بە بەردی ئاسن‌و بەردی لمین هەڵبەستراوە جگە لە قوولەکەی گوند بەرلووت کە بەشێك لە دیوارەکان واتا لە ئاستی کونەمەترێزەکان خشتی سوورەوەکراو بەکار هاتووە، بەگشتی چینە



قووله

دیوارەکان بە هۆی ماددەی قسڵەوە پێکەوە نراون سەرەڕای قسڵە گیراوەکەش بەردێکی تر (calcite) بە شێوەی کلۆی بچووك بچووك تێکەڵ بە گیراوەکە کراوە، ئەمەش بۆ زیاتر بە هێز کردنی دیوارەکانە، ئەم گیراوەیە تەنها لە دیوارەکاندا بەکار نەهاتووە، بەڵکو لە سەقفەکانیش لەگەڵ بەردو دارە راخراوەکان بەکارهاتووە، بەڵام یەکێکی تر لە قوللەکان بنمیچەکەی تەنها لە گیراوەی قسڵەکەو خشتی سوورەوەکراو دروستکراوە پاش ئەوەی دارەکانی بۆ راخراوە"(١٤).










قوللە

*** ئارامگەکانی باوە شاسوار لە کفری:**

"ئارامگەکان دەکەونە باشووری شاری کفرییەوە بەتەنیشتو لاپاڵی زنجیرە نیمچە شاخاویەکانی باوە شاسوار بە دووری (٣٠٠) مەتر لە قەیسەرییەکەوە، کۆمەڵێك ئارامگەو گۆڕ لە ڕووی بیناسازییەوە وەك یەك دروستکراون، بینای گۆڕەکان بە گومەزەکانیانەوە پێکهاتون لە سێ چین واتا دیوار پشتێن و گومەز ئەمە تەنها لە بیناکان نابینرێت بەڵکو زۆرێك لە گۆڕە ئاساییەکانیش لە سێ چین دروستکراون هەندێکیان لە سێ بەش پێکهاتوون.

شێوازی گومەز بەسەر چوار ستونەوە لەسەردەمی ساسانییەکان بەکارهاتووە تەنانەت ڕۆمەکانیش توانای ئەمەیان نەبووە بەڵکو هەشت ستونیان بەکارهێناوە، ئەوەی لێرەدا پێویستە بزانرێت دەپرسین بۆ چی سێ چین یان سێ بەش؟ چ وەك بیناکان چ وەك گۆڕە ئاساییەکان، تۆ بڵێی ئەم بیرۆکەیە لە ئایینی زەردەشتییەوە وەرگیرابێت؟.

ئەگەر بێتو سەرنجێکی گۆڕستانی باوە شاسوار بدەین دەبینین چەند جۆرێك گۆڕی تێدایە لە شێوەی گۆڕی ئاسایی، ئارامگەی یەك ژووری گومەزەدار، ئارامگە خێزانییەکان، ئەگەر سەرنجێکی مێژووی ئەم گۆڕانە بدەین دەبینین دەگەڕێنەوە بۆ نزیکەی (١٥٠) ساڵ پێش ئێستا ئەوەیش بۆ سەردەمی عوسمانییەکان.

ئەوەی بەرچاو دەکەوێت لە کەرەستەی بیناکاری ئەم گۆڕانە بریتییە لە (قایە، بەردی لمی، قسڵ)، هەموو ئەم کەرەستانە پێکەوە لە هەموو بەشو یەکە بیناسازییەکان وەك یەك بەکار هاتووە، بە شێوەیەك بەردە لمییەکان بە هۆی مادە قسڵەکەوە پێکەوە هەڵبەستراونو پاشان لە هەندێ بەشی بیناکان بە گەچی بۆر ڕووپۆش کراون، یەکێك لە کەمو کوڕیو هۆیەکانی زوو لە ناوچوونو داڕووخانی بیناکان ئەوەیە کە هەندێ لەم کەرەستانە بەتایبەتی بەردی قایەو گیراوەی گەچەکان بۆ ماوەیەکی درێژ توانای بەرگری بارانو شێی زۆریان نییە.

ئەوەی سەرنج دەدرێت لە نووسینی سەر ئەم گۆڕانە، لە بەردی تاشراو دروست کراونو بەردەکانیش جۆراوجۆرنو نووسینی سەر تابلۆکان بە شێوەی هەڵکۆڵینی قووڵ نووسراون، جۆری نووسینەکان زۆرن وەك خەتی ئاساییو خەتی ڕوقعە، بەڵام بە گشتی هەموو نووسینەکان بە عەرەبین.

هەموو ئەو گومەزانەی لە بینای ئارامگەکان دەبینرێت بە شێوەی نیوە بازنەیی تەواو دروستکراوە، گوومەزەکان بە زۆری لەسەر پشتێنەکەوە بنیات نراون، بەڵام هەندێکیان ڕاستەوخۆ دەکەونە سەر ستوونو دیواری ژوورەکان، هەندێك لەم گوومەزانە بە ئەندازەی نیوەی بەرزییەکەی پێکهاتوون لە کەوانی نیوە بازنەییو پاشان پڕکراونەتەوە لە شێوەی دیوارێکی ئاسایی.

پشتێنەکان چەند جۆرێکن، هەندێك بازنەیەکی تەواونو هەندێکی تریان شەش پاڵوون یان هەشت پاڵوون، پشتێنەکان جگە لەوەی یەکەیەکی بیناسازی جوانو سەرنجراکێشن لە هەمان کاتدا وەك پێویستییەك وایە بۆ درێژکردنەوەی تەمەنی بنمیچو گوومەزەکان.

ستوونەکانی ئەم گوومەزانە چەند شێوەیەکی هەیە وەك: (بازنەیی، چوارگۆشەیی، لاکێشەیی، چەند شێوەیەکی ئەندازەیی)، کاری ستوونەکان بریتییە لە هەڵگرتنی کەوانو بنمیچو گوومەز، ستوونەکانی گۆڕستانی (باوە شاسوار) بە شێوەی پیتی ئینگلیزی (L) دابەش بوونە بەسەر بینای ئارامگەکان بە شێوەیەك کە هەر ژوورێك چوار ستوونی بۆ کراوە، قەبارەی ستوونەکانیش دەگۆڕێت بە پێی قەبارەی ژوورو گوومەزەکان"[١٥].



**ئارامگەکانی باوە شاسوار لە کفری**





نەخشەی بناغەی ئارامگەکە







هێلکاری و بناغەی ئارامگەکە

*** پردی عوسمانی ( پردە بەردینەکە ):**

ئەم پردە لەسەردەمی موتەسەڕیفی کەرکوك (نافذ پاشا) لە ساڵی (١٨٧٥) دروست کراوە کە بریتی بووە لە (١٦) تاق، کە گەڕەکی شاتەری وقۆریەی بە قەڵاوە بەستۆتەوە[١٦]. ئەم پردە لەدوای ماوەی فەرمانڕەوایی (مەدحەت پاشا) دروست کراو، راستەو خۆ بەرەو قەڵا دەڕوانێت، بۆیە پێی وتراوە پردی بەردین لەبەر ئەوەی تەنها لەبەردو قسڵ ونورە دروست کراوە، ئەو بنکانەی کە لە زەوی چەسپ کراوە شێوەی چوار گۆشەیی هەیە، کە بە بەردی گەورە.. گەورە بنکەکەی چەسپ کراوە، تاقەکانی مام ناوەندییە یان پردەکە وەکو پانی پردەکانی ئێستا بووە، تاقەکانی شێوەی کەوانەی چەماوەیی بووە، شوورەی دەوری پردەکە نزم بووە کە تەنها هەر نیو مەتر دەبێت.

کەرەستەی بەکار هێنراو، بەردو گەچ وقسڵ بووە، ناوەڕاستەکەی شێوەیەکی تۆزێك بەرزی هەبووە، ئەملاو ئەولای نزم تر بووە.. ئەم پردە شوێنەکەی لە نێوان هەردوو پردەکانی ئێستادا بووە.

لەساڵی (١٩٥٣)دا دوو تاقی لای بانقەکەوە هەرەسی هێناوە بە هۆی هەڵسانی لافاو، کە بووە هۆی رووخاندن و لەناوچوونی.



پردی عوسمانی (پردە بەردینەکە)



*** پردی ئالتون کۆپری:**

زۆر سەرچاوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە گوایە پرد هەبووە لەسەر ئەم شارۆچکەیە، کە هەر لە سەردەمەکانی پێش زایینیەوە بەڵگەو باس هەیە دەربارەی ڕاستی ئەم قسەیە.

بەڵام کۆنترین ناوهێنانی پردی (آلتون کۆپری- پردێ) لە کتێبی (ذیل جامع التواریخ رشیدي) دایە (حافظ ابرو) کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆهەمی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە (سەدەی یازدەهەمی زایینی)، هەروەها لە کتێبی (ظفرنامە) لە (مێژووی تەیمور لەنگ)ی عەلی یەزیدیدا (نیوەی یەکەمی سەدەی نۆهەمی کۆچی)دا.

پێویستە ئەوەش بزانین کە (التون صو، کوپر صو) یان (التون کوپرو) کە ئەم دوو نووسەرە ناویان بردووە لە کاتی خۆیدا بە بەردو (الابرق) دروست کراوە، بەڵام نازانین کەی وکێ دروستی کردووە، بەڵام پردەکە لە سەدەی دەهەمدا هەبووە، بەوەی کە دکتۆر (لنون رادوولف)ی گەڕیدەی ئەڵمانی کاتێك لە ساڵی (١٥٧٦-٩٨٤)دا لە بەغدادەوە بۆ موسڵ دەڕوات بە (التون کۆپرو-پردێ)دا تێدەپەڕێت.

(کارستن نیبور)ی گەڕیدەی دانیمارکیش لە ئاداری (١٧٦٦)دا کاتێك لە بەغدادەوە بەرەو موسڵ بە (التون کوپرو) تێدەپەڕێت ئەمەی دەربارەی تۆمار کردووە، (اتون کوپرو) کە مەبەستی (پردی زێڕین)ە شارۆچکەیەکی چوار سەد تا پێنج

سەد مالّییە، دەکەوێتە نیمچە دوورگەیەکی بچووکەوە لەسەر زێی خواروو، هەروەها پێشی گووتراوە پردە گەورەو لەسەر یەکێك لە باڵەکانی ئەم رووبارەوە دروستکراوە خەڵکی کە لەم پردە بەرزە نا ئاساییە دەدوێن، لەوەش دەدوێن کە پردە کۆنەکەی پێش چەند ساڵێك رووخاوە، هێندەی ئەم پردە بەرز نەبووە، دروستکردنیشی بەم بەرزییە نەبووە، وەك دەگێڕنەوە بەو هۆیەوە بووە کە وەستایەکیان دەست نەکەوتووە کە بتوانن لەمە نزمتر دروستی بکات، لەبەر ئەوە ناچار بوون بەم بەرزییە بێت، ئەو پردە کۆنە رووخاوەی پێش ئەم پردەی کە (نیبور) بەسەریدا تێپەڕیوە، حەسەن پاشای والی بەغدا ساڵی (١١٢٩-١٧١٧) دەستکاریی و چاکی کردبووەوە.

(ج.س.بکینگهامی) گەڕیدەی ئینگلیزیش ساڵی (١٨١٦) ی زایینی کاتێك لە هەولێرەوە بۆ بەغدا دەڕوات بە (ئالّتون کۆپری) دا دەڕوات و دەڵێت: لەسەرەوەدەچێتە ناویەوە پێویستە بەسەر پردەکەدا بپەڕیتەوە بەڵام کاتی چوونە دەرەوەشــت لـەو ســەرەوە دەبێت بە پردێکی تری وەك ئەو پردەدا بپەڕیتەوە، هەریەکەشیان تەنها لەیەك کەوانە پێکهاتوون، کە زۆر باش و خوارییەکی زۆر قۆچیان هەیە.

هەروەها (هـ. ساوس گیت)ی گەڕیدەی ئینگلیزی لە ساڵی ١٨٤٠ دا بەم جۆرە باس پردەکانی دەکـات:-دوو پردەکە بەخشت دروستکراون و خشت ڕێژ کراون، بەرەو ناوەوڕاست بە گۆشەیەکی قـووچ وتیژ درێـژ دەبنـەوە. کەبەگرانی لە سەرێکەوە بۆی سەردەکەوێت و هاتنە خوارەوەی لەو سەرەوە هەر کارێکی ترسناك بوو.

بەڵام لە (الموسوعة الاسلامية)دا وایدەرخستووە کە دوو پردی قووچی کەوانەیی لەبەرد دروستکراو شارۆچکەکە بە دەشتاییەکانەوە دەبەستن. ئەو پـردەی کە بە رووکارێکی دەشتـایی لای چەپدایـە، گەلێك بە کـارامـەیی وئـازایانـە، لەسەر دۆڵێکی قووڵ دروستکراوە، هێندەش بە بەرزییەوە دروستکراوە کە سەرجەمی شارۆچکەکە لە لایەن بینەرەوە دەبینرێت، بەڵام دووەم پرد بە پێچەوانەوە لە شارۆچکەکە نزمترەو دەکەوێتە سەرە رێگایەکی سەرەکی ئەو کاروانانەی لە ئێرانەوە بۆ عێراق دێن.

ئەوەتا (نیبوری) گەڕیدە، کە دوو سەدە لەپاش (دکتۆر رادوولف) بە (التون کوپرو-پردێ)دا تێدەپەڕێت، بەو جۆرە دەیگەڕێنێتەوە کە پردێکی نوێی دیوە، کە بەرزو سەیر بووە، پردە کۆنەکەش چەند ساڵانێك لەوە پێش رووخاوە، هەروەها دەڵێت کە پردە کۆنەکە وەك ئەم تازەیە بەرز نەبووە[١٧].

کاتێك (هرتسفیلد) هاتۆتە (ئالّتون کۆپری) ئەم پردەی دیوە، وێنەیەکی، ئەم پردە گەورەیەی کێشاوە، کە لەوانەیە بگەڕێتەوە سەدەی سێیەمی کۆچی، ئەم پـردە جەزیرە لە لێـواری زابـی رۆژهـەڵات دەبەستێتەوە، کە پێکهاتبوو لە قاتێکی گەورەی نووك تیژ لە ناوەڕاستەوە، بوونی دوو قاتی بچووك لـەلای راستـەوە. بـەڵام پردەکەی دووەم بچووکترە، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی مورادی چوارەم.

هەروا قسەی وا هەیە کە پردی (التون کۆپرو). کەوا ناوی دەبەن لەسەردەمی هێرشەکەی سوڵتانی عوسمانی (مورادی چوارەم) لە ساڵی (١٦٣٩)ی زایینیی بۆ سەر (بەغدا). هەروەها ناونراوە بە (نامرد کوپروسو)، کەلە سەر ئەم ناوە بۆچوونی سەیر سەیر هەڵبەستراوە.

گـوایـە ئـەم پــردە لـەلایـەن یـەکێـك لـە سـەرکـردەکـانـی سوڵتانەوە بنیاد نراوە، ئەویش سوڵتان داوای لێدەکات کە بگاتە ئەو شەڕەی کە سوڵتان دەستی پێکردووە، بەڵام ئەم خۆی خەریك دەکات بە دروستکردنی ئەم پردەوە تا نەڕوات بۆ شەڕەکە، تا وایکرد پردەکەی تەواو کردو بووە جێگەی ستایشی خەڵکی. کاتێك سوڵتان هاتووە پێی ڕاگەیاندووە بەو کارە چاکەی کە کردویەتی بۆ ئەوەی کە گوایە رێگای پەڕینەوەی عوسمانییەکانە، بەڵام سوڵتان لەمە زۆر تووڕە دەبێت وبڕیاری سەر لێکردنەوەی دەکات کە گوایە بەشداری شەڕی نەکردووە بۆیە بە پردی نامەرد ناوی بردووە[١٨].

سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە لە کاتی کشانەوەی عوسمانییەکان لە عێراقدا هەستاون بەتەقاندنەوەی ئەم پردەو رووخاندنی تا بۆ ئەوەی ئینگلیزەکان زوو نەگەنە سەریان وتا بتوانن بە زوویی هێزەکانیان پاشەکشێی پێبکەن.



پردی ئالّتون کۆپری





پردی ئاڵتون کۆپری

*** قەڵای شێروانە:**

لەساڵی (١٢٨٣-١٨٦٦) سەرۆكی عەشیرەتی جاف (محەمەد پاشای كوڕی كەیخەسرەو بەگ كوڕی سلێمان بەگی جاف)، هەستا بە دروستكردنی قەڵایەك، بۆ ئەوەی ببێتە بنكەیەكی گەورەی دەسەڵاتەكەی كە درێژ بوو بووە لە ناوچەی كفری وسەعدیەو شێروانەو شارەزوور هەتا ناوچەی كرماشان.

یەكێك لە هۆیەكانی دروست بوونی ئەم قەڵایە هۆی سەربازی بووە، چونكە سەرۆكەكانی جاف بەرپەرچی ئەوەیان دایەوە كە لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی وئێرانی بن، كە هەردووكیان هەوڵی نزیك بوونەوەیان دەدا لێی، تا بۆ ئەوەی وای لێ بكەن ئەو دەسەڵاتە عەشایەرییەی لەناو بدەن وكەمی بكەنەوە.

دەوڵەتی عوسمانی نازناوی (امیر الامراء-پاشا)ی پێبەخشی و، لەهەمان كاتدا دەوڵەتی ئێرانی نازناوی (خان) ی پێبەخشی، هەر لەبەر ئەمە بوو تا لە ژیانا بوو بەربەرەكانی هەردوو لای ئەم دوو دەوڵەتەی دەكرد، هەر بۆیە هەستا بە دروستكردنی قەڵاكەی تا بەوەی پێشبینی هەر ڕووداوێكی سەربازی بێت لەلایەن ئەو دوو دەوڵەتەوە.

ئەگەر سەیری مێژووی دروست كەری ئەم قەڵایە بكەین، دەبینین، گەلێك ڕووداوی خوێناوی لە ژیانیدا ڕووی داوە، یەكێك لەوانە بەربەرەكانی بوو لەگەڵ مامەی (ناسرەدینی شای قاجار) ئەمیری باوەڕپێكراوی دەوڵەتی فەرهاد میرزا، فەرمانڕەوایی ناوچەی (سنە)، كە یەكێك لەو هێرشە خوێناوییانەی نێوان عەشیرەتی جاف وهێزی (دەرەك)ی سەر بەفەرهاد میرزا، كە هەوڵیدا بۆ لەناوبردنی (محەمەد پاشا)و دەسەڵاتی لە ساڵی (١٨٨١)ی زایینیی (محەمەد پاشا) ژیانی بەجێهێشت ئەویش لەكاتی پیلانێكی دوژمنان بۆ كوشتن وراكردنیان بۆ (ئێران).

بەڵام چەند هۆكارێكی تریش لەلایەن مێژوونووسانەوە ئاماژە بۆ دروستبوونی دەكەن، وەك:

١. هەندێك دەڵێن بۆ خۆشگوزەرانی و هەروەها هەوارێكی زستانە بۆ خۆی و كەسوكارو هۆزەكەی بەكار هێناوە.

٢. هەندێكیش دەڵێن هۆكاری ئیداری سەربازی بۆ بەڕێوەبردن و خۆپاراستن لە دەورووبەر دروستكراوە، هەر بۆیە قەڵای لە جێگایەكی بەرزو سەخت دروستكرد.

٣. هەندێكیش دەڵێن (محەمەد پاشا) وەك پەیمانێك داویەتی بە خۆشەویستەكەی، ئەمەو پاش گەیشتن بە خۆشەویستەكەی ئەو پەیمانەی بردۆتەسەر، بەڵام ئەمە جگە لە چیرۆكێك هیچی تر نییە، چونكە (محەمەد پاشا) لە كاتی دروستكردنی ئەم قەڵایە تەمەنی نزیكەی (٥٤) ساڵی بووەو پاشان زۆرێك لە نووسەران كاری لەو جۆرەیان كردووە بە حیكایەتی خۆشەویستی بۆ زیاتر شیرینكردنی بابەتەكانیان.

٤. پێدەچێت (محەمەد پاشا) وەك پێویستییەكی باوی سەردەمیانەی خۆی دروستی كردبێت، چونكە لەو سەردەمەدا باو بووە كە هەر دەسەڵاتدارو سەرۆك هۆزێكی گەورە كۆشكێك بۆ جێی حەوانەی خۆی دروست بكات[19].

ماوەی دروستكردنی ئەم قەڵایە چەند ساڵێكی خایاندووە لە نێوان ساڵانی (١٨٦٦-١٨٧٤)ی زایینیی، ئەم قەڵایە هەم شوێنی نیشتەجێی خێزانەكەیان وهەم شوێنێكی بەرگری وسەربازی هەیە.

ئەم قەڵایە لەسەر دوو گرد دروست كراوە كە یەكێكی سروشتییە، ئەوی تر دەستكردە، لەبەر ئەوە گردە دەستكردەكە، خۆڵی بۆ هێنراوە لە شێوەی توورەكەڕێژ، بەڵام تەپە سەرەكییەكە زۆر كۆنەو ئەگەڕێتەوە پێش ساسانییەكانیش. شوێنێكی ستراتیژی گرنگی هەبووە كە دەڕوانێتە پێدەشتی هەردوولای سیروان، لە هەمان كاتدا شوێنێكی ناوەندی دەسەڵاتی عەشیرەتی جاف بووە.

ئەم قەڵایە لە بەردو گەچ دروستكراوە. بریتییە لە شێوەی شەش پاڵو، پێكهاتووە لە دوو نهۆم، كە زۆری پەنجەرەو ڕاڕەوی هەیە، لەسەر ئەم دوو چینەوە چینێكی هۆڵێكی گەورە هەیە، هەموو بەشەكانی كەوتووە، ئەگەر ئەم هۆڵە بمایە كۆشكەكەی زۆر بەرز دەكرد، بەرزی قەڵاكە لە (عتبە)ی دەرگاكەوە بۆ سەرەوە نزیكەی (٤٥) پێ دەبێت.

ئەم قەڵایە لەسەر تەرزی بیناكاری ئێرانییە، وەكو نەخشەی قەسرەكانی (شا عەباس)و (شا تەهماسب) لە قەزوین. دەڵێن (محەمەد پاشای جاف) ئەندازیارو وەستاكانی قەڵای شێروانەی لە ئێرانەوە هێنابوو.

"زەخرەفەكانی ناو قەڵای شێروانە چەند شوێنێكی تایبەت دەگرنەوە، ئەم زەخرەفانەش ڕووەكی و ئاژەڵی و ئەندازەیین، ئەوەی شایەنی باسە زەخرەفەكانی قەڵا هەر هەموو لە شێوە زەخرەفەی دەركەوتوو (البارز) دروستكراوە لە ماددەی گەچ.

نەخش و نیگارەكانی ژووری بەرامبەر لە نهۆمی دووەم، بە تایبەتی لە تاقی سووچەكان بە شێوەی كەوانیكی نووك تیژ دروستكراوە، هەر یەك لەم تاقانە كراوە بەدوو بەشی هاوشێوەی یەكتر، كە هەر یەك لەم بەشانەش پێك هاتووە لە تاقێكی داخراوی نیوە بازنەیی، چوارچێوەی گشتی تاقە سووچییەكان بە نەخشی شێوە گەڵای خورما یان بە شێوەی پرچ هۆنینەوە ڕازاوەتەوە كە پێوانەی هەر نەخشێكی (٥) سانتیمەترە.

بەڵام هەر یەك لە دوو تاقە بچووكەكانی ناو تاقە سووچییەكان، نەخشی سەر چوارچێوەكانی دەست پێ دەكات بە عەمودو تاجێكی بچووك، پاشان بە شێوەی هێڵی تەریب و بەردەوام كەوانەكە تەواو دەكات، تاوەكو دەگات بە نەخشی تاج و عەمودەكەی بەرامبەری، لە بەشی سەرەوەی هەردوو تاقەكە دیسان بە شێوەی گەڵا خورما ڕازاوەتەوە، بەڵام بە شێوەیەكی یەكلا، هەروەها لە نێوان ئەم دوو تاقە لە ڕووی سەرەوەیان شێوەیەكی تری پرچ هۆنینەوەی بۆ كراوە.

بەڵام نەخشەكانی ژێر گرێ گەورەكەی ژوورەكە، گرێیەكی نووك تیژە كە بنمیچی ژوورەكەی هەڵگرتووە، ئەم گرێیە هەر تاقە سووچییەكەی لای ڕاستی دەرگای لە ژێر خۆی داناوە، كە ڕووی ناوەوەی گرێكە بە نەخشی ڕووەكەی و ئەندازەیی ڕازاوەتەوە.

ڕووی ناوەوە ئەم گرێیە پێك هاتووە لە چەند شێوە گوڵ و نیو گوڵێك كە چەند جارێك دووبارە بوونەتەوە تاوەكو تەواو

بوونی گرێکە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەگەر بە وورد تەماشای گوڵەکان بکەین دەبینین لە یەککگرتنی چەند سێگۆشەیەك پێکهاتووە.

ئەم گوڵانە بە چەند ڕیزێك لە ئەستێرەی پێنج لاو شەش لاو بە شێوەیەکی بازنەیی دەورە دراون، ئەوانەی کە گوڵی تەواون دەکەونە ناوەندی ڕووکەکە، بەڵام ئەوانەی نیوە گوڵن دەکەونە سەر هێڵی چوارچێوەکەی.

نەخشەکانی ڕووی ناوەوەی بنمیچی ژوورەکە لە بەشی ناوەڕاستی ژێر بنمیچەکە دیمەنێکی نەخشی تر هەیە لە ڕاستیدا زیاتر لە قوبەیەك دەچێت، چونکە لە کاتی سەیرکردندا ڕووچاڵەو هەندێك قووڵە، دیمەنێکی بازنەیی پەڕپەڕەی هەیە کە نزیکەی شانزە پەڕە دەبێت، هەر یەك لەم پەڕانە ڕازاوەتەوە بە شێوەی پرچ هۆنینەوە، کە هەموو چوارچێوەی پەڕەکانی لە خۆی گرتووە"[٣٠].

ئەوەی جێگەی سەرنجە لەم کۆشکەدا گەلێك نەخش و نیگاری جۆربەجۆر هەیە کە لەسەر دیوارو بنمیچ و ئاگردانی ژوورەکەی ڕازاندۆتەوە و جۆراجۆرە لە نەخشی و ڕووەکی و ئاژەڵی و ئەندازەیی و بەکارهێنانی جۆرەها ڕەنگی جیاواز.

ئەم قەڵایە لەهەر چوار لایەکانییەوە چوار بورجی هەیە پەیژەکانی لە ناوەوەیە، زۆری ژووری گەورەو هۆڵ وشوێنی تەقەمەنی وراڕەوی ناو خۆیی وبەندیخانە وشوێنی تر کە بەڵگەی کارامەیی و وردی بیناکارییەکەیەتی.ئەویش لە بەهێزی گرێ وکەوانەو نەخش ونیگار، لەهەر هۆڵ و ژوورێك (ئاگردان) ێك هەیە، کە تا بڵێیت زۆر دەگمەن وجوانە"[٣١].

ڕووبەری ئەو زەوییەی کە قەڵاکەی لەسەر دروستکراوە نزیکەی (٤٠٠) مەتر دووجایە، پانی قەڵا لە ڕووی پێشەوە (١٩,٣٥) مەترە، بەڵام لە ڕووی پشتەوە کەمترەو تەنها (١٨,٥٠) مەترە، ئەوەی دەمێنێتەوە درێژی قەڵایە لە ڕووی لاتەنیشتەکانەوە دیسان پێوانەکانیان جیاوازە، دێژی لای ڕاست (١٥,٤٠) مەترە، بەڵام لای چەپ (١٥,٢٠) مەترە، بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێت کە ڕووبەری قەڵاکە نزیکە لە چوارگۆشەوە، بەڵام بە شێوەیەکی تەواو لاکێشەیەکی ناڕێکە"[٣٢].

لە ماوەی دروستکردنی ئەم قەڵایە تا نۆژەنکردنەوەی گەلێك تووشی وێرانکاری و شێواندن بووە و گەلێك گۆڕانکاری لە بنەڕەتی تەلارسازییەکەی ڕوویداوە، چ لە ڕووی شێوەی دەرەوەی یان لە هونەری نەخش و زیاتکردنی بیناکاری تر لە ڕووی ناوەوەی قەڵاکە، بۆیە لە هەر یەکە لە ساڵانی (١٩٢٣) و (١٩٣٠)و (١٩٤٦)و (١٩٨٩)و (١٩٩١)و (١٩٩٨) تووشی کاولکاری و دووبارە نۆژەنکردنەوە هاتووە.



قەڵای شێروانە



نەخشەکانی قەڵای شێروانە

*** پردە بەردینەکەی داقوق:**

ئەم پردە کۆنەی داقوق دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی داقوق لە دووری هەشت کیلۆمەتر لێیەوە کە ڕێگای خۆڵی بەغدا بەکەرکوکەوە گرێ دەدات.

سەرەتای شەڕی جیهانی یەکەم دروست کراوە لەسەر ڕووباری (ئاوەسپی-ڕۆخانە) لە دووری (٣٠٠) مەتر بەرەو خوارووی شارەکەدا دەڕوات.

ئەم پردە دروستکراوە لەلایەن عوسمانییەکانەوە بۆ ئاسان کردنی کاروباری هاتوچۆی خەڵکی وسەربازی، لەماوەی وەرزی زستان وبەهاردا لەدوای داخستنی ڕێگای خۆڵی بەهۆی بارینی باران ولافاوەوە.

نەخشەی ئەم پردە لەلایەن ئەندازیارێکی کەرکوکییەوە نەخشەی بۆ کێشراوەو کرێکاری ناوچەکە کاری دروستکردنی پردەکەیان تەواو کردووە بەتایبەتی لەلایەن (وەستا فەتحوڵڵا کەرکوکی-فەتحوش کرکوکلی) ئەم پردە گرنگییەکی زۆری بووە لە ڕووی جوگرافیایی و سەربازییەوە لەماوەی شەڕی جیهانی یەکەمدا، چونکە یەکەم پردە لەسەر ڕووباری داقوق کە توانراوە بەهۆیەوە ببێتە گواستنەوەی هێزی سەربازیو خەڵك لە نێوان سەروو خواروو لە زۆری ڕۆژەکانی ساڵدا.

لەکاتی کشانەوەی عوسمانییەکان لە عێراقدا هەستان بە ڕووخاندنی بەشێکی ئەم پردە بۆ ئەوەی ئاستەنگ بخاتە بەردەم هێزی ئینگلیزەکان بۆ دواکەوتنی عوسمانییەکان.. لەدوایدا ئینگلیزەکان هەستان بە چاککردنی ئەم پردە بەسەرپەرشتی ئەندازیار (فیون)، درێژی ئەم پردە (١٩٥) مەترەو پانی (٦) مەترە، بەرزی شوورەکەی یەك مەترەو نزیکەی (١٤) چاوی هەیە بۆ پێداڕۆیشتنی ئاو کە پانی هەر چاوێکی (١٣) مەترە[٢٣].

ئەوە جێگەی سەرنجە ئەم پردە لە دروستکردنیدا گەلێك کەرەستەی وەکو بەردو گەچو نوورە بەکارهێنراوەو گرێی سەر کۆڵەکەی پردەکە کەوانەیەکی کراوەیەو خشتی سوورەوەکراو بە کارهێنراوە لە دروستکردنی گەیشتنەوەی گرێی کەوانەکان.



پردە بەردینەکەی داقوق



*** قەلاَی جەمیل بەگی بابان:**



ئەم قەلاَیە لە دەوروبەری (١٩٠٣-١٩٠٤) لە دێی (کنگربان) سەر بە ناوچەی کفری بنیات نراوە، دوو نهۆمەو کەوتۆتە بەشی رۆژهەلاَتی دێیەکەوە، بە خشتو گەچ دیوار کراوە بە شێوەیەکی هونەری بە نەخشو نیگار گومەت کراوە، لە خوارەوە دوو دیوەخانو چێشتخانەو عەمار (ژووری دانەوێلە)و تەویلەخانەو ژووری ئاژەلّی لیّ بووە.

رووبەری قەلاَ لەگەلّ حەوشەکەی نزیکەی (٥٠٠٠) هەزار مەتر بووە، نهۆمی سەرەوەیش بریتی بوو لە چەند ژوورێکی حەرەمو مالّو منالّو جێگای پاسەوانو ئێشك چییان، بەرزی قەلاَکە نزیکەی (١٠) مەترێك ئەبوو، لە دیوی لای راستییەوە کارێزێکی گەورەی ئاوو ساردراوی لە پێشدا هەلّچنرا بوو کە بۆ وەرزی هاوین زۆر لە بار بوو، بە لای چەپیشدا باخێکی (١٥) دۆنمی کە بە باخی (عومەر) بەناوبانگە، پڕە لەرەزو داری بەردارو هەمەچەشن.

دەلێن لە سالّی (١٩٥٨)ەوە چۆلّ کراوەو کەس تێدا نەژیاوە تا وای لێهاتووە ووردە.. ووردە بۆتە کەلاوە[٢٤].

*** قەلاَی پاشا (کۆشکی مەحمود پاشای جاف):**

دەکەوێتە گوندی تازە دیّ بە دووری (٩) کم لە باکووری رۆژهەلاَتی شاری کەلار، ئەم پاشماوەیە کۆشکێکی دوو نهۆمییە زیاتر لە کاروانسەرایەك دەچێت بە هۆی ئەو تایبەتمەندیانەی تێدایە بەلاَم بیناکە بە قەلاَی پاشا ناوبانگی دەرکردووە.

کۆشکەکە لەلایەن (مەحمود پاشای جاف) دروستکراوەو مێژووکەی دەگەڕێتەوە بۆ سالّی (١٨٩٥) زاینیی، جگە لە بینا سەرەکییەکەی کۆشك لای باکوورەوە بینایەکی تری لاکێشەیی هەیە کە پێدەچێت تەرخان کرابێت بۆ کۆگاو جێگای تایبەتی ئەسپو ئاژەلّی باربەر، لای باشوورەوە بینایەکی تری بچووك کە پێکهاتووە لە چەند ژوورێك بەسەر بەرزاییەکەوە دروست کراوە پێدەچێت وەك وێستگەیەکی پێشوازی بووبێت بۆ کۆشکەکە[٢٥].



قەلاَی پاشا (کۆشکی مەحمود پاشای جاف)

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**


(١) گۆڤاری (سومر)، بەشی یەکەمو دووەم، جلدی چلو چوارەم، ١٩٨٥، ١٩٨٦، لاپەڕە (٢٤١-٢٤٦)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(قشلة كركوك، الثكنة العسكرية)، خاليد سويد تاهير.
(٢) گۆڤاری (الاخاء)، ژمارە ١٩٤، (ئاب-ئەیلول)، ١٩٨٨، لاپــەڕە (٣، ٦٨)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(القشلة التراثية في كركوك)، عەتا تەرزی باشی.
هەروەها بڕوانە:
گـۆڤاری (یـورد)، ٣١ تـەممـوز، ١٩٩٨، لاپـەڕە (٣)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(کرکوك قیشلەسی ، عەبدولعەزیز سەمین بیاتی).
(٣) (وێـران کـردنـی قـەڵای کـەرکـوكو هـەوڵـدانم بۆ ڕزگارکردنی)، عەبدولڕەقیب یوسف، چاپی یەکەم، ٢٠١٠، لاپەڕەکانی (٢٤-٢٦).
(٤) (كركوك وهويتها العمرانية)، سوبحی سەعاتچی، ٢٠١٠، لاپەڕەکانی (٤١-٤٢).
(٥) ڕۆژنامەی (صوت التآميم)، ژمارە سێیەم، ساڵی یەکەم، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(قشلة كركوك)، عەبدولعەزیز سەمین بیاتی.
(٦) (الجيش والسلاح)، بەشی پێنجەم، نووسینی کۆمەڵێك نووسەر، بەغدا ١٩٨٨، لاپەڕە (٣٣٥).
(٧) گۆڤاری (الاخاء)، ئاب - ئەیلول، ١٩٨٨، ژمارە ١٩٤، لاپەڕە (٤).
(٨) بڕوانە ئەم سەرچاوانە:-
- گۆڤاری (الاخاء)، ژمارە، بێ ژمارە، ساڵی ١٩٨٩.
- (سـوق القيصرية الاثـري في كـركـوك)، محەمەد عەبدوڵڵا ساڵح.
- گۆڤاری (فیصل)، ژمارەی ١٣٤، ١٩٨٨.
- گۆڤاری (الاخاء)، ژمارە، ١٠، ساڵی ١٩٨٣.
- گۆڤاری (فنون)، ژمارە ٤٤، ١٩٧٩.
- گۆڤاری (صوت الاتحاد)، ژمارەی ٥٢، ١٩٩٥.
- گۆڤاری (صوت التآميم)، ژمارەی (٨، ٩)، ١٩٨٨، ساڵی سێیەم.
(٩) (كركوك وهويتها العمرانية)، سوبحی سەعاتچی، لاپەڕەکانی (٥٦-٥٧)
(١٠) (بیرەوەرییەکانی ژیانم)، مستەفا نەریمان.
(١١) (شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ)، مستەفا نەریمان، لاپەڕە (٥٧).
(١٢) (الجيش والسلاح)، بەشی پێنجەم، بەغدا، ١٩٨٨.
(١٣) گۆڤاری (هـاواری کەرکوك)، ژمارە، ٣، ١٩٩٩، لاپەڕە (٥١-٥٦).
(١٤) گۆڤاری (سوبارتو)، ژمارە (٤-٥)، ساڵی چوارەمو پێنجەم، لاپەڕەکانی (٨٧-٨٩)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(قوللەکانی نێوان کەلار-دەربەندیخان)، نووسینی محەمەد عەلی سوباری، ئارام محەمەد مەجید.
(١٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی (١١٣-١٢٠)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(ئارامگەکانی باوە شاسوار لە کفری)، نووسینی محەمەد عەلی سوباری، ئارام محەمەد مەجید.
(١٦) (المرشد الى مواطن الاثار والحضارة)، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (٢).
(١٧) گۆڤاری (هـاواری کەرکوك)، ژمارە، ٤، ١٩٩٩، لاپەڕە (١٨٥ - ١٨٦).
(١٨) (المرشد الى مواطن الاثار والحضارة، الرحلة السادسة).
(١٩) گـۆڤـاری (سـوبـارتـو)، ژمـارە (٤-٥)، ساڵی (٢٠١١)، لاپەڕە (٤٧)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(قەڵای شێروانە)، نووسینی محەمەد عەلی کەریم.
(٢٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی (٥٥-٥٩).
(٢١) ڕۆژنامەی (هـاوکاری)، ژمارە (١١٢٧)، ڕۆژی ١٩٨٩/١١/١٦، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(گردی شێروانە سەیری سیروان)، مستەفا نەریمان.
- گۆڤاری (ڕەنگین)، ژمارە ٩٦، ١٩٩٦، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(سیروان، شیروانە نییە)، مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی.
- گـۆڤـاری (ڕەنـگـین)، ژمـارە (١٠٠-١٠١)، ١٩٩٧، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(قـەڵای شێروانە ڕەمزی زیرەکیو مەردایەتی حەمە پاشای جافە)، عەبدوڵڵا کاکە ڕەش.
- گۆڤاری (الف باء)، ژمارە (١٠٩٩)، ساڵی ١٩٨٩، ١٨ی تشرینی یەکەم.
- (العـراق الشمالي)، محەمەد هـادی ئەلدەفتەری، عەبدوڵڵا حەسەن، لاپەڕە ٢٩٨.
- (بانگەوازێك بۆ ڕووناکبیرانی کورد)، عەبدولڕەقیب یوسف.
- گـۆڤـاری (ڕۆشنبیری نـوێ)، ژمـارە ١٣٨، ١٩٩٦، لاپەڕە (٢٦-٢٨)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(تاکەی خۆمان بەکەم بزانین)، د. حەسەن جاف.
(٢٢) گـۆڤـاری (سـوبـارتـو)، ژمـارە (٤-٥)، ساڵی (٢٠١١)، لاپەڕە (٤١)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(قەڵای شێروانە)، نووسینی محەمەد عەلی کەریم.
(٢٣) گۆڤاری (کـەرکوك)، ژمـارە ١٢، ساڵی ٢٠٠٢، لاپەڕە (١٢٢ - ١٢٣)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(سـەردەمـە کارگێڕیی وبەڕێوەبەرییەکانی ناوچەی کەرکوك)، ئەژی.
هەروەها بڕوانە:

گۆڤاری (الاخاء)، ژمارە (١٠، ١١، ١٢، ١٩٧٥)، لاپەڕە (١٣)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(وماذا تعرف عن جسر داقوق القديم)، نەجیب وەهاب.
(٢٤) گۆڤاری (ڕەنگین)، ژمارە (١١٣).
(٢٥) (ڕێبەری شوێنەوارەکانی گەرمیان)، محەمەد عەلی کەریم، لاپەڕە ١٢.

## بەشی پێنجەم

# مێژووی هونەری بیناکاری و نەخش و نیگاری ناوچەی کەرکوك لە نێوان ساڵانی ١٩١٤-١٩٧٥

وەرچەرخانێکی گەورە ڕوویدا لە مێژووی عێراقی نوێدا ئەویش هاتنی ئینگلیزەکان بوو بۆ داگیرکردنی ناوچەکەو دەرپەڕاندنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەکان بوو لەسەرتاپای ئاقارەکانی عێراقدا، کە لەگەڵ خۆیدا بووە دروستکردنی بارێکی نوێو گونجاوو لەبارتر لەهەموو دەڤەرەکانی ڕۆشنبیریو ئابووریو کۆمەڵایەتیو بیناکاریو ئایینیو پەیوەندییە سیاسییەکانی سەر گۆڕەپانەکە.

مێژووی دوورو درێژی عوسمانییەکان خۆی لەخۆیدا ببووە هەڵگری گەلێك سیفاتی دیاری سەردەمەکەی خۆی، کە جێپەنجەی زۆر بەزەقی لەسەرتاپای عێراقو ناوچەی کەرکوکدا بەدەر کەوتووە، کەبەشێکی گرنگی ئەو کاریگەرییە بووەو ڕەنگدانەوەی خۆی زۆر بەزەقی بەدەرکەوت لەلایەنەکانی هونەری بیناکاریو نەخشو نیگار، کە بووە داپۆشینی سەردەمەکانی لەوەو پێشەوەی خۆی.

هەرچەندە کە هاتنی ئینگلیزەکان سەردەمێکی نوێ بوو، بەڵام لەهەمان کاتدا کاریگەری تەرزی بیناکاری عوسمانی هەر درێژەوە بووی خۆی بەردەوام بوو، کە تا دەوروبەری پەنجاو شەستەکانی خایاند، بەڵام کەوتە بەر کاریگەری گۆڕانە نوێیەکانی نێوان هەردوو شەڕی جیهانیو لەگەڵ خۆیدا قاودرا بەجۆرەها گۆڕانی تەرزی بیناکاری نوێ بابەتو تازە لەتاقی کردنەوەی بیناکاری عێراقیدا.

هاتنی ئینگلیزەکان لە عێراقدا گەلێك قۆناغی بڕییەو، هەنگاوی هێدی.. هێدی ناوەو، بەکتوپڕی تەرزی بیناکاری خۆی جێگیر نەبووە بەسەر ناوچەکاندا، ئەویش دەگەڕێتەوە ژێر کاریگەری سەردەمەکانی پێش تەرزی بیناکاری ئینگلیزەکانو هەڵگری ئەو خاسیەتانەی کە دەوریان بینیووە، لەخۆ سازدانی ئەو ژینگە بیناکارییە لەهەڵگری سیفەتە ڕابوردووەکانی.

((ئەو ماوەیەی داگیر کردنی ئینگلیزەکان لە عێراق لەنێوان ساڵانی (١٩١٤-١٩١٨)و دامەزراندنی حکومەتی نیشتمانی لەوڵاتداو هەتا ماوەی هەڵگیرسانی شەڕی دووەمی جیهانی، دادەنرێت بەماوەیەکی گرنگ لەمێژووی بیناکاری عێراقدا، هەر لەسەر ئەوەشەوە ئەم ماوەیە هاوگونجاوە لەگەڵ بڵاوبوونەوەی کەرەستەی بیناکاری تازە بابەتو شێوازی بیناکاری جۆراو جۆر، کە بەکارهێنانی زۆر باو بووە لەجیهاندا، لەلایەکی ترەوە ڕەنگدانەوەی پێویستییە جۆر بەجۆرو فراوانەکانی جۆرەها دامەزراوو بیناکارییە، چونکە لەبەر ئەوەی پێگەیاندنی ئەم بیناکارییانە دەبێتە پێویستییەکی گرنگ بۆ جێبەجێکردنی کار ڕایکردنی بیناکارییەکان.

لەبەر ئەوەی وڵات لەو کاتەدا لە قۆناغی پێگەیاندن بووە. لەم ماوەیەدا بووە پێگەیاندنی جۆرەها تەرزی بیناکاری کە شێوەیەکی دیاری نەبووە لەرابردوودا، لەرووی کارگێڕییەوە وەکو هونەری بیناکاری فرۆکەخانەو سەرای حکومەتو سینەماو دەزگای تایبەت بە پۆستەو بروسكو تەلەفۆنی ئۆتۆماتیکی دەتوانین ئەو ماوەیەی داگیرکردنو دروست بوونی حکومەتی نیشتمانی، هەر درێژەوە بووی ئەو چارەسەرە بابەتییانەی بیناکارییە دابنێین، تێدا کەرەستەی بیناسازی بەکارهێنراوە، کە باوبووە لەتەرزی ئەوکاتەی بیناکاری سەرتاپای عێراقدا، بەڵام ئەم درێژ بوونەوەیە لەگەڵ خۆیدا بووە هەڵگری گۆڕانکاری کتوپڕو بەپەلە بۆ چارەسەرکردنی پێویستییە بیناکارییەکان))[1].

یەکێك لەو دیاری کردنانەی کە کاریگەرییەکی گەورەی دروست کرد لەسەر شێوازی بیناکاری ئەو کاتەدا، خۆی دەبینێتەوە لەسەر باری ڕۆشنبیریو پاشماوەو شێوازو ئامانجەکانی بیناکاری ئینگلیزەکان، ئەو بەریتانیانەی کە لە شوێنی پلە بەرزو لەدەزگاکانی دەوڵەتی عێراقی لە دوای دروست بوونو لەماوەی فەرمانڕەوایی داگیر کردندا کاریان



دەکرد، لە یەکە کارگێڕییەکان بوونە دەرهاویشتەی ئەو گۆڕانکارییانە(٢).

زۆربەی ئەو دام و دەزگا و بیناکارییانەی ئەو کاتە جێبەجێ کراوەو بەهۆی هاوپەیوەستی ڕاستەوخۆی، پێویستییەکانی هێزەکانی سەربازی داگیرکەر، لەگەڵ جێبەجێکردنی پێویستییەکانی حکومەتی نیشتمانی بووە بۆ کار ڕایکردنی ئینگلیزەکان. ئەویش زۆر بەڕوونی بەدەردەکەوێت لە دروستکردنی نەخۆشخانە بۆ تیمارکردنی سەربازەکان لە خاڵی هێرشە سەربازییەکانیان، یا لە دروست کردنی یانەی تایبەتی بۆ حەوانەوەو کات بردنە سەرو یان لە دروست کردنی دەزگای پۆستەو بروسك، بۆ ئاسانی گەیشتنی هەواڵەکان بەئیمبراتۆریەتی بەریتانیای گەورە تەنانەت بایەخ دانیان بە ئاسەوارو کۆنینەکانیش خۆی دەبینێتەوە لەدەست بەسەراگرتن و ڕەوانەکردنی بۆ مۆزەخانەکانی بەریتانیا.

ئەو هێزەی بەریتانیا کە ڕاستەوخۆ لە (هیند)ەوە بۆ عێراق هێنرا، هەستان بەڕێکخستن و سازدان و هێنانی جۆرەها کەرەستەی بیناکاری، بۆیە زۆربەی سەرکردەو ئەفسەرو سەربازەکانیان لە هیندستانەوە هێنرا بوون و هەموویان سەر بەچین و توێژە جۆربەجۆرەکانی هیند بوون، هەر لەبەر ئەم هۆیە بوو کە ئەو سیاسەتەی لەوێ جێبەجێ کرابوو دەیانویست لەهەموو ڕوویەکەوە جێگەی خۆی بگرێت. ئەویش وەکو هەموو میللەتەکانی ئاسیا کەوتبوونە ژێر ڕکێفی بەریتانیاوە(٣). بۆیە لە ڕووی بیناکاریشەوە هەمان سیاسەتی درێژەپێدەری ئەوان بووە.

ئینجا بۆیە ڕەنگدانەوەی ئەم سیاسەتەی وای لێکرد کە ببێتە تەقینەوەی جۆرەها شۆڕش لەناوچەکەدا، کە هەڵگری ئەو گۆڕینی سیاسەتە چەوتە بووە، هەر ئەم ڕەنگدانەوەیە خۆی دەبینێتەوە لەتەرزی بیناکاری لەو ماوەیەدا، لەکاریگەری میللەتەکانی کە بۆ هێزەکەی نێردرا بوو، یان هەوڵی ڕێکخستنی بەڕێوەبەری عێراقیان دەدا. هەر لەبەر ئەم کاریگەرییە بوو، کە دەتوانین بەچاوێکی دیارەوە قورسایی بخەینە سەر (ئەویش سەرهەڵدانی هەستی نیشتمانی و نەتەوەیی بوو لەعێراق بەتایبەتی لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانیدا، کە خۆی دەبینێتەوە لە شۆڕشی بیست دا)(٤).

کاردانەوەی ئەم شۆڕشە وای کرد کاربەدەستانی داگیرکەر هەوڵ بدەن، سەیری ئارەزووی میللەت بکەن لەدانان و نەخشەی تەرزی بیناکاری کە لەو ماوەیەدا دروست کراوە، کاریگەری ئەمیش زۆر بەڕوونی بەدەردەکەوێت لەناوچەی کەرکوك، ئەویش لەشۆڕشەکەی (ئیبراهیم خانی دەلۆ)دا(٥)، کە سەر تاپای ناوچەکەی گرتەوە. چونکە بووە هۆی ڕاوەستانی گەلێك پرۆژەی بیناکاری کە هەمووی هەر لەخزمەتی هێزی سەربازی بەریتانیادا کاری دەکرد، نەك لەخزمەتی ڕووی گشتی بیناکارییەکەدا.

هەموو ئەو بیناکارانەی کە لەو ماوەیەدا کاریان کردووە هەوڵیان داوە کە خوازیاوی ئەو خاسیەتانە بن وەکو ئاوو هەوای تایبەتی ناوچەکەو، هەوڵیان داوە هەندێك ئاسانکاری بیناکاری بەکاربهێنن بۆ کەمکردنەوەی خراپی ئاوو هەوای باو، دەتوانین بڵێین هەموو ئەو ئاسان کاریانە کە بەکارهاتووە تایبەت بوو بەئاوو هەوای گەرمی ئەو ناوچانەی باوبووە لەهونەری بیناکاریدا. لەبەکارهێنانی دیواری پان و دروست کردنی ڕارەو لەبەرامبەر پەنجەرەو کردنەوەی بۆشایی بەرز بۆ دروست کردنی هێزی هاتنە ژوورەوەی هەواو بەکارهێنانی بەرزی زۆر بۆ ژووری داخراو.. کە هەموو ئەمانە باو بووە لەبیناکاری ناوچەکەدا.

یەکێك لەو شتانەی کە زۆر بایەخی پێدرا دروست کردنی ئاوەڕۆ بوو لەسەربانەکانەوە، کە ئەمیش تەنها لەڕووی ئەو سوودەیەوە نەبوو، بەڵکو کاریگەرییەکی هونەریشی هەبوو بۆ دەرپەراندنی لەڕووی بیناکارییەکەوە(٦). زۆری ئەو ئاوەڕۆیانەی، بەکارهاتووە لەو ماوەیەدا لەهەموو بیناکاریەکاندا، جێگەی سەر سوڕمانە، بەتایبەتی لەناوچەیەکدا کە ئاوو هەواکەی بەناوبانگە بەکەمی باران بارین، ئەمیش هۆی ئەم بایەخ دانە بەئاوەڕۆ دەگەڕێتەوە

سەر کاریگەری بیناکاری ئینگلیزیو ئەو بەکارهێنانە بیناکاریانەی کە باو بووە لەووڵاتی (هیند)، کە بەناوبانگە بەباران بارینی زۆر[٧].

ئەگەر چاوێك بەبیناکاری ئەو ماوەیەی ناوچەی کەرکوکدا بخشێنین دەبینین بایەخێکی زۆر دراوە بەبەکارهێنانی (ئاوەڕۆ)، بەتایبەتی ئاوەڕۆی سەربانی بیناکارییەکان ئەمیش لەبەکارهێنانی ئاسنو چینکۆ لەدروست کردنی ئاوەڕۆکاندا، ئەگەر سەیری ڕووی بیناکارییەکان بکەین دەبینین کە ئاوەڕۆکان ڕوویەکی جوانکارییان نواندووە لەدروستکردنیدا یەکێك لەگیروگرفتەکانی کە چارەسەریان بۆ دۆزییەوە دروست کردنی (بنمیچ)ە، کەبریتی بوو لەگرێیەکی گەورەو شوێنێکی گرنگی بیناکاری بووە، کە توانرا چارەسەری بکرێت بەهۆی (گرێی گەچی) لەگەڵ بەکارهێنانی پارچە ئاسنی باریكو درێژ، کە بەهۆی ئەم کارەوە پانتاییەکی گەورەو فراوان داپۆشرێت کەلەوەو پێش شتیوەها ڕووی نەدابوو.

توانرا کە بنمیچ بەش بەش بکرێت بەهۆی دوو پارچەی ئاسنی، کەوای کرد بتوانێت بەشێکی زۆری هۆڵە گەورەکان داپۆشێتو ڕاڕەوی هۆڵەکان سەربگیرێت، یان هەستن بە بەکارهێنانی (جەمەلۆن) بۆ سەرگرتنی بیناکارییەکان، کە لەگەڵ خۆیدا بۆ بەکارهێنانی فراوان دەور دەبینێت[٨].

دیاردەی بەکارهێنانی جەمەلۆن لەزۆر شوێنی ناوچەی کەرکوك بەکارهێنرا، هەروەها بەکارهێنانی گەچو ئاسنیش تا ئەم ساڵانەی دوایی هەر برەوی هەبووە وەکو کەرەستەیەکی پێویست لەبیناکاریدا دەوری خۆی بینیووە، کە جێگەی گوومەتو گرێی گەچی گرتەوە.. (ئەو کەرەستە بیناکاریانەی کە بەکارهاتووە بریتی بووە لە (گەچ)و (نورە)، کە بەشێوەیەکی زۆر فراوان، کە هەردووکیان دوو کەرەستەی بەردەستنو لەگەڵ دەستدا ئیش کردنیان خۆشە. هەروەها کەرەستەی چیمەنتۆش بەکارهاتووە بەتایبەتی لەدروست کردنی کۆڵەکەی بیناکاریدا[٩].

تایبەتمەندیەکی تری ئەو بیناکارییە ماوەی دروست کردنو بایەخدانە بەڕووکاری ڕووی دەرەوەی بیناکارییەکەو هەوڵدان بۆ سازدانو خۆ خەریك کردن تەنها لەدەرەوەو ئەوەندە بایەخ بەڕووکارەکانی ناوەوە نەدرێت. کاریگەری ئەم جۆرە بایەخدانەش ئەگەڕێتەوە سەردەمی بیناکاری (ڕینسانس) لەئەورووپا[١٠].

**یەکەم:-** ئەوەی لەهونەری بیناکاری ناوچەی کەرکوکدا بەرچاو دەکەوێت لەو ماوەیەدا، بایەخدانە بەو پێویستییانەی بیناکاری، کە هێزەکانی ئینگلیز سوودی لێ دەبینێت، بۆیە سەرەتای داگیر کردن خوول دەخواتەوە لەو دامو دەزگایانەی کە دەبێتە جێبەجێ کردنی کار ڕایی کردنی لەڕووی کارگێڕی داگیرکردنەکە، وەکو دەزگای پۆستەو وێستگەی شەمەندەفەرو سەراو دەزگای پۆلیسو گومرگو باجو یانەو نەخۆشخانەی سەربازی.

لە سەرەتادا هەوڵیان داوە کە بکەونە جێبەجێ کردنی پێویستییەکان وەکو ئەوەی بایەخ بدەن بەڕووی بیناکارییەکە، بۆیە ئەوەی گرنگ بووە کە شوێنێك بکەنە ڕووکاری ئەو کارگێڕییە، کە نموونەی ئەم جۆرە ئاسان کارییانەمان زۆرە کە لەو ماوەیەدا بەکارهێنراوە، وەکو بەکارهێنانی سەرای عوسمانییەکان لەدەزگای پۆلیسو بەکارهێنانی قشڵەی کەرکوك لە حەشارگەی سەربازیو مۆڵگەگرتنی هێزی سەربازی تێدا، هەروەها بەکارهێنانی (قەڵا) لە جێگیر کردنی هێزی سەربازیو پۆلیس لە نێویدا.

**دووەم:-** ئەوەی لەو ماوەیەدا سەرنج دەدرێت لەناوچەی کەرکوکدا بایەخدان بووە بەو کەرەستانەی کە باو بووە لەسەردەمەکانی پێش داگیر کردنی ئینگلیزەکان وەکو گەچو نوورەو بەرد کە ئەمە زۆر بایەخی پێ دەدرا لەگەڵ بەکارهێنانی چیمەنتۆ، بەڵام لە چوارچێوەیەکی تەسکتر، چونکە بەرزی نرخەکەییو بەکارنەهێنانی لەوەو پێش وایکرد کە زیاتر بایەخ بەگەچو نوورەو بەرد بدرێت.. کەرەستەیەکی تریش هاتە جیهانی بیناکارییەوە ئەویش (شیش)و (چینکۆ)و (ئاسن)و (خشتی سورەوەکراو) بوون، کە هەریەکەیان بەپێی پێویست جێگەی خۆی گرت.

**سێیەم:-** ڕوویەکی تری بیناکاری سەری هەڵدا ئەویش گۆڕینی نەخشە لەسەر تەرزی ڕۆژهەڵاتیو هەوڵدان بۆ گۆڕینی لەسەر شێوازی ڕۆژئاوایی، ئەوەی کە باوبووە لەخانووەکانی ناوچەی کەرکوك دروست کردنی خانوو بوو لەسەر شێوازی (کەڵەگی) یان (دوێرو خەزنە)، بەڵام لەوەو دوا کەوتنە بایەخدان بەڕووی ڕۆژئاوایی بیناکاری وەکو خانووەکانی (عەرەفە)و گەڕەکی (ئیسکان)و کۆمپانیای نەوتی کەرکوك.

**چوارەم:-** بایەخدان بەڕووی دەرەوەی بیناکاری کە ئەمیش زۆر بەڕوونی بەدیار دەکەوێت لەدروست کردنی ڕووکاری دەرەوەی خانوو کۆگاو شوێنە گشتییەکان،







لەبەکارهێنانی نەخش‌و نیگاری رووەکیدا خۆی دەبینێتەوە یان لەرێکخستنی خشتی سوورەوە کراو لەسەر باری درێـژی‌و پانی کە خۆی لەخۆیدا دەبێتە دروست کردنی جوانکاری رووی دەرەوەی خانووەکە.

**پێنجەم:-** هەر چەندە کە گۆران لەتەرزی بیناکاری رۆژهەلاتیدا روویدا، بەلام کاریگەری کەوانەو کۆلەکەو رارەو دەوری خۆی بینی لەگەڵ تێك هەلکێشی بیناکاری رۆژئاواییدا، بەلام ئەم جارەیان لەسەر شێوازێکی بیناکاری تازە ترو لەبارتر لەگەڵ ژینگەو ئاوو هەواکەداو. بەکارهێنانی کۆلەکەی چوارگۆشەیی باو بوو.

**شەشەم:-** بایەخدان بەشێوازی نوێ لەبەکارهێنانی دەرگاو پەنجەرەدا، ئەویش زیاتر لەبەکارهێنانی پەنجەرەی دارو دەرگای دار لەسەر شێوازی لاکێشەیی و، هەولدان بۆ دروست کردنی پەنجەرەی زیاتر لەخانوودا.

**حەوتەم:-** هەولدان بۆ بەکارهێنانی بنمیچی تەخت‌و بەکارهێنانی ئاسن لەسازدانیدا، یان دروست کردنی گرێی گەچی لەنێو ماوەیی ئاسنەکاندا.

**هەشتەم:-** بایەخدان بەئاوەرۆو هێنانە خوارەوەی بەدرێژی رووی بیناکارییەکە، کە زیاتر لە (چینکۆ) دروست کرابوو.

*** هونەری بیناکاری نێوان سالانی (١٩٥٠–١٩٦٠):**

دەتوانین قۆناغێکی گرنگیتر لە هونەری بیناکاریدا دیاری بکەین، ئەویش ئەو ماوەیەیە کە کەوتۆتە نێوان کۆتایی شەری دووەمی جیهانی‌و کۆتایی پەنجاکاندا، دەتوانین بلێین دامەزراندنی قۆناغی بیناکاری نوێیە لە عێراقدا.

هۆی گرنگی ئەم ماوەیە لەوەدا بوو، کە رووداوێکی گرنگ روویدا لەمێژووی مرۆڤایەتیدا، ئەویش کۆتایی‌و راوەستاندنی شەری دووەمی جیهانی‌و لەگەڵ خۆیدا بووە دروست بوونی گۆرانێکی گەورەو هەمەلایەنی لە هەموو لایەنەکانی کۆمەلایەتی‌و ئابووری‌و پیشەیی‌و رەنگدانەوەی ئەم لایەنانە لەسەر دەروازەی لایەنەکانی ولاتدا بۆ گەشەکردنی بارەکانی کۆمەلایەتی‌و ئابووری‌و بیناکاری[11]، هەر لەگەڵ ئەم گۆرانانەدا بووە دروست بوون‌و گەشەکردنی هونەری بیناکاری لەسەر ئاستێکی فراوان‌و پەل هاویشتنی بۆ نەخشەو پەیرەوی بیناکاری تازە بابەت.

ئەوەی بەدیار دەکەوێت لەم گۆرانە کت‌و پرەدا، دەگەرێتەوە بۆ چەلەنگی ئەو بیناکارییە جیهانییانەی کەلەدوای شەر هەولی چاککردنی ولاتەکانیان دەداو، کەوتنە دارێژرانی ناوچەو ئاقارەکان لەسەر شێوازی تازە بابەت‌و هاوگونجاندنی لەگەڵ پێویستییەکانی سەردەمدا، کە ئەمە لەگەڵ خۆیدا بووە دروست بوونی بزاڤێکی بیناکاری هەمەرەنگ‌و فرە بابەت‌و هەمەرەنگ بوونی لایەنە بیناکارییەکان[12].

ئەوەی لە ناوچەی کەرکوکدا بەرچاومان دەکەوێت، روودانی گۆرانکارییەکی گەورە روویدا، لەدروست کردنی جۆرەها تەرزی بیناکاری کە لەگەڵ گۆرانە جیهانییەکەدا هاوپەیوەست بووە، بەلام هەرچەندە کە پێویستییەکی زۆری بیناکاری هەبوو، نەیتوانیوە بکەوێتە جێبەجێ کردنی ئەو پێویستییانە لەسەر ئاستێکی گونجاو، ئەو بیناکاریانەی کە سەری هەلدا بوو جێبەجێ کردنی زیاتر لایەنە کارگێرییەکان بوو، ئەگەر سەیری لایەنە بیناکارییەکانی گشتی شارەکە بکەین دەبینین، جۆرەها تەرزی بیناکارییان دروست کردوە لەسەر شێوازی تازە بابەت‌و لەسەر تەرزی رۆژئاوایی‌و زیاتر دوورکەوتنەوە لەتەرزی بیناکاری رۆژهەلاتی هەروەها بەهۆی دۆزینەوەی رێژەیەکی زۆری نەوت لەشارەکە بەتایبەتی گەشەکردنی کۆمپانیای نەوتی کەرکوك، کە هەستا بەجێبەجێکردنی جۆرەها پرۆژەی بیناکاری بۆ پێویستی کۆمپانیای نەوت‌و کارمەندانی دەزگا کارگێرییەکانی، کە زیاتر نەخشەی بیناکارییەکانیان لەسەر شێوازی نەخشەی (بیناکارە–ئەندازیارە) ئینگلیزەکان جێبەجێ ئەکرا.

((هەر لەبەر ئەمەیە بەهاتنی پەنجاکان بووە گونجاندنی زەمینەیەکی بەپیت‌و بەردەست بۆ ئەو پێشکەوتنەی کە لەهەموو چالاکییەکانی بیناکاریدا روویدا، لەگەڵ ئەو ئاوو هەوا رۆشنبیرییەی کە روویدا لەولاتدا بووە هەولدان بۆ راکێشانی ئەو گۆرانکارییە بەپەلانەو سەرنج دان‌و رەنگدانەوەی لەهەموو جوانکارییەکانی تری وەکو وێنەکێشان‌و شیعرو ئەدەب))، لەهەمان ماوەدا بووە سەرهەلدانی دیاردەیەکی تازە لەتایبەت مەندی ئابووری عێراق، ئەویش لەگەشە کردنی شاقولی بەرهەم هێنانی نەوت خۆی دەبینێتەوەو کەلەکە بوونی رێژەیەکی زۆری پارە، ئەمە لەگەڵ خۆیدا بووە پێویستی پەلەکردن لەجێبەجێ کردنی پرۆژەکان‌و ئاوەدانی لەولاتدا هەر لەگەڵ ئەم پێشکەوتنەدا بووە کەلەکە بوونی سەرمایە لەلای ژمارەیەکی زۆری چینی بۆرجوازی نەتەوەیی، کە ئەمە لەپێش شەردا بەرچاو ناکەوت))[13]، هەر ئەم چینە بوو دەوری بینی لەجێبەجێ کردنی پرۆژە بیناکارییەکاندا.

((چالاکی بیناکاری تازەی عێراقی دەستی کردە گەشەکردن

لەگەڵ دەستەو تاقمە هونەرییە نوێیەکانو پێشکەوتنە کۆمەڵایەتییەکانی بەکۆتایی هاتنی پەنجاکان، کە بەرهەمی بیناکارە عێراقییەکان لەو ماوەیەدا گەواهی ئەو ڕاستییەن لەسەر ئاستی بیناکارییدا.

هەر لەبەر ئەمەیە کۆتایی پەنجاکان دادەنرێت بەنزیك بوونەوەو سەرهەڵدانو دامەزراندنو ڕێکخستنو بەکارهێنانە تازەکانی بیناکاری لەعێراقدا.

دەتوانین سەرەتای شەستەکان دابنێین بەبناغەو گەشەکردنی هونەری بیناکاری، ئەویش بەدادانو چڕکردنەوەی کارە جوانکارییەکانو فرە لقی شێوازەکانی، کە بووە گەشەکردنی شێوازی بیناکاری کە دەربڕی خواستەکانی ئەو واقیعە دەردەبڕێت، لەگەڵ پێویستییەکانی گەشەکردنو پێشکەوتندا بگونجێت. ئەوەی کە دەوری بینی لە گەشەکردنی بیناکارییدا، زۆری کەرەستەی جۆر بەجۆرو بەرزبوونەوەی داهاتی نەتەوەیی بوو لەدوای زۆربوونی بەرهەمی نەوت، بەپێی یاسای ژمارە (٨٠)ی کۆتایی پەنجاکانو ئەم گۆڕانە زیاتری گەشەسەند بەتایبەتی لەدوای شۆڕشی (١٩٥٨) کە بووە هۆی پێشکەوتنی هەمە لایەنی لەهەموو بوارەکاندا، کە هونەری بیناکاری بەشێکی گرنگی ئەو پێشکەوتنە بووە[١٤].

ئەگەر سەیری ناوچەیەکی وەك کەرکوك بکەین لەنێوان ساڵانی (١٩٥٠-١٩٦٠) ئەم چەند سەرنجە گەڵاڵە دەبێت:

١. گۆڕانێکی تەواو لەتەرزی بیناکاری خانووی ڕۆژهەڵاتی و هەنگاو بەرەو خانووی ڕۆژئاوایی کە نموونەمان خانووەکانی شەریکەی نەوتو گەرەکی (عەرەفە)و (ئازادی)و (ئیسکان)ە.

٢. واز لێهێنانی بەتەواوەتی هونەری کۆڵەکەو کەوانەوگوومەتو بایەخدان بەکۆڵەکەی ئاسنو چیمەنتۆ.

٣. بایەخدان بەزۆری لەکەرەستەی وەکو چیمەنتۆ، شیش، شێلمان، شووشەو دارو، ڕازاندنەوەی ئەو خانووانە بەو جۆرە کەرەستانە.

٤. سەرهەڵدانی بیناکاری چەند چین لەسەر یەکتریو بایەخدان پێی لەڕوویەکی بیناکاری جیهانییەوە.

٥. بایەخدانی زیاتر بەبنمیچی تەختو داڕێژانی بەشیشو گەچ لە دروست کردنیدا.

٦. هەوڵدان بۆ بەکارهێنانی پەنجەرەی فراوانو پێوانەی لاکێشەیی، گوێدانو بایەخی زیاتر کردنی ڕووناکی.

٧. بەکارهێنانی باخچە لەبەردەمی ماڵەوە، لەگەڵ دروست کردنی پەرژینو دیواری نزم بەدەوری خانوودا، ئەویش ڕازاندنەوەی بەدروست کردنی نەخشو نیگاری لەسەر شێوەی جوانکاری خشتی سورەوەکراو-(طابوق) ڕازاندنەوەی ڕووکاری دەرەوەی خانووەکە بەو جوانکارییە.

*** هونەری بیناکاری لەنێوان ساڵانی (١٩٦٠-١٩٧٥):**

لەدوای چەواشە بوونی شۆڕشی (١٩٥٨)و لادان لەو ڕێڕەوانەی کە لەسەرەتای شۆڕشەوە بانگەوازی بۆ دەکردو سەرهەڵدانی گەلێك لایەنو توێژ بۆ گۆڕینی شۆڕش لەخۆیو ئامانجەکانیو سەرئەنجام سەرهەڵدانی کودەتایەکی تر کە هەموو ئامانجەکانی شۆڕشی قاودایە ناو بۆتەی گۆڕانە سیاسییەکانەوە و لەناوەوە و لەدەرەوە عێراقی بەرەو جیهانێکی نادیاری ڕاکێشا کە هەموو ئاواتەکانی میللەتی عێراقی کردە قوربانی بیرو باوەڕو ئامانجە نەتەوەییە عەرەبییەکەیانو هەوڵدان بۆ جێبەجێ کردنی ڕێبازە شۆڤینییەکان، کە دوا ئەنجام بووە تێکدانی هەموو نەتەوەکانو گۆڕانی هەموو واقیعی عێراق لەپێناوی مەرامەکانیانو، ڕەنگدانەوەی هەموو ئەم چەواشەکردنە جێپەنجەی خۆی بەدیاردا لەبوارەکانی کۆمەڵایەتیو ئابووریو ڕۆشنبیریو ئایینیو زمانو لایەنە بیناکارییەکانو هەوڵدان بۆ گۆڕینیان. یەکێك لەو لایەنانەی کە گۆڕانێکی گەورەی تێدا ڕوویدا هونەری بیناکاریو هەنگاوە بیناسازییەکان بوو، کە هەموو هەنگاوەکانیان بووە قوربانی سیاسەتەکەیانو تەنها جوانکارییەك چییە لەواقیعە شوومەکەیان دوور نەکەوتەوە.



هەنگاوەکانیان‌و نەخشەکانیان ووردە. وورده زیادی کرد ئەویش بەتایبەتی لەنیوەی شەستەکان‌و سەرەتای حەفتاکان زۆر بەزەقی سەری هەلدا لەرووی جێبەجێ کردنی نەخشەی بیناکارییە سەربازییەکانیان. ئەمیش بەگۆڕینی نەخشەی شارەکە لەسەر دارێژرانی ئامانجە سیاسییەکەیان‌و دروست کردنی دام‌و دەزگای سەربازی لەنێو بیناکاری نەخشەی گشتی شارەکەدا. بۆیە گەلێك رووکاری ئەو بیناسازییە کەوتە بەر ئەو تەوژمە گشتییەی چەواشەی شۆڕش‌و خۆی مۆلدا لەخولگەیەکی داروخاو‌و لەناوچوون. ((ئەوەی لەو ماوەیەدا بەرچاو دەکەوێت کە شێوازەکانی نەخشەکێشان پشتی دەبەست لەسەر ریزکردنی شێوەی یەك لەدوای یەك (Hirachy)، ئەویش بەهۆی فراوانی ئەو ئاقاری نەخشە کێشانە لەرووی (دیمۆگرافی)و (جوگرافی) یەوە))[15].

ئەوەی کە گرنگە لەمەدا دیاری کردنی تایبەتمەندی هەر ئاقارێکە بەپێی ئەو پێوەرەی کە هەیەتی لەرووی نەگۆڕەوە وەکو سروشت‌و جوگرافیا، یان بەپێی پێوەری گۆڕاوەوە وەکو ژینگەو رۆشنبیری دانیشتوانی ئاقارەکە... دەبینی لەم ماوەیەدا گەلێك گریمان (فرضیات) دیاری کرا بۆ ئاقارەکانی عێراق، بەلام هەموو ئەمانە، بریتی بووە لەبیردۆزێکی رووت‌و نەکەوتبووە ژێر کاریگەری واقیعی مەیدانی ئەو شوێنانەوە.

لەساڵی (١٩٦٥)، وولاتیان دابەشکردە سەر سێ ئاقارەوە، سەروو ناوەراست‌و خواروو، هەندێکی تر کردیانە سەر چوار ئاقار بەشێوەی سەروو، خواروو، رۆژئاوا، بیابان.

یان دابەشکردنێکی تریان دانا کە پشتی دەبەست بەهۆکارەکانی تۆپۆگرافی‌و جوگرافی، ئەویش بۆ سێ ئاقار، ئاقاری مەرکەز، کە دەکاتە بەغدا، ئاقاری سەروو کە دەکاتە (موسڵ‌و هەولێرو سلێمانی‌و کەرکوك)، ئاقاری خواروو کە (بەسرە) بنکەکەی بووە.

هەر بۆیە لەنێوان سالانی (١٩٧٠-١٩٧٤) گەلێك نەخشەو پێرەوی تایبەتی دانرا بۆ دارێژرانی شاری کەرکوك کە تا بگونجێت لەگەڵ مەرامە سیاسییەکانیاندا.

لە ساڵی (١٩٧٢)دا هەستان بەنەخشەی بنەرەتی شاری کەرکوك، لەلایەن دەزگای یۆنانی (Doxiad is Associates International) لەگەڵ هاوکاری (المركز القومي للاستشارات الهندسية والمعمارية). بەلام دوای ماوەیەکی تر هەستان بۆ دووبارە گۆڕینەوەی نەخشەکانیان، ئەمیش کەوتبووە ژێر کاریگەری ئەو حالەتانەی کە پێویستییەکانی دانیشتوان‌و گۆڕانەکان دەور دەبینن، لەچوارچێوەی پانتایی زەوییەکەی‌و دابەشکردنی ئەو نەخشانە[16].

((دەزگای دۆکسیادس لەنێوان سالانی (١٩٧٣-١٩٧٥) هەستا بە بەکارهێنان‌و چاککردنی نەخشەکەی، ئەو نەخشەیەی کە بۆی دانرا بوو هەتا ساڵی (٢٠٠٠)ی بۆ کێشرا، هەر چەندە کەوتبووە ناوچەیەکی کوردستان، بەلام ئەمان هەستابوون بەدانانی نەخشەکەیان بەپێچەوانەی رەچاو کردنی شوێنی جوگرافی‌و تۆپۆگرافی شوێنەکەی شاری کەرکوك، بەلکو هەولیان دەدا کە هەمان شێوازی شەترەنجیان لەنەخشەکەیان بەکار بهێنن))[17]، چونکە داوایان لێکرابوو کە نەخشەی شارەکە وەکو شارێکی خواروو سەیر بکرێ هەموو بۆچوون‌و پێویستی دانیشتوانە کە کرابووە قوربانی نەخشە سیاسییەکان.

نەخشەکەی (دۆکسیادس) بەم جۆرە دارێژرا بوو:-

١. پانتایی نیشتەجێ بوونی دانیشتووان.
٢. پانتایی جێگەی بازرگانی‌و خزمەت گوزاری تەندروستی.
٣. ناوچەی بازرگانی.
٤. جێگەی پیشەسازی گشتی.
٥. جێگەی پیشەسازی سووکەڵە.
٦. پانتایی دیاری کراو بۆ ناوچەی تایبەتی، هەروەها شوێنی کۆمپانیا تایبەتییەکانی وەکو کەرەستەی نەوتی‌و سروشتی.
٧. شوێنی دام‌و دەزگاو بەکارهێنانە تایبەتییەکانی.
٨. زەوی‌و زاری کشتوکاڵی.
٩. هێڵی هاتوو چۆ.
١٠. کۆمپانیا تازەکان.
١١. داموو دەزگای دادوەری.
١٢. رێگا گشتییەکان.
١٣. رێگای هێڵی شەمەندەفەر.
١٤. کەناڵە ئاودێرییە چاککراوەکان.
١٥. رێگا گشتییەکانی دەرەوە[18].

بەلام ئەگەر سەرنج بدەین لەدابەشکردنەکەیان ئەم بۆچوونانە گەلالە دەبێت:-

١. پشت گوێ خستنی گەلێك شوێنی شارەکە، بێ ئەوەی گوێ بدرێتە شوێنی ئاسەوارو کۆنینە، بەلکو هەولیان داوە کە شوێنی ستراتیژی مەرامی بۆچوونەکە دیاری بکەن، کە نموونەمان چۆلکردنی قەلا بوو لەدانیشتوان‌و لەدوایدا رووخاندنی رووی شارستانی مێژوویی قەلاکە، یان کردنی گەلێك شوێنی ئاسەواری‌و خستنە چوارچێوەی وەکو زەوییەکی کشتوکاڵی.

٢. هەموو نەخشەکان لەچوارچێوەیەکی تەکتیکی بیناکاری دەسورێتەوە، کە گەلێك جار وا رێکەوتووە بۆ چەند جارێك رووی شوێنێك گۆڕدراوە، تا لەگەڵ مەرامی واقیعی سەربازی بیناکارییەکەدا بگونجێت‌و رووی ستراتیجی بیناکارییەکە، تەنها بۆ رووی سەربازییەکە نەخشەی بۆ کێشراوەو هەموو بیناکارییەکانی تری بۆتە قوربانی.

٣. هەولدان بۆ کۆکردنەوەی دام‌و دەزگاو بیناکارییەکانی گشتی دەورە دراو بەگەلێك رووی بیناکاری سەربازی تایبەتی.

٤. دوور خستنەوەی خزمەتگوزارییەکانی گشتی شارەکە لەناوچە کوردنشینەکان‌و دروست کردنی لەشوێنێکی سەربازی دوور لەو ناوچانە.

٥. هەولدان بۆ دروست کردنی پشتێنێکی سەربازی بەدەوری شارەکەدا ئەویش بەچۆلکردنی لادێکانی دەوروبەری‌و رووخاندنی شوێنی بیناکاری لادێکانی.

*** چەند نموونەیەکی بیناکاری نێوان سالآنی ( ١٩١٧-١٩٧٥ ):**

دەتوانین لەو ماوە بیناکارییەی کە باسمان کرد گەلێك نموونەی بیناکاری بهێنینەوە کە گەواهی ئەو راستییە دەدەن کە تەرزی ئەو هونەرە تا چ رادەیەك گۆڕانی بەسەردا هاتووەو لەگەڵ ڕێرەوی پێشکەوتنەکانی ئەو سەردەمەدا قۆناغ بە قۆناغی بڕیوە کە نموونەمان لەو بەلگانە:

کتێبخانەی گشتی کەرکوك، خانووەکانی ئیسکان و عەرەفە، پردە ئاسنینەکەی ئالتون کۆپری، یاریگەی عەرەفە، شوێنی هێلی شەمەندەفەری کەرکوك، خانووی بنکەی راهێنانی پیشەسازی.

لێرە بەدواوە هەوڵ دەدەم کە بکەومە وەسپ کردنی رووی بیناکاری هەریەکە لەو خانووبەرانەو بەراوورد کردنی لەگەڵ تەرزی بیناکاری سەردەمەکانی پێش خۆی.

*** کتێبخانەی گشتی کەرکوك:**

ئەم کتێبخانەیە لەساڵی ١٩٣٧ دروست کراوە، لەسەر پانتایی زەوییەکی فراوان، کە تەرزی بیناکارییەکەی تێکەڵاوە لەهونەری بیناکاری ئیسلامیو هونەری بیناکاری کاریگەری ماوەی هاتنی ئینگلیزەکان ((کە هەندێك ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە لەسەر تەرزی ئەندەلوسییە))[١٩]، و نموونەی ئەم تەرزە بەکارهێنراوە لەبەریتانیا لەسەدەی چواردەهەمی زایینی، کە دادەنرێت بەیەکێك لەقۆناغەکانی تەرزی بیناکاری (قوطی)، کە جۆرێکە لەتەرزی بیناکاری ئەورووپی[٢٠].

زەوی ئەم کتێبخانەیە لەلایەن (سەید ئەحمەدی خانەقاوە) پێشکەش کراوە بۆ دروست کردنی کتێبخانە، بەرامبەر ماوەیەکی دیاری کراو، کە بەڕێوەبەری کتێبخانەکە لەلایەن ماڵی (سەید ئەحمەد)ەوە دەست نیشان بکرێت و کورد بێت.

بەڵام ئەگەر لەرووی بیناکارییەوە سەیری بکەین، دەبینین زۆر بەووریایانەو لەسەر شێوازێکی رێك و پێك نەخشەی بۆ کێشراوەو تا رادەیەکی چاك تێك هەلکێشی تەرزی بینکاریەکانی لەشوێنی خۆیدا دەست نیشان کراوە، کە لەبەرکارهێنانی کۆڵەکەو کەوانەو بنمیچ و رارەو پەنجەرەو ژووری فراوان و هۆڵ و هەروەها بەکارهێنانی ژێر زەمین.

سەرەتای کتێبخانەکە بریتییە لەدوو جووت کۆڵەکەی گەورە، کە کەوانەی نووك تیژ بەسەریدا هاتووە، کەوانەکەی ناوەراست گەورەترە لەهەردوو کەوانەکەی ئەملاو ئەولای، ئینجا رارەوێکی چوارگۆشەیی دێت، پێش چوونە ژوورەوەی بۆ ناو کتێبخانەکە.

لەم لاو ئەولای کۆڵەکە گەورەکان ١٢ ریز جووت کۆڵەکەی لای چەپ و ١٢ کۆڵەکەی جووت لەلای راست بلاوبۆتەوەکە نێوان هەردوو جووت کۆڵەکە، بەکەوانەیەکی نووك تیژ دادراونەتەوە بەسەریداو بەردەمی هەریەکە لە١٢ کۆڵەکە تیژەکان رارەوێکی لاکێشەی درێژ بلاوبۆتەوە کە بانەکەیان بەسەر کۆڵەکەکە دادراوەتەوە، بنمیچێکی تەختی هەیە.

رووی ناوەوەی کتێبخانەکە بریتییە لەدوو هۆڵی لاکێشەی گەورە لەم لاو ئەولای هۆڵەکەی ناوەوە، کە ژوورێکی لەسەر باری درێژیو پانی ئەوی تر دروست کراوەو دەرگاکانیان لەنێو یەکتری دایە، بنمیچی هەموو هۆڵەکان تەختەو شیش و گەچ بەکارهێنراوە لەدروست کردنیدا.

ئەوەی سەرنج دەدرێت لەم کتێبخانەیەدا بەکارهێنانی باخچەیەکی فراوانە لەبەردەمییەوە لەگەڵ بوونی بە باخچە لە تەنیشتەکانی، لەگەڵ بەکارهێنانی ئاوەڕۆی ئاوە لەسەربان بەزۆری هەروەها لەگەڵ بەکارهێنانی کۆڵەکەی جووت و



کتێبخانەی گشتی کەرکوك

شێوە لوولەکی لەگەڵ کەوانەی نووك تیژو نووك چەماوە لەگەڵ کەوانەی نووك تیژی پەڕپەڕەیی، هەروەها دروست کردنی پەنجەرەی لاکێشەیی و سەر کەوانەیی چەماوە.

ئەگەر لەرووی نەخش‌و نیگارەوە سەرنج بدەین دەبینین کە هیچ نەخش‌و نیگارێکی تێدا نییە، ئەویش زیاتر لەوەی کەوتبووە بەر کاریگەری ئەو ماوەیە کە نەخش‌و نیگار ئەو دەورەی نەبووە لەتەرزی بیناکاریدا.

دەربارەی پەنجەرەو دەرگاکانی کتێبخانەکە لەدار دروست کراوەو پەنجەرەکان لەگەڵ شیش دا تێك هەڵکێش کراوە. شتێکی تر کە لەم کتێبخانەیەدا بەکارهێنراوە، ئەویش (ژێر زەمینە)، دەروازەکەی لەبەرامبەر دەرگای چوونە ژوورەوەیە و لەسەر بارێکی لاکێشەیی دروست کراوەو شوێنێکی گرنگی هەڵگرتنی دەسنووس‌و پاشماوە گرنگەکانی کتێبخانەکەیە.

*** بنکەی راهێنانی پیشەسازی لە کەرکوك:**

ئەم بیناکارییە لەپەنجاکاندا لەکەرکوك دروست کراوە وەکو بنکەیەکی زانستی‌و راهێنانی قوتابیان لەسەر پێگەیاندنی لەپیشەسازی نەوتدا.

روویەکی رێك‌و پێکی بیناکاری هەیەو لەسەر باری درێژی دروست کراوەو بریتییە لەشێوەیەکی دووچین کە ئەمیش روویەکی تازەی بیناکاری ئەو کاتە بووە ئەگەر سەرنج بدەین، ئەوەیە زیاتر کەوتۆتە ژێر کاریگەری بیناکاری ئینگلیزیەوەو تێك هەڵکێشی تەرزی بیناکاری خۆماڵی ناوچەکەی تێدا بەکار نەهێنراوە وەکو ئەوەی لەتەرزی بیناکاری کتێبخانەی گشتیدا بەکارهێنراوەو داچۆڕاوە لەهەموو روویەکی بیناکاری لەوەو پێشەوەی خۆی. لەبەر ئەوەی هۆی دروست کردنەکەی روویەکی کارگێری زانستی هەیە بۆ زیاتر کەوتۆتە بەر کاریگەری پێویستی ئینگلیزەکانەوە.

ئەوەی زیاتر بەکارهێنراوە لەم بیناکارییە دروست کردنی پەنجەرەی گەورەو دەرگای فراوان لەدارو تێك هەڵکێشی بەشیش، هەروەها بەکارهێنانی خشتی سوورەوەکراو لەدروست کردنیدا، لەنەخشاندنی رووی بیناکارییەکە بەئاوەڕۆی سەربان‌و دروست کردنی کۆلی ئاوەڕۆ بۆ هێنانە خوارەوەی ئاوەکەی.



بنکەی راهێنانی پیشەسازی لە کەرکوك

*** خانووەکانی عەرەفە و ئیسکان:**

ئەمانەش روویەکی دیاری سەردەمی تەرزی بیناکاری ئینگلیزەکانن، کە لەوەو پێش تەرزی لەو جۆرە دروست نەکرابوو لەکەرکوکدا، ماوەی دروست کردنەکەی لەنێوان سالآنی (١٩٦٠-١٩٧٠) بووە.

بەڵام ئەگەر بەراووردێکی هەردوو رووی بیناکاری خانووەکان بکەین دەبینین جیاوازی هەیە لەنێوان هەردوو تەرزی بیناکارییەکە، کە ئەمیش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی ماوەی نێوان هەردوو دروست کردنەکە.

١. خانووەکانی ئیسکانی کۆن لەروویەردا بچوکترە لەخانووەکانی عەرەفە.

٢. تەرزی بیناکاری خانووەکانی عەرەفە زیاتر پێشکەوتن‌و گۆڕانی تێدایە بەرەو هونەری بیناکاری رۆژئاوایی.

٣. خانووەکانی ئیسکانی کۆن بچوکتر دیارە لەچاو خانووەکانی عەرەفە، لەژمارەی ژوورو پێوانەی ژوورو هۆڵ‌و ڕاڕەو بەکارهێنانی پەنجەرەو قاپیدا.

٤. بەکارهێنانی باخچە لەخانووەکانی عەرەفە وەکو شتێکی باو بەکارهێنراوەو پانتاییەکی فراوانی داگیر کردووە، کە ئەمە لەخانووەکانی ئیسکان بەرچاو ناکەوێت.

٥. دروست کردنی هەیوان‌و هۆڵی دانیشتن لەخانووەکانی عەرەفە وەکو پێویستییەکی گرنگ بەکارهێنراوە.

٦. بەکارهێنانی پەرژینی نزم بەدەوری خانووەکانی عەرەفەو رازاندنەوەی بەخشتی سوورەوەکراو (طابوق).

٧- ئەوەی لەدروست کردنی هەریەکە لەخانووەکانی (ئیسکان) و (عەرەفە) بەکارهێنراوە، خشتی سوورەوە کراوە (طابوق).

٨- زیاتر بایەخدان بەئاوەڕۆی سەربان لەخانووەکانی عەرەفە وەکو ئەوەی لەخانووەکانی ئیسکانی کۆندا هەیە.







**چەند نموونەیەك لە نەخشەی خانووەکانی عەرەفە**

* پردە ئاسنینەکەی ئاڵتون کۆپری:

لەدوای ئەوەی عوسمانییەکان لەعێراقدا هەرەسیان هێناو کەوتنە کشانەوەی هێزە سەربازیەکانیان لەساڵی (١٩١٧)، هەستان بەچەند کارێك بۆ رێگەگرتنی پێشرەوی هێزی سەربازی ئینگلیزەکان، بۆیە رووخاندنی پردە کۆنەکەی ئاڵتون کۆپری یەکێك بووە لەو رێگە گرتنانەی دژی ئینگلیزەکان بەکاریان هێنا.

دوای ماوەیەکی تر ئینگلیزەکان هەستان بەدروست کردنەوەی ئەم پردە لەسەر شێوازێکی نوێ، ئەویش بە بەکارهێنانی کۆڵەکەی گەورەی چیمەنتۆ لەگەڵ بەکارهێنانی شیش و بورغی لەبەستنەوەی ئەملاو ئەولای پردەکەدا، هەروەها لەگەڵ سەرگرتنی پردەکە دیسانەوە بەشیش و بورغی، کە زۆر لەپردە کۆنەکە پتەو ترو بەهێز تر بووە.

* سەرا - پۆلیسخانە:

ئەمیش یەکێك بووە لەدەزگا کارگێڕییەکانی سەردەمی ئینگلیزەکان و دەورێکی چاکی بینیووە لەبەڕێوەبردنی کاروبارەکانیاندا.

مامۆستا (مستەفا نەریمان) ئاوا باس دەکات:

(دەوڵەتی عوسمانی ساڵی (١٣٠٠)ی کۆچی سەربازگە (قشلە) یەکیان لەپاینی شاخی (باوە شاسوار) دروست کرد کە (٤٠) ژوورو داڵان و حەوشەیەکی گەورەو تەویلەیەکی تیادا بوو، لەسەردەمی داگیرکەری بەریتانیاشدا ساڵی ١٩١٩ ئینگلیزەکان سەرایەکی دوو نهۆمی یان لەرۆژئاوای شارەوە بە بەردو قسڵ دروست کردو بانیشیان بەئاسن و بورغو قایم کرد تا ساڵی (١٩٧٢) یش هەر سەرای حکومەت بوو[٢١].

هەر بەو جۆرە سەرایان لە (چەمچەماڵ)و (شوان)و گەلێك شوێنی تر لەو جۆرە تەرزە دروست کردبوو.

* کۆشکەکەی دارا بەگ:

((بریتییە لەکۆشکێکی جوان و رێك و پێك، کە لەساڵی ١٩٢٦ دروست کراوە لەلایەن ئەندازیارێکی ئینگلیزەوە، کە بریتییە لەدوو نهۆم و پانێتی کۆشکەکە (٢٥٠) مەترە)).

ئەگەر لەرووی بیناکارییەوە سەیری ئەو کۆشکە بکەین دەبینین کە تێکەڵاوییەکی بیناکاری هونەری ئیسلامی و هونەری بیناکاری ئینگلیزی تێدا بەکارهێنراوە، لەبەکارهێنانی کۆڵەکەی چوارگۆشەیی و کەوانەی چەماوەو بەکارهێنانی خشت لەدروست کردنیدا، هەروەها دروست کردنی پەنجەرەی سەر کەوانەیی و تێك هەڵکێشی بەشیش و دار لەگەڵ بەکارهێنانی پەنجەرەو دەرگای گەورەو فراوان تا بگونجێت لەگەڵ رووی بیناکاری نێوان ساڵانی (١٩١٧-١٩٤٠)[٢٢].

ئەوەی لەم بیناکارییەدا بەرچاوە دەکەوێت تایبەتمەندی راکێشانی کارەبایە بە رێگای ئیش پێکردنی ئاشێك لە نێو خانووەکەدا.



کۆشکی دارا بەگ



کۆشکی دارا بەگ

*** وێستگەی شەمەندەفەری کەرکوك:**

ئەمیش بریتییە لەتێکەڵاوییەکی بیناکاری و سازدانی بەکارهێنانی هەریەکێکی لەرووی تەرزی بیناکارییەکەوەو نەخشاندنی تەرزی بیناکارییەکە بەخشتی سوورەوەکراو.



شەمەندەفەری کەرکوك

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

(١) گۆڤاری (آفاق عربیة)، ژمارە ١٠، ١٩٨٠، ساڵی پێنجەم، حوزەیران، لاپەڕە ٦٤، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(دراسة في عمارة العراق بين الحربين ١٩٢٠-١٩٤٠)، د. خالد السلطاني.
(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦٥).
(٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦٦).
(٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦٧).
(٥) بڕوانە:
(ابراهيم خان ثائر من كوردستان)، موکەڕەم تاڵەبانی، چاپخانەی ئەسعەد - بەغدا، ١٩٧١. یان:
(شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ)، مستەفا نەریمان.
(٦) گۆڤاری (آفاق عربیة)، ژمارە ١٠، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٧٥).
(٧) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٧٦).
(٨) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٧٦).
(٩) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٧٩).
(١٠) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٨١).
(١١) گۆڤاری (آفاق عربیة)، ژمارە ٤، ساڵی دەیەم، کانونی یەکەم، ١٩٨٤، لاپەڕە ٦٥، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(دراسة فی عمارة الخمسینات في العراق)، د.خالد السلطاني.
(١٢) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٦٦).
(١٣) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٦٧).
(١٤) (العمارة الحديثة في العراق، تحليل مقارن في هندسة العمارة والتخطيط)، ئەندازیار عەقیل نوری مەلا حوێش، (دار الشؤون الثقافية العامة)، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٨، لاپەڕە ١١.
(١٥) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٦٢).
(١٦) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٦٤،٦٥).
(١٧) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٩٨).
(١٨) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٧٨).
(١٩) گۆڤاری (العربي الكويتي)، ژمارە (٥٣)، نیسان، ١٩٦٣، لاپەڕە ٥٦، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(کرکوك)، سەلیم زەبال.
(٢٠) (الفن المعماري والهندسة التشكيلية العامة في المساجد الاسلامية والمراقد المقدسة)، شاکر هادی غەزەب، لاپەڕە ٥٦.
(٢١) (بیرەوەرییەکانی ژیانم)، مستەفا نەریمان، بەغدا، ١٩٩٤، لاپەڕە (١٣،١٤).
(٢٢) گۆڤاری (ڕەنگین)، ژمارە ١٤٧، نیسان، ٢٠٠١، لاپەڕە (٢٦)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(هەوارگەی دڵان و گوڵاڵەی دەشتی گەرمیان ناوچەی حەوتەغار)، ئیدریس هەفتەغاری و حەسەن عەلی.

# بەشی شەشەم

## چەند لایەنێکی بیناکاری ناوچەی کەرکوك

لێرە بە دواوە هەوڵدەدەم کە چەند لایەنێکی بیناکاری وڕووی شارستانی تەرزی ئەو بیناکاریانە بخەمە ڕوو وەکو بازاڕو قەیسەری‌وخان وکاروانسەراو کارێز وئاسیاوو دیوەخان وگەرماو.

* بازاڕ:

دەتوانین بازاڕ بە یەکێك لە ڕووە شارستانییەکانی تەرزی بیناکاری دابنێین، کە دەورێکی کاریگەری هەیە لە پێشکەوتنی کۆمەڵگەو پەیوەندییە ئابووری‌و کۆمەڵایەتییەکاندا.

کەرکوك دادەنرێت بە یەکێك لەو شارە کۆنانەی کە خاوەنی چەندەها لایەنی بیناکاری بازاڕە کە ئەویش پەیوەستە بە گۆڕان‌و پێشکەوتنی شارەکەوە.

یەکێك لە ڕووە سەرەکییەکانی شار ئەوەیە کە شێوەیەکی بازرگانی هەیە، هەندێك لە لێکۆڵەرەوەکان ئەوەیان لا راستەکە گەشە کردنی شار لە بنەڕەتدا پەیوەستە بە بنکەی ئاڵوگۆڕ کردنی بازرگانییەوە، هەروەها گەشە دەکات لە بە یەك گەیشتنەوەی ڕێگاکانداو بازاڕ دادەنرێت بە یەکێك لە چالاکییەکانی بازرگانی، ئەویش بە شێوەو قۆناغی جیاوازی جۆر بە جۆر، کە ڕەنگدانەوەیەکی ڕاستەوخۆی هەیە بە سەر بەڕێوەچوونی بازاڕ وجۆرە کانیدا.

ئەگەر سەرنجی ناوچەکانی وەکو کەرکوك بدەین دەبینین کە یەکێك لەو هۆیانە، ئەوەیە کە ڕوویەکی بازرگانی هەیەو دەتوانین بڵێین هەر ئەو ڕووە، بۆتە هۆی گەشە کردنی شارو لەگەڵ خۆیدا جمو جووڵی بازاڕیش گەشەی کردووە.

دەتوانین بازاڕ دابنێین بە یەکێك لە هێڵەکانی لێك گەیشتنی شارستانی لە نێوان کۆمەڵگەی شارو کۆمەڵگەی لادێدا. بازاڕ لەسەر چەند بنەمایەك دامەزراوە وەکو بنەمای شوێن‌و دانیشتوان‌و بنەمای سەرمایە[1]، هەر لەبەر ئەمەیە کار تێکردنی بنەماکانی، دەوری کاریگەری بینیوە لە ڕووی بیناکارییەوە، چونکە ئەگەر شوێنی بازاڕەکە لە ڕووی گرنگییەوە بایەخی هەبێت، ئەوا بەهەمان جۆر لە ڕووی بیناکارییەوە بایەخی پێدەدرێت. یان فراوان‌و پانتایی زیاتر داگیر دەکات بۆ ئەوەی پێویستییەکانی دانیشتووان پڕبکاتەوە. یان ئەگەر سەرمایە یەکی چڕی هەبێت پێویستی لەوە دەچێتە دەرەوە لە بازاڕێکی بچووك بەڵکو لە نەخشەیەکی گەورەتر لە بازاڕ خۆی دەبینێتەوە کە ئەویش قەیسەرییە.

ئەگەر سەیری ناوچەکە بکەین دەبینین نموونەی لەم جۆرەمان زۆر زۆرە وەکو گۆڕینی بازاڕی حەسیرە کۆنەکە بە بازاڕێکی گەورەتر بەهەمان ناو یان کردنەوەی بازاڕی تر لە تەك بازاڕی قەیسەرییەکەو بازاڕی عەسری‌و بازاڕی (قاڕی بازاڕ).

جیاوازی سروشتی چالاکییە بازرگانییەکان لە شارە جۆربەجۆرەکاندا. دەورێکی گرنگی هەیە لە ئەگەری گۆڕانی چالاکی بازرگانی ودروست کردنی بازاڕی تازە لە جێگەی ئەوانەی پێشوودا[2]. هەر وەکو ئەو پەیوەندییەی نێوان (کفری)و (کەرکوك)و (ئاڵتون کۆپری)و (سلێمانی) و (چەمچەماڵ)، کە پەیوەندییە بازرگانییەکانی نێوانیان کاریگەری خۆی بینیوە لە سەرهەڵدانی جۆرەها بازاڕی تازە لە ناوچەکانیدا.

گەلێك بۆ چوون دەور دەبینێت لە دابەشکردنی بازاڕ بۆ ئەوەی هیچ زیانێك بە خاوەن بازاڕەکان وخەڵکی گشتی بازاڕەکە نەگەیەنێت.. ئەویش لەدابەشکردنی جۆری پیشەو کەرەستەی بازاڕەکەدا لە ناو شار. کاریگەری خۆی هەیە لە ڕێکخستن‌و دابەشکردنیدا کە هەندێکی وای لێ دێت بگوێزرێتەوە بۆ دەرەوەی شار[3]. بەڵام ئەگەر سەیری بازاڕەکانی کەرکوك بکەین ئەم کاریگەرییە بەو جۆرە نییە وتاڕادەیەك هەمە چەشنی هەیە لە دابەشکرد نەکاندا.

نەخشەی بازاڕ بە شێوەیەکی وا دەکێشرێت کە لەگەڵ

خواستەكانی بیناكاری شارەكەدا بگونجێت هەر لەبەر ئەمە دەبینین نەخشەیەكی نەگۆڕ نییە بۆ نەخشەی بیناكاری بازاڕ، ئەوەی كە هەیە خۆی لەو چوار چێوەیە دەبنێتەوە هەر بۆیە ئەو گۆڕانەش خۆی دەبینێتەوە لە چوارچێوەی گەشە كردنی بارودۆخی ئابووریدا.

هاتن و بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام گۆڕانێكی گەورەی دروست كرد لە بنەما سەرەكییەكانی بازاڕدا كە تاڕادەیەك جیاوازە لە شێوەی بیناكاری بازاڕی لەوەو پێشەوە.

دەبینین كە شێوەی بازاڕ لە وڵاتی ئیسلامیدا پەیوەستە بە جۆرەها شێوەی بیناكاری كە بەستراوەتەوە بە هۆكارەكانی گەشە كردنی ئەو شارەو دەوری لە چوار چێوەی بیرو باوەڕەكانی ئایینی ئیسلامیدا، هەر بۆیە ئەم كارە بە تەرزی شێوەیەكی بیناكاری كۆمەڵگەی ئیسلام دروست كراوە، لەهەمان كاتدا خواستنی ئەوەی كە هەبووە لە بیناكاری بازاڕ لە سەردەمەكانی پێش ئیسلام وەكو بازاڕی بیزنتی و ڕۆمانی وساسانی وجۆرەهای تر كە لەگەڵ ئایینی ئیسلامدا بگونجێت. هەر لەبەر ئەمەیە هەندێك لە لێكۆڵەرەوەكانی وەكو (سوفاجیە) و (ستێرن) بۆ ئەوە دەچن كە نەخشەكانی شارەكانی وڵاتە ئیسلامییەكان وەرگیراوە لە نەخشەی شارەكانی (یۆنان) وەكو شەقام و بازاڕو نەخشەی شوێنە گشتییەكان..، ئەگەر سەرنجی ئەم ڕاستی بدەین دەبینین كە ڕەگی نەتەوەكانی پێش ئیسلام لە ناوچەی كەركوكدا بە جوانی بە دیار دەكەوێت بەڵام ئەوە جێگەی باسە پیرۆی نەخشە كێشانی بازاڕو بیناكاری لە سەردەمی عەباسییەكاندا گەشەی كردو پێش كەوت و شوێنێكی بەرچاوی بە خۆیەوە دیت[٤].

نموونەی ئەم جۆرە پێشكەوتنەمان قەیسەرییەكەی سەر قەڵایە كە لەكاتی خۆیدا جێگەی ئاڵوێر كردنی خوری بووە. كە لەوانەیە نموونەی لەو جۆرە زۆر بێت بەڵام پاشماوەكانی تاكو ئێستاكە نەدۆزاوەتەوە.

ئەگەر سەیری شاری كەركوك بكەین بازاڕ دەكرێتە دوو بەشەوە بەشی ڕۆژهەڵات و بەشی ڕۆژئاوا، بازاڕەكانی بەشی ڕۆژهەڵاتی بریتییە لە (بازاڕی گەراج حەویجە) و (بازاڕی قاڕی بازاڕ)، (بازاڕی مریشك فرۆشەكان) و (بازاڕی گەنم فرۆش) و بازاڕی تەنەكەچییەكان) و (بازاڕی قەیسەری) (بازاڕی حەسیرەكە) و (بازاڕی جووت قاوە) و (بازاڕی ئاسنگەران) و (بازاڕی شەقامی سەڵاحەدین) و (بازاڕی ئیسكان) و (بازاڕی ئازادی).

بازاڕەكانی بەشی ڕۆژئاوای بریتییە لە (بازاڕی عەسری) و (بازاڕی ئاڵتون چی) و (بازاڕی ئەحمەد ئاغا) و (بازاڕی قۆریە) و (بازاڕی شەقامی الجمهوریە) و (بازاڕی حەمدانی) و (بازاڕی حەسەن ئەجم)، (بازاڕی شەقامی ئەوقاف).

ئەگەر بێتو سەیری هەردوو بەشەكەی بكەین دەبینین كە پەیوەستییەكی شادەماری گرنگ هەیە لە نێوان ڕۆژ هەڵات و ڕۆژئاوایدا[٥].

ئەگەر لە ڕووی بیناكارییەوە سەیری بكەین دەبینین كە بریتییە لە دوو بەش، بەشێكی شێوەی دروست كردنەكەی كۆنەو پاشماوەی ئاسەواری گرنگی هەیە، بەڵام بەشەكەی ڕۆژئـاوای لە ڕووی بیناكارییەوە هەمووی تازە بابەتەو تەرزی ئەو تۆی نییە[٦] كە بابەتەكانی كۆن بێت، نموونەی ئەمە قەیسەری سەر قەڵا و قەیسەری جووت قاوەیە كە دوو شێوازی بیناكاری كۆنن كە خاوەنی ڕابردوویەكی سەردەمی عەباسی و عوسمانییەكانە، قاڕی بازاڕیش نموونەی وەكو ئەوانەیە، بەڵام بنەڕەتەكانی تەرزی بیناكاری لە دەست داوە، بەهۆی ئەوتازەكارییەی كە چەند جارێك بەسەریدا هاتووە، بۆ فراوان كردنەوەی.

دەتوانین چەند سەرنجێك بخەینە ڕوو دەربارەی بیناكاری بازاڕ لە شاری كەركوكدا:–

١. ئەگەر سەیری ڕووی بیناكاری بازاڕ بكەین، دەبینین كەوتۆتە ژێر كاریگەری گۆڕانە مێژوویییەكان و وەرچەرخاندنی سەردەمە ئیسلامییەكان، هەر ڕەگی قۆناغەكانی پێش ئیسلامی تێدا ڕەنگی داوەتەوە.

٢. لێرەدا خاڵێكی گرنگ هەیە، ئەویش دروست كردنی قەڵایە لە ڕووی بیناكارییەوە، لە سەرەتادا تەنها شوێنی ئاوەدان بریتی بووە لە قەڵا، بۆیە هەموو دامو دەزگاكانی كارگێڕی و بەڕێوەبەرێتی لە نێو قەڵادا بووە، لە سەردەمەكانی پێش ئیسلامدا بازاڕ لە نێو قەڵادا بایەخی تایبەتی هەبووەو شێوازێكی فراوانی خۆی وەرگرتووە، دوای ماوەیەكی تر ئاوەدانی كەوتۆتە دەرەوەی قەڵاو لەگەڵ خۆیدا بازاڕ لە دەوروبەری قەڵادا ئاوەدان كراوەتەوە.

٣. خاڵێكی گرنگ هەیە، ئەویش شوێنی جوگرافیایی كەركوكە، كە وای كردووە زیاتر بایەخ بدرێت بە بازاڕو خان و كاروان سەراوو قەیسەری، چونكە گرنگی شوێنەكەی وای كردووە كە ببێتە هۆی پێكەوە بەستنی ناوچەكانی هەولێرو سلێمانی وكفری و خورماتوو و داقوق بە یەكترییەوەو ئاڵو گۆڕە بازرگانییەكانی تێدا گەشە بكات.

٤. كارتێكردنی گۆڕانە سیاسییەكان لە ناوچەكەدا دەورێكی گرنگی بینیوە، لە گۆڕینی تەرزی بیناكاری بازاڕدا، ئەوەیش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە كە ئەم جۆرە تەرزانە كەوتۆتە بەر كارتێكردنی ڕووداوە سیاسییەكان، دەبینین بۆتە هۆی لە دەست دانی بنەمایەكی زۆری بیناكارییەكەیان، یان گۆڕانی تەواوی بەسەردا هاتووە، یان تەنها پاشماوەیەك چییە بۆمان بەجێنەماوە بۆیە ئەوەی سەرنج دەدرێت نەبوونی زۆری تەرزی بیناكاری ونەخش ونیگارەكانێتی لە هونەری بازاڕو قەیسەری وخاندا.

٥. ئەگەر سەرنجی بازاڕ بدەین دەبینین شێوەی پیشەكاری جیا.. جیای هەبووە، وەكو ئەوەی بازاڕ هەبووە تایبەت بووە بەیەك جۆرە كەلوپەلی بازرگانی، بەڵام لە سەردەمێكی تردا بۆتە جێگەی مامەڵە كردنی جۆرەها كەلوپەلی بازرگانی.

٦. ئەوەی جێگەی باسە لە بازاڕدا لە شارەكە بوونی زۆری قەیسەرییە، كە ئەویش دادەنرێت بە بنكەیەكی فراوانی بازرگانی.

٧. ئەو كەرەستانەی كە بەكار هاتووە لە هونەری بیناكاری بازاڕا بریتی بووە بەزۆری لە بەردو گەچ و خشتی سوورەوە كراوە ومەڕمەڕو دارو تەختە، لەگەڵ بەكار هێنانی ڕەنگ لە نەخشاندنی نەخش و نیگاردا.

٨. زیاتر ئەو نەخشانەی بەکار هاتووە بریتی بووە لە نەخش‌ونیگاری ڕووەکی وڕازاندنەوەی لە چوار چێوەی جۆرەها وێنەی جۆر بە جۆر.

*** خان - کاروان سەرا :**

یەکێك لەو دیاردە شارستانییەی هونەری بیناکاری هونەری خان وکاروانسەرایە لە ناوچەی کەرکوکدا.، دەتوانین بە لایەنێکی گرنگی بیناکاری‌وئابووری وباری کۆمەڵایەتی دابنێین.

خان ڕوویەکی پەیوەستە بەگەشەی ئابوورییەوەو شوێنەکان دەوریان هەیە لە دروست بوونی خاندا، ئەویش بۆ ڕاپەراندنی کاروباری ئابوورییەکان، ئەو ناوچانەی کەوتوونەتە سەر ڕێگا بازرگانییەکان، شوێنێکی گرنگیان هەیە لە پێگەیاندنی بیناکاری خاندا.. لەبەر گرنگی خان زۆرتر بایەخ دەدرێت بە بوونی تەرزی بیناکارییەکەی‌و هەولدەدەن کە ڕێژەیەکی زۆر جێگەی کەلوپەلی بازرگانی تێدا بێت.

ئەگەر بگەڕێینەوە سەر مێژووی خان دەبینین مێژوویەکی دووردرێژی هەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێکی زۆر زوو. لە سەردەمی کۆن ئەم خانانە جێگای حەوانەوەی گەشت کەران بووە بۆ هاتوچۆ، لە هەزارویەك شەوەدا هاتووە دەربارەی بە کرێ گرتنی فلانەکەس لە ژوورێك لەخان دا(٧). هەر لەبەر ئەمەیە سەردەم لە دوای سەردەم بایەخی خۆی هەبووە.

کەرکوکیش وەکو هێلێکی گرنگی بازرگانی کاروان سەرا دەورێکی گەورەی بینیوە لە دروست کردنی خاندا، بۆ ئاڵوگۆڕ کردنی کەلوپەل وحەوانەوەی بازرگانەکان، چونکە هێلی پێکەوە بەستن بووە لەگەڵ ناوچەکانی (سلێمانی) و (هەولێر)و (موسڵ)و (بەغدا)، بۆیە ناوچەکانی (پردێ)و (چەمچەماڵ)و (خورماتوو)و (داقوق)و (کفری)، ڕێگەی ئەو پێکەوە بەستنە بووە لەگەڵ خوارووی عێراقدا.

دەتوانین خانەکان بکەینە دوو بەشەوە، جۆرێکیان لە ناو شارەکانە ئەویش لە نزیکی بازاڕەوەیە کە وەکو بنکەیەکی بازرگانی گرنگ. ئەم جۆرە خانانە پێك هاتووە لە چەندەها ژوور بۆ شوێنی هەلگرتنی کەلوپەلە بازرگانییەکان وجێگەی ئەوانەی کە لەوێ دەمێننەوە، تا کەلوپەلە کانیان ساغ بکەنەوە.

جۆری دووەمیان بریتییە لەو خانانەی کە لەسەر ڕێگا دەرەکییەکان دادەنرێت، ئەویش بۆ حەوانەوەی خەلکی کە بۆ ماوەیەکی کەم دەمێنێتەوە، ئنجا دەڕۆن بۆ شوێنی مەبەست(٨).

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت لە کاتی خۆێدا هەندێك لە خانەکان جێگەی هەلگرتن‌و فرۆشتنی تەنها یەك شێوە کەلوپەلی بازرگانی بووە.. وەکو ئەوەی جێگەی ئالووێری (خورما) یان (دانەوێلە) یان کەلوپەلی تر بووە، وەکو خان خوورما لە کەرکوك جێگەی کڕین‌و فرۆشتنی خوورما بووە.

گەلێك جارخان هی پیاوێکی دەولەمەندی شارەکە بووە، بۆیە ئەو پیاوە لەو شارەدا گرنگی بینیوە لە برەوی کاروباری خانەکەدا. هەروەها خان دەورێکی گرنگی بینیوە لە ڕووی بەڕێوەبەرییەوە، ئەویش پێویستی بە چەند کەسێك هەبووە بۆ پارێزگاری‌و بەڕێوەبەری خانەکە وەکو کۆلْ هەلگرو خانچی وپاسەوان‌و دەرگاوان وپاککەرەوەی خان‌و بەرپرسی خان.

ئەگەر لە ڕووی بیناکارییەوە سەیری بکەین، بریتییە لە داگیر کردنی پانتایەکی فراوان لە زەوی بۆ ئەوەی بتوانرێت بە شێوەیەکی ڕێکوپێك هەموو پێویستییەکانی بیناکاری تێدا دروست بکرێت وەکو ژوورو هەیوان وهۆڵ‌و حەوزو ئاخوڕ وشوێنی پاسەوان‌و نێشککر ومیوانی خان.

زۆری ئەم خانانە لە گەچ وبەرد دروست کراوە شێوەیەکی تاڕادەیەك چوار گۆشەیی هەیە، کە ناوەڕاستی بریتییە لە حەوشەیەکی گەورەو، لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا بیرێکی قووڵ هەیە بۆ پێویستی بە دەست هێنانی ئاو بۆ خانەکە، ژمارەیەك ژوورو هەیوان بەسەر ئەم حەوشەیەدا دەڕوانێت، هەیوانەکان داپۆشراوە بەگرێی نووك تیژ کە دروست کراوە لە بەردوو گەچ یان کۆڵەکەکانی لە مەڕمەڕ ڕازاوەتەوە، هەروەها سەکۆ هەیە لە خاندا بۆ نوێژکردن، کە ئەویش بەرز دروست کراوە لە حەوشەی خانەکە، خان شوورەیەکی بەرزی بۆ کراوەو بورجی لەسەر دروست کراوە بۆ پارێزگاری کردن بە تایبەتی ئەو خانانەی لە دەرەوەی شارن.

هەموو خانێك دەروازیەکی گەورەی هەیە، لە هەندێکی تردا چەند دەروازەیەکی تری هەیە لە تەنیشتەوە یان لە پشتەوە بۆ ئاسان کردنی هاتوچۆ. کە نموونەی لەم جۆرە لە خانەکانی کەرکوك‌و کفریدا بەرچاو دەکەوێت زەوی حەوشەوژوورەکانی خانەکان داپۆشراوە بە چینێکی چاك لە خۆڵ ئینجا بەخشتی سوورەوەکراو بۆ ئەوەی دوور بێت لە وەرگرتنی شێ‌و زیان بە کەلووپەلە بازرگانییەکان.

زۆری بنمیچی خانەکانی کەرکوك لە شێوەی گومەت دروست کراوە زۆر کەمی هەیە بە شەلمان‌و گەچ وبەرد دروست کرابێت، ئەویش ئەو خانانەی کە لە دوای شەڕی جیهانی یەکەم دروست کراوە، بەلام هەموو خانەکان (کۆنەکان)، بە شێوەی گرێ، کۆڵەکە وگومەت بنیات نراوە.

زۆری خانەکان ڕازاوەتەوە بە ژمارەیەکی زۆر پەنجەرەی دروست کراو لە شیش ودار یان لە شیش وتێك هەلکێش کراوە لە بەردی مەڕمەڕ، کە چوار چێوەی پەنجەرەکان بە نەخشی جۆراو جۆر ڕازاوەتەوە، بریتییە لە نەخشی ڕووەکی لە شێوەی لقی داروگوڵ وئەستێرە.

زۆری دەرگای خانەکان چوار چێوەکەی لەمەڕمەڕ دروست کراوەو دەرگاکانی لە دار دروست کراوە کە بە زۆری داری گوێزو داری تووە، بۆ ئەوەی بەرگەی گەرما و سەرما بگرێت، دەرگاکان یان سادەیە وبە بزماری سەرگەورە ڕازاوەتەوە، یا ڕازاوەتەوە بەنەخشی دروست کراو لە دار وشێوەی جۆر بە جۆر.

خانەکانی ناوچەی کەرکوك بریتین لە دوو چین (نهۆم) کە دابەش کراوە بە سەر کۆمەلێك ژوور کە دەڕوانێتە سەر ڕاڕەوێکی درێژ بە درێژایی ژوورەکان، ڕاوەستاوە لەسەر کۆڵەکەی جۆراوجۆر هەیانە شێوە کەوانەیی یان چوار

گۆشەیی، کە هەموویان دەڕوانن بەسەر حەوشەی خانەکەدا.

(مێجەرسۆن) لە کاتی گەشتەکەیدا بۆ کەرکوك ئاوا باسی دوو نهۆمی خانی کەرکوك دەکات:-

...... بەلام تەنیا لە دوونهۆم هۆدەو هەیوان پێك هاتبوو[٩].

خانەکانی ناوچەی کفریش بریتی بووە لە حەوشەی پان وبەرین وچەند ژوورێك هەندێکی تەرخان کرابوون بۆ میوان وخاوەن ولاغەکان، ئەوانی تریش بۆ تەویلەو ئاخوڕ.

"ئەگەر سەیری دروستکردنی خانەکان بکەین دەبینین لە دوو بەش پێکهاتوون، بەشی یەکەم لە خانەکان بریتییە لەو خانانەی کە لە سەرە ڕێگا دەرەکییەکان دروستکراوە بۆ ڕێگای هاتووچۆکەرانی بازرگانی ناوچە سنوورییەکان، یان ماوەی نێوان شارێك بۆ شارێکی تر کە دوورییەکانیان لە نێوان ماوەی ڕۆژە ڕێیەك بێت بە پیادە لە وێستگەی خانێك بۆ خانێکی تر، خان بە زۆری لە و جێگایانە دروست دەکرا کە سەرچاوەی ئاوی لێ نزیك بوو.

لەم جۆرە خانانەدا خزمەتگوزاری پێشکەش بە کاروانچییەکان دەکرا، پشوویان دەدا تاوەك لە ماندووبوونی ڕێگە بحەسێنەوە بۆ پاراستنی کەلوپەلەکانیان لە جەردەو ڕێگری شەوانە، لەگەڵ بوونی کۆگا بۆ کەلوپەلەکانیان، بوونی تەویلە بۆ ئاژەڵە بارهەڵگرەکانیان ئەم تەویلانە بۆ ئەسپ و حوشترو جەڵەبی مەڕو ماڵات بەکاردەهات، هەروەها دابین کردنی ئالیك تێیاندا، بەلام بە پێچەوانەی گوندرێژەکان کە زۆر گرنگی بە داکردنیان نەدەدرا لە خانەکاندا، لە ناوەندی حەوشەی خانەکاندا حەوزی ئاو بەکار دەهات بۆ خواردنەوەی مرۆڤەکان و بەکاریشیان دەهێنا بۆ ئاژەڵان، بوونی فڕنی نانکردن و تەنوور تیایاندا، شوێنی نوێژکردن لە شێوەی مزگەوتی بچووکدا، هەروەها هەبوونی گەرماو، جگە لەوەش ئەو کەرەستە مادییانەی کە بەکاردەهێنرا لە دروست کردنی بیناسازی خانەکاندا جیاوازە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، لە بەکارهێنانی خشتی قوڕین یا خشتی سورەوەکراو.

بەلام جۆری دووەم لە خانەکان بریتی بوو لەو خانانەی لە ناوەندی شارەکان بوو، ئەوەی جێگەی سەرنجە لە رووی بیناکارییەوە ئەم خانانە قەبارەیان بچووك تر بوو لەو خانەکانی جۆری یەکەم.

ئەم خانانە دروست دەکران بە شێوەیەکی فراوان تر، کاری کڕین و فرۆشتنی کالا بازرگانییەکانی تیادا دەکرا، بەلام خانی سەرە ڕێگا دەرەکییەکان تەنها وێستگەیەك بوو بۆ تێپەڕبوونی کاروانچییەکان، خانە ناوخۆییەکان بازاڕێکی گرنگی ناوشارەکان بوو بۆ ئالوگۆڕی بازرگانی و ناردنە دەرەوەی ئەو بەرهەمە ناوخۆییانەی کە لە ناوچەیەك یان شارێك لە ڕێگەی بازرگانییەوە دەنێردران و بووبوونە هۆی گەشەسەندنی چەندین شاری گەورەی بازرگانی، خانی ناو شارەکان لە هەندێك تایبەتمەندیدا هاوبەشی لەگەڵ خانە دەرەکییەکان هەبوو. لە رووی پێشکەش کردن خزمەتگوزارییەکان وەك گەرماوەکان لە ناو شارەکاندا نزیك بە خانەکان دروست دەکران چونکە ئەو ڕێبوارانەی کە لە ڕێگە دوورەکانەوە دەهاتن ماندوو بوون و پیس دەبوون بە تۆزو خۆڵی ڕێگەو مانەوەیان بۆ چەند هەفتەیەك لەناو شارەکاندا، پێویستییان بە خزمەتگوزاری بوو[١٠].

*** خانەکانی ناوچەی کەرکوك:**

**(١) خانی قازی:**

دەربارەی دەرگای ئەم خانە، مامۆستای هێژا (عەبدولرەقیب یوسف) ئاوا دەگێڕێتەوە:-

کاك حەسەن ڕۆژێك لە سالی ١٩٨٢ بە منی گوت، لە سالی (١٩١٢)دا دەرگای شوورەی دەربەندی بازیان هەر لەو دەربەندە کەوتبوو، بەلام هەندێك لە خەلکی کەرکوك هاتن بردیان بۆ کەرکوك، خستیانە بەر دەرگای خانێك لە خانەکانی، منیش لەو کاتەوە کەوتمە تەعقیبی ئەم دەرگا مێژووییە لە کەرکوك تا بیستم ئەو خانە (خانی قازی) بەو ڕووخێنراوە، تا ڕۆژی (٣١)ی ئابی سالی (١٩٨٥)، چووم بۆ دیتنی شوێنی خانەکەو یەکێکی زۆر شارەزام لە وێ دیت کە کاك (جەمال بەهجەت)ە کە خانی (سەید نورەددین)ی بە ئیجار گرتووەو بەمنی گوت ئەم ئەرزەی کە ئێستا دەیبینین بەرامبەر ئەم خانەی (سەید نورەددین) جێگەی خانی قازییە ومالمان لە نێو خانەکەدا بوو لەگەل هەندێك مالی تریش تا کاتی ڕووخاندنی لە حەفتاکاندا. زۆر جارم لە باوکم و کوێخا قادری موختاری گوندی تەکیەی بەردەمی بازیان کەدەهاتنە مالمان، بیستووە دەیان گوت:-

ئەم دەرگایە دەرگای شوورەی بازیانەو، بەمنی دەگوت دەرگاکە زۆر گەورە بوو، لە دار گوێز بوو مێخی گەورەی پێوەبوو، جێگەی دەرگای خانەکەشی بۆم دەست نیشان کرد وگوتی گوایە بە شۆفل ڕووخێنراوەو دەرگاکە لە ژێر گلی خانەکەدا ماوەتەوە.

جێگەی ئەم خانی قازییە دەکەوێتە تەنیشتی (مزگەوتی فەرهاد - جامع النعمان)و لە لای خانی (حاجی محەمەدی قەرزدار-خانی گچکە)و خانی سێ دەری وخانی سەید نورەددین وهەموو بەرامبەر یەکێ لەو سێزدە خانە کە دەکەونە بەر سنگی قەلاتی کەرکوك لەلای باشوور وباشووری ڕۆژهەلاتی[١١].

**(٢) (خان خورما)**

**(٣) خانی بەلەدیە (شارەوانی):**

ئەم خانە لە دوو چینی گەچ پێکهاتبوو، لە سالی (١٨٨٢) دروست کراوە، کەوتووە نێوان خانی قیردارو ڕووباری خاسە، دەروازەی خانەکە بەرەو ڕووی ڕووباری خاسەیە، ئەو ڕێگایەی کە بەرەو لای گەڕەکی چای و موسەللا دەڕوات، ئەم خانە لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو ڕووخێنراوەو لە جێگەی بازاڕێکی سەردەمیانە لە دوو چین دروست کراوە، کە یەکێکیان بە شیش و چیمەنتۆ دروست کراوە، قاپی بازاڕ دەکەوێتە ناو ئەم بازاڕەوە.

**(٤) خانی گومرگ**

**(٥) خانی ئەسعەد بەگ**

**(٦) خانی گوڵبانی (خانی حاجی قادر گوڵبانی)**

**(٧) خانی چوقور**

**(٨) خانی گاورەکان**

**( ٩ ) خانی قاسم بەگ**
**( ١٠ ) خانی عەبدوڵڵا موسڵاوی**
**( ١١ ) خانی حەمدی بەگ**
**( ١٢ ) خانی تەها بەگ**
**( ١٣ ) خانی دەدە حەمدی**
**( ١٤ ) خانی شێخ حەسەن**
**( ١٥ ) خانی ئەوقاف**
**( ١٦ ) خانی سادق سەڕاف**
**( ١٧ ) خانی سەید عۆم**
**( ١٨ ) خانی قۆریە**
**( ١٩ ) خانی سەید نورەددین**
**( ٢٠ ) خانە سپی**
**( ٢١ ) خانە قوونە**
**( ٢٢ ) خانی حاجی ڕەفیق**
**( ٢٣ ) خانی ئەڵڵا وێردی**
**( ٢٤ ) خانی شۆر حەمام**
**( ٢٥ ) خانی کوردستان**
**که خاوەنەکەی ناوی (محەمەد فەتحوڵڵا) و ناسراو بە محەمەد کوردستانی بوو.**
**( ٢٦ ) خانی خەبات**
**( ٢٧ ) خانی عومەر ئەحمەد**
**( ٢٨ ) خانی سەیفە کوێر**
**( ٢٩ ) خانی حاجی محەمەدی قەرزدار -خان گچکە**
**( ٣٠ ) خانی سێ دەری**
**( ٣١ ) خان گەو.. گەو**
**( ٣٢ ) خانی ئەوڕەحمان بەگی بابان**
**( ٣٣ ) خانی سەید موحسن ئاغا ( خان خورما )**
**( ٣٤ ) خانی سەید عومەر ئاغا**
**( ٣٥ ) خانی سلێمان ئاغا**
**( ٣٦ ) خانی حاجی ڕەشید**
**( ٣٧ ) خانی حاجی کازم**
**( ٣٨ ) خانی خەنۆوزەکە**
**( ٣٩ ) خانی مەلا عەباس ناسراو بە ( خانی گەنم )**
**( ٤٠ ) خانی سەید موحسن ئاغا ( خانی خوێ )**
**( ٤١ ) خانی کاروانچی**
**( ٤٢ ) خانی قیردار**
**( ٤٣ ) خانی قازی**
**( ٤٤ ) خانی ناسیح بەگ**
**( ٤٥ ) خانی عەبدوڵڵا موسڵاوی**
**خانەکانی کفریش ئەمانەن.**
**( ٤٦ ) خانی حەسەن خەلیفە**
**( ٤٧ ) خانی مەجید پاشا ( خانی پاشا )**
**کە ئەمە لە هەموویان گەورە تر بوو، مەجید پاشای بابان دروستی کردبوو، ئەم کاروانسەرایە بەرامبەر بە قشڵە بوو لەسەر دوو دۆنمە ئەرز دروست کرابوو[١٢].**




**هێلکاری خانی (گەوهەر) چینی یەکەم**




**هێلکاری خانی (گەوهەر) چینی دووەم**



رووکارێکی خانی (گەوهەر)



هێلکاری خانی (هیندیەکان)



خانی (قەڵا)

*** گەرماوەکان:**

"گەرماوەکانی کوردستان لە ناوچەکانی سلێمانیو هەولێرو کەرکوك بە ڕێژەیەکی بەرچاو بڵابونەتەوە، لە جۆرو هێلکاریو بنەمای نەخشەسازیو تایبەتمەندییە هونەرییەکان بە تایبەتی لە بواری دیکۆردا، ئەم گەرماوانەی کوردستان هەر درێژەدادەری گەرماوەکانی تری کوردستانن لە کۆندا کە بۆ سەدەیەك یا دوو سەدە یا سێ سەدە دەگەڕێتەوە.

زۆری ئەم گەرماوانەی کوردستان هاوشێوەن لە جۆری نەخشەسازیو بنەماکانی تەلارسازی لە بواری شێوەی هۆڵە هەشت پایەکانیدا کە بە شێوەی گومەتو حەوزو پەنجەرە رازاوەتەوە.

ئەوەی بەرچاو دەکەوێت لە گەرماوەکان بریتییە لە دوو هۆڵی گەورە لە تەك یەکتری، هۆڵی یەکەم بۆ دانیشتنو خۆ لەبەر کردنە، هۆڵی دووەم بۆ خۆشوشتنە، لە نێوان هەردوو هۆڵەکەدا پاشکۆیەك هەیە بۆ بەستنەوەی یەکتری، لە هۆڵی خۆشوشتندا حەوزێکی هەشت پێیی بۆ ئاو هەیە بە تایبەتی بۆ ئاوی گەرم، هەروەها گومەتەکەی هەشت پێیەو پەنجەرەی هەیە کە بە بۆیەی ڕەنگاورەنگ ڕەنگ کراوە بۆ ئەوەی رۆشنایی لەسەرەوە بێتە ناو هۆڵی خۆششتنەکەوە"[١٣].

دەربارەی هونەری بیناکاری ونەخش ونیگاری گەرماوەکان لە شاری کەرکوك، زانیاری ئەوتومان نییە، کە ئەو ڕووە بخاتە ڕوو، ئەویش لەبەر ئەوەی زۆری گەرماوەکان دەستی پێدا هێنراوە چاك کراوەتەوە لەکاتی چاکسازییەدا هەموو ڕووی تەرزی بیناکارییەکەی لە دەست داوە.

وەکو ئەوەی لە بە ساڵاچووەکان بیستراوە کە گوایە هەندێك لە گەرماوەکان ڕووی نەخش ونیگاری جۆربە جۆر هەبووە ئەویش زیاتر لە هۆڵی دانیشتنی گەرماوەکان بووە نەك لە نێو شوێنی خۆشتنی گەرماوەکەدا بۆ نموونە گەرماوی (حەمام ئاوێنەدار)، هۆڵەکەی ڕازاوە بووبە شووشەی بریقەدار کە لە جۆری شووشەی ئاوێنەدار بوو، بەڵام ئەگەر سەیری دەرگای گەرماوەکان بکەین دەبینین کە ڕازاوەتەوە بە دەرگای داری بزمار ڕێژ کراو چوارچێوەکەی بە بەردی مەڕمەڕ نەخشێنراوە.

زۆری گەرماوەکان لەبەردو گەچ دروست کراوە، تا ڕادەیەکی چاك فراوانی وقەبەیی لە شێوەی بیناکارییەکەیدا بەرچاو دەکەوێت.

دەربارەی گەرماوەکان هەبووە تایبەت بووە بە ژنان هەبووە تایبەت بە پیاوان، یان هەیان بووە لە خزمەتی هەردوو لادا بووە.

*** گەرماوەکانی شاری کەرکوك:-**

**(١) گەرماوی ئاوێنەدار، شوێنەکەی لە تەنیشت قەڵابوو.**
**(٢) گەرماوی موفتی، شوێنەکەی لە تەنیشت قەڵابوو.**
**(٣) گەرماوی گاورەکان، لە شوێن یانەی سۆلافی جاران.**
**(٤) گەرماوی هیندی لە شوێن یانەی سۆلافی جاران.**
**(٥) گەرماوی (حاجی خورشید) لەلای دەباخخانەکە.**
**(٦) گەرماوی (عەلی)، لە گەڕەکی بەرتەکیە.**
**(٧) گەرماوی شێخ قابیل، لە گەڕەکی بەرتەکیە.**
**(٨) گەرماوی عەزیز ئەفەندی.**
**(٩) گەرماوی شەفا.**
**(١٠) گەرماوی بڵاخ.**
**(١١) گەرماوی حاجی باقی.**
**(١٢) گەرماوی حاجی حەسەن.**
**(١٣) گەرماوی شوێر حەمام.**
**(١٤) گەرماوی دەدە حەمدی، لە گەڕەکی (چای).**
**(١٥) گەرماوی عەلی بەگ:**

ئەمە بە یەکێك لە گەرماوە کۆنەکانی کەرکوك دادەنرێت، کە دەگەڕێتەوە بۆ بنەماڵەی (جەلالییەکان) لە کەرکوك کە بە یەکێك لە خانەوادەکانی کەرکوك بەناوبانگن، لەو پاشماوانەی کە جێماوە لێیان بریتییە لە مزگەوتو قەبرسانو گەرماوێك.

بە پێی مێژووی سەر گۆڕستانەکە ساڵی (١٠٣١) ی کۆچی بۆ دانراوە بەرامبەر بە (١٦١٢)ی زاینی، بەڵام ئەگەر بەراوردی زاینییو کۆچییەکە بکرێت ئەوا مێژووی زاینییەکەی دەکاتە ساڵی (١٦٢١)ی زاینیی.

**(١٦) گەرماوی (الجمهورية).**
**(١٧) گەرماوی سەید عەلاوی.**
**(١٨) گەرماوی تەقاوت، لە گەڕەکی (پیریادی)**
**(١٩) گەرماوی (قادر حەمام چی).**
**(٢٠) گەرماوی سەید نورەددین، حاجی سابیر، عەبە کوێر لە شۆریجە.**
**(٢١) گەرماوی ئەحمەد حاجی جەبار -حەسەن پاوانم.**



**ڕووکارێکی گەرماوی (عەلی بەگ)**



گەرماوی دەدە حەمدی




ڕووکارێکی گەرماوی (عەلی بەگ)



ڕووکارێکی گەرماوی (عەلی بەگ)



**گەرماوی (کفری)**








**گەرماوی (حاجی باقی)**

*** دیوەخان:**

**ئەمەش** دادەنرێت بە یەكێك لە لایەنەكانی شارستانی ڕووی بیناكاری شارەكە، كە ڕوویەكی جوانكاری خانووی ئەو **كاتە** بووە لە شارەكەو تایبەت بووە بە ئەو ماڵە دەوڵەمەندانەی شارەكە كە هەردەم جێگەی هاتو چۆو ڕاگرتنی میوان بوونەو هەردەم دیوەخانیان جمەی هاتووە لە خەڵكی دا.

ئەو ماڵانەی كە دەوڵەمەند بوونە بایەخێكی زۆریان داوە بە دروست كردنی ژوورێكی گەورەی لاكێشەیی كە لە (٥×١٠) مەتر كەمتر نەبووە، بەڵكو لەو پێوانەیەش گەورەتر بووە وچەندەها پێویستیو ڕووی بیناكاریو نەخش ونیگاری هەبووە تایبەت بووە بە دیوەخان كە زیاتر لە ژوورەكانی تری ماڵەكە بایەخی پێ دراوە. ئەوەی لە بیناكاری دیوەخان بە بەر چاو گیراوە بریتی بووە لە گرتنی ڕێژەیەكی زۆری خەڵكی وجێنشین كردنی لە بارێكی پێویست.

زیاتر دیوەخان دروست دەكرا لە شوێنێكی دابڕاو لە خانووەكە، بۆ ئەوەی بارێكی هێمن وئارامی هەبێت تێكەڵ بە باری خێزانی ماڵەكە نەبێت. بەكار هێنانی دەروازەی گەورەو دروست كراو لە دەرگای داری بە بزماری گەورە ڕێژ كراوە، لایەنێكی تر ڕازاندنەوەی بنیمچی هۆڵەكە یان دیوە خانەكە بە نەخشی جۆراو جۆر ئەویش بە تایبەتی لە هێڵی بنمیچ وقەراغەكانی بنیمچەكە وڕازاندنەوەی تاقی دیوەخانەكە بە نەخشی جۆراو جۆری وەكو لۆقەندان وڕووی نەخش ونیگاری جۆر بەجۆر.

*** هەندێك لە دیوەخانەكانی كەركوك:**

**(١) دیوە خانی سەید ئەحمەدی خانەقا.**
**(٢) دیوەخانی تەكیەی تاڵەبانی.**
**(٣) دیوەخانی شێخ محەمەد ڕەئوف تاڵەبانی.**
**(٤) دیوەخانی شێخ حەبیب تاڵەبانی.**
**(٥) دیوە خانی بەهائەددین ئەفەندی، لە گەڕەكی سەی سەروەر.**
**(٦) دیوەخانی حاجی مەجید قایەچی، لە گەڕەكی سەی سەروەر.**
**(٧) دیوەخانی حاجی عیزەت، لەگەڕەكی زێویە.**
**(٩) دیوەخانی عومەر ئاغای تەرجلی، لە گەڕەكی پریادی.**
**(١٠) دیوەخانی سدیق بەگ، لەگەڕەكی شاتەری (شاترلو).**
**(١١) دیوە خانی ئەسعەد بەگ، لە گەڕەكی شاتەری.**
**(١٢) دیوە خانی قەرە ئەباح (عەبدولڕەحمان)، لە گەڕەكی ساری كەهیە.**
**(١٣) دیوەخانی نازم بەگ، لەگەڕەكی بەگەكان.**
**(١٤) دیوەخانی ئیبراهیم بەگ، لە گەڕەكی بەگەكان.**
**(١٥) دیوەخانی بورهان بەگ، لەگەڕەكی بەگەكان لەلای گەرماوی (حەمام عەلی).**
**(١٦) دیوەخانی عەلی بەگی تكریتی، لەگەڕەكی حەمام عەلی.**
**(١٧) دیوەخانی مەزهەر بەگی تكریتی، لە خوار سینەما (حەمراء) وە.**
**(١٨) دیوەخانی سەید فەتاحی جەباری.**
**(١٩) دیوەخانی سەید وەلەد كاكەیی.**
**(٢٠) دیوەخانی (محەمەد عەلی سەر بڕاو).**
**(٢١) دیوەخانی (گوڵچین) كە شوێنەكەی لە پشت منارە نەخشینە بووە.**

*** ئاسیاو-ئاش:**

دەتوانین ئاسیاویش بە ڕوویەكی بیناكاری دابنێین، لەبەر ئەوەی توانای ئارەزووی مرۆڤی تێدا دەخرێنە كارو جوانكاری خۆی بەكار دەهێنێت لە دروست كردنی بیناكاری ژووری ئاسیاو ومنارەی ئاسیاو وكەرەستەی ڕاكێشانی ئاو، دروست كردنی چۆنێتی كاركردنی ئاسیاوەكە، كە هەموو ئەمانە پێویستی بە توانا وئاوەز هەیە بۆ ڕاپەراندنی ئاشەكە.

ئەگەر ئاشەكان لە ڕووی بیناكارییەوە سەیربكرێت بریتییە لە ژوورێكی گەورەی لاكێشەیی ومنارەیەك بەشی سێیەمی بریتییە لە كەرەستەی كاركردنی ئاشەكە.. هەموو كەرەستەكان لە ناو ژوورەكەدا بوو بەتەنها تەنووری ئاشەكە نەبێت لە دەرەوە بوو لە بەردەم جۆگای ئاشەكە دروست كرابوو.. ژووری ئاشەكە دابەش كرابووە چەند بەشێك، بەشێكی شوێنی كەلووپەلی ئاش و بەشێكی شوێنی ئاشەوان و بەشێكی تری شوێنی دانانی باراش بوو، هەڵگرتنی بۆ كاتی پێویست تا نۆرەی هاڕینی دێت.

دەربارەی كەرەستەی بەكارهێنراوی بیناكاری لە ئاشەكانی ناوچەی كەركوكدا بریتی بووە لە خشتی كاڵ یان بەكار هێنانی بەرد لە شوێنی پێویست بەڵام زیاتر خشتی كاڵ بەكار هاتووە ئەو كەرەستانەی لە دەوروبەری شارەكاندا بەكار هاتووە بۆ دروستكردنی ئاش زیاتر گەچ وبەرد بووە.

ئەو ئامێرانەی لە دروست كردنی ئاشەكەدا بەكار هاتووە بریتی بووە لەم كەرەستانەی خوارەوە:

تەنوری ئاش، دەم دۆڵ، زەمودك، تۆپی ئاش، پەڕە، بستە، تەوەرەو بەرداش، نێ، پێ ئاش، لوغم، دۆڵیانی ئاش، كەوچكەئاش، چەقەنە، خەردار، بەردی ئاش، گەروو، تەوقی بەرداش.

زۆربەی ئەو ئاشانەی لە ناوچەی كەركوكدا هەبووە بە ئاو گەڕیاوەو زیاتر پشتیان لەسەر ئاوی كارێز بەستووە بۆ بە گەڕخستنی، هەبووە لە ناوچەكانی (قادر كەرەم)و (جەباری) دوو ئاش بە ئاوێك كاریان كردووە.

هەندێك سەرچاوە ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن كە گوایە ئاش هەبووە لە جیاتی ئاو بە هەوا كاری كردووە وەكو ئەوەی دێی (عەلی سەرا)ی ناوچەی كاكەیی لە ناوچەی داقوق كە گوایە لە لایەن محەمەد چۆبانی كاكەیییەوە (١٨٩٠-١٩٣٥)، دروست كراوەو تا ماوەیەكی چاك كاری پێ كردووە..و ناوبانگێكی گەورەی بینیوە لە ناوچەكەدا.)[١٤].

بەرداشیش بریتییە لە دەستاڕێكی بەردی گەورە وخڕو ئەستوورایی (١٠- ١٢)سم ولە ناوەڕستدا كونێكی تیادا دەبێت بە بۆشایی (١٠سم) كە گەنمەكەی تێبچێت بۆ هاڕین وگەورەیی بەرداشەكە بەپێی ئاو زۆریو كەمی دەبێتو خڕیی بەرداشەكە لە بەینی مەترو زیاتر، بەرداش دەبێت دووان بێت یەكێك لە سەرەوە ودووەم لە ژێرەوە[١٥].

بەڵام دەربارەی ئەو بەردانە زیاتر ئەوە وەستای

تایبەتی دروستی دەکرد، خەڵکی ناوچەی کەرکوك زیاتر ئەم بەردانەیان لە سلێمانی و دەوروبـەرەوە دەهێنا بۆ ئەم ئاسیاوانە.

هەندێك لە ئاسیاوەکان منارەی هەبوو بە بالآی (١٠ – ١٥) مەتر بەرزی، کە ئەمیش زیاتر لە خشتی کاڵ و قووڕ دروست دەکرا، کە چەند مەبەستێکی هەبوو لە دروست کردنیدا:

١. گوایە ئەم منارانە لەو شوێنانە دروست کراوە کە دوورە دەست بووە بۆیە ئەمە بەکار هێنراوە بۆ ئاگادار کردنی خەڵکەکە کە گوایە ئاش دەگەڕێت بۆیە هاواریان دەکرد: ئاش بەتاڵ. ئاش بەتاڵ لەکاتی تەواو بووندا.

٢. یان ڕووی بەکارهێنانی بۆ ئەوە بووە کە لە دوورەوە دیار بێت کە ئاسیاو لەو شوێنەدا هەیە و خەڵکەکە پێی بزانن.

٣. یان بەکار هێنراوە بۆ بەتەنگەوە هاتن و ڕزگار کردنی خەڵکەکە لە پیاوی خراپ و ڕێگر کاتێك هێرشیان کردۆتە سەر خەڵکە کە لە ئاشەکەدا.

* نموونەی چەند ئاسیاوێکی ناوچەی کەرکوك:

( ١ ) ئاشی ( ئیمام عەباس )
( ٢ ) ئاسیاوی ( شوورکە )
( ٣ ) ئاسیاوی ( خان قازی )
( ٤ ) ئاسیاوی ( مزگەوتی مەلا عابد )
( ٥ ) ئاسیاوی ( هەمزە لییەکان )
( ٦ ) ئاسیاوی ( تەپەی ئاسیاو )، لەنێوان گوندی مەنتیق و تۆپزاوە.
( ٧ ) ئاسیاوی ( عەلبوا )، کە خاوەنەکەی ( سەید عوبێد ) بووە.
( ٨ ) ئاسیاوی ( سەید ڕەحمان ).
( ٩ ) ئاسیاوی ( سەید قادر )، لە دێی ( چەم سوور خاو ).
( ١٠ ) ئاسیاوی بڕنەو، لە ناوچەی قادر کەرەم.
( ١١ ) ئاسیاوی شەکرە کوژاو، لە ناوچەی قادرکەرم.
( ١٢ ) ئاسیاوی ( عەبدولقادر زەنگنە ).
( ١٣ ) ئاسیاوی ( قەرە چێوار )
( ١٤ ) ئاسیاوی پەڵکە.
( ١٥ ) ئاسیاوی، پاریاوڵە، کە خاوەنەکەی سەید ئیسماعیل بوو.
( ١٦ ) ئاسیاوی ژاژ.
( ١٧ ) ئاسیاوی ئەحمەد سەید خدر ( قەڵا میکاییل )
( ١٨ ) ئاسیاوی عەزیز یار ئەحمەد، لە دێی قەڵا وەیس
( ١٩ ) ئاسیاوی ( حەمك )
( ٢٠ ) ئاسیاوی گۆڵەمەر، کە خاوەنەکەی ( حەمەی سەعید ) بووە.
( ٢١ ) ئاسیاوی خوێلێن، لە دێی مەملەحە بووە.
( ٢٢ ) ئاسیاوی ( قەیتول ).
( ٢٣ ) ئاسیاوی گەڕاوی.
( ٢٤ ) ئاسیاوی ئۆمەرە گەدە، لە قەرە حەسەن خاوەنەکەی ( شێخ تاهیر شێخ عەبدولڕەحمان ) بوو.
( ٢٥ ) ئاسیاوی ( بان لە یلان )، لە قەرە حەسەن.
( ٢٦ ) ئاسیاوی ( دووز خورماتوو )، تاکو ئێستا کە منارەکەی لەلای پردەکە هەر بە ڕووخاوی ماوە.
( ٢٧ ) ئاسیاوی ( دێ ڕەشە )
( ٢٨ ) ئاسیاوی ( قەرە وەیس )
( ٢٩ ) ئاسیاوی ( شێخ مەحمود )
( ٣٠ ) ئاسیاوی ( شێردەرە )، کە خاوەنەکەی ( شێخ محەمەد شێردەرە ) بوو.
( ٣١ ) ئاسیاوی ( حاجی عەبدوڵڵا )، لە ئۆمەرە گەدە، خاوەنەکەی ( عەبدوڵڵا عباس ) بوو.
( ٣٢ ) ئاسیاوی ( مێرە سوورە )، خاوەنەکەی ( شێخ ڕەزا ) بوو.
( ٣٣ ) ئاسیاوی ( سیامەنسور )، لە قەرە حەسەن
( ٣٤ ) ئاسیاوی ( هەناره )، خاوەنەکەی ( سەید کەریم ) بووە.
( ٣٦ ) ئاسیاوی ( یاروەلی ) سەروو، لە ناوچەی شوان.
( ٣٧ ) ئاسیاو ی ( سەیدان )، لە ناوچەی ( شوان ).
( ٣٨ ) ئاسیاوی ( گوڵم کەوە )، لە ناوچەی ( شوان ).
( ٣٩ ) ئاسیاوی ( قشلاخ )، لە ناوچەی ( شوان )
( ٤٠ ) ئاسیاوی ( دارتوو )، لە ناوچەی ( شوان ).
( ٤١ ) ئاسیاوی ( پەلك )، لە ناوچەی ( دوبز ).
( ٤٢ ) ئاسیاوی ( شەفاغا )، لە ناوچەی ( دوبز ).
( ٤٣ ) ئاسیاوی ( سەرشاخ )، لە ناوچەی ( دوبز )
( ٤٥ ) ئاسیاوی ( توورکە )، لە ناوچەی ( شوان ).
( ٤٦ ) ئاسیاوی ( قەرە تامور )، لە ناوچەی ( هەمەوەند )
( ٤٧ ) ئاسیاوی ( عەلی مەنسور )، لە ناوچەی ( هەمەوەند )
( ٤٨ ) ئاسیاوی ( عەلی ئاغا )، لە ناوچەی ( دوبز ).
( ٤٩ ) ئاسیاوی ( شیوە سوور )، لە ناوچەی ( هەمەوەند )
( ٥٠ ) ئاسیاوی ( ژاڵەی دەربەند )، لە ناوچەی ( هەمەوەند )
( ٥١ ) ئاسیاوی ( گوتیە ) ؟
( ٥٢ ) ئاسیاوی ( گەورە دێ )
( ٥٣ ) ئاسیاوی ( کانی بی )
( ٥٤ ) ئاسیاوی ( شێخ وەیس )
( ٥٥ ) ( ئاسیاوی نزیك پارێزگای کەرکوك ).
( ٥٦ ) ئاسیاوی ( کۆشکلی ).
( ٥٧ ) هەردوو ئاسیاوەکەی لای ئۆرزدی.
( ٥٨ ) ئاسیاوی ( عەبە گاور ).
( ٥٩ ) ئاسیاوی ( قەرەباشی یەکەم ).
( ٦٠ ) ئاسیاوی ( قەرەباشی دووەم )
( ٦١ ) ئاسیاوی ( خانەقا )
( ٦٢ ) ئاسیاوی ( تسن -تسعین )
( ٦٣ ) ئاسیاوی ( خدر زنە )
( ٦٤ ) ئاسیاوی ( سوورکە )
( ٦٥ ) ئاسیاوی ( قاپە کونەدار )، لەسەر ڕێگای یاروەلی.
( ٦٦ ) ئاسیاوی ( مەلا قاسمی یەکەم ).
( ٦٧ ) ئاسیاوی ( مەلا قاسمی دووەم )
( ٦٨ ) ئاسیاوی ( گاور )، لە یاروەلی.
( ٦٩ ) ئاسیاوی ( شێخ مەحمود )، لە کۆچەکی خواروو.
( ٧٠ ) ئاسیاوی ( سوورە دێ )
( ٧١ ) ئاسیاوی ( سەنگەسار )، لە نێوان ( یاروەلی ) و ( کۆچەك )
( ٧٢ ) ئاسیاوی ( عەتار )
( ٧٣ ) ئاسیاوی ( ساردا و عەتار )
( ٧٤ ) ئاسیاوی ( گۆران )، لەدێی گۆران.
( ٧٥ ) ئاسیاوی ( ئەحمەد دوورسن )، لە دێی ئۆمەربەگ.

( ٧٦ ) ( ئاسیاوی جووتە )، لە نێوان ( پاپیلان )و ( جولحان )

( ٧٧ ) ئاسیاوی ( باش عەیات )، لە نێوان ( پاپیلان )و ( جولحان ).

( ٧٨ ) ئاسیاوی ( خوار ئۆمەربەگ ) بەرامبەر ( قارعەلی )

( ٧٩ ) ئاسیاوی ( دار ئەختیار )، کە لە سەر کارێزی ڕەحمانە کۆڵە ئیشی کردووە.

( ٨٠ ) ئاسیاوی ( حوسێنی ئیسلام )

( ٨١ ) ئاسیاوی ( ئەمینی قادر ) لە ( قەیتوول )

( ٨٢ ) ئاسیاوی ( حاجی حەمە عەلە )، لە ( قەیتوول )

( ٨٣ ) ئاسیاوی ( حەسەن مارف )، لە ( قەیتول )

( ٨٤ ) ئاسیاوی ( قادر، لە ( قەیتول ).

( ٨٥ ) ئاسیاوی ( سەید تە پان )

( ٨٦ ) ئاسیاوی ( تە پە سەوز )

( ٨٧ ) ئاسیاوی ( قەرە تە پە )، لەدێی تە پە سەوز.

( ٨٨ ) ئاسیاوی ( مامشە )

( ٨٩ ) ئاسیاوی ( قایتەومن مەجید مام سالح ).

( ٩٠ ) ئاسیاوی ( حاجی قادر ) لە ( قایتەومن )

( ٩١ ) ئاسیاوی ( قادر ئەحمەد زاڵە )

( ٩٢ ) ئاسیاوی ( عومەر علی زاڵە )

( ٩٣ ) ئاسیاوی ( جەلال ئاغا )، لە گەڕاوی.

( ٩٤ ) ئاسیاوی ( دیوانە ئەحمەد ) لە گەڕاو.

( ٩٥ ) ئاسیاوی ( ئاشەسپی )، لە مەرزیخەی ژوورو.

( ٩٦ ) ئاسیاوی ( حەمە لۆر )، لە ( تۆمار ).

( ٩٧ ) ئاسیاوی ( حوسێنەگا )، لە ( تۆمار )

( ٩٨ ) ئاسیاوی ( باش عەیان )، لە ( تۆمار )

( ٩٩ ) ئاسیاوی ( جووتە )، لە ( تۆمار )

( ١٠٠ ) ئاسیاوی بەردبڕ لە ( تۆمار )

( ١٠١ ) ئاسیاوی ( سدیق بەگ ) لە ( تۆمار ).

( ١٠٢ ) ئاسیاوی ( فایق ئاغا )، لە ( زەندەقر )-( زەنقر )

( ١٠٣ ) ئاسیاوی ( تە پەی ئاسیاو )، لە ( تۆبزاوەی داقوق )

( ١٠٤ ) ئاسیاوی ( قوتە )، لە ( گوڵم کەوە ).

( ١٠٥ ) ئاسیاوی ( جوولەکەکان ) لە ( ساڵەیی )

( ١٠٦ ) ئاسیاوی ( بیرەکۆنەکە )، لە ( ساڵەیی )

( ١٠٧ ) ئاسیاوی ( سێ تە پان )، لە ( ساڵەیی )

( ١٠٨ ) ئاسیاوی ( بنەوانە )، لە ( ساڵەیی ).

( ١٠٩ ) ئاسیاوی ( زەوی ڕەش )، لە ( ساڵەیی ).

( ١١٠ ) ئاسیاوی ( ئەحمەد گۆزەر )، لە ( ساڵەیی )

( ١١١ ) ئاسیاوی ( عەمر بلاخ ) لە ( ساڵەیی )

( ١١٢ ) ئاسیاوی ( عومەر ڕەیحان )، لە ( ساڵەیی )

( ١١٣ ) ئاسیاوی مەجید بەگ.

( ١١٤ ) ئاسیاوی ( شێخ عەبدولڕەحمان دروات )، گوندی شێخ محەمەدی خواروو ژوورو.

( ١١٥ ) ئاسیاوی ( محەمەدبایە )، گوندی شێخ محەمەدی خواروو ژوورو.

( ١١٦ ) ئاسیاوی ( شێخ ڕەحمان شێخ محەمەد )، گوندی شێخ



هێلکاری چۆنێتی ئیشکردنی ئاسیاو



ئاسیاوی (شاترلو)

محەمەدی خواروو ژوورو.
( ١١٧ ) ئاسیاوی ( حەمید عارف )، گوندی حەقتا چەشمە.
( ١١٨ ) ئاسیاوی ( سەناو بەرز )، گوندی هەنارەی خواروو.
( ١١٩ ) ئاسیاوی ( مەرزە جار )، دوو ئاسیاو لە گوندی ( گۆڵەمە )
( ١٢٠ ) ئاسیاوی ( خوار شێخ تاهیر )، گوندی ( ئۆمەرە گەدە )
( ١٢١ ) ئاسیاوی ( ژوورین عەبەی عەباس )، گوندی ( ئۆمەرە گەدە ).
ئەمانەش هەندێکی ترە لە ئاسیاوەکانی کەرکوك :-
( ١٢٢ ) ئاسیاوی ( ناوەڕاست )
( ١٢٣ ) ئاسیاوی ( کوڕ میکاییل )
( ١٢٤ ) ئاسیاوی ( یەهودییەکان- جوولەکەکان )
( ١٢٥ ) ئاسیاوی ( جنۆکەکان )
( ١٢٦ ) ئاسیاوی سەقا ئەحمەد )
( ١٢٧ ) ئاسیاوی ( گلان -گولان )
( ١٢٨ ) ئاسیاوی ( ئاشچی )
( ١٢٩ ) ئاسیاوی ( شابەندەر )
( ١٣٠ ) ئاسیاوی ( شێخان )
( ١٣١ ) ئاسیاوی ( جفت )
( ١٣٢ ) ئاسیاوی ( خەندەق ).
( ١٣٣ ) ئاسیاوی ( ئەوتچییەکان )
( ١٣٤ ) ( ئاسیاوی پێغەمبەر )
( ١٣٥ ) ئاسیاوی ( بچووك )
( ١٣٦ ) ئاسیاوی ( قەرە باشی )
( ١٣٧ ) ئاسیاوی ( فیە لیجە )
( ١٣٨ ) ئاسیاوی ( جبرایيل ).
( ١٣٩ ) ئاسیاوی ( مازوو )
( ١٤٠ ) ئاسیاوی ( دەروێشە قووتە )
( ١٤١ ) ئاسیاوی ( سێلاو )
( ١٤٢ ) ئاسیاوی ( عومەر پاشا )
( ١٤٣ ) ئاسیاوی ( تەندوورە )
( ١٤٤ ) ئاسیاوی ( زەینەڵ هندلە )
( ١٤٥ ) ئاسیاوی ( زەیتون )
( ١٤٦ ) ئاسیاوی ( سوورە )
( ١٤٧ ) ئاسیاوی ( ڕەجەب )
( ١٤٨ ) ئاسیاوی ( حاجی بەکر )
( ١٤٩ ) ئاسیاوی ( مردووەکان )
( ١٥٠ ) ئاسیاوی ( چەم ئاسیاو )، لە ( خاڵە بازیانی )
( ١٥١ ) ئاسیاوی ( عەزیزی )، لە ( خاڵە بازیانی )
( ١٥٢ ) ئاسیاوی ( عەزیز عەرەب )، شێخ عەبدوڵلا، لە گوندی کەوەڵە.
( ١٥٣ ) ئاسیاوی ( چالغ ئۆغلێ ):
ئەم ئاسیاوەس لە ساڵی (١٨٢٦-١٨٢٧) دروست کراوە.
( ١٥٤ ) ئاسیاوی ( ئەشکچی ).



**ئاسیاوی گوندی (خاڵەبازیانی)**



**ئاسیاوی گەڕەكی (ڕەحیم ئاوا)**







ئاسیاوی (قازی) لە کفری

*** کارێزەکان:**

کارێزیش دەورێکی باشی بینیوە لە هونەری بیناکاری وکاریگەرییەکی باڵای دروست کردووە، بۆیە هەڵکەندنی کارێزیش لێزانی وتوانایەکی بیناکاری گەورەی دەوێت بۆ سەرخستن وئەنجام دانی کارێکی کاریگەرو بەردەوام.

هونەری بیناکاری کارێز لەوە دایە، کە پێویستی بە هەڵکەندنی بیری سەرەکی وهەڵچنینی جۆگەی نێوانی بیرەکانی خەتی یەکەم ودووەمە، چۆنێتی سازدانی دروست کردنی دەمی کارێزەکە ودروست کردنی ئاوگر بۆ بەکار هێنانی ئاوی کارێزەکە، ئەمانە هەمووی پێویستی بە توانای بیناکاری کارێز هەڵکەندن دەبوو تا بەوەی ڕایبپەڕێنێت.

ناوچەی کەرکوکیش گەلێك کارێز وکارێز کەندی بە ناوبانگی هەبووە کە توانای خستۆتە کارو ژمارەیەکی زۆر کارێزیان لە کەرکوك ودەوروبەری لێداوە بۆ ئاوەدان کردنەوەی مزگەوتو خان وکاروانسەرا وماڵە گەورەکان ودیوەخان وشوێنە گشتییەکان، کە هەموویان بەڵگەی توانای (کارێز کەندەکان) بە دەردەخەن.

بەڵام ئەوەی جێگەی داخە ئەم کارێزانەهەمووی کوێر بۆتەوەو شوێنەواری نەماوە، ئەوی تاکو ئێستاکە ماوە کارێزەکەی لای کڵێسە (سووورە) کەیە لەسەر ڕێگای (سلێمانی-کەرکوك).

گەلێك کارێز کەند لە ناوچەی کەرکوکدا بە ناو بانگ بوونە وەکو:- وەستا (سەید عەلی)و (سەید عەباس)و (وەستا ئەحمەد) خەڵکی (باوە) بوونە. وەستا (جەبار) خەڵکی ناوچەی (لەیلان و تەرجل) بووە.

وەستا (فەتاح)، وەستا سمایل محەمەد عەلی کە ناسراوە (بەسەید وەسمان) لە بنەڕەتدا خەڵکی تورکیا بووە لە ساڵی

(١٩١٢) دا هاتۆتە (کەرکوك)، کە لەم ساڵانەی دوایدا کۆچی دوای کرد لە (شۆڕیجە)، هەروەها وەستا (ئەحمەد کوێر)، خەڵکی (بانگۆل).

* چەند نموونەیەکی کارێزەکان:-

(١) کارێزی (تسن- تسعین)

ئەمە درێژ دەبێتەوە لە پردی عوسمانییەکانەوەو دەڕوات بە ژێر نەخۆشخانەکەوە بۆ گەڕەکی (تسعین)

(٢) کارێزی (بابە گوڕ-گوڕ)

لەسەر هێڵی شەمە ندەفەرە کۆنەکەوە لەلای ئاشە سوورەکەوە درێژ دەبێتەوە.

(٣) کارێز (بەڵاوە)

ئەمە لە (خاسە) وە درێژ بۆتەوە بۆ گەڕەکی (تسعین).

(٤) کارێز (تۆپزاوە)

ئەمە لە یاروەلی یەوە بۆبن مزگەوت (مەلا ڕەزا) دەچێت.

(٥) کارێز (یایچی)

(٦) کارێز (عەرەفە)

(٧) کارێز (حاجی جەمیل) لە (شۆرجە)

(٨) دووکارێز لە گوندی (بانگۆڵ) هی (عەلی حەمەدی قادر)

(٩) کارێزی (شێخ نایف) لە (باوە)

(١٠) کارێزی (شێخ جەبار) لە (چیمەن)

(١١) کاریزی (وەستا خدر)

(١٢) کارێزی (شێخ حوسێن)

(١٣) کارێزی (جانی)

(١٤) کارێزی (تەکیە)

(١٥) کارێزی (باخ سۆفی)، لە (ئۆمەرەگەدە)

(١٦) کارێزی (باخ حەمید حەسەن)، لە (ئۆمەرەگەدە).

(١٧) کارێزی (باخ شێخ عیزەدین)، لە (ئومەرە گەدە).

(١٨) کارێزی (یونس)، لە (ئومەرە گەدە)

(١٩) کارێزی (گۆم سۆفی) لە (گەنیاگ)

(٢٠) کارێزی کوێخا ڕەحیم (مێرگە باز) لە (گەنیاگ)

(٢١) کارێزی (ئەحمەد سوڵتان) لە شیوی گوزەبیتی لە گەنیاگ.

(٢٢) کارێزی مەڕ خواردەی سەروو

(٢٣) کارێزی مەی بانە، لە مەڕ خواردەی سەروو.

(٢٤) کارێزی حەوزەکەی بەر ئاوایی، لە مەڕ خواردەی سەروو.

(٢٥) کارێزی (مەیدان حاجی محەمەد) لە گۆڵەمە)

(٢٦) کارێزی (حاجی ستار)، لە شێخ محەمەدی خواروو ژوورو

(٢٧) کارێزی (شێخ ڕەحمان شێخ محەمەد) لە شێخ مەحەمەدی.

(٢٨) کارێزی (عەمر بلاخ)، لە (ساڵەیی)

(٢٩) کارێزی (شەخسەکە)، لە (ساڵەیی)

(٣٠) کارێزی (شەخسەکە)، لە (ساڵەیی)

(٣١) کارێزی (کونجیلی)، لە (ساڵەیی)

(٣٢) کارێزی (تکان لی)، لە گوندی (ڕێدار)

(٣٤) کارێزی (زمرکان)، لە (پەریخانی خواروو)

(٣٥) کارێزی (تەرجیل)، کە هی عومەر ئاغای تەرجیلی بوو، سەرچاوەکانی دەگەڕێتەوە شاخەکانی دەوروبەری دێی (تەرجیل).

(٣٦) کارێزی (بادەوا)، هی شێخ فایقی بادەوایی بوو.

(٣٧) کارێزی (کووڕە)، لە گوندی (قەرە چێوار)، کەهی شێخ حەسەنی قەرە چێوار بووە.

(٣٨) کارێزی دێی (قەشقە)، کە بە ناو بانگە بە (شێخان).

(٣٩) کارێزی ڕۆخانی عەلی زاڵە جەلال ئاغا، لە گوندی (قایتەوەنی عەلی زاڵە).

(٤٠) کارێزی (تۆپزاوەی حوسێن بەگ).

(٤١) کارێزی (مەحمود ئاغا)، لە (ترکەلان).

(٤٢) کارێزی (سەید عومەر)، لە (ترکەلان).

(٤٣) کارێزی (ئەحمەد بەگ)، لە (یاییچی).

(٤٤) کارێزی (مامشە) هی شێخ ڕەشیدی تاڵەبانی بوو.

(٤٥) کارێزی (باوە).

(٤٦) کارێزی (کانی میرزا) لە (پاریاوڵە)

(٤٧) کارێزی (کانی میرزا) لە (پاریاوڵە)

(٤٨) کارێزی (مەلا تاها)، لە (سۆران)

(٤٩) کارێزی (مەلا عەزیز)، لە (سۆران)

(٥٠) کارێزی (چلکنە)، لە (دار ئەختیار)

(٥١) کارێزی (کۆمەڵە) لەبەری ئاوایی کە مێژووەکەی زۆر کۆنە لە (دار ئەختیار)

(٥٢) کارێزی (ڕەحمانە کۆڵە)، کە دوو ئاسیاوی لەبەر بووە لە (دار ئەختیار)

(٥٣) کارێزی (شێوە لوولەکە)، لە (دار ئەختیار).

(٥٤) کارێزی (گەزەکان)، لە (دار ئەختیار).

(٥٥) کارێزی (پەلکە)، لە (دار ئەختیار)

(٥٦) کارێزی (بەر ڕەزەکە)، (لە دار ئەختیار)

(٥٧) کارێزی (قومەکە)، لە (دار ئەختیار).

* تونێل- ئاقدز:

تونێل بریتییە لە ڕاڕەوێك لە ژێر زەوییەوە کە مەبەستی دروست بوونی بۆ کارێکی بەرگریو خۆپاراستنو سەربازییە، کە زیاتر دەچێتە چوار چێوەی نەخشەی سەربازی درێژخایەنەوە. دەورێکی کاریگەر دەبینێت بۆ بەرەنگار بوونەوەی دووژمن لە شوێنەکانی وەکو قەڵاو وبورجو حەشارگە.

"ئەو کونە دەستکردەیە کە لە نێو قەڵا دروست دەکرێتو لە ژێر زەوییەوە دەچێت بۆ دەرەوەی قەڵا، ئاقدز ڕێگای نەهێنییە تا لە کاتی ئابلۆقەدانی قەڵا لەلایەن سوپای دوژمنەوە، ئەوانەی نێو قەڵا لێیەوە هاتووچۆ بکەن بۆ دەرەوەی قەڵا بۆ هێناوەی ئاو و ئازووقەی پێویستو بۆ راکردنو رزگاربوونیش ئەگەر بزانرێت دوژمن قەڵا داگیر دەکات"[١٦].

مامۆستا (عەبدولڕەقیب یوسف) لە باسی تونێلدا باس لە چەند شوێنێکی (قەڵا) دەکات، کە گوایە ئەمانە هەموو ڕێگەی هاتوو چۆی ژێرەوە بووە بۆ ڕۆیشتن لە قەڵاوە بۆ دەرەوە.

تونێلی زیندان لە نێو بینایەی زینداندایە کە دەکاتە خانووی سەیید نورەددین ئاغا، کە یەکێك بووە لە دەوڵەمەندەکانی کەرکوك، بە پێی ئەو سەرچاوانەی کە لە وەستاکانی ئەو کاتەوە وەرگیراوە لە نێو ژێر زەمینی زیندانەکەدا چەند تونێلێك هەبووە بۆ دەرەوە[١٧].

مزگەوتی گەورە کە پێی دەوترێت (ئۆلو جامیع) تونێلێکی هەیە دەکەوێتە پشت دەرگای ڕۆژئاوای قەلا کە بەشی ڕۆژئاوا لە قەلا لە ڕاڕەوەکەیدایە[١٨].

(مەلا مەجیدی قوتب) کاتێك بەڕێوەبەری ئەوقاف کەرکوك بووە لە ساڵی (١٩٣٤)، (ئەحمەد قازی بەغدادی) مزگەوتەکەی ئاوەدانکردۆتەوە، کە زۆر حەزی لە ئاوەدانکردنەوەی شوێنە ئایینیەکان بووە، دەمی ئاقدز بەردەکەوت بە تیرەی دەوری (١,٥) مەترو لە پشت دەرگای ناوەڕاستی تارمەکە بوو بە دەوری (١) مەتر، (ئەحمەد قازی) کرێکارێکی نارده ناوی بە وایەری کارەبایی و ماوەیەك پێوە چوو نەگەیشتە کۆتاییەکەی و گەڕایەوە، دەمی دیکەی ئاقدزەکە لەلای رووباری (خاسە)دایە، پاش وەرگرتنی ئەم زانیاریانە لە مامۆستا (قوتب) لە چەند کەسێکیش بیستووە کە دەمی کونێکیان لە قەراغی ڕۆژهەڵاتی رووباردا دیوە کاتێ ئاوەکە کەم دەبوو بەدەر دەکەوت دەبێت ئەمە دەمی ئاقدزەکە بێت و نەیان زانیوە چییەو ڕژێمی بەعس ئەو قەراغەی ڕۆژهەڵاتی خاسەشی شێواندووە[١٩].

ئاقدزی سێیەم لە پشت و لە نزیك دەرگا حەلواچییەکان لە خانووی بنەماڵەی (عنایەت)دا بوو کە لە دەرگا بەسەر دەکەوتی لە دەستە چەپ خانووی (حاجی ئیبراهیم حەلواچی) بوو، پاش ئەو خانووی (حاجی نەجم) بوو، پاش ئەو خانووی (عنایەت) واتە خانووی سێیەم لە پشت دەرگا بووە[٢٠].

بەڵام ئەگەر سەرنج بدەین لە چەند شوێنێکی تری دەرەوەی قەڵادا (تۆنێل) هەیە، کە دەتوانین هاوپەیوەستی بکەین لەگەڵ ئەوانەی سەر قەڵادا.

لە چینی ژێرەوەی کڵێسە سوورەکەی سەر ڕێگای سولێمانی-کەرکوك تونێلێك هەیە، کە کەوتۆتە دوای کڵێسەکە، کە جاران خەڵکی توانیویەتی بەناویدا تا ماوەیەکی چاك گووزەر بکات.

هەر لەهەمان کاتدا تونێلێکی ڕووخاوی تر هەیە لە لای کۆتایی قەبر سانەکەی (ئیمام قاسم) لە پشت قوتابخانەی (ئیمام قاسم)ی سەرەتایی کە بەشێکی زۆر کەمی لێ ماوە.

من لەو باوەڕەدام، کە لەوانەیە تونێلی کڵێسە سوورەکە هەر درێژەوەبووی تونێلی قەبرسانەکە بووبێت و بەڵام لە دووایدا ڕوخێنراوە ولە ناو چووە.

هەروەها ڕێی پێ دەچێت کە ئەو تونێلانەی کە (مامۆستا عەبدولڕەقیب)[٢١] لە قەلا باسی دەکات، هەر هاوپەیوەست بووبێت لەگەڵ کڵێسە کەو قەبرستانەکە، کە لەکاتی تەنگانەدا شوێنێکی بەرگری وسەربازی گرنگ بووە بۆ خۆ دەرباز کردن، هەموویان بەڕێگەی دیاری کراو گرێ دراون بەیەکترییەوە، بەڵام بۆ زیاتر شارەزا بوون لێی پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زیاتر دەکات بۆ ڕاستی بۆ چوونەکانی.

هەروەها سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە گوایە لەناو قشلەوە تۆنێلێك هەبووە کە بۆ گەڕەگی (ئەلماس) دەرچووە، بەڵام تاکو ئێستاکە هیچ بەلگەیەکی ئاسەواری نییە بۆ ڕاستی ئەم بۆ چوونە، کە تا چ ڕادەیەك دەمانگەیەنێتە سەر باری قسە دەماو دەمەکان دەربارەی ئەم تونێلە.

هەر لە تەك کڵێسە سوورەکەدا کارێزێك هەیە کە ئەمیش لە وانەیە لەوەختی خۆیدا بۆ شوێنێکی دیار لەو تونێلەوە ڕاکێشراوە بۆ ئەوەی لە کاتی تەنگانەدا سوودی لێ ببینرێت وبەکاری بهێنن، بەڵام ئێستا ڕێرەوی کارێزەکە لە بەردەم کڵێسەکەدایە، بەڵام شوێنی هاتنی ئاوەکە لەلای تونێلەکەوە ڕێ دەکات.

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

(١) (المدينة الأسلامية)، د. محەمەد عەبدولستار عوسمان، (عالم المعرفة)، کوێت، ١٩٨٨، چاپخانەی (الرسالة)، لاپەڕە (٢٥٢).
(٢) (الأسواق الشعبية في مدينة كركوك، دراسة انثروبولجية)، شەفیق ئیبراهیم سالح ئەلجبوری، نامەی ماجستێر، زانکۆی بەغدا، حوزەیران ١٩٩٤، لاپەڕە (١٩-٢٠).
(٣) (المدينة الأسلامية)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٦٠).
(٤) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢٥٩).
(٥) (الأسواق الشعبية)، هەمان سەرچاوە، پەراوێزی (٢)، لاپەڕە (٧٢).
(٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٤١).
(٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٧٣-٧٤).
(٨) گۆڤاری (الف باء)، ژمارە (١٦٨٠)، کانونی یەکەم، ساڵی ٢٠٠١، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:
(الخانات امانات الأجداد للاحفاد)، نووسینی سیهام ئەلشیمیری.
(٩) گۆڤاری (پەروەردەو زانست)، ژمارە (٢)، ساڵی (١)، پاییزی (١٩٧١)، لێکۆڵینەوەیەکی وەرگێڕاوە بە ناونیشانی: (مێجەرسۆن بۆ کەرکوك دەگەڕێتەوە).
(١٠) گۆڤاری (سوبارتو) ژمارە ٢، پایزی ساڵی (٢٠٠٨)، لاپەڕەکانی (٣٣-٣٥)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(خان، سەرەتاکانی دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی لە سەردەمە مێژووییەکاندا)، نووسینی مەهدی جەلال مستەفا.
(١١) گۆڤاری (هەزارمێرد)، ژمارە (١١)، ساڵی سێیەم، (٢٠٠٠).
(١٢) رۆژنامەی (هاوکاری)، ژمارە (٨٩٦)، رۆژی ١٩٨٧/٦/٢٥، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:
(نامە خانەو شتە عەنتیکەکانی خوالێخۆشبوو، نووسینی مامۆستا عەبدولڕەقیب یوسف.
(١٣) گۆڤاری (سوبارتو) ژمارە ٢، پایزی ساڵی (٢٠٠٨)، لاپەڕەکانی (١٤٠-١٤١)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(الحمامات التراثية في كوردستان)، نووسینی دکتۆرە نەرمین عەلی،.
(١٤) (شاعیرو ناودارانی کاکەیی)، هەردەوێل کاکەیی، ساڵی ١٩٩٠، بەغدا، لاپەڕە (١٣٨).
(١٥) (شاری سلێمانی)، بەرگی یەکەم، ئەکرەمی مەحموودی رەشە، بەغدا، ١٩٨٧، (دار الحرية للطباعة)، لاپەڕە (٥٥٤).
(١٦) (وێرانکردنی قەڵای کەرکوك و هەوڵدانم بۆ رزگارکردنی)، عەبدولڕەقیب یوسف، ٢٠١٠، لاپەڕە (٢٨).
(١٧) (وێرانکردنی قەڵای کەرکوك و هەوڵدانم بۆ رزگارکردنی)، عەبدولڕەقیب یوسف، ٢٠١٠، لاپەڕە (٢٩-٣١).
(١٨) (وێرانکردنی قەڵای کەرکوك و هەوڵدانم بۆ رزگارکردنی)، عەبدولڕەقیب یوسف، ٢٠١٠، لاپەڕە (٣٣-٣٥).
(١٩) (وێرانکردنی قەڵای کەرکوك و هەوڵدانم بۆ رزگارکردنی)، عەبدولڕەقیب یوسف، ٢٠١٠، لاپەڕە (٣٥-٣٦).
(٢٠) (وێرانکردنی قەڵای کەرکوك و هەوڵدانم بۆ رزگارکردنی)، عەبدولڕەقیب یوسف، ٢٠١٠، لاپەڕە (٣٧-٣٨).
(٢١) گۆڤاری (کەرکوك)، ژمارە ١، لێکۆڵینەوەیەکی مامۆستا عەبدولڕەقیب یوسفە دەربارەی کەرکوك.

## بەشی حەوتەم

# تایبەتمەندییەکانی هونەری بیناکاری ناوچەی کەرکوك

*** شەناشیل (باڵەخانوو)(*):**

لەرووی بیناکارییەوە بریتییە لە بەرزەك (نتۆ)، یان لەدەرپەڕینی رووی خانووەکە تەنها لە چینی (نهۆم)ی یەکەم (طابق)، کە مەبەست لێی راستکردنەوەی شێوەی چینی زەوییە لە روویەکی لێك نەچووە بۆ شێوەیەکی لێك چووی (تجانس)، گۆشەیەکی وەستاو، کە ئەمە وادەکات ژوورەکانی چینی ژێرەوە لەخۆیدا دەبێتە ژووری هاوشان (هاوڕێکی)و هاودژ، کە هەندێك لەم دەرپەڕینانە دەبێتە شێوەی سەیر.. سەیر وەکو ددانی شانەو گوێچکەی ددانی دار، بە پێچەوانەی زۆر لەوانەی کە باوەڕیان وایە لەسەر شەناشیل، هۆیەکە زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ کارێکی بەڕێوەبەری، کە ناگەڕێتەوە بۆ هۆیەکی جوانکاری[1].

هەروەکو ئەوەی کە باوە لەتەرزی بیناکاری شەناشیل ئەوەی کە بۆمان بەجێ ماوە دەگەڕێتەوە بۆ چوار سەدە لەمەوپێش کە لەوانەیە هەر لەسەردەمی ماوەی دەسەڵاتی عوسمانییەکان بێت، بەڵام هیچ بەڵگەیەکمان بەدەستەوە نییە کە بوونی شەناشیل لەپێش ئەم ماوەیە بسەلمێنێت. بۆیە ئەوەی کە هەیە دەگەڕێنەوە بۆ ماوەی نێوان ساڵانی (٧٠٠-٨٠٠). هەروەها وا باوەڕ هەیە کە شەناشیل لەماوەی سەردەمی عەباسییەکاندا هەبووە، بەڵام هیچ بەڵگەو دەستوورێك نییە پاڵپشتی ئەم بۆچوونە بێت.

بەڵگەکان ئەوە بەدەستەوە دەدەن کە گوایە بوونی شەناشیل لەشاری (دیاربەکر)ی کوردستانی سەروو هەبوو. ئینجا لەوانەیەو رێی تێ دەچێت، هەر لەکوردستانەوە هاتبێتە عێراقو تایبەتمەندی خۆی لەدەست دابێت، ئەویش زیاتر رایەکە پتەو دەکات کە هاتبێتە ناوچەکە لەماوەی فەرمانڕوایی عوسمانییەکان. هەروەها بوونی دروستکردنی بیناکاری شەناشیل زیاتر لەگەڵ ئاوو هەوای کوردستاندا دەگونجێتو زیاتر ناوچەیەکی چیاییە، کە جوانکارییەکی تایبەتی دەدات بە بیناکارییەکە[2].

(ئەوەی لەشەناشیلدا دەیبینین بریتییە لە رووکاری داری، تەرزێکی شێوەی تایبەتی لەبەرامبەر خانوو باڵەخانەکانی چینی سەرەوەی ژوورێك یان چەند ژوورێك کە دەڕواننە سەر کۆڵانەکانی گەڕەك بەچەند پەنجەرەیەکی داری گەورەی شێوە تەرزی تایبەتی لەجۆری ترازاو (منزلق)، کە بەبەرزکردنەوە دەکرێتەوە بەداگرتنی دادەخرێت، دەتوانی پەنجەرەکە رابگریت بەهۆی ددانەی ئاسنی بچووکەوە، پەنجەرەکە لەسەرخۆی دادەبەزێت بۆ ئەوەی شووشەکانی نەشکێت، لەدوای پەنجەرەی شووشەکانەوە، داربەندێکی پێوە دەکرێت کە لە دار دروستکراوە، سوودی بۆ ئەوەیە کە رێگە لەچوونە ژوورەوەی خۆر بگرێت لەوەرزی هاوینو پارێزگاری ئاوو هەوای ژوورەکە رابگرێت، بەکار بهێنرێت بۆ سەیرکردن بۆ دەرەوە کە لەکۆڵانەوە تۆ نەبینن، ئەویش بەشێوەی تایبەتی بەرزو نزم دەکرێتەوە. شەناشیل نزیکەی (٥٠-٧٠) سانتیمەتر لەرووی خانووەکەوە، دێتە سەر کۆڵانەکە، لەهەندێك لە خانووەکان ئەم دەرپەڕاندنە لەکۆتایی لایەکی روویەکەیەتی یان لەهەردوو لایەکەیەتی[3].

وا باوە لەژووری شەناشیل لەزۆری کاتەکاندا، گەورەترین پانتایی رووبەری خانووەکەی داگیر کردووەو لەهەموویان زیاتر رازاوەتەوە بەنەخشو نیگارو بەبەهاترین جۆری مافوورو فەرش داپۆشراوە، کە لەسەر بنکەیەکی داری پەیژە دار دروستکراوە. جۆری ئەم دارەی کە بەکار دەهێنرێت لەدروستکردنی شەناشیلدا بریتییە لە داری قۆخو داری ساج.

بەڵام لەچلەکانی سەدەی رابردوودا گۆڕانێکی گەورە رووی دا ئەویش گۆڕینی ئەو رووە دارانەی پەنجەرەکان کە رازابوو بەجۆرەها **نەخش بە رووکاری خشتی سوورەوەکراو**

لەسەر کۆڵەکەی داری. بەهۆی ئەو گۆڕان و پێشکەوتنەی لەماوەی شەڕی جیهانی یەکەمدا رووی داو هاتنە ناوەوەی جۆرەها شـــێوازی بینـاکـــاری جیاواز، وای کرد کە ئەم جۆرە تەرزەی بیناکاریە بەرەو نەمان بڕوات و خەڵکی بەلای ئەوەدا بڕوات کە ئاسانە لەدروستکردنی بیناکاریداو نرخێکی کەمی تێدەچێت بۆیە بووە سەرهەڵدانی جۆرەها ڕاڕەو وەکو ئەوەی لەگەڵێك خانووبەرەدا بەرچاو دەکەوێت کە پێی دەوترێت (بەلەکۆنە).

ئـەگـەر سـەرنـج بـدەیـنـە نـاوچـەکـانـی کـوردسـتـانـی باشوور دەبینین کاری هەڵگرتنی ئەم شەناشیلانە لەبەرد دروستکراوە لەگەڵ دەستەی ئاسن کەلەسییەکانەوە هاتۆتە عێراق و بایەخی پێ دراوە، بۆیە لەجیاتی بەکارهێنانی دارەکە ئاسن جێگەی گرتۆتەوە لە هونەری بیناکارییەکە کەئەمیش تایبەتمەندییەکی جیای داوە بەهونەری بیناکارییەکەی، کارگەیشتە ئەوە کە شەناشیل دروستکراوە لەئاسن و خشتی سوورەوەکراو کەتوانراوە جۆرەها نەخش لەرێکخستنی خشتەکاندا بسازێنرێ[٤].

*** چەند سەرنجێکی تایبەتمەندییەکانی شەناشیلی (باڵەخانوو) ی ناوچەی کەرکوک:**

١. ئەگەر سەرنج بدەینە هونەری شەناشیلی کەرکوک دەبینین، بریتی نییە لەهونەرێکی دابڕاو لەهونەری بیناکاری خانووەکە، وەکو ئەوەی هەیە لەشەناشیلی (بەسرە)و (بەغدا)، چونکە ئەگەر سەرنج بدەیت هەرلەهەمان کەرەستەی بیناکاری دروستکراوە.

٢. زیاتر هونەری شەناشیلی کەرکوک پێوانەکەی لەنێوان (١-١,٥)م پانی و (٥,٥٥-٦,٥)م درێژییە.

٣. زۆری بەکارهێنانی پەنجەرەی بچووك.. بچووك کەبەشێکی زۆری رووبەری بیناکارییەکەی داپۆشیوەو شێوەی پەنجەرەکان لەسەرەوە کەوانەیی نییە وەکو ئەوەی شەناشیلی بەغدادی و بەسرەیی.

٤. بەکارهێنانی گەچ و بەرد و شەلمان و خشتی سوورەوەکراو لەهونەری بیناکاری شەناشیلەکەدا بەکارنەهێنانی تەختە بەشێوەیەکی فراوان وەکو ئەوەی خانووەکانی عێراق، بەڵام لەوانەیە پاشماوەی ئەو جۆرەمان بەدەست نەگەیشتبێت.

٥. زۆرتر رێگەی پێ دەچێت کە شەناشیلی کەرکوك لەچلەکان و پەنجاکاندا بڵاو بووبێتەوە، زۆر گەڕام بەدوای ئەوەی کەنموونەیەکی بیناکاری پێش ئەو مێژووەم دەست بکەوێت بەدەستم نەهێنا، لە بەساڵاچووەکان زۆر پرسیارم کرد، هیچ شتێکی وام بەدەست نەهێنا کەبەڵگەی ئەو راستییە بێت.

٦. زیاتر شەناشیل لەو شوێنانە بەکارهاتووە کە کەوتۆتە سەر رێگای گشتی هاتووچۆی خەڵکی رێگا گشتییەکانی



**یەکێك لە شەناشیلەکانی سەر قەڵا**

شار، تا بەوەی تایبەتمەندی چاودێری دەرەوەی هەبێت.

٧. نەبوونی بەکارهێنانی نەخش و نیگار لە هونەری بیناکاری شەناشیلدا ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی سەرهەڵدانی لەچلەکان و پەنجاکاندا کەدەوری نەخش و نیگار ئەوەندە نەبووە لەتەرزی بیناکاریدا.

٨. لەهەندێك شەناشیلەکاندا، بوونی دەرگا لەسەرە وەکو دروستکردنی بەلەکۆنەیەك بۆ راوەستان و رازاندنەوەی بە پەرژینی ئاسنینی، ئەمە زیاتر لەسەرەتاو کۆتایی شەستەکاندا بەرچاو دەکەوێت.

٩. بەکارهێنانی (پارێزبەند) بۆ پەنجەرەکان لەدەرەوە کەلە چینکۆ یان دار دروستکراوە کەلەناوەوە دەتوانرێت رابکێشرێت کاتێك بتەوێت دابخرێت، تا پاراستنی لەخۆرو بتوانیت ئاوو هەوای ژوورەکە رابگیرێت.

١٠. بەکارهێنانی خشتی سوورەوەکراو لەهونەری شەناشیلدا بەڵام زۆر بەکەمی بەرچاو دەکەوێت، زیاتر لە بەردو گەچ دروستکراوە.

١١. ئەوەی لەشەستەکاندا بەرچاو دەکەوێت بوونی پەنجەرەیەك یان زیاتر لەهەر لایەکەوە.







چەند نموونەیەك لە شەناشیلی شاری کەرکوك

*** هونەری بیناکاری لادێی کوردەواری ناوچەی کەرکوك؛**

لادێـی کـوردەواریـش وەکـو هـەمـوو لادێـیـەك هەڵگری خاسیەتی تایبەتی بیناکاری خۆیەتی، کە مرۆڤ یەکسەر دەتـوانـێـت بیـنـاسـێـتـەوەو مـۆرکـی سـەردەمـەکـەی خۆی بخاتە روو لەهونەری بیناسازیدا.. لادێـی کوردەواریش بەپێی ئەو شوێنەی تیایدا بنیاتنراوە وای لێ هاتووە کە خاوەنی سـەردەمو چاخی دیاریکراو بێتو پێشکەوتنە بیناکارییەکەی قۆناغ بەقۆناغ دیـاری بکرێت. بۆیە هەر لە (چەرموو) وە دەتوانین شارستانییەتی ئەو بیناسازییە شی بکەینەوە، چونکە نموونەی خانووەکانی (چەرموو) زنجیرەی ئەو خانووانەیە کە تا ئێستا لایەنە بچووکەکانی ماوەتەوە لە لادێی کوردەواریدا.

ئەگەر سەیری بیناکاری ناوچەی کەرکوك بکەین دەبینین هەر هەمان زنجیرەی ئەپساوی بیناکاری لادێی کوردستانەو بەپێی سەردەمەکەی مۆرکی تایبەتی خۆی وەرگرتووە. (کاتێك لادێییەك بیر لەدروستکردنی خانووەکەی دەکاتەوە ئاوەزی بۆ ئەوە دەچێت کە پێش خۆی چۆن بیریان کردۆتەوە، هەوڵدەدات کە ئەو جوانکارییەیان لێ وەربگرێت.. هەروەها پشت بەوە دەبەستێت کەتوانای مادی چەندێکەو قەبارەی فراوانی خێزانەکەی ئێستاو دوا ڕۆژ چەند دەبێت. هەروەها بیر لەوە دەکاتەوە چۆن فراوانی بکات بۆ ئەو زیادکردنە. ڕێـژەی ئـەو ئاژەڵانـەی کەخێزانەکەی بەخێوی دەکـات.. ئەمانە هەمووی هەنگاوی خانووە لەلادێدا)[٥].

هـەوڵ دەدات کـە ئـەو کـەرەسـتـانـە بەکاربهێنرێت کەلەناوچەکەدا باوە. بۆ نموونە جوتیاری کوردی ناوچەی کـەرکوك زیاتر قوڕو خشتی کـاڵ وەکـو دوو کـەرەستـەی سـەرەکـی بەکار دەهێنێت، لـەگـەڵ بەکارهێنانی (بـەرد)، بەڵام بەشێوەیەکی کەم بەتایبەتی لەو شوێنانەدا کە بەرد بەدەست دەکـەوێت، ئـەوەش زیاتر لە ناوچەی (کفری)و (حەمرین)و (قادرکەرەم)، بەڵام ناوچەکانی تر هەر خشتی کاڵە گڵی تێکەڵ بە (کا)ی کوتراو دەکرێت.

بەکارهێـنـانـی داریـش وەکـو کـەرەسـتـەیـەکـی گرنگی خانوو بەکار هاتووە، بەتایبەتی بەکارهێنانی ئەو دارەی کە باو بووە لەناوچەکەدا وەکو: (ئەسپیندار)و (داربەڕوو) و (قامیش)و (دارسـەروو)و (دارتـوو) کە ئەمانە زیاتر بۆ کاریتە یـان داری نـاوەڕاسـتـی خانووەکـە بەکارهاتووە، لەملاو ئـەو لایـەوە داری بچووك دارەڕاکـراوە لەسەربانی خانووەکە لەشێوەی (گـورگـە پشت) دا، کە ناوەڕاستی خانووەکە تۆزێك بەرزی هەیە بۆ ئـەوەی ئەم لاو ئەو لای لاری هەبێت، کە ئەمیش زیاتر لە ناوچەکانی (قادر کەرەم) و (قەرەحەسەن) بەکار دەهێنرێت، بەڵام ناوچەکانی (شوان) و (حەویجە)و (دەوروبەری کەرکوك) زیاتر سەربانی تەخت بەناوبانگە.

لەدوای دارەڕاکردنی دارە بچکۆلەکان ئینجا بەقامیش، وردە دارو گـەڵا بانەکەی دادەپـۆشرێت، لـەگـەڵ ڕشتنی نزیکەی (١٨) ئینج خۆڵی وشكو پاك پێش ڕشتنی قوڕی گێراوە بەسەریدا، کە بەبارستایی (٣) ئینج لەسەریەوە، بەڵام لەهەندێك شوێنی تر لەناوچەی کەرکوك تەنیا قوڕە گێراوەکە بەکاردەهێنن، بێ بەکارهێنانی خۆڵ کە بەفرو بـارانـێـکـی زۆر دەیـگـرێـت، تـابـۆ ئـەوەی ئـەگـەر بەفرەکە ماوەیەکی زۆر باری تەڕییەکەی بداتە نێو خۆڵە وشکەکە.

چینی دەرەوەی خـانـووەکـە ئـەو ڕووەی زیـاتـر بەفرو بـاران دەیـگـرێـت، بەقوڕێکی گـێـراوەی چاكو تێر لە (کا) کەفماڵ دەکرێت تا بۆ ئـەوەی بەرگەی کاریگەرییەکانی گەرماو سەرما بگرێت، بەڵام ژمارەی ژوورەکانو قەبارەی خـانـووەکـەش لـەیـەکـێـکـەوە بـۆ یـەکـێـکـی تـر دەگـۆڕێـت، لەدەوڵەمەندەوە بۆ هەژار، لەکەم خێزانەوە بۆ فرە خێزان لەتواناوە بۆ بێ توانا.

دەبـیـنـیـن زۆری ژووری لادێ لـەدوو ژوور یـان سێ ژوور تێپەڕ ناکات لـەگـەڵ پێویستی تـری خانووەکە بۆ حـەوانـەوەی ئـاژەڵانو شوێنی چێشت لێ نـان، بەدەگمەن دوو چینی دابنرێت لەخانووی لادێـی ناوچەی کەرکوك، ئەگەر دروست بکرێت تەنها ژوورێـك دروست دەکرێت، لەماڵە دەوڵەمەندەکاندا زیاتر دیوەخان دروست دەکرێت کە ئەمیش تایبەتمەندی خۆی هەیە لەهونەری بیناکاری خانوودا.

مامۆستا دکتۆر (شاکرخەسباك) ئاوا بەو جۆرە باس لە هونەری بیناکاری لادێی کوردەواری دەکات: (دروستکردنی گوند لەپارێزگای سولەیمانیو هەموو گوندەکانی ناوچە چیاییەکان، جیـاوازی هەیە لـەگـەڵ گوندی کوردنشینی ناوچە دەشتییەکانی پارێزگای هەولێرو کەرکوك لەڕووی شوێنو تـەرزی بیناسازیەکەیدا، هەموو کاتێك گوندی ناوچە تەختاییەکان هەڵدەستن بەدیاریکردنی لەشوێنێکی تەختی نزم تا بۆ ئەوەی بەئاسانی سەرچاوەی ئاو بەدەست بهێنێت، کەلەم جـۆرە گوندانە (بیر) یەکەم سـەرچـاوەی ئـاوە، ئەگەر بێتو لەنزیك سەرچاوەی ڕووبـارەوە نەبێت. ئەم گوندانە شێوەیەکی لاکێشەیی درێـژی هەیە لەچەند کۆمەڵگەیەکی درێژ پێکهاتووە لەماڵی پەرشو بڵاو وکۆڵانی تەسك تەسكو هەمووکاتێك گوندەکە پانی ڕێگا سەرەکییەکە دەکاتە دوو بەشەوە.

هەر بۆیە خانووی کوردنشینی ناوچە دەشتییەکانی پارێزگای هەولێرو کەرکوك پێك هاتووە لە شێوەیەکی چوار گۆشەیی کەسەرەکەی چەماوەیە، ژوورەکانی لە یەکترییەوە جیـایـە، ژووری خـەوتـنو دانیشـتن بەشێکی سـەرەکی ماڵەکەیە کەپێوانەکەی نزیکەی چل مەتر دەبێت (٨×٥م)، دابەش دەکرێتە سەر سێ بەش کە نێوانیان بەنیوە دیوار دابەشکراوە هەر بەشێکی لە خۆیدا سەربەخۆیە. زۆر کەمو دەگمەن ڕێ دەکەوێت ژووری ئاژەڵان لەگەڵ ژووری خەوتن بێت. نـەبوونـی پـەنجـەرەی ڕاسـتـی لـەم ژوورانــەو زیاتر کونی گـەورە بڵاو بۆتـەوە لـەژوورەکـان کە ڕێـگـەی هاتنە ژوورەوەی ڕۆشناییە بەشێوەیەکی چاك. زۆری ژوورەکانی تر شێوەیەکی بچوك تری هەیە لەقەبارەدا، کە هەر یەکێکی لـەسێ مـەتـری چـوار گۆشـە تـێـپـەڕ ناکات کەئەویش بۆ حەوانەوەی ئاژەڵانو پەلەوەرە، هەروەها (هۆدە) هەیە بۆ هەڵگرتنی ئالیكو سووتەمەنی، هەروەها بڵاوبوونەوەی

چاڵ لە حەوشەی ماڵەكە بۆ هەڵگرتنی دانەوێڵە)[٦].

ژووری ئاژەڵان بەشێوەیەكی ئەندازەیی تایبەتی دروستكراوە كە دەرگاكانی لەناوەوەیە كە هەر یەكێكیان دەچێتە سەر ئەوی تریانەوە، هەموویان دەروازەیەكی سەرەكییان هەیە بۆ حەوشەی ناو ماڵەكە، كەئەمەش سوودی تایبەتی و سروشتی و مرۆڤی هەیە كە بۆ پاراستنیانە لەگەرماو سەرما)[٧].

حەوشەی ماڵەكەش بەشوێنێكی گرنگی ماڵەكە دادەنرێت كە خێزانەكەی تێیدا هاتووچۆی لێ دەكەن لەكاتی رۆژدا، بەتایبەتی لەهاویندا، و حەوشەكەی بە ووردە بەرد یان زیخ دەرێژن تا بۆ ئەوەی لەزستان نەبێتە قوورو لیتاو لەهاتووچۆدا.

زۆر كەم خانوویەكی لادێی بدۆزینەوە، هەمووی لەیەك بكات، بەڵكو هەریەكەی لەویتریان جیاوازی هەیە لەرووی بیناكاریدا، بەڵام هەمووی یەك دەگرێتەوە لەجۆری ژوورەكاندا، كە هەموویان ژووری دانیشتن و خەوتن و ئاژەڵان و شوێنی هەڵگرتنی میوەو پێویستی تری ناو ماڵ پێك دەهێنن. زۆربەی خانووەكانیان پشتی لەرووی بایە، رووی خانووەكە بەرەو لای گردی دێیەكەیە، پەرژینی حەوشەكەی لای پشتەوە زیاتر بەرز دەكرێتەوە، وەكو لای پێشەوە، دەروازەی سەرەكی خانووەكە رووی لەلای تەختی دێیەكەیە بۆ ئەوەی بەئاسانی هاتووچۆی مرۆڤ و ئاژەڵان ببینرێت و تا چاو بڕبكات مرۆڤ بتوانێت بچووكترین شت هەست پێ بكات[٨].

بەكارهێنانی دوكەڵ كێشی سۆبەی ماڵەكە لەخانووەكەوە، كە ئەمیش جوانكارییەكی تایبەتی دەداتە دروستكردنی خانووەكە.

بەكارهێنان و هێشتنەوەی (گوێسوانە)، ئەویش بە دەركردنی زیادە لەم لاو ئەو لاوە كە هەم جوانی دەدات بەخانووەكەو هەم بۆ سێبەرو پاراستنی خانووەكە لە بەفرو باران، لەگەڵێك كاتدا (گوێسوانە) دارە ڕاكانی جیا دەكەن لەدارە رای ماڵەكە تا بۆ ئەوەی لەكاتی ئاگر كەوتنەوە ماڵەكە ئاگر نەگرێت و تەنیا گوێسوانەكە بگرێتەوە.

(بوونی ژووری ناوەندی هەیوان)، كە وەكو پەرستگای ماڵەكە وایە لەبەر نەبوونی دیواری چوارەم، كە بەبەشێكی گرنگ دادەنرێت، بەتایبەتی لەوەرزی هاوین و گەرمادا، هەندێك سەرچاوە هەیوان بە ژووری سێ دیوار دادەنێن، دەیگەڕێننەوە بۆ سەردەمی (ئیسلامی) و (ئەخمینی)، بەڵام ئەمە بریتییە لە هونەرێكی بیناكاری كوردی بنەڕەت، چونكە نموونەی ئەم جۆرە خانووانە لەخانووەكانی (كاردۆخ[٩]) دۆزراوەتەوە. بوونی كانی ژنان، شوورەكردنی لەناو گوندەكە لەبەر نەبوونی ئاو لەناو ماڵی كوردەواری.. كەئەمیش بریتییە لەجوانكارییەكی بیناكاری لادێی كوردەواری. بایەخدان بەهاتنە ژوورەوەی خۆر بۆ ناو خانووەكان، رووی خانووەكە لەو لایە دروست دەكرێت كە خۆر بێتە ژوورەوە، ئەمیش پاشماوەی بنەڕەتی ئایینی زەردەشتییە كە تاكو ئێستاكە رەگی تێدا ماوەتەوە. رازاندنەوەی پەرژینی ماڵەكەو سەربانی ماڵەكە بە رێكخستنی خشتی كاڵ لەباری ئاسۆیی و ستونی و باری چوار گۆشەیی و سێ گۆشەیی، لەهەندێك كاتدا بۆشی خستنە نێوانی بەشێوەیەكی ئەندازەیی.

رێكو پێك، بوونی (سەكۆ) وەكو شوێنێكی دانیشتن لەهاوین لە ناو حەوشەكەدا، كە هەم بۆ دانیشتن و نان خواردن و شوێنی خەوتنی گەورەی خاوەن ماڵەكەیە. (سەكۆ) بریتییە لە دروستكردنی شوێنێكی لاكێشەیی كە بەبەرزی نیو مەتر دروست دەكرێت لەرووی حەوشەكەوە، لەلاوە پەیژەی بۆ دروست دەكرێت بۆ سەركەوتن بۆ سەر سەكۆكە، زیاتر روویەكی تەخت و بەقوڕێكی چاك كەفماڵ دەكرێت. دروستكردنی تاقی لاكێشەیی چوارگۆشەی لەژوورەكاندا بۆ هەڵگرتنی شت و مەك تێدا كە وكو هونەرێكی بیناكاری پێویستی ماڵە. دروستكردنی جامخانەی قوڕین لەژوورەكاندا كەبە بەرزی مەترو نیوێك دروست دەكرێت و چەند خان و تاقێكی بۆ دەمێنێتەوە بۆ هەڵگرتنی شتوومەك و پێویستی ماڵ كە پێی دەوترێت (شوقلەت).

بەڵام ئەگەر سەیری ئەو ئامارانە بكەین كە دەربارەی قەوارەی لادێی ناوچەی كەركوك كراوە دەگەینە ئەم راستییانەی خوارەوە:

(ئەگەر سەیری رێژەی گوندی بچووك بكەین لەناوچەی كەركوكدا دەبینین كە (٤٥٪)ی رێژەی گوندی پارێزگاكەی داگیر كردووە، بەڵام ئەگەر سەیری رێژەی گوندی مام ناوەندی بكەین لەپارێزگاكە بریتییە لە (٥٢٪)ی كە ئەوەی تری دەمێنێتەوە بریتییە لە قەوارەی گوندی گەورە كە رێژەیەكی زۆر كەمی داگیر كردووە، بۆ زیاتر شارەزایی بڕوانە ئەو خشتەیەی خوارەوە)[١٠].

| ژ | قەوارەی ناحییەكان | قەوارەی گوندی بچووك | گوندی ناوەندی | گوندی گەورە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | مەركەزی | (٩٤) | (١٥٤) | (١) |
| ٢ | پارێزگا | | | |
| ٣ | كفری | (١٦٨) | (١٥٤) | (٢٩) |
| ٤ | چەمچەماڵ | (٩٨) | (١٤٤) | (٢٠) |
| ٥ | خورماتوو | (١٠١) | (١٠٦) | (٣) |
| | حەویجە | (١٦٢) | (٧٠٩) | (٣٩) |
| | كۆی گشتی | (٦٢٢) | (١٩٣) | (٣١)[١١] |

لێرەدا دەگەینە ئەو راستییە كەناوچەیەكی وەكو كەركوك نەبوونی رێژەیەكی زۆری قەوارەی گوندی گەورە خۆی دەبینێتەوە لەچەند هۆكارێكی سیاسی و ئابووری و كۆمەڵایەتی كە دەوریان بینیوە لە ناوچەكەدا، ئەمیش لەنەبوونی ئاسوودەیەكی سیاسی وایكردووە كە ببێتە هەڵگری پووكانەوەی ئەو قەوارەیە لەگوندی بچووك بچووك و مام ناوەنیدا، ئەم هۆكارە دەورێكی سەرەكی بینیوە لە كاریگەری بەسەر ئابووری و پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكانی دروست بوونی قەوارەی گوندی گەورە.




*** گرنگی بزوتنەوەی (هەقە) کانی ناوچەی کەرکوك لەهونەری بیناکاری گوندا:**

(یەکێ لە ڕووداوە بایەخدارەکانی ئەم سەدەیە (سەدەی بیستەم)ی کوردستانی خواروو بەرپابوونی بزوتنەوەی **(هەقە)یە**[١٢]، کە بزووتنەوەیەکی ئایینی- کۆمەڵایەتی بەراستی مەزن بوو. لەکۆتایی ساڵانی هەزارو نۆسەدو بیستدا بزوتنەوەیەکی ئایینی- کۆمەڵایەتی بەناوی (هەقە) وە پەیدا بوو. بنیاتنەری ئەم جوڵانەوەیە (شێخ عەبدولکەریمی شێخ مستەفای کوڕی حاجی شێخ ڕەزای عەسکەری بوو)[١٣].

**ئەوەی** لێرەدا گرنگە بزوتنەوەی هەقەکان دەورێکی کاریگەریان بینی لە ناوچەی کەرکوکداو بووە بنکەیەکی بەهێزی جوڵانەوەکەیان‌و وای لێ هات کە بووە تۆقی کاربەدەستانی حکومەت، ڕێو شوێن گیرا بۆ کپ کردنی جوڵانەوەکەیان. ئەوەی جێگەی باسە هەقەکان ڕەگێکی قووڵیان دروست کرد لەگەڵێك لایەنی کۆمەڵایەتی‌و بیناکاری‌و ئابووری‌و ڕۆشنبیری ناوچەکانی (شوان) بەتایبەتی‌و ناوچەکانی تری کەرکوك بەشێوەیەکی گشتی.

(هەر گوندێك چەند هەقەیەکی تیا بوایە، ئەو چەند هەقەیە خانوویەکیان لەو گوندەدا دەکرد بە (تەکیە) و، هەموو براو خوشکانی هەقەی گوندەکە لەکاتی دەست بەتاڵیدا یا کاتی کە میوانیان بهاتایە، یا کە پێویستیان بە پرس‌و ڕای ناو برایەتی‌و هەواڵ زانینی یەکتر بوایە، پێیان ڕادەگەیەنرا لەوێ کۆببنەوەو هەر پێشنیارێك ببوایە پێشکەش دەکراو تەگبیرو **ڕای ناو برایەتی دەکراو لەمەسەلەکە ئەدوان‌و** دەکۆڵرایەوە **لەم** تەکیانەدا ژیانێکی خۆش بەسەر دەبرا، بە تایبەتی لە کاتی دەست بەتاڵیدا بە تەبایی‌و خۆشی یەکترەوە بە گۆرانی وتن‌و ڕازو سەرگوزشتە گێڕانەوە قسەی نەستەق‌و ئامۆژگاری‌و باسی ئایینی‌و خواپەرستی‌و هەق پەرستی **دەکرا**.

**ئەم تەکیانە هەمیشە نموونەی پاك‌و تەمیزی بوون. پێڵاو بردنە ژوورەوە یان هەروەها پێڵاو بردنە ناو ژووری دانیشتن‌و نووستن لای هەقەکان قەدەغە بوو. لەهەر گوندێکدا** یەکێ لەهەقەکانی ئەو گوندە دەکرا بەلێپرسراوی تەکیەو **پێیان ئەووت** (سەر تەکیە)[١٤] هەروەها ئەم بارە هەرەوەزییە **لەو چەند** گوندەدا کەسەر بە حەمەسوور بوون حاڵ‌و بارێکی خۆشتری دروست کردبوو. پێش خەڵکی تر تراکتۆرو **مەکینەی تری کشتوکاڵیان کڕیبوو**، هەمووی موڵکی گشتی بوو. **لێرەدا دەگەینە** ئەم ڕاستییەی خوارەوە لە هونەری **بیناکاری (هەقە)کاندا:**

١. بەهۆی کاری ئەو هەرەوەزییەی کە **لەنێو هەقەکاندا** هەبوو، کاریگەری خۆی هەبوو لەسەر هونەری **بینکاری گوند** ودروستکردنی خانوودا، ئەویش لەو خاڵەدا خۆی **دەبینێەوە کە** دەورێکی باڵای هەبوو لەسازدانی پوختی هونەری بیناکاریدا، چونکە زیاتر کارە بیناکارییەکانی ڕێك‌و **پێکتر دەکردو زیاتر هاوشێوەیی‌و** باڵا دەستی خستنە گەڕی **تواناکان خۆی دەبینێتەوە.**

٢. **ئەوەی سەرنج دەدرێت** لەگوندی هەقەکاندا **پاك‌و پوختی بیناکارییانە ئەویش بەوەی وەرگیراوی بیروباوەڕەکانیان لەتەرزی بیناسازییەکەدا ڕەنگی دەدایەوە.**




٣. دروستکردنی (تەکیە)و (دیوەخان) بە یەکێك لە چالاکییە بیناکارییەکانی هەقەکان دادەنرێت، بایەخێکی زۆریان دەدا پێی و بەشتێکی گرنگی بیروباوەڕە ئایینییەکەیان دادەنا. تەکیە بریتی بوو لە هۆڵێکی گەورەی لاکێشەیی وا کە خۆی لەنزیکەی (١٠×٥)م دەداو شوێنێکی گرنگی هەقەکان بوو، کەبەتاقی فراوان رازاوە بوو بوو و هەواکێشی لەسەرەوە بۆ دانرابوو.

٤. هەروەها ئەوەی سەرنج دەدرا لەگوندەکانی (کلاوقوت)ی ناوچەی شوان رێکوپێکی بیناکاری بوو، کە ژوورەکانی دانیشتن لەگەڵ ژووری ئاژەلان بەدیوارێك جیاکرابۆوەو دەرگایەکی هەبوو بۆ هاتووچۆ.

٥. زیاتر ئەوەی سەرنج دەدرا لەخانووبەرەی هەقەکان هاوشێوەیی هاوچەشنی بوو لەدروستکردندا ئەویش خانووەکانیان جیاوازی ئەوتۆی نەبوو لەنێوان کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر، هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کاری هەرەوەزییەکەی نێوانیان کەهەموویان وەکو یەك یارمەتی یەکتریان دەدا لەدروستکردنی خانووبەرەی یەکتریداو هەموویان هەوڵیان دەدا کە هەمان شێوەی براکەی بەبێ جیاوازی بەدەست بهێنن.

*** کاریگەری بیروباوەڕی ئایینی کاکەییەکان لەسەر هونەری بیناکاری:**

کاکەییەکانی ناوچەی کەرکوکیش کاریگەری خۆیان بەجێ هێشتووە لەهونەری بیناکاری. ئەویش لەژێر کارتێکردنی ناخی ئەو بیروبۆچوونە نهێنییەی ئایینەکەیان، کە هەم رەگێکی ئایینە کۆنەکانی کوردستان‌و هەم رەگی ئایینی ئیسلامی تێدا هەیە، بۆیە ئەو کاریگەرییەی ئایینەکانی پێش ئیسلامی رەنگی داوەتەوە. ئەگەر سەیری بیناکاری خانووی کاکەییەکان بکەین دەبینین هەندێك تایبەتمەندی هەیە، چ لەرووی دروستکردن لەقەبارەی ژوورو لەدروستکردنی تەکیەو دیوەخان‌و شوێنی ئاژەڵ بەخێو کردن، کە وردە جیاوازییەکی هەیە لە هونەری بیناکاری لادێکانی تری دەوروبەری کاکەییەکان. یەکێك لەو تایبەتمەندییانە دروستکردنی (تەکیە)یە کە بریتییە لە ژوورێکی لاکێشەیی گەورە، شوێنی دروست کردنەکەی لەشوێنێکی چەپی ماڵەکە دروست دەکرێت، تا بۆ ئەوەی لەپاراستنی نهێنی ئایینەکەیاندا بەدوور بن لە هاتووچۆی کەسانی نامۆ. ئەم تەکیانە زیاتر لەو ماڵانەدا دروست دەکرێت کە لەچینی یەکەمی کاکەییەکانە کەئەویش (سەیدە)کانیان، کە ئەمانە لەگەڵ (مام)و (عام)دا زۆر جیاوازییان هەیەو هەڵگری نهێنی‌و رێکخستنی ئایینی کاکەییەکانن. هەروەها تایبەتمەندییەکی تری بیناکارییان دروستکردنی گومەزە، لەسەر گۆڕی پیاو چاکانیان کە شێوەیەکی تا رادەیەك قووچەکی هەیە، ئەم دیاردەیە بەزۆری لەگوندەکانیان بەرچاو دەکەوێت.

*** تایبەتمەندی هونەری بیناکاری‌و نەخش‌و نیگاری جولەکەکانی ناوچەی کەرکوك:**

جولەکەکانیش وەکو هەموو ئەو نەتەوانەی تری ناوچەکە خاوەنی کەلەپوورێکی گرنگی ئەو شارستانییەتەن کەلە ناوچەکەدا گەشەی کردووە، پاشماوەکانیان لەهونەری بیناسازی‌و تەرزی نەخش‌و نیگاری، شایەدی ئەو راستییەن‌و گەوایی فراوانی ئەو هونەرە دەدەن لە ناوچەکەدا. ئەو گۆڕانە



نەخشی ئەستێرەی داوود

مێژووییەی کەبەسەر ژیانیاندا هاتووە لەناوچەکەو ئەو ماوە درێـژەی ژیانی دەسبەسەریان، تا بەتەواوی کۆچکردنیان لەساڵی (١٩٥٠) بەرەو فەلەستین.

جولەکەکان توانیویانە خاسیەتێکی تایبەتی دروست بکەن، کە ببێتە هۆی ڕەنگدانەوەی لە جوانکاری خانووی جولەکە. چونکە ئەو پاشماوە مێژووییەی کە بەدەستمان گەیشتووە، ئەوە دەردەخەن کە توانای گۆڕانە مێژووییەکەیان تایبەت مەندییەکی بەربڵاوی دروست کـردووە کە لەگەڵ خۆیدا هەڵگری سەردەمەکانی پێوە دیارە.

ئـەوەی لـێرەدا گرنگە بیـڵێم‌و دەمـەوێـت بچمە نێو باسەکەمەوە جوانکاری لایەنەکانی هـونـەری بیناکاری‌و نەخش‌و نیگارو بەراووردکردنی ئەو جۆرە تـەرزە لەگەڵ هەڵگری بیناکاری سـەردەمـە مێژووییەکان‌و بـەراووردی لـەگـەڵ هـونـەری نـەتـەوەکـانی تـردا، کە تـاڕادەیـەك چەند تایبەتمەندییەکی جیای خۆی هەیە کە هەڵگری کۆمەڵێکی لێکچووە لە ناوچەکەدا.

جیـاوازی جیهانەکەیان وای کـردووە ببێتە هەڵگری سیفاتێکی تایبەت بـەوانـەوە، ئـەویش لـەو دیـاردەیـەوە خـۆی دەبینێتەوە کـە پێویستە بکەوێتە شیکردنەوەی قۆناغە مێژووییەکانی بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە، چونکە گەشەی ژیانیان زۆر جیاوازە لەگەشەی نەتەوەکانی تر، ئەویش لەوەی هەڵگری سیفەتە ئایینییەکەیان وای کردووە خۆیان لەقۆناغێکی ئایینی گرێدراو بەقۆناغە سیاسی‌و مێژووییەکەیان ببینێتەوە.

هێنانی ئەمانە (جولەکەکان) وەکو بەندکراوێکی جەنگ هـەر لـەسـەرەتـاوەو چـەوسـانـدنـەوەی بـەردەوامـیـان وای کـردووە کە بۆ خۆیان جیهانێکی تایبەت دروست بکەن‌و جوانکارییەکانیان لەو جیهانەوە خول بخواتەوە. بۆیە ئەگەر بمانەوێت ئەو جوانکارییە بزانین دەبێت هەموو لایەنەکانی ئەو جیهانەو تایبەت مەندییەکانی تاوتوێ بکەین، تا بگەینە ڕاستییەکان. چونکە جیهانەکەیان گرێ دراوە بە کۆمەڵێك کـاری چەوساندنەوە لـەلایـەن دەسەڵاتەکانی ناوچەکەوە کـەوای کـردووە خـۆی لـوول بـدات لەخولگەیەکی نهێنی هەڵگری هێما (ڕمز) ئایینییەکان‌و تاوانی ئەو نهێنییانەو ڕەنگدانەوەیان لەژیانی ڕۆژانەیاندا. بۆیە جۆری پەرستنیان بەستراوەتەوە بەترس‌و خۆشاردنەوەو خۆپاراستن کە لەگەڵ



نەخشی نەخشکارێکی جوولەکە لەسەر مزگەوتێك لە کفری



یەکێك لە قوتابخانەی جوولەکەکان لە کەرکوك

خۆیدا ئەم نووچ دانە کاری کردۆتە سەر بیرکردنەوەی ئارەزووی ئەم مرۆڤە بۆ شتەکان و ئەفراندنی دروستکردنی شتەکان، هەوڵی داوە ئەوە بەدەست بهێنێت لەچوارچێوەی هێماکاندا خۆی ببینێتەوە، تا بەوەی کەس گێچەڵی پێ نەکات و سەر ئێشەی بۆ دروست نەکات.

ئەوەی لەهونەری بیناکاریی و نەخش و نیگاردا بەرچاو دەکەوێت کە تەرزی خانوو دروست کردنیان هەڵگری چەند لایەنێکی هەیە کە رەچاوی باری کۆمەڵایەتی و ئایینی و ئابووری ژیانیان کراوە بۆ کاتی تەنگانە. تواناکانیان بۆ ئیشکردن و هەوڵدان بۆ هەموو کارێکی قورس و گران وای کردووە بتوانن مامەڵە لەگەڵ بازاڕدا بکەن و بژێوییەکی ئابووری گەشە بوو بە دەست بهێنن، کە بتوانن خۆیان لەقۆناغی نەبوونی و کەم دەرامەتی رزگار بکەن کە ئەم گەشەی ئابوورییە رەنگی داوەتەوە لەتەرزی بیناکاریی و دروستکردنی خانوو بەرەکانیان، ئەویش لەچوارچێوەی بژێویان خوولی خواردووە، کە خاوەنی دەرامەتێکی چاك بوونە بۆیە هەردەم بایەخیان بەجۆری بیناکاریی و بەکارهێنانی نەخش و سیمای گشتی خانووەکانیان و جۆری بەکارهێنانی پێویستییەکانیان داوە لە ماڵەکانیاندا.

ماڵێکی جوولەکان نابینیت کە نەڕازابێتەوە بە جۆرەها نەخش و نیگاری جۆر بەجۆر کە دەربڕی هێمانی ئایینی و رەنگدانەوەی (تەوراتە).

هەروەها بەهۆی گۆشەگیرییان لەگەڵ موسڵمانەکان و مەسیحییەکانی کەرکوکدا، وای لێ هاتووە کە کارتێکردنی تەرزی بیناکاریی و نەخش و نیگاری موسڵمانان و مەسیحییەکانی کەم پێوە دیار بووە، نەخشە کێشانی خانووەکانیان جۆرێکی تر بووە کە تایبەت بووە بە جیهانی خۆیانەوە. زۆربەی پاشماوەکانیان کەوتۆتە بەر کاریگەری گۆڕان و شێواندنی تەرزی بیناکارییەکەی، ئەویش لەلایەن نەتەوەکانی ترەوە وەرگیراوە و لێی زیاد و تێکدراوە کە زیاتر چوارچێوەیەکی ئیسلامی وەرگرتووە، کە نموونەی ئەمەمان (مەرقەدی دانیاڵ پێغەمبەر)ە لەسەر قەڵا، کەلەبەر پیرۆزییەکەی چەند جارێك چاك کراوەتەوە و سیما بنەڕەتییەکەی لەدەست داوە و منارە و گومەزێکی شێوە بیناکاری موسڵمانەکانی بۆ زیاد کراوە یان هەیە لەو پاشماوانەیان بەتەواوەتی تێکدراوە و پاشماوە نەماوە وەکو پەرستگای (تەورات) و قوتابخانەی (هۆراس خزوری).

*** قوتا بخانەی هۆراس خزوری:**

ئەمە یەکێکە لە هونەری بیناکاری جولەکەکان لەناوچەی کەرکوك، کە بریتییە لە خانوویەکی دروستکراو لەخشتی سوورەوەکراو، کە دابەشکراوەتە سەر دوو چینی خانووەکە لەهەریەکەی کۆمەڵێك ژووری لەخۆی گرتووە کە هەیوانی ژوورەکان لەسەر کۆڵەکەی بازنەیی راوەستێنراوە، لە رووی قوتابخانەکە لەسەر چوار کۆڵەکەی بازنەیی راوەستاوە لەسەر سنگ و ژێری کۆڵەکەکان بەبنکەی چوار گۆشەیی راگیراوە کە بەرزی ئەوبنکانە نزیکەی (١٠–١٥) سانتیمەتر دەبێت و درێژی کۆڵەکەکانی دەرەوە نزیکەی چوار مەتر دەبێت.. و لەسەرەوەی کۆڵەکەکانی دەرەوە ریزێك خشت لەسەر باری درێژی دانراوە کە جوانکارییەکی داوە بەرووی قوتابخانەکە، بەڵام رووی دەرەوەی چینی سەرەوە وەکو شێوەی بەلەکۆنەیەکی بۆ دروستکراوە بۆ راوەستان و بینینەکە بە پەرژینی ئاسنین رازاوەتەوە. دەربارەی شێوەی پەنجەرەکانی لەدار دروستکراوە و شێوەیەکی لاکێشەیی هەیە و بەشیش لەنێو دارەکان تێك هەڵکێش کراوە. هەروەها بێجگە لەم قوتابخانەیە گەلێك قوتابخانەی تری جولەکە هەبوو لەشارەکەدا (بۆ نموونە دوو خانووی زۆر گەورە هەبوو کە لەکاتی خۆیدا قوتابخانە بوو کەلەدوای ساڵی (١٩٤٩) دا کرایە قوتابخانەیەکی نیشتمانی بۆ پیشەسازی کەلەدواییدا کرایە ناوەندی (الشرقیة)[١٥]، بەڵام هیچ پاشماوەیەکی ئەوتۆی نەماوە تا بەراووردی رووی بیناکاری بکەین، ئەوەی کە ماوە گەلێك کاری بیناسازی تێدا کراوە کە رووە راستەقینەکەی لەدەست داوە.



قوتابخانەی هۆراس خزوری

*** هونەری بیناکاری خانووبەرەی جولەکەکان:**

ئەگەر سەیری هونەری بیناکاری خانووبەرە کانیان بکەین، دەبینین هەلگری چەند سیفاتێکی هونەری بیناکاری خانووبەرە بوونە لەکەرکوکدا، بەڵام لەهەمان کاتدا هەلگری چەند تایبەتمەندییەکی هونەری بیناکاری جولەکەکان بووە، کە مۆرکی جوداخوازی پێوە دیارەو تایبەتمەندی جیهانەکەیان بووە، کە هەر لەسەیرکردنێکی سەر پێی هەست بەو وردە جیاوازییە دەکەی.

ئەوەی لەهونەری بیناکارییان بە دەر دەکەوێت کە بایەخ دانە بەهەموو ڕوویەکی گرنگی ناوماڵ، بۆیە لەگەڵ خۆیدا دەبێتە ڕاپێچی، گەلێك ڕووی بیناکاری بۆ دابینکردنی ئەو پێویستییانە. ئەویش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە لەدروستکردنی ژێر زەمین و باخچەو ژووری بچووك بچووك بۆ هەلگرتنی پێویستی ناوماڵ، هەروەها لەدروستکردنی ژووری تر لەچینی دووەم. زۆری خانووبەرەی جوولەکەکانی کەرکوك بریتیە لە دوو ژووری ئەملاو ئەولاو، دروست کردنی هۆڵێکی ناوەندی فراوان لەنێوانیاندا، کە ڕووی هەردوو ژوورەکەی ئەم لاو ئەو لای دەڕواننە سەر هۆڵەکە، کە هۆڵەکە لەخۆیدا دەبێتە ژووری سێیەم لەڕووی بیناکارییەوە.

لەپێشی ئەم دوو ژوورەو هۆڵەکەدا دەرگایەکی هەیە کە لە دەرەوە دەڕوانێتە سەر باخچەیەکی گەورە کە هەر لەدەرگای دەرەوە تا دەرگای ژوورەکەی داگیر کردووە، هەر لەحەوشەکەدا پێویستی پێشاو گەرماوی لێ جیاکراوەتەوە. هەروەها ماڵێکی جوولەکەکان نابینیت کە ژێر زەمینێکی تێدا نەبێت کەلەهەندێك ماڵدا لەژێر زەمینێك زیاتری تێدا هەیە، لەهۆڵەکەوە بەپەیژە دەچێتە ژێر زەمینەکە. ئەوەی سەرنج دەدرێت لەهۆڵی ماڵی جولەکەکاندا بوونی سەکۆیە بەچوار دەوری هۆڵەکەدا بۆ دانیشتن و ڕازاندنەوەی بەبەردی مەڕ مەڕو نەخشاندنی بە جۆرەها نەخشی جۆربەجۆر ئەویش زیاتر نەخشەکان لەخوارەوەی سەکۆکەوە بەدیار دەکەوێت و پانی هەر سەکۆیەك نزیکەی مەترێك دەبێت.

زۆری خانووەکانیان بەکۆڵەکەی مەڕ مەڕو کەوانەی نووك تیژ ڕازاوەتەوە، کە جوانکارییەکی تایبەتی داوە بەژوورەکان، بنمیچەکانی بە گومەت و گرێ دروستکراوە. ئەوەی سەرنج دەدرێت زۆری بەکارهێنانی تاقە لەژوورەکاندا زۆرتر بریتیە لە تاقی شێوە کەوانەیی و ڕازاندنەوەی سەرەوەی تاقەکان بەنەخشی جۆراوجۆر، کە زۆری نەخشەکان بریتییە لە نەخشی ڕووەکی گەڵا یان کە بەدرێژایی تاقەکە ڕازاوەتەوە. دەرگای ژوورەکان و دەرگای دەرەوە ڕازاوەتەوە بەدەرگای پان و سەرەوەی شێوە کەوانەیی هەیە کەهەندێکی ڕازاوەتەوە بەبزماری سەر زل و پان، یان ڕازاندنەوەی بە نەخشی لاکێشەیی و چوار گۆشەیی یان تێك هەڵکێشی ڕووەکی لەگەڵ ئەندازەییەکاندا.

چوارچێوەی دەرگا سەرەکییەکان ڕازاوەتەوە بەبەردی مەڕ مەڕ وڕازاوەتەوە بەجۆرەها نەخشی ڕووەکی. ئەوەی لەهونەری نەخش و نیگاری ماڵی جوولەکەکاندا بەرچاو دەکەوێت، زۆری و چڕی نەخش و نیگارەکانێتی، داگیر کردنی بەشێکی فراوانی بنمیچی ژوورەکان و پشتێنەی سەرەوەی ژوورەکان بەنەخشی جۆراوجۆر کە بەشێکی ئەو نەخشانە بریتییە لەشێوەیەکی باوی ئەوەی هەبووە لەناوچەی کەرکوکدا، بەڵام بەشێکی تری تایبەتمەندی هەیە کە هەلگری سیفەتی شیکردنەوەی (میسۆلۆجیای تەوراتە) لەنێو چوونی وەرگرتنی ئەفسانەی تایبەت بەجیهانی جوولەکەوە یان لەو داب و نەریتانەی تایبەت بووە بەمرۆڤی جولەکەوە کە تێکەڵی ئەفسانەی نەتەوەکانی تری کەرکوك بووە، ئەمیش لەجوانکاری ئەو دەستانەوە بووە کە جوولەکە بوونەو کاری نەخشەکانیان کردووە، بەڵام ئەو دەستانەی غەیرە جوولەکە بوون تێك هەڵکێشی جیهانە ئیسلامییەکەی تێدا کراوە. ئەوەی سەرنج دەدرێت لەنەخش و نیگاری ماڵی جوولەکان چڕوپڕی فراوانی داگیرکردنی پانتایی نەخشەکانە ئەویش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە زۆری نەخشە ڕووەکییەکان زۆر بەناو یەکدا چوونەو ئەگەر زۆر بەووردی سەیری نەکەیت هەست بەجیاکردنەوەی گەڵاو لقی نەخشە ڕووەکییەکان ناکەیت، کە ئەم کاریگەرییەش لەژێر کارتێکردنی ڕەنگەکاندا خۆی دەبینێتەوە، کەڕەنگی نەخشەکان شێوەیەکی جیای ڕەنگی سروشتی نەخشەکانی وەرگرتووە. بۆیە لەو ڕوانگەیەوە هەست بەنامۆیی دەکەی لەچێژ وەرگرتن لە (استیعاب)ی نەخشەکان بەڵام ئەگەر ماوەیەك بەنێو جیهانی ڕەنگەکان ڕۆ بچیتە خوارەوە فراوانی جیهانی نەخشەکانت بۆ دەردەکەوێت و دەکەویتە شیکردنەوەی بنەما سەرەکییەکانی داب و نەریتی جوولەکەکان.

ئەوەی جووداوازی هەیە لەنەخش و نیگاری موسڵمانەکان جیاوازی ڕەنگە، کە موسڵمانەکان زیاتر ڕەنگی سەوزو شین زۆر بەکار دەهێنن، بەڵام جوولەکەکانی کەرکوك زیاتر هاوسەنگییەك لەنێوان ڕەنگەکاندا هەیەو تا ڕادەیەك ڕەنگی سوور زاڵە بەسەریدا. کە ئەمیش خۆی دەبینێتەوە لەخولگەی داب و نەریتی ئایینەکانی ناوچەی کەرکوك، کە کاریگەری تێك هەڵکێشی دروست کردووە، سەرنجێکی تری نەخشەکان بەکارهێنان و نەخشاندنی (ئەستێرەی داوود) ە، کە ئەمیش ڕازاوەتەوە لەنێو نەخشە ڕووەکییەکان و ناوەندی نەخشەکانی داگیر کردووە کە وەکو پیرۆزییەك سەیری کراوە یان لەپشتێنەی سەکۆکان و پەیژەی ماڵەکان ڕازاوەتەوە، کە بەڵگەی باوەڕ بوونە بە پیرۆزی ئەوەی لە میسۆلۆجیای تەوراتدا هەیە.

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

(*) باڵە خانوو: هەرچەندە کە زۆر گەڕام دەربارەی ووشەی بەرامبەری (شناشیل)، بەڵام لەکوردییدا هیچ سەرچاوەیەکم بەر دەست نەکەوت، بۆیە هەستاوم بەبەکارهێنانی ووشەی (باڵەخانوو) لەبەرامبەر (شناشیل) ئینجا نازانم تا چەندێك ووشەکەی پێکاوە.


(١) گۆڤاری (الف باء)، ژمارە (١٦١٥)، ساڵی سی و دووهەم، ئەیلول، ١٩٩٩، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:
(عندما تتحدث بصمت الحي)، هیند رەشید.
(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو.
(٣) گۆڤاری (افاق عربية)، ژمارە (٥) ايار (١٩٨٨)، لاپەڕە (٩٥-٩٦)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناو نیشانی:
(الشناشيل طراز معماري عربي اصيل)، حەمید محەمەد حەسەن.
(٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٩٥)
(٥) (تاريخ فن العمارة العراقية في مختلف العصور)، شەریف یوسف، بەغدا، ١٩٨٢، لاپەڕە (٦٠٤-٦٠٥)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:
(البيت الريفي الكردي في شمال العراق).
(٦) (الأكراد، دراسة جغرافية اثنوغرافية)، د. شاکر خەسباك، زانکۆ بەغدا، چاپخانەی (الشرقية)، ١٩٧٢، لاپەڕەکانی (١٥٧-١٦٣).
(٧) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (١٦٥).
(٨) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (١٥٩-١٦٠).
(٩) (تاريخ فن العمارة العراقية)، هەمان سەرچاوەی پەراوێز (٢٢)، لاپەڕە (٦٠٨).
(١٠) گۆڤاری (شمس كردستان - ڕۆژی کوردستان)، مانگی ئابی ١٩٧٦، لاپەڕەکانی (١٩،٢١)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:
(حجم القرية الكردية والعوامل المؤثرة فيه)، فوئاد حەمە خورشید،.
(١١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٠).
(١٢) (ئاوڕدانەوەیەك لەبزوتنەوەی هەقە)، مستەفا عەسکەری، چاپخانەی عەلا، بەغدا، ١٩٨٣، لاپەڕە (٤).
(١٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٠).
(١٤) هەمان سەرچاوە لاپەڕە (٤٣،٤٤).
(١٥) (المدارس اليهودية والايرانية في العراق، دراسة مقارنة)، د.فازڵ ئەلبەراك، چاپی دووەم، بەغدا، ١٩٨٥، لاپەڕە (٣٠).

## بەشی هەشتەم

# هونەری بیناکاری و نەخش و نیگاری مزگەوت لە ناوچەی کەرکوکدا

یەکێك لەو دیاردە گرنگانەی هونەری بیناکاری ناوچەی کەرکوك، هونەری دروستکردنی مزگەوتە، کە بەیەکێك لە کۆڵەکە گرنگەکانی هونەری بیناکاری ئیسلام دادەنرێت لەناوچەی کەرکوکدا، مێژوویەکی دووروودرێــژی هەیە لەسازدانی تەرزی بیناکاری و نەخش و نیگاردا، کە تا رادەیەك جوداوازی و جوانکاری خۆی هەیە زۆر جیاوازە لە هونەری بیناکاری خانووبەرەو بازاڕو خان و شوێنە گشتییەکانی تری ناو شاری کەرکوك.

لــێرەدا دەتـوانـین بگەینە ئەو راستییەی کە هونەری بیناکاری مزگەوت خاوەنی تایبەت مەندی خۆی هەیە، پێویستە بەچاوێکی تایبەتییەوە سەیری بکرێت، لەهەمان ئەو کاریگەرییەوە ناوچەکە هەڵگری خاسیەتی خۆیەتی لە رووی بیناکاری مزگەوتەوە.

(مزگەوتەکانی ئیسلام شتێکی ئەو تۆی تێدا نییە، بریتییە لە گۆڕەپانێکی گەورە یان زەوییەکەی بچووك، کە هەموو دەم چاك و تەخت دەکرێت و شوێنی رووی بەرەو قیبلە دیاری دەکرێت، شوێنی نوێژ کردن دیاری و رێك دەخرێت، ئەم پانتاییە یان شوورە رێژ دەکرێت یان شوورە رێـژ ناکرێت، زەوییەکەی بەبەردی گـەورەو پاك تەخت دەکرێت، لەسەر هەموو ئەمانەوە دیوارو بنمیچ و گومەت و منارەی بۆ دروست دەکرێت، یان ئەگەر هەموو ئەمانەی لەسەر دروست نەکرێت هیچ شتێك لەمەسەلەکە ناگۆڕێت، ئەو مزگەوتە هەر بەسانایی و پیرۆزی دەمێنێتەوە کە هیچی کەمتر نییە لەمزگەوتە گـەورەکـان، چونکە لـەبـەر ئـەوەی مزگەوت پیروباوەڕو رووحە)[1].

ئـەگـەر سـەیـری مـێـژووی بیـنـاکـاری مـزگـەوت بکەین لـەنـاوچـەکـەدا، دەبینین خـاوەنـی هـەڵـگـری سیفاتەکانی سادەیی و سانایی لـەدروست کـردن و پـیرۆزی لە شوێن، بەرچاوگرتن و بایەخ پێی و هەوڵدان بۆ تازەکردنەوە، رێگە دان بەهێنانی تـەرزی تـازە بابـەت بۆ سازدانـی هونەری مزگەوتەکە هەروەها پێویستی بوونی مزگەوت لەو شوێنەی ژیانی تێدا هەیە، هـەر لەبەر ئەم پێویستی بوونانە وای کردووە کە ناوچەکە بایەخ بەدروست کردنی مزگەوت بدات و هەوڵی چاککردنی زیاترو گەورە کردنەوەی بدات.

لادێیەکی ناوچەی کـەرکوك نـەبووە کە مزگەوتی تێدا نەبێت و بایەخی خۆی نەبوو بێت.. باسی ئـەوەمان کرد کە گوایە سەرەتای هـونـەری بیناکاری مزگەوت لەشاری کـەرکوك و دەوروبـەریـدا تەنیا بریتی بـووە لەوەرگرتنی هونـەری بیناکاری کڵێسەو سازدانـی لەچوارچێوەیەکی ئیسلامیدا، کە زۆر نموونەیان لەو تێك هەڵکێشە بیناکارییە هێنا بووە بۆ کاری بەراوورد کاری وەکو وەرگرتنی کت و متی بیناکارییەکەو پیرۆزی شوێنەکەو لەبەر چاوگرتنی پیرۆزی ئەو شوێنەی کە کڵێسەکەی کراوەتە مزگەوت لەبەر چاوی خەڵکیدا.

بـەڵام ئـەوەی کە لـێرەدا پێویستە باسـی لـێوە بکەم لەهونەری بیناکاری مزگەوت بریتییە لە ماوەی فەرمانڕەوایی عوسمانییەکان و دوای عوسمانییەکان. ئەویش دەتوانین بەقۆناغێکی نوێی دابنێن لە هونەری بیناکاری مزگەوتدا.. لەو ماوەیە دا ژمارەیەکی زۆر مزگەوتی تێدا هەبووە کەهەندێکی تاکو ئێستا کە هەر بەردەوامەو هەندێکی تری لە رووخاندایە کە نـموونـەی مـزگـەوتـەکان ئەمانەیە: مـزگـەوتـی تەکیەی تاڵەبانی (مزگەوتی مەجیدیە)، مزگەوتی خـادم سجادە، مزگەوتی نائیب، مزگەوتی ئیبراهیم تکریتی، مزگەوتی منارە نەخشینە، مزگەوتی ئیمام قاسم، مزگەوتی دڵی باش، مزگەوتی سەر پردەکە، مزگەوتی هیندییەکان، مزگەوتی شێخ حـوسـامـەددیـن، مـزگـەوتـی سـەید غـەنـی، لـەگـەڕەکی ئاخوور حوسێن. بەڵام ئەگەر هەڵوێستەیەك بکەین لەگەڵ ئەو مزگەوتانەدا، چەند سەرنجێك لامان گەڵاڵە دەبێت:-

١. ئەوەی بەرچاو دەکەوێت لەم مزگەوتانەدا فراوانیو قەبەییە لەدروست کردنیدا، کە تارادەیەکی چاك پانتاییەکی گەورەی داگیر کردووە، ئەویش لەشوێنی فراوانی نوێژ کردنو درێژی منارەو گەورەیی گوومەتو چەندینی لەژمارەی گوومەتەکانداو رازاندنەوەی منارەکان بەنەخشی جۆر بەجۆر.

٢. ئەوەی بەسەر هونەری بیناکاری ئەم مزگەوتانەدا هاتووە، تازەکردنەوەیەتی بۆ چەند جارێكو گۆڕینی رووی تەرزی بیناکاریەکەی، کەوای لێ هاتووە گۆڕانە مێژووییەکانی نەناسینەوە، ئەمیش بە تایبەتی لەفەوتاندنو لەدەست دانی نەخشەکانیدا زیاتر کاریگەرییەکە بەرچاو دەکەوێت.

٣. بە هۆی ئەو تازەکردنەوەی کە بەسەر مزگەوتەکاندا هاتووە بۆتە فەوتاندنی بەشێکی زۆری نەخشەکانو سڕینەوەو سپی کاری بەشێکی زۆری ئەو نەخشانە کە ئەمە وای کردووە نەتوانین بەراووردێکی نەخشەکان بکەین بۆ دۆزینەوەی ماوە مێژووییەکان، چونکە لەسەرەتای دروستکردنیدا جۆرە نەخشێك بەکار هاتووە، بەڵام لەگەڵ چاککردنیدا نەخشی تر جێگەی گرتۆتەوە، یان بەتەواوەتی نەخشەکان سڕاونەتەوە وەکو ئەوەی مزگەوتی گەورەی تاڵەبانیو مزگەوتی (نوعمان) یان هاتوونە تێك هەڵکێشی لایەکی نەخشە کۆنەکەیان لەگەڵ نەخشە تازە بابەتەکەدا ساز داوە وەکو ئەوەی دەرگای مزگەوتی ئیبراهیم تکریتی کە چوار چێوەکەیان بەنەخشی تازە بابەت رازاندۆتەوە کەزۆر لایەنی سازداوە لەگەڵ دەرگا دارینەکەیدا.. یان هەیە لەنەخشەکانیدا لێی کەوتووە هاتوونە بەنەخشی زۆر جیاواز لەوە تەنانەت لەرەنگیشدا جیاواز رازاندۆتەوە، وەکو ئەوەی مزگەوتی (نوعمان) زۆربەی نەخشی مزگەوتەکان کەوتۆتە بەر دەرگاو پەنجەرەو بنمیچو شوێنی میحرابو منارەو ناوەوەی گومەتەکان، بەڵام شوێنەکانی تر هیچ جۆرە نەخشێکی تێدا نییە.

بەکارهێنانی رەنگی سەوزو شینی زۆر بەشێوەیەکی فراوان لەسازدانی نەخشو نیگارەکاندا، ئەویش زیاتر کەوتۆتە بەر کاریگەری پیرۆزی ئەم رەنگە لەبەکارهێنانیدا لەناوچەی کەرکوك. زۆربەی ئەو نەخشانەی کە بەکارهاتووە لە نەخشاندنی مزگەوتەکاندا، بریتیە لەنەخشی رووەکی جۆر بەجۆرو چڕ، بەیەکدا چوو یان بەکارهێنانی نەخشی لەبزینەییو چوار گۆشەییو لاکێشەیی تێك هەڵکێش لەگەڵ نەخشە رووەکییەکاندا.

زیاتر نەخشی مزگەوتەکانی کەرکوك کاریگەری لاساییکردنەوەی پێوە دیارە، لەچوارچێوەیەکی ئیسلامییانەی مزگەوتە بەشێوەیەکی گشتی، بۆیە زۆر کەم تایبەت مەندی نەخشو نیگاری خۆماڵی پێوە دیارە، وەکو ئەوەی کە نەخش کراوە لەمزگەوتی (نائیب)، کەلەلایەن (عەلی نەقاشی) سنەییەوە نەخشێنراوە کە خاوەنی ڕەگێکی خۆماڵییە کە جیاوازە لەنەخشی مزگەوتەکانی تری هەمان ماوە.

دیاردەیەکی تر کەلەنەخشو نیگارەکاندا بەکار هاتووە، بەکارهێنانی (خەتی عەرەبی) یە لەنەخشاندنی رووی دەرەوەو ناوەوەی مزگەوتەکە کەهەندێك جار تێك هەڵکێش کراوە لەگەڵ نەخشەکاندا، وەکو جوانکارییەك بەکارهێنراوە، ئەو خەتانەی کە بەکارهێنراوە بریتییە لەئایەتی قورئانو حەدیسەکانی پێغەمبەرو پەندو ئامۆژگارییە ئاینییەکان.

جۆری نەخشەکان یان لەسەر گەچەکە یان لەسەر مەڕ مەڕ یان لەسەر خشتی سوورەوەکراو هەڵکەندراوە. کە ئەمیش هەریەکەی خاوەنی تایبەت مەندی خۆیەتی لەبەرکارهێنانی جۆری نەخشەکاندا.

جۆری کەرەستەی بەکارهێنراو لەمزگەوتەکاندا بەردو گەچە بەشێوەیەکی زۆر فراوان، کە زۆربەی مزگەوتەکان بەو دوو کەرەستەیە رازاوەتەوە، ئەویش لەبەر زۆری ئەو دوو کەرەستەیە لەناوچەکەدا، ئاسانی بەدەست کەوتنو کەمکردنی ئەرکی گواستنەوەی یەکێك لەو کەرەستانە بەکارهێنانی خشتی سوورەوەکراوە، کەئەمیش زۆری لەرووی مزگەوتو گومەتی مزگەوتەکاندا بەکارهێنراوە، وەکو گوومەتی مزگەوتی (خادم ئەلسوجادە)، کە جوانکاری کراوە لەریزکردنی خشتەکاندا، لەهەرەیەکە لەمنارەکانی تەکیەی تاڵەبانیو مزگەوتی منارە نەخشینەدا.

دارو تەختەو ئاسنیش لەرازاندنەوەی دەرگاو پەنجەرەکان بەکار هاتووە، لەگەڵ سوود بینین لە مەڕ مەڕ لەنەخشاندنی چوارچێوەی دەرگاو پەنجەرەی مزگەوتەکاندا، یان لەهەڵکۆڵینی مێژووی دروستکردنی مزگەوتەکاندا.

٥. ئەوەی بەرچاو دەکەوێت لەمزگەوتەکانی ناو شاری کەرکوکدا، کەمی بەکارهێنانی منارەیە بۆ مزگەوتەکان وەکو ئەوەی کە نییەتی لەهەریەکە لەمزگەوتی (نائیب)و (مزگەوتی سەر پردەکە)و (مزگەوتی خادم ئەلسوجادە)و گەلێکی تر.

*** مزگەوتی ( منارە نەخشینە ):**

یەکێکە لەو مزگەوتانەی کە مێژوویەکی دووردرێژی هەیە، دەگەڕێتەوە بۆ ماوەی فەرمانڕەوایی دەسەڵاتی عوسمانییەکان کە مێژووی دروستکردنەکەی (١٢٣٣)ی کۆچییە کە دەکاتە (١٨١٢) زایینی. بەڵام ئەگەر سەیری بکەین دەبینین گەلێك رووی بیناکاری لەدەست داوەو هیچ شتێکی ئەوتۆی نەماوەتەوە لەهونەری بیناکاریەکەی، چونکە لەبەر ئەوەی چەند جارێك دەستی پێدا هێنراوەتەوەو گۆڕینێکی گەورەی بەسەردا هاتووە. ئەوەی کە بۆمان بەجێ ماوە تەنیا لەرووی مێژوویی بیناکاریەکەوە منارەکەیەتی، ئەویش لەبەراوردی ئەو وێنانەی بەدەستم گەیشتووە لە بەراوردی نەخشەکانیدا، کە دووبارە لە ساڵانی (١٤٠٥) ی کۆچی (١٩٨٤)ی زایینی تازە کراوەتەوەو گەلێك رووی مێژوویی لەدەست داوە.

ئەوەی بەدەستمان گەیشتووە لەماوەی عوسمانییەکان دەتوانین منارەکە بکەینە سێ بەشەوە، بەشی یەکەمی کە لەنیوەی زیاترە بریتییە لە نەخشی هێڵی شکاوە کە تا سەرەوەی ئەم بەشە بەردەوام بووە یان لەگەڵ نەخشی تردا تێکەڵ کراوە، زانیاریمان دەربارەی نییە.

لەسەری ئەم بەشەوە ڕیزێکی تر بەخشت رازاوەتەوە وەکو شێوەی دەرپەڕاندنی خشتەکان کە شێوەی (مقرنص)




نەخشێکی کۆنی منارە نەخشینە)

اتی وەرگرتووە، لەسەر ئەم ڕیزەوە سێ ڕیزی تر بەخشتەکان ڕازاوەتەوەکە وەکو شێوەی نیوە کوپەیەکی فراوانی دروست کردووە کە لەقەبارەی بەشەکەی یەکەم گەورەترە تا بۆ ئەوەی خەڵکی لێیەوە بووەستێت، ئینجا بەئاسن پەرژینی بۆ کراوە کەبەرزی ئەو پەرژینە ئاسنینە نزیکەی مەترێك دەبێت.

بەشی سێیەمی منارەکە دێت کەلەبەشەکەی یەکەم درێـژییـەکەی کـورت تـرە کـە هـیـچ جـۆرە نـەخـشـێـکـی لێ بەرچاو ناکەوێت لەوانەیە لەوێنەکەدا دەرنەچوو بێت یان نەخشەکانی کەوتبێت، لەسەری ئەم بەشەوە گومەزێکی بۆ کراوە کە سەری گومەزەکە بەسێ ئەستێرەی لەسەر یەکتری ڕازاوەتەوە. ئەگەر سەیری منارەکەی ئێستا بکەین دەبینین کە هەمان درێژی منارەکەی وەختی عوسمانییەکانە، بەڵام تەنیا گۆڕینی لەجۆری نەخشەکان، شێوەی دابەشکردنەوەی خشتەکاندا کراوە، هەروەها گۆڕین لەدەرگای منارەکەو بنکەی منارەکەو پەرژینە ئاسنینەکەدا کراوە.

لەکاتی تازەکردنەوەدا تەنیا بەشی یەکەمی نەخش‌و نیگاری منارەکە چاك کراوەتەوەو بەشەکانی سەر پەرژینەکە وەکو خۆی بەبێ نەخش، بەجێ هێڵراوەو نەخشی بۆ دانەنراوە. بنکەی منارەکە بەبەرزی مەترو نیوێك هەڵساوە کەشەش ڕووی هەیە، بەڵام ڕوویەکانی بەرێك‌و پێکی دانەمەزراوە، لەسەر بنکەوە ڕیزێك نەخشی گوڵی هەیە، ئینجا ڕیزێك نەخشی هێڵی شکاوە دروست کراوە، لەدوایدا دووبارە ڕیزێك لەنەخشە گوڵیەکە دووبارە کراوەتەوە، لەسەر ئەمانەوە شریتێکی ڕەنگی شینی بەقەبارەی تەنیشتی خشتەکان ڕازاوەتەوە، لەسەر ئەم شریتەوە ڕازاوەتەوە بەنەخشی لەبزینەی گەورەو بچووك، بەڕەنگی سپی‌و شین، کە بریتییە لەیانزە نەخشی لەبزینەیی سپی‌و یانزە نەخشی لەبزینەی شین.

لەسەر ئەم نەخشانەوە شریتێکی تری شین هاتۆتەوە، کەلەسەر ئەمەوە سێ ڕیزی تر نەخشی جۆراوجۆر ڕازاوەتەوە، کە دووبارە نەخشە شینەکە هاتۆتەوە کەلەوەو دوا گومەتەکە فراوان کراوەتەوە بەبەرزی مەترێك نەخش کراوە بەنەخشی جیاواز لەبەشی یەکەمی منارەکە کە دابەشکراوەتە سەر خانەی لاکێشەیی‌و نەخشی شێوە لەبزینەیی لەناو یەکتریدا.

* مزگەوتی ( خادم ئەلسوجادە ):

ئەم مزگەوتە کەوتۆتە گەڕەکی بولاق لەپشت گەراجی ئوتومبێلەکانی سلێمانی، کەلەنێو ماڵەکاندایە.. سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە گوایە ئەم شوێنە لەسەردەمی سوڵتانی عوسمانی (عەبدولحەمید خان) دروستکراوە، ئەو شوێنەی بەدیاری داوە بەخێزانی هەڵگری بەڕەی نوێژکردنی پێغەمبەر، هەر بۆیە مزگەوتەکەش بەناوی مزگەوتی (خادم ئەلسوجادە) وە ناونراوە. هەر لەبەر ئەم هۆیە بوو زۆر لە سوڵتانەکانی عوسمانییەکان هەوڵیان داوە ئەو بەڕەیە

بگوێزنەوە بۆ ئەستەمبوڵو لەمۆزەخانەی (تۆپ قاپوو)ی دابنێن بەڵام نەیانتوانی بگەنە هیچ ئەنجامێك بۆ کارەکەیانو بێ ئەنجام بوو[٧]. ئەوەی لەپاشماوەی ئەم مزگەوتەدا بۆمان بەجێ ماوە تەنیا گومەتەکەیەتی، کەسەرتاپای مزگەوتەکە داڕوخاوەو بەکەڵك نەماوە، هیچ شوێنەوارێکی مێژوویی نەماوە تا لەکاتی بەراوردە مێژووییەکان بەکار بهێنرێت.

گومەتەکەی رازاوەتەوە بەخشتی سوورەوەکراو لە دەرەوە، کە هەر لەبنکەیەوە بەخشت هەڵچنراوە، تا لووتکەی گوومەتکە رۆیشتووە، خشتەکان لەسەر باری پانی داڕێژراوەو بەشێوەیەکی وا رازاوەتەوە کە بە شێوەیەکی هەرەمی ریز کراوە بەرەو سەرەوەو بەرەو خوارەوە، کەلە نێو ئەو پێچەوانەوە شێوەی گوڵی دەرچووە، کە ناوەوەی خشتەکان بەرەنگی شین رەنگ کراوە، کەلەدوورەوە جوانکارییەکی وای داوە بەنەخشەکان، وەکو لەبزینەیی دیارە لەدوورەوەو لەنزیکەوە وکو گوڵ بەدیار دەکەوێت.

*** تەکیەی تاڵەبانی (مزگەوتی مەجیدیە):**

ئەم تەکیەیە لەسەردەمی شێخ مەحموودی زەنگنەدا دروست کراوە لەساڵی (١١٨٥)ی کۆچی بەرامبەر (١٧٦٤)ی زایینی، کە ئەم شێخ مەحموودە کوڕی (سەید یوسف)ە، یەکێکە لە پیاوە گەورەکانی ناوچەی (قەرەداغ)، هۆی ناو هێنانی بەشێخ مەحموودی زەنگنە دەگەڕێتەوە **بۆ** چاککردنەوەی کچی سەرۆکی عەشیرەتی زەنگنە لە نەخۆشی، بۆیە بەو ناوەوە بانگی دەکەن کە گوایە **هەموو دکتۆرو زاناکان دەستە وەستان بوون لەچارەسەرکردنیدا، لەبەر خۆشەویستی عەشیرەتەکە بۆی سەرۆکەکەیان کچەکەی خۆی لێ مارە کردووە، بۆیە ناونراوە بە زەنگنەیی.**

**ئەم شێخ مەحموودە دوو کوڕی هەبووە بەناوی ئەحمەدو** محەمەد، بەڵام شێخ مەحموود لەساڵی (١٢١٥)ی **کۆچی** (١٨٠٠)ی زایینی مردووە، کوڕەکەی شێخ ئەحمەد **تەکیەکەی** بەڕێوە بردووە، شێخ مەحموود هەر **لەتەکیەکە نێژراوە** شێخ ئەحمەد هەستا بەدروستکردنی **تەکیەیەکی تر لەدێی** تاڵەبان، وای دانا کە لقێکی تەکیەی گەورەی **کەرکوکە. شێخ** ئەحمەد لەساڵی (١٢٥٧)ی کۆچی (١٨٤١)ی **زایینی کۆچی دوایی** کردووە، لەتەکیەی کەرکوك نێژراوە، کە نزیکەی **١٥ کوڕو کچێکی لەپاش بەجێ ماوە، یەکێك لەکوڕەکانی شێخ ئەحمەد (شێخ عەبدولڕەحمان)ە، کە لەساڵی (١٢١٢)ی کۆچی (١٧٩٧)ی زایینی لەدایك بووە، کە ماوەیەك لەدێی (قرخ)و (تاڵەبان) دانیشت، بەڵام باوکی پێش کۆچ کردنی داوای لێ کرد کە بگەڕێتەوە بۆتەکیەی گەورە لەکەرکوك.**

**یەکێك لەو کارە گرنگانەی کە کردوویەتی گەورە کردنەوەی تەکیەکەو حەرەمەکەیەتیو دروست کردنی منارە بۆ تەکیەکە لەساڵی (١٢٦٠)ی کۆچی (١٨٤٤)ی زایینی کە دەکاتە سەردەمی سوڵتان (عەبدولمەجید)ی سوڵتانی عوسمانی، هەر لەو سەردەمەدا فەرمانێکی سوڵتانی دەرچوو بۆ مزگەوتەکە بەناوی (شێخ عەبدولڕەحمان)، لەبەر رێزگرتنی سوڵتان مزگەوتەکە ناونراوە بە مزگەوتی (مەجیدیە)، ئینجا لەدوای فراوانکردنی مزگەوتەکە بەرەو (نەجەف) رۆیشتووە** بۆ زیارەت کردن، هەر لەسەردەمی ئەم (شێخ عەبدولڕەحمان)ە دا، شاعیری گەورە (عەبدولڕەحمان مەولەوی) سەری لەتەکیە داوە. ئەم (شێخ عەبدولڕەحمان)ە جێگرو موریدی هەبووە لە (ئێران)و (عێراق)و (هندستان)**و** (تورکیا)و وڵاتانی تری ئیسلام، تەریقەتەکەی لەپاکستان **بەتەریقەتی** رەحمانی بەناوبانگ بووە، لە ساڵی (١٢٧٥)**ی کۆچی** (١٨٥٨)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە **لەتەکیەی تاڵەبان نێژراوە** لەکوڕەکانی شێخ عەلیو شێخ **عەبدولقادرو شێخ رەزاو شێخ** عەبدولواحیدو شێخ حەسەنە، **بەڵام دەربارەی.کوڕەکانی** شێخ ئەحمەد، هەریەکەی **لەناوچەیەکدا جێگر بوون، کەوتنە** بڵاوکردنەوەی تەریقەتەکەی **کە** شێخ عەبدولکەریم لەدێی (بادەوا)ی ناحیەی **(قەرەحەسەن)و شێخ** (محێدین) **لەدێی (سرتاب)و** (حاجیلە)و لەناوچەی (خانەقین)و (شێخ **عەبدولغەفور)** لەکۆیەو (شێخ عەبدولعەزیز) لەناوچەی **(گل)و (شێخ** حوسێن) لەدێی **بادەواو شێخ** محەمەد سالح لەشاری کەرکوك مزگەوتێکی دروست کرد بەناوی مزگەوتی هیندییەکان، شێخ محەمەد عارف لەدێی قەرەبلاغی قەزای کفری جێگیر بوو. لەدواییدا **شێخ عەلی** کوڕی شێخ عەبدولڕەحمان جێگەی باوکی گرتەوە لەتەکیە، کە لەساڵی (١٢٨٤)ی کۆچی (١٨٦٧)ی زایینی لەدایك بووە وە لەساڵی (١٣٣٠)ی کۆچی (١٩١١)ی زایینی لەتەکیە نێژراوە، بەڵام لەبەر زیرەکیو لێزانیو ناوبانگی، سوڵتان عەبدولحەمیدو وەزیرەکانی داوای دیتنیان کردووە بۆ ئەستەمبوڵ، بەڵام لەدواییدا رۆیشتووە بۆ حەج لە ساڵی (١٣٠٤)ی کۆچی (١٨٨٦)ی زایینی، نزیکەی ساڵێك **لەوێدا ماوەتەوە** لە تەك **گۆڕی پێغەمبەر، لەدوای خۆی وەسیەتی کردووە کەکوڕەکەی** (محەمەد عەلی) **لەجێگەی دانیشێتو کاروبارەکانی تەکیە بەڕێوە بەرێت، ئەم زاتە لە ساڵی (١٢٧٣)ی کۆچی (١٨٥٦)ی زایینی لەدایك بووەو لە ساڵی (١٣٥٢)ی کۆچی (١٩٣٣)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە. لەدوای شێخ محەمەد عەلی کوڕە گەورەکەی شێخ محەمەد جەمیل هاتۆتە جێگەی، کە لەساڵی (١٣١٠)ی کۆچی (١٨٩٢)ی زایینی لەدایك بووەو لە ساڵی (١٣٨١)ی کۆچی (١٩٦١)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە. ئەم زاتە دەستێکی باڵای هەبووە لەزانستی قورئانو لەبەرکردنو خوێندنەوەی قورئانو لە (تجوید)ی قورئانو زانستی (صرف)و (نحو)و زمانی عەرەبی (منطق)و (العقائد) و (الفقه)و هەروەها زانیاری دەربارەی زمانی فارسیو تورکی، لەدوای خۆی شێخ محەمەد جەمیل، کوڕە گەورەکەی شێخ عەلی جێگەی گرتۆتەوە.**

*** ماوە مێژووییەکانی هونەری بیناکاری نەخشو نیگارەکانی تەکیەی تاڵەبانی:**

**دەتوانین لەماوەی مێژووی دروستکردنی تەکیەدا سێ ماوە دیاری بکەین بۆ بەراوردی هونەری بیناکاریو نەخشو نیگارەکانی:**

**١. ئەم ماوەیە لەنێوان ساڵانی (١٧٧١-١٨٤٤)ی زایینی، ئەم ماوەیە هەر لەدروستکردنیەوە تا کاتی دروستکردنی منارەو گەورەکردنەوەی تەکیە کە کۆی دەکاتە ماوەی (٧٥)**



ی تەمەنی. لەم ماوەیەدا گەلێك گۆڕانی بەسەردا هاتووەو گەلێك ڕووی بیناکارییەکەی هەنگاوی ناوە بەرەو باشتر، بەڵام هەموو ئەوانەی کە لەو ماوەیەدا هاتوونە ئەو بایەخە بیناکارییەیان پێ نەدراوەو نەیان توانییوە کە لەڕووحێکی خواپەرستییەوە بیگوێزنەوە بەرەو چوارچێوەیەکی بیناکاری، چونکە لەو ماوەیەدا تەنانەت منارەو گومەتی نەبووە، بۆیە بەڵگەیە بۆ بایەخ نەدانی، کەرەستە بەکارهێنراوەکانی لەخشتی کاڵو قوڕو هەروەها بەردو گەچیش بەکار هاتووە، بەڵام بەشێوەیەکی زۆر فراوان نەبووەو هەر لەبەرەوە لێی زیاد کراوەو لەسەر نەخشەیەکی پوخت نەبووە لەچاو ئەو ناوبانگییەی کەهەیبووە، ئەوانەی کە تەکیەکەیان بەڕێوە بردووە ئەو ئارەزووە بیناکارییان نەبووە تا بایەخی پێ بدەن. دەربارەی هونەری نەخش و نیگار لەم ماوەیەدا هیچ بەڵگەیەکی مێژوویيمان نییە کە گوایە نەخش و نیگاری هەبووبێت.

٢- ماوەی دووەم لەنێوان ساڵانی (١٨٤٤-١٩٦٧) کە ئەم ماوەیە گرنگترین ڕووی بیناکارییە کە دەکاتە نزیکەی (١٢٣) ساڵی تەمەنی تەکیەیە، کە یەکەم هەنگاوێك کرا لەڕووی بیناکاریەوە دەگەڕێتەوە سەردەمی (شێخ عەبدولڕەحمان) لەساڵی (١٨٤٤)ی زاینیی کەهەستا بە گەورە کردنەوەی تەکیەو حەرەمی تەکیەکەو دروستکردنی منارە بۆ تەکیەکەو گۆڕینی گەلێك ڕووی بیناکارییەکەی لەڕووی ژوورو هەیوان و زیارەتگەو کەوانەو کۆڵەکەو گۆڕینی پەنجەرەو دەرگاکانی نێو تەکیەکە، کەئەمە لەسەردەمی سوڵتان (عەبدولمەجید)دا بووە.

دروستکردنی کەوانەی نووك تیژو چەماوە لەنێو کۆڵەکەکاندا، کەلەوانەیە لەکاتی تازەکردنەوەدا هەردوو شێوەکە بەکارهێنرابێتن هەروەها بایەخدان بە نەخش و نیگار لەسەر کەوانەی دەرگاو پەنجەرەکان و ڕازاندنەوەی بە بەردی مەرمەڕ، بەکارهێنانی داری تەختی سەرە بزمار، دەرگاکانی هەموو بێ نەخش بووە، پەنجەرەکانی لەتەختەو شیش دروستکراوە. یەکێك لەو دیاردە شارستانییەی کە بۆی کراوە ڕاکێشانی کارێز بووە بۆ ناو تەکیەکەو دروستکردنی حەوز بۆی لەنێو تەکیەکەدا.

*** منارەی تەکیە:**

منارەکە لەسەر بنکەیەکی لوولەکی بەرز دروست کراوە کە دەکاتە تا ڕادەیەك نیوەی گشتی منارەکە، کە قەبارەیەکی زۆر فراوانی هەیە زۆر لەقەبارەی بەشەکەی تر فراوانترە، زۆر بەڕوونی هەست بەجیاوازی قەبارەکانیان دەکرێت. ئەگەر سەیری ڕیزی نەخشەکانی بنکەکەی بکەین، دەبینین کە خانەو ڕیزی نەخشەکان بەناڕێکی دابەشکراوە، بەش نەکراوەتە سەر خانەی ڕێکو پێکەوە.

لەڕیزی یەکەم هێڵێکی نەخشی لەبزینەیی ڕازاوەتەوە کەلەسەر ئەم ڕیزەوە خانەیەکی تر نەخشی هێڵی شکاوەی لەسەر یەکتر هەیە، لەسەر ئەم ڕیزەوە خشتەکان لەسەرباری درێژی دانراوەو هونەرێکی جوانی نەخش و نیگار دەنوێنێت. ئینجا لەسەر هەموو ئەمانەوە نزیکەی پێنج ڕیز نەخشی هاو شێوە دێت کوتو مت وەکو نەخشەکانی مزگەوتی منارە نەخشینە وایە، ئەم کۆمەڵە نەخشانە بریتییە لەنەخشی هێڵی شکاوەو تێك هەڵکێش کردنی بەنەخشی لەبزینەیی





گەورەو بچووك، كە نەخشە لەبزینەییەکان بەسەرەو خوار (پێچەوانەی یەکتری) رازێنراوە. لەسەر ئەم پێنج ریزەوە، ریزێك نەخشی چوار گۆشەیی رازاوەتـــەوە، کەلەسەر ئەمانەوە ریزێکی نەخشی هێڵی شکاوە بە دەردەکەوێت، ئینجا دووبارە نەخشە لەبزینییەکان دووبارە بۆتەوە، هەر بەو شێوەیە نەخشە هێڵە شکاوەکان دووبارە بۆتەوە تا گەیشتۆتە سەرەوە كە لێرەدا بنکەی منارەکە کۆتایی هاتووە. رەنگی نەخشەکانی بنکەکەی زیاتر رەنگەکانی قاوەیی و شین و سەوز بەکارهێنراوە.

دەربارەی نەخشەکانی منارەکە دەتوانین بیکەینە سەر دوو بەشەوە، كە بەشی یەکەمی زیاتر لە سێ بەشی داگیر کردووە كە بریتییە لە هەمان نەخشە لەبزینەییەکانی بنکەکەی، بەڵام زۆر بەگەورە کراوەیی نەخشەکان نەخشێنراوە ئینجا لەسەر ئەمانەوە ریزێك نەخشی گوڵی رازاوەتەوە، لەسەر ئەمانەوە نەخشی تر هەیە، بەڵام وەکو بەدەردەکەوێت بریتییە لە نەخشی چوارگۆشەیی.

رەنگەکانی منارەکە زۆری رەنگی شین و سپی بەکار هاتووە لەنەخشەکاندا. لەسەری ئەم نەخشانە بەبەرزی مەترێك رووی منارەکە فراوان بۆتەوەو خشتەکان لەسەر باری رووی دەرپەڕیوەو رازاوەتەوە، کەوەکو دەردەکەوێت نەخشی بۆ ساز درابێت بەڵام هیچ شتێکی لێ نەماوە تا وەکو بەراووردی بکەین. لەسەر سەری منارەکەوە گومەزێکی بۆ دروستکراوە كە تەنیشتەکانی ئەم گومەزە رازاوەتەوە بەچەند ریزێك لەنەخشی لەبزینەیی و چوارگۆشەیی و هێڵی چەماوە.

٣. ئەم ماوەیە لەنێوان سالانی (١٩٦٧-١٩٨٠)ی زایینییەوە دەست پێدەکات، گۆڕانێکی گەورە رووی دا لەهونەری بیناکاری و نەخش و نیگارو سەرتاپای ئەو تەرزە گۆڕانی بەسەردا هات كە لەسالانی لەوەوپێش دروستکرابوو، ئەویش گۆڕانەکە لەگەورە کردنەوەی تەکیەکە بە شێوەیەکی گشتی و دروستکردنی بیناکاری تازە بابەت بۆی و رازاندنەوی لەسەر شێوە بابەتی تازە وەکو دروستکردنی هۆڵی دانیشتن و هۆڵی پرسە و کۆگای کەلوپەل و شوێنی وانە وتنەوە. هەروەها دروستکردنی چوار گوومەت كە یەکێکی گەورەو سیانی بچووك، بەڵام منارەکان هیچ نەخشێکی بۆ دروست نەکراوە.

گۆڕینێکی گەورەی تر کرا ئەویش رووخاندنی منارە کۆنەکەو دروستکردنی منارەیەکی تازە بابەت و درێژتر لەوەی ترو رازاندنەوە بە نەخشی تازە بابەت كە زۆر جیاوازە لەنەخشەکانی منارەکەی پێشوو.

ئەوەی كە سەرنج دەدرێت لەنەخشەکانی ئێستا زیاتر رازاندنەوەی منارەکەیە بەخشتی سوورەوەکراو، سازاندنی نەخشەکان لەسەر باری پانی و درێژی، دروستکردنی شێوەی کەوانەو تاق لەنێوان نەخشی گومەتەکاندا، كە بەرەنگی سەوزو شین و سپی نەخشێنراوە. بەڵام ئەوەی سەرنج دەدرێت لە دروستکردنی ئەم منارەیەدا، لەسەر بنەڕەتی بنکەیەکی شەش روویی، کەهەر روویەکی شێوە تاقێکی کەوانەی بۆ کراوە لەخشت و دەوروبەرەکەی بەنەخشی جۆراوجۆر رازاوەتـــەوە، بەڵام زیاتر رووی جوانکاری





بنکەکەی لەسازدانی خشتەکان دروستکراوە وەکو ئەوەی نەخشی جۆر بەجۆر بەکاربهێنرێت.

بەرزی بنکەکەی نزیکەی دوومەتر دەبێت و لەسەر بنکەکەیەوە منارەکە دێت کە شێوەیەکی لوولەکی هەیە، لەسەرەوەدا نەخشەکانی بنکەکەی دووبارە کراوەتەوەو نەخشی زۆر بەکەمی بەکار هاتووە، زیاتر خشتەکان کاریگەرییان بینیوە. بۆیە ئەگەر بەراووردی بکەین لەگەڵ منارە کۆنەکەدا دەبینین کە جوانکاری و خۆماڵی و دەست ڕەنگینی هونەری بیناکاری و نەخش و نیگاری خۆی لەدەست داوە. ئەویش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە نەخشەکانی کت و مت لاسایی کردنەوەی ئەو نەخشە باوانەیە کە لە هونەری بیناکاری مزگەوتدا بەکار دەهێنرێت.

بەڵام نەخش و نیگاری منارە کۆنەکە خاوەنی هەڵگری چەند سیفاتێکی خۆماڵی وکوردی بووە، کە تەنانەت لەبەکارهێنانی ڕەنگەکانیش دا خاوەنی ئەو سیفاتە خۆماڵی بووە. بەقەناعەتی خۆم دەڵێم کەنەخشی منارە کۆنەکە کاریگەری نەخشەکانی کۆشکی (نوزی) لای (تڕکەڵانی) پێوە دیارە لەبەکارهێنانی نەخشی لەبزینەیی و چەماوەو چوارگۆشەیی، تەنانەت تا ڕادەیەك کاریگەری ڕەنگەکانیش زۆر بەزەقی بەدەر دەکەوێت، بەڵام لەمنارەکەدا زیاتر کاریگەرە ئیسلامییەکە دەوری بینیوە لەسازدانی ڕەنگەکاندا.

بەڵام لەمنارە تازەکەدا ڕەنگ هیچ کاریگەرییەکی نەماوەو هەست بەتاریکی سازدانی ڕەنگەکان دەکەیت، تەنانەت نەخشەکان کاریگەریشیان لەسەر منارەکە بەجێ هێشتووە لەڕووی جوانکارییەوە، بنەماکانی تەرزی بیناکاری بەجێ نەهێناوە.

*** مزگەوتی نائیب:**

ئەمیش یەکێکە لەومزگەوتە گرنگانەی کەرکوك کە لەساڵی (١٩١٨) دروستکراوە، بەڵام زۆر بەداخەوە هیچ ڕوویەکی بیناکاری نەماوە، ئەویش بەهۆی ئەو تازەکردنەوەی کەبەسەریدا هاتووە لەساڵانی هەشتاکاندا، ئێستاش چەند ڕوویەکی بیناکاری ماوە لە نەخشی سەر دەرگاو پەنجەرەو نەخشی سەر کەوانەکانی دەرگای دەرەوەو بەکارهێنانی نەخشە ڕووەکییەکانی و ڕازاندنەوەی بەئایەتی قورئان و مێژووی دروستکردنی مزگەوتەکە. مامۆستای بەڕێز عەبدولڕەقیب یوسف وای باس دەکات کە هەموو نەخشەکانی لەدەست و خامەی هونەرمەند عەلی نەقاشی سنەیی بووە.





مزگەوتی نائیب

*** مزگەوتی ئیبراهیم تکریتی[*]:**
ئەم مزگەوتە گەلێك لایەنی بیناکاری بەجێ ماوە کەنەخشی مەرمەڕی لەسەر دەرگاو پەنجەرەو ناوەوەی مزگەوتەکەدا هەیە، ئەوەی زیاتر سەرنج دەدرێت پاشماوەی سەرەکی دەرگاکەیە کە بە نەخشی داری رازاوەتەوە.



مزگەوتی ئیبراهیم تکریتی

*** مزگەوتی عوریان:**
کەوتۆتە ناوەڕاستی قەلاوە، مێژووی دروست کردنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٧٢٩)ی زایینی، ئەم مێژووە لەسەر پارچەیەکی مەرمەڕ لەسەر دەروازەکەی نووسراوە.
ئەم مزگەوتە بەو میحرابە جوانەی کە هەیەتی، رازاوەتەوە بە نەخش ونیگاری رووەکی وئەندازەیی رەنگاوڕەنگ بەڕەنگی جۆراوجۆر، لە شێوەی گوڵدایە، دوای لادانی بەشێکی ئەم نەخشانە، دەرکەوت کە ئەمە تازە کراوەتەوە، لە ژێرییەوە نەخشی رووەکی هەیە، کە لەسەر ئەم نەخشەی ژێرەوە نووسینێك هەیە، کە بەڵگەی ئایەتی قورئانییە: (وكفلها زكريا، كلما دخل عليها زكريا المحراب).
بەڵام منارەی مزگەوتەکە، دروست کراوە لە گەچ وبەردو نەخش کراوە ئەم لاو ئەولاکەی بەنەخش ونیگاری گەچی، کە لە شێوەی ئەندازەیی وەکو ئەستێرەی شەش لایی، دەورەدراوە بە چوار چێوەیەکی (تەوریقی) ئیسلامی.

بەناوبانگە بە دوو گوومەت، یەکێکی گەورە، ئەوی تر بچووك، کە گەورەکەیان، بنکەکەی لەسەر چوار لای وەکو یەك راوەستاوە، کە دانراوە لەسەر هەشت لای تر ئینجا شانزە لای تر، ئەم شێوازە بنکەی گومەتەکەی دروست کردووە، کە بەرزییەکەی نزیکەی (١٥)مەتر دەبێت[٣].

*** مزگەوتی ئیمام قاسم:**
دەکەوێتە گەڕەکی ئیمام قاسم، کە گوایە کوڕی (موسی کاظم)ە[٤]، بەڵام لە شەڕەکەی دەشتی لەیلاندا لە رۆژی (٢٤) ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٧٢٣)ی زایینیدا قەوما، تۆپاڵ عوسمانی سەرداری سوپای عوسمانلی کوژراو تەرمی خۆی وچەندین گەورە پیاوی سوپاکەی هێنرانەوە بۆ کەرکوك ولە یەکێك لە ژوورەکانی (مزگەوتی ئیمام قاسم) دا نێژران وئێستاکە ژنە کورد، ئەوانەی کە کوڕیان نابێ رۆژانی چوارشەممە دەچنە سەر گۆڕەکەی و بۆ ئەوەی کوڕیان ببێت (٣) جاران بەسەر گۆڕەکەیدا باز دەدەن وبە پیاو چاك

وئەسحابەی دەزانن[٥].

ئەم مزگەوتە دروست کراوە لە گەچ وبەرد، بنمیچەکەی لەسەر کۆڵەکەو کەوانە دروست کراوە، کە باو بووە لەسەردەمەکانی ئیسلامی دوواوە، دەربارەی مێژووی سەرەتای دروست کردنی نازانین، بەڵام تازە کراوەتەوە لە ساڵی (١٦١٤)ی زاینیی[٦]، بۆیە ڕێ تێدەچێت مێژووی بنیاتنانی ئەم مزگەوتە زۆر لەو مێژووانە کۆنتر بێتو لە سەرەتادا سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە شوێنی ئەم مزگەوتە گۆڕستان بووە، بۆیە پەیوەندی ناوەکەیو مێژووی گەڕەکەکەی جیاوازی هەیە.

*** مزگەوتی حەسەن پاکیز:**

بریتییە لە بەرزییەکی خۆڵی سپی، کە لە ژێرییەوە مزگەوتەکەیە کە تا ئێستا پاك نەکراوەتەوە[٧]، پاشماوەکەی بە شێوەیەکی ڕێكو پێك هەڵنەدراوەتەوە.



مزگەوتی حەسەن پاکیز



نەخشی مزگەوتی (منارە نەخشینە)









نەخشی و کوڵەکەکانی نێو مزگەوتی (ئەحمەد ئاغا)

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:
(١) (المساجد)، د.حوسێن موئنس، (عالم المعرفة)، ژمارە (٣٧)، چاپخانەی (الأنباء)، کوێت، ١٩٨٨، لاپەڕە (٥٥).
(٢) **گۆڤاری** (الأخاء)، ژمارە (١٩٢)، تشرینی دووەم، کانونی یەکەم، ١٩٨٨، لاپەڕە (٦)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناو نیشانی: (السجادة النبوية الشريفة في كركوك)، عەدنان ئەلقوتب.
(*) مامۆستای هێژا عەبدولڕەقیب یوسف لە باسی ئەم مزگەوتەدا بە مزگەوتی ئیبراهیم سامەڕایی ناوی دەبات ئینجا نازانم تا چ ڕادەیەك مامۆستا ئەم ناوەی هێناوە لە کتێبی: (بانگەوازێك بۆ ڕووناکبیرانی کورد)، عەبدولڕەقیب یوسف، چاپخانەی کامەرانی، سلێمانی، ١٩٨٥، لاپەڕە (٩٨).
(٣) گۆڤاری (هاواری کەرکوك)، ژمارە ٤، ١٩٩٩، لاپەڕە (١٤، ١٥).
(٤) گۆڤاری (فیصل)، هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (١٧).
(٥) گۆڤاری (التراث الشعبي)، ژمارە دووەم، ساڵی سیانزەهەم، شوبات، ١٩٨٢، لاپەڕە (١٨).
(٦) گۆڤاری (الاخاء)، ژمارە(١٠)، ساڵی(٢٢)، شوبات، ١٩٨٣، لاپەڕە (٣٢).
(٧) گۆڤاری (الف باء)، ژمارە (١٥٣٤) ١٩٩٨، لاپەڕە (٥،٤)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناو نیشانی: (قلعة كركوك المخفي والمعلن في تأريخ المدينة)، عەبدولستار ئەلبەیزانی.

## بەشی نۆیەم

# مێژووی هونەری بوراق لە ناوچەی کەرکوکدا

هونەری بیناکاریو نەخشو نیگار بەهایەکی گرنگی هەبووە لەناوچەی کەرکووکدا ((کاتێك ئیسلام هات هەستا بە ڕووخاندنی ئەو وێنەو پەیکەرانەی کە هەلگری بت پەرستی بوون، ئەویش پێ داگرتن بوو بۆ باوەڕ بە تاکی ئەو خوایە کە هاتووە لەو ئایینە تازەیەدا.

بت پەرستی بە کفر دانا کە لەو کاتەدا باو بووە، دەبێت دەستنیشانی ئەو ئەنجامە خراپە بکەین، دەرهاویشتەی ئەم ڕووداوانە کاری کردە سەر هونەری وێنەکێشان لە سەرەتای سەدەی نۆیەمی زایینی، بە بەهانەی ئەوەی کە گوایە فەرموودەی پێغەمبەر هەیە ئەم جۆرە وێنانەی بە تەواوەتی قەدەغە کردووە کە هەلگری نموونەی مرۆڤو ئاژەلن. ئەم بیرباوەڕە باوبوو هەتا سەرەتای سەدەی بیستەمی زایینی، تا ئەو کاتەی مێژوونووسو ڕەخنەگرانی هونەر لێکۆلینەوەی جۆربەجۆریان نووسی بۆ بێ تاوانی ئەم کارەو سەلماندیان کە ئەوانەی ئەمەیان تۆمار کردووە بە هەلەدا چوونە. ئەم کارە وای کرد لە هونەرمەندی موسلمان بایەخ بە خەتو نەخشو نیگارو هونەری چکۆلەی تر لە جیاتی وێنەو کۆتەڵ ئادەمی بدات))[1].

دەبینین ئەم کاری قەدەغە کردنو جیاوازییە جێگەی بەربەرەکانێتی موسلمانەکانو (فقهاء)کان بوو لەسەر چۆنیەتی ئەم کارە، چونکە لە قورئاندا دەقێکی دیاری کراو نییە دەست نیشانی ئەمە بکات[2]. هەروەها جیاوازیش هەیە دەربارەی فەرموودەکانی پێغەمبەر لەسەر مەسەلەی قەدەغەکردن[3]، مەسەلەی ئەم قەدەغە کردنەش لە کاتی کۆکردنەوەی فەرموودەکان داڕووی دا کە لەوە پێشتر شتی وا نەبوو[4]. ئەم مەسەلەیەش جیاوازی هەیە لە نێوان زانایانی موسلمانانی (شیعە)و (سونی)دا کە هەریەکەی بە جۆرێك بۆچوونی خۆی خستۆتە ڕوو[5].

هەرچەندە کە بەربەرەکانییەکی زۆر ڕوویدا، بەلام کەژاوەی هونەری ئیسلامی ڕێڕەوی خۆی هەرگرتوو بەردەوام بوو، هەر چەندە هەندێك بەربەست هاتە ڕێگایو نەیتوانی بە شێوەیەکی فراوان بەردەوام بێت بەلام ئەگەر ڕاستت دەوێت ئەو خۆ شاردنەوەیە وای لێکرد کە پالێ پێوە بنێت بۆ هێنانەدی گۆڕین (تحوير)و تەرزی تازە، کە هەندێك نیشانەو سیمای جیای خۆی هەیە.

مێژوو نووسەکان دەست نیشانی ماوەی بوژانەوەی مێژووی هونەری ئیسلامی دەکەن لە نێوان ناوەڕاستی سەدەی حەوتەمو کۆتایی سەدەی نۆیەمی زایینی، ئەویش لەبەر ئەوەی تێکەل بوونێکی لە خۆڕا (العضوي) ی ئەو پاشماوەی شارستانییەتانەیە کە هەبووە لەوەو پێش هەستاوە بۆ وەرگرتنی بۆچوونی خۆی ئەویش بە دەرخستنی ئەو هاوسەنگییە لە نێوان تاقیکردنەوە دەولەمەندەکانیو خستنە ژێر ڕکێفی بیروباوەڕی ئیسلام لە چوارچێوەی ئەم سێ لایەنەی خوارەوە تا بۆ ئەوەی وا بەدی نەکرێت کە لە ئیسلام لای داوە.

**یەکەم:** ڕێگەدان بە کێشانی وێنەی ئاژەلانی خەیالیو ڕووت کردنەوەی لەو مانا کۆنەوە کە هەیبوو، هەولێ ئەوەیان دەدا کە نەبەسترێتەوە بەو ژینگە سروشتییەی هەبووە، وای لێ بکەن دوور بکەوێتەوە لە سیفەتی واقیعی

**دووەم:** ڕێگەدان بە کێشانی وێنەی ئەو ئاژەلانەی کە خوا ڕاوو خواردنی حەلال کردووە، یاڕێگەی داوە بە کاری بهێنێت بۆ ڕاو، وەکو تەیرو ئاسکەو سەگ.

**سێیەم:** ڕێگەدان بە کێشانی وێنەی ئاژەلانی دوو شێوە، کە هەلدەستێت بە تێکەلاو کردنی گیان لەبەرانی جۆربەجۆر وەکو ئەوەی سەری مرۆڤو لەشی ئەسپو پێی ئاسکە[6].

لێرەدا دەگەینە ئەو ڕاستییە کە مەسەلەی قەدەغەکردنی وێنەو کۆتەل، سەرهەلدانی دیاردەی ئەو ڕێگەنەدانە، دەگەڕێتەوە بۆ داشۆرانی ئاوەزی عەرەبی سەردەمی




(جاهلی)، لە بیری پەرستنی كۆتەڵو كرنووش بردن بۆی چونكە عەرەبەكان ئەو كۆتەڵانەیان كردۆتە خواوەندیانو دەیانپەرستو قوربانیان پێشكەش دەكرد، بۆیە ئەگەر پێغەمبەر هەستابێت بە قەدەغە كردنی ئەو خەڵكە لەو جۆرە وێنەو كۆتەڵانە بۆ ئەوە بووە خەڵكەكە لەو ڕێگایە دوور بخاتەوە.

ئەگەر بەراوردێكی نیوە دوورگەی عەرەبی بكەین لەگەڵ ناوچەكانی تر، دەبینین مەسەلەی پەرستنی كۆتەڵ زۆر دەمێك بوو لە ناوچەكانی تر كۆتایی هاتووە، بڵاوبوونەوەی ئایینی زەردەشتیو مەسیحی جێگەی خۆی گرتبوو، بوو بووە بناغەیەكی بنەڕەتی ژیانی نەتەوەكانی دەرەوەی نیوە دوورگەی عەرەبی، بۆ نموونە ناوچەی كەركوك دەمێك بوو كەوتبووە بەر كارتێكردنی ئایینی زەردەشتیو مەسیحیو چەندەها شوێنی بیناكاریو ئاوەدانی هەبووە كە ئەو ڕاستییە دەگەیەنێت چ لە هونەری دروست كردنی ئاتەشگەو كڵێسەدا، بەرزی هونەری (ئەیقۆنات) لە نێو كڵێسەكاندا هەبووە، تا ڕادەیەكی چاك باڵا دەستی ئەوە هەبووە كە ئاوەزی مرۆڤی ناوچەی كەركوك لە قاوغە تەسكەكەی پەرستنی كۆتەڵ هاتۆتە دەرەوە وەكو هونەرێك سەیری كراوە نەوەك وەكو كۆتەڵێكی ڕووت لە هونەر تەنها بۆ پەرستنی بەكارهاتووە.

یەكێك لەو هونەرانەی كە لە سەردەمی ئیسلامدا ڕووی دا هونەری وێنەی (بوراق) بوو، كە دیاردەیەكی دیاری ئەو سەردەمە دەگەیەنێت، چونكە زیاتر ئەگەر بەم هونەرەدا ڕۆبچینە خوارەوە دەبینین هەڵگری سەردەمی هونەری ئیسلامییە بەڵام هەڵگری خاوەنی سیفەتی سەردەمەكانی پێش ئیسلامیشی تێدا مۆڵ دراوەو خاوەنی كەلەپوری نەتەوەكانی ترە.

لێرە بەدواوە هەوڵدەدەم وەسپێكی (بوراق) بكەم ئینجا بكەومە شی كردنەوەی وێنەی هونەری بوراقو بەراوردی ئەم هونەرە بكەم لە ناوچەی كەركوك لەگەڵ ناوچەكانی تردا، لایەنی جیاوازی بەراوردو كارتێكردنی بنەڕەتی نەتەوەكانی ناوچەی كەركوك بەسەر ئەم هونەرەوە چییە.

*** وەسپی بوراق:**

گەلێك كتێبی جۆربەجۆر، وەسپی بوراقیان كردووە چ لە پەرتووكی (الاسراء والمعراج)و فەرهەنگەكانی زمانی عەرەبی لە (مختار الصحاح)دا بەو جۆرە باسی دەكات:- ((ئاژەڵێكە كە پێغەمبەر پێی چوو بۆ ئاسمان لە شەوی (میعراج) دا یان ئەو ئاژەڵەیە كە پێغەمبەرەكان سواری دەبن كە دەڵێن بوراق ئەسپی جوبرایلە)).

لە (المنجد في اللغة والعلوم والاداب)دا ئاوا وەسپی داوە: ((ئاژەڵێكی باڵدارە كە پێغەمبەری هەڵگرت لە مەكەوە بۆ مزگەوتی الأقصی)).

بەڵام (مختار القاموس) ئاوا باسی دەكات:

((ئەو ئاژەڵەیە كە پێغەمبەری خوا سواری بوو لە شەوی میعراج كە وەكو بارگیر نەبووە لەسەری گوێدرێژەوە بوو بۆیە

دەڵێن براق لەبەر پاکی ڕەنگەکەی‌و تیژی بریقەو پەلەیی جوڵانەوەی)).

هەندێك كتێب وەسپی زیاتریان داوە پێی وەکو (معراج النبي محمد صلى الله علية وسلم)، کە دەڵێ:

(بریتییە لەو ئاژەڵەی وەکو ئاژەڵ نییە لە بارگیر ناچێت‌و گەورترە لە گوێ درێژ ڕووی وەکو ڕووی مرۆڤە، ڕوومەتی وەکو ڕوومەتی ئەسپە، چوار قاچی هەیە چاکترینی جۆرێتی لە دونیادا، مووەکانی لا ملی ڕازاوەتەوە بە مرواری تەڕو چنراوە بە گەوهەری شەوچراو مەرجان، پشتی بریتییە لە یاقوتی سوور، بەڵام گوێیەکانی لە زەبەرجەدی سەوز دروست کراوە، هەردوو چاوەکانی ئەستێرەیەکی پرشنگدارە، تیشکی هەیە وەکو تیشکی خۆر بریقەدارە، دەست‌و قاچەکانی بریتییە لە زێڕی سوور، سنگی ڕازاوەتـەوە بە جۆرێك لە گەوهەر کە بریقە دەداتەوە هەروەکو بریقەی ئەستێرە لە ئاسماندا، هەروەکو هەورە تریشقە، کلکێکی هەیە لە زومردی سەوز، دووباڵی هەیە وەکو باڵی هەڵۆ، خاڵێکی بەلاوەیە وەکو خاڵی مانگ کە بۆنی مسکی تێدا بڵاو دەبێتەوە، مەمکەکانی گرێ دراوە بە مەمکدانێکی دروست کراو لە زێڕی سوور).

وەسپێکی تر هەیە ئاوا باسی دەکات:

ئـەم وەسـپـە جیـاوازیـیـەکی وای نییە لـەگـەڵ ئـەوەی پێشوودا تەنها چەند شتێکی کەم نەبێت بـەڵام جیاوازی هەیە لە بنەڕەتی دەقەکە ((وەکو ئاژەڵە، بەڵام ئاژەڵ نییە، بە بارگیر ناچێت بەڵام لەسەر گوێ درێـژەوەیـە، ڕوویەکی هەیە وەکو ڕووی مرۆڤ، لەشی وەکو لەشی ئەسپە، موویەکی هەیە لە گەوهەری تەڕ چنراو بە شیشی یاقووتی، کە بریقە دەداتەوە وەکو ئەستێرەیەکی بریقەدارە کە ئەسووتێ وەکو تیشکی خۆر لەلای ڕاستییەوە ئاوزەنگییەکەی ڕازاوەتەوە بە مەرجان‌و گەوهەر)).

بـەڵام لە کتێبی (معراج المصطفى)دا هەندێك سیفاتی زیاد کردووە کە گوایە درێژو سپییەو وەزین‌و لغاو کراوە.

بەڵام لە کتێبی (معراج النبي) هەندێك شت زیادی کردووە بەم جۆرە:

((.... دوو گوێی بە جوولەی هەیە..))، ئینجا هاتووە لە پەراوێزی لاپەڕەکە وەسپێکی دوورو درێژی بوراقی داوە ئەویش لەسەر هەندێك سەرچاوە کە هێناوییەتەوە:-

مجلس لە کتێبی (العیون)دا دەگێڕێتەوە (شامی)یەك لە (امیر المؤمنین)ی پرسی دەربارەی کونیەی (بوراق) ئەویش لە وەڵامدا کە هەریەکە (ابا هلال)و (الطبري) لە (مجمع البیان) دا باسیان کردووە ئاوا دەڵێت:

(ڕوومەتی وەکو ڕوومەتی مرۆڤ وایە، کلکی وەکو کلکی مانگایە، موویەکانی وەکو مووی ئەسپە، پێیەکانی وەکو پێی حوشتر وایە، کورتانێکی بەهەشتی هەیە، دووباڵی هەیە بەلا قۆڵەکانیدا).

(العصفوري) ئاوا باسی دەکات:

((ڕوویـەکـی ئادەمی هەیە، دوو چاوی گـەورەی ڕەشـی هەیە، دوو گوێیووردی هەیە، ڕەنگی وەکو تاووسە، تێڵی











وەکو گوڵ وایە، لەشی لە یاقووتی سوورو مەرجانە، سەری مسکی بۆندارە، کە هیچ تێکەڵاو نییە، گەردنی لە عەنبەرەو گوێیەکانو شانەکانی لە گەوهەری سپییە، تێکەڵاو بە زنجیرەیەك لە زێڕ کە بەستراوە بە گەوهەرو ئەڵماس، زینێکی لەسەرە پێك هاتووە لە ئاوریشمی ڕووت، هەنگاوەکانی بەپێی دووری بڕی چاوێتی))[٧].

## * بنەڕەتی وێنەی بوراق:

هەرچەندە لە قورئانی پیرۆزدا هیچ هێمایەك نییە بۆ ئەوەی کە ئەو شتە چی بوو کە پێغەمبەر پێی ڕۆیشتووە لە مەکەوە بۆ (قودس) لە شەوی (المعراج)، بەڵام خوای گەورە تەنها ئەوەندەی باسکردووە لە سوورەتی (الأسراء) کە دەڵێت: ((سبحان الذي اسرى بعبده ليلاً من المسجد الحرام إلى المسجد الأقصى))، هەر چەندە لە ئایەتەکەدا هیچ دەستنیشانی ئەوەی نەکردووە بەچی هۆیەکەوە سەرکەوتووە، بەڵام ڕێکەوتنێك هەیە لە نێوان موسڵمانەکان کە گوایە ئەو ئاژەڵەی پێی ڕۆیشتووە بەو جۆرە بووە کە باسمان کرد لە سەرەوە.

بەشێکی زۆری زاناکانی شوێنەواری ئەورووپا لەو باوەڕەدان کە بنەڕەتی (بوراق) دەگەڕێتەوە سەر وەرگرتنی ئیلهامی شارستانییەتە کۆنەکانی پێش بڵاوبوونەوەی شارستانی ئیسلامی. لەبەر ئەوەی گەلێك بەڵگەی لەو جۆرە هەیە کە ئەو ڕاستییە بەدەست دەهێنێت، چونکە هەندێك وێنە دەبینین ڕووی ئافرەتو لەشی سەگو شێرو کلکی مار، لەگەڵ بوونی باڵ، کە نموونەی ئەمە لە شارستانییەتەکانی میزۆپۆتامیا (نێوان دوو ڕووبار)و (سوریا)و (میسر)و (یۆنان)و (ڕۆمان)و (ئێران)دا بەرچاو دەکەوێت.

نموونەی ئەمە جوانەگای باڵداری ئاشوورییە کە پێکهاتووە لە لەشی جوانەگاو بەسەری مرۆڤێکی ڕیشدار، لەگەڵ دوو باڵی باڵداردا، یان ئەو ئاژەڵە خەیاڵییەی لە میسری کۆندا باو بووە پێی ووتراوە (هول)، کە چووەتە ناوی ڕووحی یەکێك لە فرعەونەکانی میسر. لە مۆزەخانەی بەریتانیادا هەندێك ئاسەوار هەیە کە لە (جیلا)ی یۆنانی دۆزراوەتەوە، زۆر لێکچووە لە نموونەکانی لەوەو پێشەوە، کەوێنە کێشراوە لەسەر چەند پارچە پارچەیەك کە دەگەڕێنەوە بۆ سەدەی پێنجەمی پێش زایین، لە یەکێك لەلاکانی ئەو پارانە وێنەی خواوەندی ڕووبار هەیە لەسەر شێوەی وێنەی جوانەگا کە سەری مرۆڤێکی ڕیش داری پێوەیە، لە پارچەیەکی تر کە دەگەڕێتەوە بۆ هەمان ماوەی مێژوویی، لە جیاتی لەشی جوانەگاکە گۆڕاوە بە ئەسپ، پاشماوەیەکی تری باڵدار لە (خرساباد) لە نزیك (موسڵ) دۆزراوەتەوە کە لە کۆندا ناسراوە بە (دۆرشروکین) بە (مانای شاری سەرجۆن)، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەشتەمی زایینی، بریتییە لە سەری مرۆڤێکی ڕیش دار.

هەروەها لە ئێرانو قوبرس نموونەی هاوشێوەی ئەو کۆتەڵانە دۆزراوەتەوە، کە دەگەڕێتەوە نزیکی بۆ هەمان سەردەم، لە مۆزەخانەی بۆستن کۆمەڵێك ئاژەڵی خەیاڵی لە ڕۆما دۆزراوەتەوە سەرەکەی سەری هەڵۆیە، دەندۆکەکەی چەماوەیە، لەشەکەی لەشی شێرەو گوێیەکانی تاڕادەیەك وەکو گوێی سەگ وایە، کلکی کۆتایی هاتووە بە زنجیرەیەك نەخشو نیگاری ڕووەکی، کە شێوەکانی وەرگیراوەو گۆڕاوە لەگەڵای (کانتس).

کاتێك نووسەرە موسڵمانەکان هاتوونە هەستاون بە باسکردنی ئەم شێوە خەیاڵییانە، نموونەیان لەم جۆرانە بڵاوکردۆتەوە، وەك قەلە ڕەش (زاغ)و قەلەباچکە، کە کێشراوە بەسەری مرۆڤ و لەشی قەلەباچکە، هەروەکو ئەوەی بەجێ ماوە لە دەستنووسەکانی (قەزوینی) بە ناونیشانی (عجائب المخلوقات وغرائب الموجودات)

نوسەری (بعلبکی)، (تەقییە ئەلدین ئەلمەقریزی) لە کتێبەکەیدا بە ناونیشانی (المواعظ والأخبار في ذكر الخطط والآثار) باس لە کۆتەڵی (ابي الهول) لە میسر دەکات، کە گوایە لە کاتی خۆیدا ئەم کۆتەڵە لەژێر لمەوە بووەو تەنها سەرو شانی بە دەرەوە بوو، ڕوویەکی کەناری هەبووەو لەشی ڕەنگاو ڕەنگ بووە بە چەند ڕەنگێکی بریقەدار (بەراق)، درێژییەکەی حەفتا پێ بووە، زۆری خەڵکی میسر پیرۆزی تایبەتی دەگەڕێنەوە سەر ئەم کۆتەڵەو گەلێك توانای (طلسم)و جادوویی لێ دەگێڕنەوە، کە باوەڕ دەدات بە خەڵکی بۆ بزربوون لە ناخۆشی بیابان. دەگێڕنەوە لە ساڵی (١٣٧٨) ی زایینی لە میسر پیاوێکی سۆفی بەناوبانگ سەری هەڵدا بە ناونیشانی شێخ (محەمەد سائم ئەلدەهر)، زۆری پێ تووڕە دەبوو کە دەیبینی خەڵکی باوەڕیان بە پیرۆزی ئەم کۆتەڵە هەیە، لە نێوان خەڵکەکە بە تایبەتی لەلای موسڵمانەکان. ئەمە وای لێ کرد هەستێت بە شێواندنی ڕووی ئەم کۆتەڵە، (مقریزی) لەسەر ئەمە دەڵێت کە گوایە، هەر لەو کاتەوە ووشکە ساڵی ئەو ناوچەیەی داپۆشیوەو لم بەشێکی زۆری ئەم ناوچەیەی گرتووە، بۆتە هۆی داپۆشینی بەشێکی زۆری کۆتەڵەکە، زۆری خەڵك باوەڕیان بە پیرۆزییەتی، دەڵێن گوایە هۆی ئەو کارەی شێخ (محەمەد سائم ئەلدەهر) وای کردووە ئەو ناچەیە تووشی ئەم دەردە بووە.

ئەوەی پێویستە لێرەدا بووترێ ئەوەیە کە هەموو ئەم سەرچاوانە دەورێکی کاریگەریان بینیوە لە کێشانی وێنەی (بوڕاق) لەلای هونەرمەندانی ئیسلام.

(نجاری) وا ڕادەگەیەنێت کە ناوی (البراق) داڕێـژراوە لە زۆری بریقەداری ڕەنگە سپییەکەی یان داڕێـژراوە لە (البرق - هـەورە تریشقە)، چونکە بەوە جیا دەکرێتـەوە ئەم ئاژەڵە خەیاڵییە لە تیژییەکەی وەسپ کراوە بە تیژی هەورە تریشقە، هەندێك لە مێژوو نووسەکان لەسەر پێستی ڕەنگەکەی ڕێکەوتوون کە گوایە پێغەمبەر ئەم ڕەنگەی بە زیاتر داناوە لەسەر ڕەنگەکانی تر، لەپێش ئەمەدا بڕیاری دابوو کە موسڵمانەکان دەبێ جل و بەرگی سپی لەبەر بکەن و مردووەکانیان بە سپی کفن بکەن، هەروەها فەرمودەیەکی پێغەمبەر هەیە دەربارەی شەوی میعراج گوایە ڕەنگی سپی بوو کە بردوویەتی بۆ ئاسمان، هەندێك ڕاوبۆچوون هەیە کە ڕەنگی ئاڵتونی بووە[8].

حەقی ئەوەمان هەیە کە بڵێین پەیوەندییەکی دروست هەیە بە ئەو باوەڕە ئایینییە بۆ هەڵبەستنی ئەو چیرۆکانە کە لەلایەن خەڵکەوە بڵاوبۆتەوە، کە بە زەمان بڵاویان کردووەو جۆرەها گۆڕین و گەورە کرانەوەی تێدا کراوە کە جۆرەها بەرگی پێدا هێنراوە، ئەویش لەژێر کارتێکردنی ئەو خەیالات و توانای جوانکارییان بۆ ئەو وەسپە، بە تایبەتی لە ئاهەنگە ئایینییەکاندا بە دەردەکەوێت. کە ڕەنگدانەوەی ئەمانە هەمووی بە دەرکەوتووە لەسەر وێنەی (بوڕاق) بە جۆرەها شێوەی.

زۆر ڕاستە ئەگەر بڵێین کە بڵاوبوونەوەی ئیسلام بە ڕادەیەکی فراوان، بۆتە هۆی ئەوەی ئەتەوەو چین و توێژێکی زۆری ئەم وولاتانەی لە خۆی کۆکردۆتەوە، کە هەریەکەی خاوەنی شارستانێتییەکی جۆربەجۆرە لە هونەرو ئەدەب و مێژوو، کاریگەری خۆی هەیە بە سەر دروست بوونی ژینگەیەکی ئیسلامی تـوواوە لەنێو بۆتەی ئەو شارستانییەتانەی کە هەبووە لە ئاقارەکەیدا.

ئینجا دەگەینە ئەو ڕاستییە کە بنەڕەتی (بوڕاق) هەر لەو چوار چێوەیەداو، کەوتۆتە ژێر کارتێکردنی هۆیەکانی وەرگرتن و دانـەوەی هونەرە کۆنەکانی کە لە ناوچەکەدا هەبووە وەکو هونەری میللەتەکانی ئاشووری و سۆمەری و هوری - میتانی و کاشی و ساسانی و پرسییەکان.

*** بەراوردێکی وێنەیەکی سەر دیواری کۆشکی نوزی لەگەڵ وێنەی بوراقدا:**

نوزی یەکێکە لەو ناوچە ئاوەدانانەی سەردەمی (هوری- میتانی) کە دەورێکی گرنگی بینیوە شان بە شانی ناوچەکانی تر وەکو کوڕوخانی و ئەراپخا.

یەکێك لەو پاشماوانەی کە بۆمان بەجێ ماوە کۆشکەکەی نوزییە، کە لە خۆیدا گەلێك لایەنی هونەری بیناکاری و نەخش و نیگاری تێدا هەیە، کە دەتوانرێت گەلێك لایەنی شاراوەی ئەم کۆشکە شی بکرێتەوە.

((لەبەر ئەوە دەبینین کە وێنەکێش لە (نوزی) هەڵدەستێت بە وێنەکردنی تابلۆی بەش..بەش لە داری ژیان و سەری گاو دەمامکی هاوچوو بە کۆتەڵی (حاطور)، کە دەتوانین ڕەچەڵەکی (سووری)و (میسری) تێدا بدۆزینەوە، کە ئەم جۆرە نموونانە زۆر ئاساییە بۆ دەوڵەتێکی میتانی کە دەسەڵاتی بەسەر ناوچەیەکی زۆردا گرتبێت هەر لە چیای (تۆرۆس) هەتا چیای (زاگرۆس)، کە سەری (بکرانی) هێمایەکی کۆنە کە بەکارهاتووە لە سەرەتای چاخی بەردین لەسەر گلکاری گردی (حلف) بەڵام لە دوایدا لەنوزی بە ڕێگایەکی زۆر تایبەتمەند گۆڕاوە، کە لە توێیدا بنەڕەتی تایبەتی شێوە ئەندازەیی بەهێزی تێدایە، بۆ نموونە لە (سەری گا)دا هەست دەکەی کە پێکهاتەکەی بریتییە لەکۆمەڵێك نیشانەی ئەندازەیی، دەتوانین ئەو گوزارە ئەندازەیە ببینین لە وێنەی سەر ئەو دیوارە لە دەمامکی ئاژەڵێکی تردا لە شێوازێکی لێکراوەیی (تجسم)، کە دۆزراوەتەوە لە (ئالالاخ) لە کۆشکی (تقمیا)، ئەم دەمامکە داتاشراوە زۆر بە ووریایی لە بەردی کلسی سپی، کە داڕێـژراوە شێـوازە سروشتییەکەی بە دابڕانێکی تەواو کە زۆر بە زەحمەت دەتوانرێت شێوەی ئەم دەمامکە بناسرێتەوە تەنها شاخە شۆڕەوە بووەکانی نەبێت، کە ئەمە تاکە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە بەرانە، مرۆڤ دەتوانێت بڵێت کە ئەمە بریتییە لە نەخش و نیگارێکی سەر دیوار وەکو ئەو دەمامکەی کە کێشراوە لە (نوزی)، لەسەر ئەمەشەوە لە (نوزی) سەری بەرانێکی تر دۆزراوەتـەوە، کە دروست



**چەند وێنەیەكی سەر دیواری كۆشكی (نوزی) لە كەركوك**

كراوە لە بەردی گەچی (حجر الجبس)، كە نزیكە لەو شێوازەی دۆزراوەتەوە لە (ئالالاخ). بە بۆنەی لێك نزیكی ئەم دوو كۆمەڵەوە دەمانگەیەنێتە ئەوەی كە یەكێكی لە ڕۆژهەڵاتو یەكێكی تر لە ڕۆژئاوا، بەڵگەیە بۆ ئەوەی كە بوونی هونەرێكی میتانی یەكگرتوو هەبووە بە سیفەتێكی بنەڕەتی [٩].

ئەوی لە تابلۆكانی سەر كۆشكی (نوزی) بەرچاو دەكەوێت بریتییە لە وێنەی درەختی (ژیان)و سەری گاو ئافرەت كە گوێی وەكو گای هەیەو دەمو لووتی نییە.

ئینجا دەگەینە ئەو ڕاستییە كە هاوبەشی ناوچەكانی لەگەڵ نوزیدا دەگەڕێتەوە ژێر كارتێكردنی شارستانی میتانییەكان لەسەر ئاقارێكی گەورەی ئیمپراتۆریەتەكەیان ئەگەر سەرنجی وێنەكانی سەر دیواری نوزی بدەینو لەگەڵ وێنەی بوراقدا بەراوردی بكەین دەبینین تێكهەڵكێشی نێوان ئاژەڵو ئادەمی تێدایە وەكو هاوبەشیو ئەو وێنەیە لە نێوان سەری ئافرەتو گوێی ئاژەڵ، كە زۆر لە شێوەی بوراق دەچێت لە ڕووی پێكهاتەی هاوبەشو هێڵەكانی نێوانیان.

ئەمەی لەسەرەوە باسم كرد دەگاتە سەردەمەكانی پێش بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام بە ماوەیەكی زۆر. بەڵام نموونەی لەم جۆرانە زۆر هەیە لە ماوەی سەردەمە ئیسلامیەكان بە تایبەتی لە سەدەكانی ناوەڕاستی ئەو ماوەیە ئەویش بە دەردەكەوێت لە وێنەی سەر دیواری ماڵەكانی كەركوكو بەتایبەتی قەڵاو وێنەی جۆراوجۆر لەسەر جامخانەی كوردەواری، گەلێك شێوەی جودایان هەیە، كە كارامەیی ئەو هونەرمەندانە نیشان دەدات كە كێشاویانەو بۆچوونەكانیان لە ڕووی ئایینییەوە خستۆتە چوارچێوەی تابلۆكانەوە.

دەبینین ئەم وێنانەی لە چوارچێوەی ئەندازەیی جۆراوجۆردا ڕازاوەتەوە بە نەخشی چوار گۆشەییو لاكێشەییو بازنەییو سێ گۆشەییو كێشانی بە ڕەنگی جۆراوجۆر.

*** وێنەكانی بوراقی ناوچەی كەركوك:**

ئەگەر سەیری شوێنی وێنەكان بكەین دەبینین لە جامخانەی كوردی ئاوێنەدارو ماڵە دەوڵەمەندەكاندا لە نەخشو نیگارەكانیادا زۆر بە ڕوونی دیارە، كە بە جۆرەها تەرزی خەیاڵی وێنەی كێشراوە، لە هەوڵدان بۆ دەرخستنی شێوازێكی خەیاڵی شێوە ئامێزو دروست بوونی بەهایەكی جوانو هەوڵدان بۆ ئەفراندنێكی هونەری.

كاتێك سەیری وێنەكان دەكەیت، وا هەست دەكەیت كە منداڵێك وێنەی كێشابێت، زیاتر ڕوویەكی منداڵ ئامێزی لە خۆی گرتووە، ئەمیش ناگەڕێتەوە بۆ بێ دەسەڵاتی هونەرمەندەكە، بەڵكو دەگەڕێتەوە، بۆچڕی ئەو وەسپانەی كە بۆئاژەڵەكە (بوڕاق) كێشراوە وای كردووە هونەرمەندەكە بخاتە دنیایەكی خەیاڵی بۆ كێشانی وێنەكە، كە دووری بخاتەوەلە واقیعەكەی كە تێدا گەشەی كردووە، چونكە جیاوازی وەسپەكان وای كردووە نەتوانێت شێوەیەكی دیار بەدەربخات بۆ هەریەكە لە ئەندامەكانی لەشەكەی، بۆیە هەوڵی داوە خۆی قاڵ بدات لە شێوازێكی ئەندازەیی ئامێز.

تێكەڵاوكردنی جۆرەها ڕەنگ لە تابلۆكاندا وای كردوە لە گەلێك شوێندا كە بۆچوونی وەسپەكانی دوور خستۆتەوە، بۆ نموونە زۆری سەرچاوەكان باسی ئەوە دەكەن گوایە ڕەنگی سپی بریقەدار بووە، بەڵام لە تابلۆكانی كەركوكدا، ڕەنگی سوورو زەردو شینو ڕەش تێكهەڵكێش كراوە، كە زۆر لە ڕاستی وەسپی سەرچاوەكان دووری خستۆتەوە.

لە هەندێك سەرچاوە وەسپی كلكیان داوە، وەكو كلكی ئەسپو مانگا، بەڵام لە تابلۆكانی كەركوكدا، كلكێكی پانی ڕەنگاو ڕەنگی هەیە لە سەرەتادا باریكەو تا دێت پانو گەورە دەبێتەوە.

لە كێشانی وێنەی باڵەكانیشدا بە هەمان جۆر، جۆرەها ڕەنگ تێكەڵ كراوە كە زۆری لە واقیعی وەسپەكانەوە دوورە زۆری وێنەكان ڕازاوەتەوە بە وێنەی تەیرو تواڵو ئاژەڵی جۆربەجۆرو دەشتاییو گوڵو گوڵزارو نەخشی هەمە ڕەنگ شێوەی وێنەكە بە دەمو چاوی ئافرەت دەچێتو تاجێكی ڕەنگاو ڕەنگی لەسەر نراوە، بە جۆرەها خشڵی جۆراوجۆر ڕازاوەتەوە. لە وێنەكاندا وا بەدەردەكەوێت كە پرچێكی درێژی داداوەتە خوارەوەو بەسەر شانو ملیدا شۆڕبۆتەوە زۆری ئەو وێنانەی كە كێشراوە لە نەخشاندنی بوراق لەسەر شووشەی سادە دروست كراوەو بە ڕەنگی جۆراو جۆر ڕازاوەتەوە، ڕەنگەكان بریتییە لە سوورو سەوزو شینو زەردو ڕەشو سپی.



نموونەیەك لە وێنەی بوراق لە کەرکوك



نموونەیەك لە وێنەی بوراق لە کەرکوك

*** مێژووی بوراق:**

ئەو پاشماوانەی کە بە دەستمان گەیشتووە لەو هونەرە لە نێوان سالآنی چلەکان و پەنجاکان و شەستەکان، زۆر برەوی هەبووەو هەموو مالآن بە تایبەتی لادێکان تێدا بەکارهاتووە، بەلآم لە ناوەڕاستی حەفتاکان ئەم هونەرە وردە.. وردە ڕووی لە کزی کردووەو لە سەرەتای هەشتاکان هیچ دەورێکی نەماوە، ئەویش بە هۆی گۆڕانکاری ژیان و کزی بایەخ دان بە نەخش و نیگارو ڕازاندنەوەی مالەکان.

*** وەستا بە ناوبانگەکانی بوراق لە ناوچەی کەرکوکدا:**

١. وەستا مەجید عەلی نەجام، کە لە بنەڕەتدا خەلکی گلە.
٢. وەستا جەبار گلی.
٣. وەستا حەمە لالەی جەباری.
٤. وەستا حاجی جەباری شێخانی.
٥. وەستا محێددین.
٦. وەستا عەلی مەنیج، کە لە بنەڕەتدا خەلکی (بەیانلووە)
٧. وەستا عەودلی شوانی.
٨. وەستا نوری جەباری.
٩. وەستا محێددین جەباری.
١٠. وەستا حەسەنی درێژ.
١١. وەستا تۆفیقی حاجی محەمەدی قەلآیی.
١٢. وەستا حەمەی نالمی شوانی.
١٣. وەستا مستەفا.
١٤. وەستا فایق، دووکانەکەی لە قەراغ خاسە بووە.
١٥. وەستا محەمەد عەلی، دووکانەکەی لە کوێرە حەمام بووە.
١٦. وەستا مەحموود سۆرانی، دووکانەکەی لە کوێرە حەمام بووە.
١٧. وەستا ئەحمەد سۆرانی.
١٨. وەستا محەمەد عەباس لە بازاڕی حەلواچییەکان.
١٩. وەستا ئەحمەد عەباس لە بازاڕی حەلواچییەکان.
٢٠. وەستا سەعید.
٢١. حاجی عەبدوللا، شوێنەکەی لە ناوبازاڕ لە حەمام حاجی بان.
٢٢. وەستا سەید وەلی، لە بازاڕی گەورە.
٢٣. وەستا ستار حاجی عومەر، لە بازاڕی گەورە.
٢٤. وەستا ئەحمەد مام مەجید - لە گەڕەکی شۆڕیجە.
٢٥. وەستا عەبدوللا غیبوللا کاکەیی، ئەمە گەڕۆك بوو بە لادێکاندا دەسووڕایەوە.
٢٦. وەستا سەید بەهرام مستەفای کاکەیی دوکانەکەی لە گەراجی (حەویجە)یە.

*** مێژووی وێنەی نەخشەکانی سەندوق لە ناوچەی کەرکوکدا:**

کوردیش وەکو هەموو نەتەوەکانی تر هەولی داوە کە ژیانی کۆمەلآیەتی خۆی ڕێك بخات و هەموو دەم، هەنگاوی بەرەو پێش بنێت بۆ گۆڕانە کۆمەلآیەتییەکان هەر لە سازدانی ژیانییەوە لەمالەوە تا هەموو لایەنەکانی ژیانی لە دروستکردنی **هونەری بیناکاری** و سازدانی نەخش و **نیگار**.

مالیش لایەنێکی گرنگی ئەم پەیوەندییە کۆمەلآیەتییانەیە، بۆیە هەردەم، کاریان کردووە بۆ ڕێکخستنی ئەو ژیانەی نێو مال، چ لەڕووی سازدانی بیناکاری و بەکارهێنانی ڕەنگ و ڕازاندنەوەی نێو مال لەکەرەستەو کارپاییەکانی مالەکە، بۆیە هەولی داوە بەدروستکردنی جۆرەها ئامرازو کەرەستە بۆ پاراستنی شتەکانی نێو مال.

کەرەستەکانیش بەجۆرەها شێوەو مادەی هەمە چەشن دروستکراوە، وەکو دارو بەردو ئاسن و قیرو خشت و شووشە، کە هەریەکەی بەپێی پێویستییەکانی سەردەمەکەیان و زۆری ئەو کەرەستانە لەو ناوچەیەدا هەبووە.

یەکێك لەو کەرەستە گرنگانە دارە، کە هەر لەسەردەمانێکی زوو، بۆ جۆرەها مەبەستی دیار بەکارهێنراوە و کەرەستەیەکی زۆرە لەناوچەکەو هەردەم لەپێویستی زیاد بووەو هەموو دەم زۆربەی ئامانجەکانی پێ دروستکراوە.

لەبەر ئەوەی ناوچەی کەرکوك هەردەم سەوز بووەو داری لێ ڕوواوە، بۆیە ئەم کەرەستەیە زۆر هەرزان بووەو لەڕووی ئابوورییەوە نرخێکی چاکی هەبوو بۆ سازدانی کەرەستەکان.

ئەگەر سەیری ناوچەیەکی وەکو کەرکوك بکەین، دەبینین کەخاوەنی گەلێك شارستانی بووە وەکو : (نوزی) و (کورپوخانی) و (ئەراپخا) و (ئال-ئیلانی)، بۆیە هەردەم هەولی داوە کە پەرە بە شارستانییەکەی بدات و گرنگی پێشکەوتنەکانی برەو پێبدات، خاوەنی گەلێك کەرەستە بوو **بۆ پێشکەوتنی شارستانی** ناوچەکەی و **هەردەم جێ پەنجەی دیار بووە لە شارستانییەتی ناوچەکانی** دەوروبەریەوە.

**هەر لەبەر ئەمەیە کە کاریگەری ئەم** شارستانییانە جێ و ڕێگای خۆی دیارکردووە لەسەر ناوچەی کەرکوك، یەکێك لەو کاریگەرییانە پیرۆزی بەکارهێنانی دارو ڕوواندنی دارە، کە دەگەڕێتەوە ژێر کاریگەری و پیرۆزی لە ئایینی زەردەشتیدا.

دارتاشەکانی جاران زۆر شتیان دروست دەکرد کەئێستا دروستی ناکەن و باوی نەماوەو لەبیر چۆتەوە کە ئەمانەی خوارەوە نموونەی چەند کەرەستەیەکی دارە کە دارتاشەکان دروستیان دەکرد:

١. سندوقی ئەشتەرخان، بریتی بوو لە تەختە داری گوێز بۆ خشل و پارە. کە ئەمیش جۆری هەبوو سادەو، هەیبوو ڕازابووەوە بە جۆرەها نەخش و نیگاری داری.

٢. فەرەنگ سازی، بریتی بووە لەدروستکردنی پەنجەرە بەتەختەی دار گوێز، نەخش دەکرا، بەبێ بزمار، شووشەی ڕەنگاورەنگی تێ هەلدەکێشرا، یان ئەم پەنجەرانە بەتەختەو شیش و ئاسن تێك هەلکێش دەکرا، هەروەها جۆری دەرگاکانیش هەیانبوو کە بەبزماری ئاسن دەبەسترا و هەیبوو سادە بوو، هەیانبوو نەخش دار بوو.

٣. نەخش کردنی پێش مالآن و بالەخانەو بنمیچی مالآن، نەخش داری ڕەنگاورەنگ و سادە دەکرا، بەلآم ئەم جۆرە زۆر کەم لەناوچەی کەرکوکدا بەرچاو دەکەوێت.

٤. هەروەها دروستکردنی دەرگا و پەنجەرەی نەخشدارو سادەو دەرگای گەرماو، کەئەمیش لەداری سادە دروست دەکرا.

٥. دروستکردنی کورسی و تەپلەك و مێزی خڕو هێلکەیی و قەنەفەی چایخانە و ماڵان.

٦. کورسی تەختە بەند لەهاویندا لەحەوشە، خێزان لەسەری دەنووستن بەهۆی پەیژەیەکی بچووکەوە پیا سەردەکەوتن.

٧. دروستکردنی جەنجەڕو شەن بۆ گێرە کردنی خەرمان بۆ جیاکردنەوەی گەنم و کایەکەی، دوایی بەشەن بەبایان دەکرد.

٨. جۆڵانەو بێشکەو بلوێرو ڕەوڕەوە بۆ پێگرتنی منداڵ.

٩. کلکەخاکەناس و پاچ و پەیژە و پنە و گەڵا کوتك و بەفرماڵ و باگردێن.

١٠. دروستکردنی سندوقی بوراق (سندوقی بووك)، پێشەکەی نەخشەکاری و ڕەنگا و ڕەنگ بەوێنەی دولدولەکەی (ئەسپەکەی) ئیمام عەلی، یان ئەسپی بوراق پێغەمبەر، کە ئاوێنە بەنیان تێ دەکرد بۆ جل و بەرگ و بوخچەیان تێ دەخست لە جیاتی کەنتۆر.

١١. سندوقی هەزار پیشە بەکار دەهێنرا بۆ ئەسبابی چایی.

١٢. قاپقاپی نەخشدارو ساکار، کچ و ژن لەماڵدا لە پێیان دەکرد، کە ناوچەی کەرکوك ناوچەیەکی بەناوبانگ بووە پێی.

١٣. کۆڵەکەی هەشتی بۆ پێش هەیوان و لەگەڵ کاسە بەندی سەر کۆڵەکە، لەباتی پایە بۆ ژێر خانووی دارەڕا بەکاریان دەهێنا، هەروەها هەندێك دارتاش دارە مەیت و شتی تریان بەکار دەهێنا[١١].

*** سەندوقی بوراق - سەندوقی بووك:**

بریتییە لەسندوقێکی شێوە لاکێشەی قەبارە دارکە دەتوانین پێوانەی بەم جۆرەی خوارەوە دەستنیشان بکەین:

درێژی ئەم سەندوقە لەنێوان (١,٠٦ -١,١٢) مەتر دایە، کە پانی ئەم سندوقە لە نێوان (٥٢-٥٨) سم دایە، شێوەی ڕووی ئەم سندوقە دابەش کراوەتە سەر سێ بەش لە پانتایی ڕەنگییەوە، کەهەر یەکە بریتیە لە سێ پارچەی لاکێشەیی، کە لاکێشەکەی ناوەڕاستی لەوانی تر گەورەترە، لاکێشەکانی ئەو لاو ئەولای بەپێوانەی (٣٨)سم درێژی و (٢١)سم پانی، بەڵام پێوانەی لاکێشەکەی ناوەڕاست درێژی (٣٨)سم و پانی (٢٩)سم، تەختەی لای بارە درێژییەکەی بەپێوانەی (١,٠٦) مەتر دێژی و (٤٢)سم پانییە، کە لای بارە پانیەکەی بریتییە لە (٥٢)سم درێژی و (٤٣)سم پانی، هەروەها ئەم سندوقە ڕاوەستاوە لەسەر چوار قاچ بەدرێژی (١٩)سم و (٦)سم پانی

ئەوەی کە سەرنج ڕادەکێشێت لەم سندوقە بەکارهێنانی ڕەنگە بەشێوەی زۆر فراوان و ڕازاندنەوەیەتی بەجۆرها شووشە.

ئەگەر سەیری ماوە مێژووییەکەی بکەین دەبینین ساڵ لەدوای ساڵ و ماوە لە دوای ماوە گۆڕانی گرنگ ڕووی داوە لە دروستکردنەکەی و گەلێك تایبەتمەندی خۆی لەدەست داوە کە هەریەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری سەردەمێکی جیا، هەروەکو ئەوەی لەبەکارهێنانی شووشەو بەکارنەهێنانی شووشە، لەبەکارنەهێنانی پەڕە.. پەڕەی دار لەخوارەوە یان دروستکردنی پەڕەو چەکمەجە بۆی یان لەدروستکردنی کلیل بۆ ناوەڕاستی سندوقەکە، کەلەسەرەتادا ئەم بەکارهێنانانە نەبووە. هەروەها لەهەندێك لەم سەندوقانەدا لەسەدەمێکی جیاواز، بەکارهێنانی ئاوێنە لە ناوەڕاستی سەندوقەکە لە جیاتی نەخشاندنی سەندوقەکە. کە ئەمە لە خۆیدا جوانکارییەکی ترەو بایەخی خۆی هەیە لەسیمای



نموونەیەك لە سەندوقی بوراق



نموونەیەك لە سەندوقی بوراق

سەندوقەکە.

دەربارەی ماوە مێژووییەکەی ئەم سندوقانە ئەوەیە کە نموونەم بەدەست کەوتووە هەر لە ساڵانی (١٣٥٠)ی کۆچی، (١٩٣٠)ی زایینیی، کە ئەمە وا دەگەیەنێت هەر لەسییەکانەوە برەوی هەبووەو بەکارهێنراوە لەماڵە دەوڵەمەندو هەژارەکاندا، بەڵام نموونەمان بەدەست ناکەوێت لەدوای ساڵانی نێوان حەفتاکان، کەئەمیش بەڵگەیە بۆ لەدەست دانی ئەم هونەرە.

*** کەرەستە بەکارهێنراوەکانی سەندوقی بوڕاق:**

دەربارەی کەرەستە بەکارهێنراوەکانی یەکەمو سەرەکی ترین کەرەستە (دارە)، کە زۆر بەشێوەیەکی فراوان کاری پێکراوەو جۆری ئەو دارەی کە بەکارهێنراوە لە شێوەی سووکەو تەنکەو هیچ دارێکی قەبەو قەوی تێدا رێك نەخراوە، کەرەستەی دووەم شووشەیە، شووشەیش لەپارچە لاکێشەییەکانو چوارچێوەی سەندوقەکە، زیاتر ئەو شووشانە ڕەنگ کراوەو وێنەکانی لەسەر دروست کراوە.

بەکارهێنانی بزمار لەجۆری بچووكو باریك بۆ ئەوەی لەگەڵ دارە سووکەکاندا بگونجێت، لەگەڵ دەسکی بەکارهێنراو بۆ دەرگاکەی ناوەڕاست.

یەکێك لەو پێویستییانەی تر رەنگە، کە جۆرەهای تێدا بەکار دەهێنرێت، لەرەنگی سوورو شینو سەوزو رەشو سپیو ئاڵتوونیو زیوییو پەمەییو ئەرخەوانیو زەردو سووری هەناری، هەروەها جۆرە رەنگێکی فسفۆری بەکار هێنراوە، بۆ ئەوەی بە تایبەتی لەشەودا بریقە بدات، یان لە رۆژدا لەگەڵ بریقەی جامەکە (شووشەکە) جۆرە جوانکارییەك بدات بەسەندوقەکە. کەرەستەی کانزایش بەکار هاتووە لەمسو ئاسن، بەڵام بەشێوەیەکی زۆر کەمو سادە.

*** بابەتەکانی سەندوقی بوڕاق:**

بابەتەکانی سەر نەخشی سەندوقەکە گەلێك جۆرو هەمە چەشنە، کە هەریەکە خاوەنی هەڵگری ئاوەزی نەخشکارێکە لە رووی بۆ چوونی بابەتەکانی، ئەویش لە ژێر کاریگەری باری کۆمەڵایەتیو ئایینیو ئابووریدا خۆی دەبینێتەوە، چونکە بابەتەکانی پابەندی ئەم لایەنانەو لەو خولگەیەدا دەسووڕێتەوە، بەڵام لەبەرئەوەی لەخولگەیماڵەوەیە بۆیە ڕەنگدانەوەی بابەتی سیاسی تێدا بەکار نەهێنراوە خراوەتە جیهانێکی کۆمەڵایەتی کوردەواری ناوچەی کەرکوك.

ڕەچاوکردنی بابەتی کۆمەڵایەتی گونجاو لەگەڵ ژینگە کۆمەڵایەتییەکە، بۆ ئەوەی هەموو کەسێك هەستی پێ بکاتو ڕوویەکی ئاسایی هەبێت، گرێ دراو بێت بە پابەندە ئایینییەکان، بۆیە بابەتێك هەڵنەبژێردراوە کە نامۆ بێت لەگەڵ بارە ئایینییەکەدا.

ئەگەر سەرنجی بابەتەکانی بدەین، هەوڵی سازدانی ڕێنومایییەکانی (کۆمەڵایەتی–ئایینی) کراوە بووەتە هۆی ئەوەی وێنەیەکی وا نابینین کە داماڵراو بێت لە ڕووە ئایینییە کۆمەڵایەتییەکە، بۆیە وێنەکان رووکارێکی کاریکاتێری رەمزی بابەتێکن بۆ ئەوەی نەخشکار لۆمەی کۆمەڵایەتی نەیەتە سەریو ڕەواجە ئابوورییەکەی نەشکێت.



نموونەیەك لە سەندوقی بوراق

*** بابەتی وێنەی بوڕاق:**

ئەم بابەتە لە زۆری سەندوقەکاندا بەکار هاتووە بۆیە سەندوقەکەیش هەر بە ناو ئەوەوە ناونراوەو پێی بەناوبانگ بووە، کەئەمیش بریتییە لە ڕوویەکی خەیاڵی وێنەکەو باس لەو ئاژەڵە دەکات کە لەشەوی (میعراج)دا پێغەمبەر پێی ڕۆیشتووە بۆ ئاسمان، کە لە وەسفەکاندا بریتییە لە ئاژەڵێکی نائاسایی.

*** بابەتی وێنە ئاژەڵییەکان:**

زۆربەی وێنەکانی سەندوقەکانی ڕازاوەتەوە بەوێنەی ئاژەڵانی وەکو (تاوس، بوڕاق، حاجی لەق لەق)، بەڵام ئەگەر سەیری ئەم وێنانە بکەین دەبینین ڕوویەکی دیاری ئەم بابەتە هەیە، هیچ گۆڕانێکی تێدا نەکراوەو وەکو خۆی ئەوەی کەهەیە لە سروشت وێنە کێشراوە، چونکە کاریگەریە ئایینییەکە دەوری نەبووە بەسەر بابەتی وێنەی ئاژەڵاندا.

تا ماوەیەکی چاك کاریگەری ئایینی دەوری خۆی بینی بەسەر وێنەی مرۆڤدا لەبەرئەوەی بە ڕوویەکی حەرام سەیر دەکرا، بەڵام ئەم کارتێکردنە بەسەر وێنەو بابەتی ئاژەڵاندا نەکەوتبووە، بۆیە ئەوەی کە هەبوو بە ڕوویەکی سروشتی خۆی پێوانەی بۆ دەکرا ناوچەی کەرکوکیش نەکەوتبووە بەر ئەو کاریگەرییە ئایینیەوە تا بەتەواوەتی وێنەکە لە ڕووی سروشتی دابڕێت.

*** بابەتی وێنەی ڕووەکی:**

ئەمە پانتاییەکی گەورەی لەڕووبەری سەندوقەکە داگیر کردووە، بەتایبەتی لەڕووی پارچەکانی ئەم لاو ئەولای سەندوقەکە لەگەڵ چوارچێوەی سەندوقەکەو قاچەکانیدا.

وێنە ڕووەکییەکان بریتییە لەگەڵای دارمێوو گەڵای دارو گەڵای هەنارو گوڵی هەنارو گوڵە باخ و گوڵە بەڕۆژەو گوڵە قەنەفڵ و..

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت لەوێنە ڕووەکییەکاندا بریتییە لە گۆڕینی وێنەکان لەسروشتەکانی خۆیدا، ئەویش بەتێکەڵکردنی گەڵامێوە لەگەڵ بەرەکەی هەنار یان گەڵای هەنار لەگەڵ بۆڵە ترێدا، یا تێکەڵکێشی گوڵەباخ لەگەڵ مێخەکدا لەگەڵ هەمان گەڵاو لقی دار گوڵەکەدا، ئەمیش جوانکارییەکی داوە بەنەخشەکان.

*** بابەتی وێنەی ئایینی:**

بریتییە لە وێنەو نەخشی ئایەتی قورئان و ڕازاندنەوەی بەمزگەوت و منارەو نەخشاندنی وێنەکان بەرەنگی سەوزو سپی و جۆرەها ڕەنگی تر هەروەها تێکهەڵکێشی ئایەتەکان لەگەڵ وێنە ڕووکییەکان یان وێنەی مزگەوت و منارەکانیدا، بەکارهێنانی وێنەی ئەسپ و شمشێرەکەی ئیمامی عەلی، بیستوومە لەزۆر کەس کە ئەو جۆرە وێنەیە هەیە بەڵام هیچ جۆرە نموونەیەکم بەدەست نەکەوت.. لە ناوچەی (داقوق)

زیاتر بەکار هێنرابێت لەبەر ئەوەی لەرووی ئایینییەوە شیعە مەزهەبن، بەڵام ناوچەکانی تر لەم رووەوە دوورن کە سونی مەزهەبن.

*** تەکنیکاری لەوێنەکاندا:**

ئەگەر سەرنجێکی وێنەکان بدەین دەبینین کە توانایەکی زۆر بەهێزیان بەکار هێناوە لەکێشانی وێنەکان، ئەویش کەنەخشکار نەخشەکانی کێشاوە لەرووی ناوەوەی شووشەکەو لەدەرەوە رووی راستی وێنەکانی بەدەر خستووە کە ئەمیش لەدوو رووەوە گرنگە، روویەکی توانای نەخشکارەکە بەدەرخات، روویەکی تری بۆ ئەوەیە لەکاتی سڕینەودا لەسەر جامەکە وێنەکە تێك نەچێت، چونکە ئەگەر لە ڕووی دەرەوە بێت ڕووی بۆیاخەکان بەزوویی دەڕوات.

توانایەکی تری نەخشکارەکان بەکارهێنانی رەنگ بەشێوەیەکی فراوانو چڕ، ئەویش لەوەی دابەشکردنی رەنگەکانە بەشێوەیەکی یەکسانی، وەکو ئەوەی لە تابلۆیەکدا هەموو رەنگەکان بەکارهێنراوە لەسوورو شینو سەوزو زەردو پەمەیی و ئەرخەوانی هەناریو رەشو سپیو خۆڵەمێشی، کە دەبێتە هۆی ئەوەی ڕوویەکی جوانکاری بدات بەسندوقەکە.

هەروەها بەکارهێنانی شووشە بەند بەپانتاییەکی فراوان خۆی لەخۆیدا باڵا دەستی نەخشکارە بۆ بریقەدان یان تیشك دانەوەی شووشەکەیە لە ماڵو سەرنج راکێشانی مرۆڤ لەکاتی سەیرکردنیدا.

*** بەراوردی سەندوقی بوڕاقی ناوچەی کەرکوك لەگەڵ ناوچەکانی تردا:**

ئەگەر بەراوردێکی ئەم سەندوقە بکەین لەگەڵ ناوچەکانی تردا دەبینین چەند تایبەتمەندییەکی هەیە، کە کەرکوك جوداوازی هەیە لەرووی قەبارەو نەخشو رەنگو جۆری بەکارهێناندا، لەرووی قەبارەوە سەیر بکەین دەبینین لە ناوچەی کەرکوکدا سەندوقە دوولا یان دوو چاوو گەورەتر بەرچاو دەکەوێ، وەك ئەوەی لە ناوچەی سلێمانیدا هەیە، هۆکەش ئەگەڕێتەوە بۆ کاری ژینگەو شوێن، کە لەناوچەی کەرکوکدا ئەم دوو هۆکارە فراوانەو رێگای زۆرتر هەیە بۆ رازاندنەوەی ماڵ[١٢].

لەرووی رەنگەوە زیاتر رەنگەکان لە ناوچەی کەرکوکدا گەشاوەیی پێوە دیارەو زۆری رەنگەکان بەکارهێنراوە لە نەخشاندن کەئەمەش خۆی لە خۆیدا بۆتە رەنگدانەوەی وێنەکان بەشێوەیەکی گەشاوە.

دەربارەی وێنەکانیش زیاتر بابەتی رووەکی پانتاییەکی گەورەی داپۆشیوەو هەموو بابەتەکانی تر لەنێو بابەتی رووەکییەکان لە (٩٠٪) تابلۆکانی سەندوقەکانی داگیر کردووە.

لە سەندوقەکانی کەرکوکدا مێژووی دروستکردنو ناوی دارتاشەکەی نووسراوە، کەئەمەش لەناوچەکانی تردا بە کەمی بەرچاو دەکەوێ، بۆ نموونە لەسەندوقێکدا نووسراوە (١٩٥٣- کەرکوك - اوسطة - مصطفى)، یان لەیەکێکی تر نووسراوە (١٣٥٠) لە هەندێك کاتدا مێژووەکەی کۆچی



نموونەیەك لە سەندوقی بوڕاق

نووسراوە.

هەروەکو لەسەندوقەکانی ناوچەی کەرکوك بەرچاو دەکەوێت هێشتنەوەی پەڕپەڕەو دەرەکە، ئینجا پەر پەڕەکان یان لەناوەڕاستەوە، بووە یان لە ئەملاو ئەولاوە بوو.

تایبەتمەندییەکی تر ئەوەیە کە سەندوقەکانی ناوچەی کەرکوك شێوەیەکی لاکێشەیی تەواویی وەرگرتووە، بەڵام هی ناوچەکانی تر کەمی شێوە لاکێشەیی پێوە دیارە.

تایبەتمەندییەکی تر ئەوەیە کە تابلۆکانی سەر سەندوقی ناوچەی کەرکوك، هەڵگری خاسییەتی ئەو شارستانییانەن کە لە ناوچەی کەرکوکدا سەری هەڵداوە، وەکو شارستانی (هـوری - میتانی) ناوچەی (نـووزی)و (کـوپرو خانی)و (ئەراپخا)و (ئال-ئیلانی) بۆ نموونە دەتوانین بەراورد بکەین لە نێوان تابلۆکانی سەر دیواری ژووری فەرمانڕەوا لە (نوزی) لەگەڵ تابلۆکانی سەر سەندوقەکەدا کەزۆر لێك چوون هەیە لە نێوانیاندا.

* ئەودارتاشانەی کاری سەندوقی بوراقیان کردووە لە ناوچەی کەرکوکدا:

١. وەستا فائق-دوکانی لە قەراخ خاسە بوو؟
٢. وەستا محەمەد عەلی-دوکانی لە کوێر حەمام بوو.
٣. وەستا مەحمود سۆرانی- دوکانی لە کوێر حەمام بوو.
٤. وەستائەحمەد سۆرانی.
٥. وەستا محەمەد عەباس-دوکانی لە حەلواچییەکان بوو.
٦. وەستا ئەحمەد عەباس-دوکانی لە حەلواچییەکان بوو.
٧. وەستا سەعید.
٨. وەستا سەید وەلی-دوکانی لە بازاڕی گەورە بوو.
٩. وەستا ستار حاجی عومەر-دوکانی لەبازاڕی گەورەبوو.
١٠. وەستا مستەفا-کە کاکەیی بوو.
١١. وەستا محەمەد پیرە- کە دوکانەکەی لە گەراجی حەویجەیە.

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**


(١) (لمحات عن الفن العراقي)، د. خالید الچادر، لاپەڕە (٤١-٤٢).
(٢) (التصویر في الإسلام عند الفرس)، زەکی محەمەد حەسەن، چاپی یەکەم، چاپخانەی (لجنة التألیف والترجمة والنشر)، ساڵی ١٩٣٦، لاپەڕە (٢٦).
(٣) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢٧).
(٤) (زمن لکل الأزمنة، نظرات وآراء في الفن)، بلند حەیدەری، ١٩٨١، چاپی یەکەم، بەیروت، (مؤسسة العربیة للدراسات والنشر)، لاپەڕە (٢٩).
(٥) (التصویر في الإسلام)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٦ -٧).
(٦) (زمن لکل الأزمنة)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٨).
(٧) گۆڤاری (التراث الشعبي)، ژمارە (٩)، ساڵی (٨) ١٩٧٧، لاپەڕە (٥٩-٦٠-٦٠)، لێکۆڵینەوەیەك بە ناونیشانی:
(ثلاث مصورات للبراق)، لەیس خەفاف.
(٨) گۆڤاری (الفنون العربیة)، ژمارە یەکەم، ١٩٨١، لاپەڕەکانی (٣٠-٣٣)، لێکۆڵینەوەیە بە ناونیشانی:
(البراق وماهي مصادره)، نووسینی: موسەلسەل ئەلعانی.
(٩) گۆڤاری (هەزارمێرد)، ژمارە (١٢)، ساڵی سێیەم، ٢٠٠٠، لێکۆڵینەوەیەك بە ناونیشانی:
(هونەری بیناکاریو نەخشو نیگاری ناوچەی کەرکوك، سەردەمە مێژووییەکان)، نووسینی: ئەژی.
(١٠) گۆڤاری (الف باء) ژمارە (١٦٧٥) ساڵی سیو سێیەم، چوارشەممە، تشرینی دووەم (٢٠٠١م)، (١٤٢١هـ)، لێکولینەوەیەکە بەناونیشانی:
(زرق ورق واشجار ونشار)، نەرمین ئەلموفتی).
(١١) (شاری سلێمانی)، بەرگی دووەم، چاپی دووەم، نووسینو کۆکردنەوەی ئەکرەمی مەحمودی سالمی ڕەشە، دەزگای ڕۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی، کتێبی ژمارە (٢٣١)، ساڵی ١٩٨٩.

## بەشی دەیەم

# مێژووی هونەری نەخشی لۆقەندان لەناوچەی کەرکوکدا

ناوچەی کەرکوك شوێنێکی گرنگو دەولەمەندی شارستانی جۆربەجۆرەکانە، کە قۆناغ لەدوای قۆناغ هەنگاوی بڕیوەو گەلێك کەلەپوورو ئاسەواری کۆنینەی بەجێماوە لە (نوزی)و (کوڕووخانی)و (قەلاّ)و (ئەراپخا)دا، کە گەواهی ئەم راستییە دەدەن.

شارستانی (گۆتی)و (لۆلۆیی)و (هوری-میتانی)و (میدی)و (ئاشووری)و (ساسانی) یەکان، هەریەکەی جێ پەنجەی خۆی بەجێهێشتووەو بۆتە هۆی دەولەمەندکردنی ناوچەکە لەهەموو رووەکانو گۆڕانەکانی پێشکەوتندا.

یەکێك لەو پێشکەوتنانە، هونەری بیناکاریو نەخشو



نموونەیەك لە نەخشی لۆقەندان



نموونەیەك لە نەخشی لۆقەندان

نیگارە، كە هەریەكەی جێگایەكی گرنگی بەجێهێشتووەو هەولیان داوە ببێتە بەرزكردنەوەی هەرەمی گۆڕانە بیناكارییەكانی ناوچەكەو وای كردوە تایبەتمەندییەكی دیارو بەرچاو دروست بكات كە ببێتە ئەوەی جوانكاریو سیفەتی تایبەتی خۆی وەربگرێت.

یەكێك لەو هونەرانە كە باڵا دەستی خۆی بەجێهێشتووە، هونەری نەخشو نیگارو هەلكۆلینی ئەو نەخشانەیە، چ لەسەر گەچ یان دار یان مەڕمەڕ بێت. هەر لەبەر ئەمەیە كە ئەو هونەری نەخشو نیگارانەی ناوچەی كەركوك تایبەتمەندی خۆی هەیەو نموونەیەكی بەرچاوی هونەری كوردستانو خاوەن ئەزمونێكی دیارە لەتەرزی بیناكارییدا.

هاتنو بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام، لەگەڵ خۆیدا بووە موتوربەكردنی ئەو هونەری نەخشو نیگارانەی لەوە پێشەوە كە هەبووە، كاریگەرییەكی هەمەلایەنەو هەمەچەشنە بووە لەچوارچێوەی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلامدا، كە ئەمە وای كرد ببێتە هەلگری تایبەتمەندییەكی بەرچاو لەهونەری نەخشو نیگاردا.

ئایینی ئیسلام چوارچێوەیەكی نەخشو نیگاری دروستكرد، كە توانی ببێتە ئەوەی هەلگری چەند سیفاتێكی ئەو ژینگە ئیسلامییە بێت، لەگەڵ قۆزتنەوەی ئەو ژینگەیەی لەوەو پێش هەبوو، ئەمە وای كرد هەر ناوچەیەكی بەپێی خاسیەتەكانی شارستانییەتەكەی تایبەتمەندی خۆی وەربگرێت.

بەڵام تایبەتمەندی هەریەكە لەو ژینگەو ئاقارە ئیسلامیانە وای كرد بەپێی دوورو نزیكی لەئیسلامو كاریگەری شارستانییەتەكانی لەوەو پێش ببێتە هەلگری سیفەتە جوداكانی خۆی وەكو نەخشو هێڵو رەنگو تەرزی رووی دەرەوەی نەخشو نیگارەكان، ئەویش لەچوارچێوەی رووكاری ئەوەی كە نەخشەكەی لەسەر كراوە، چوونە ناوەوەی بەرووپۆشێكی ئیسلامی بەڵام لەژێر كاریگەری تەرزی نەخشو نیگارەكانی پێش ئیسلام.

هونەری (لۆقەندان)، یەكێكە لەو هونەرانەی كە لەوەو پێشی شارستانی بڵاوبونەوەی ئیسلام هەبووە، بەڵام كاریگەری بڵاوبونەوەی ئیسلام، ئەم هونەرەی قۆستەوە بۆ ناوچوارچێوەیەكی ئیسلامو كردیە هونەرێكی ئیسلامی تەواو، هەرچەندە تەنها روویەكی باریكو تەماوی سەردەمەكانی پێش ئیسلامی تێدا دەناسرێتەوە.

*** بنەرەتی هونەری لۆقەندان لە پێش ئیسلامدا:**

ئەوەی بەدەستمان گەیشتووە دەربارەی ئەم هونەرە ئەوەیە كە لەشارستانییەكانی پێش ئیسلامدا بەكارهاتووە بەتایبەتی لەرازاندنەوەی ژوورەكانی هەریەكە لە (نوزی)و (كوڕووخانی) دا، هەروەها لەوەوپێش كاشییەكان ئەم هونەرەیان بەكارهێناوەو بایەخیان پێداوە ((ئەوەی لەشارستانی كوڕووخانی بۆمان بەجێماوە، لەژوورەكانی (١٦، ١٧، ١٨، ١٩، ٢٠، ٢١، ٢٢، ٢٣)ی چینی دووەمی، كە بریتی بووە لەتاقی قووڵو باریك، بەڵام تاكو ئێستاكە كاری ئەم تاقانە نەزانراوە، لەوانەیە بەكارهێنرابێت بۆ ئەوەی شتی تێدا هەلگیرێت.

هەروەها ئەم جۆرە تاقانەو بەكارهێنانی لەكۆشكی (كۆریكالزۆ) هەبووە، كە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی كاشییەكان[1].

بەڵام ئەگەر سەیری لادێكانی ناوچەی كەركوك بكەین دەبینین، بەكارهێنانی ریز تاقو تاقی تاك. تاك بەكارهێنراوە بۆ هەلگرتنی شتوومەكو پێویستی دەگمەنی ماڵ بەتایبەتی لەشوێنێكی بەرز كە دەستی منداڵی پێ نەگات، ئەویش بۆ هەلگرتنی شتێ كە نرخو بەهای هەبێت.



**نموونەیەک لە نەخشی لۆقەندان**



**خانووی عەلی ئۆتراقچی لە هونەری لۆقەندان**

هەر لەبەر ئەوەیە دەتوانین نموونەی ئەم جۆرە نەخش و نیگارە لەپێش ئیسلامدا بدۆزینەوە، بەڵام بەو جۆرەو لەسەر ئەو تەرزەو شێوەیە نەبووە کە کەوتۆتە چوارچێوەی رووبەکی گشتی ئایینی ئیسلامەوە، بەڵکو زیاتر رووکارە ئیسلامییەکە جوانکارییەکی تری پێداوە کە جیاوازی هەیە لەگەڵ رووی بەکارهێنان و جۆری دروست کردنەکەی.

*** ماوەی بڵاوبوونەوەی لۆقەندان:**

زانیاری پێویستمان نییە دەربارەی ماوەی بڵاوبونەوەی (لۆقەندان)، ئەویش بەهۆی فەوتاندنی بەشێکی **زۆری** شوێنەواری نەخش و نیگاری خانووەکانی ناوچەی کەرکوك بەتایبەتی خانووەکانی قەڵا؛ بەڵام بەپێی ئەو شارستانییانەی کە دەستمان گەیشتووە، کە ماوەی ئەم هونەرە **لەسەردەمی** فەرمانڕەوایی عوسمانییەکان زیاتر بڵاوبۆتەوە **لەنێوان** ساڵانی (١٣٠٨ی کۆچی ١٨٩٠ی زاینی) تا دەوروبەری ساڵانی (١٣٤٠-١٣٤١ی کۆچی -١٩٢١-١٩٢٢ی زاینی). **کە** نمونەمان ماڵی (ساڵح ماڵی) لە ساڵی (١٣٣١-١٩١٢) یان ماڵی تەکیە (١٣٠٨-١٨٩٠)، یان ماڵی مەلا قادری ئیمام (١٣٤٠-١٩٢١).

مامۆستای **هێژا عەبدولڕەقیب یوسف ئاوا باسی ماوەی** بڵاوبونەوەی دەکات:

(بەر لەجەنگی یەکەمی جیهانی، کوردە دەوڵەمەندەکان، سەر دیوارو تاق و دەورو پشتی دەرگەو پەنجەرەی ماڵەکانیان نەخش دەکرد، **بەڵام** لەدوای جەنگەوە ئەم هونەرە رووی لەکزی کردووە)[٢]

بەڵام ڕای تایبەتی خۆم ئەوەیە، کە ئەم هونەرە زیاتر (عەلی نەقاش) و (حەسەن نەقاشی)ی دیاربەکری ئەم هونەرەیان هێناوەتە ناوچەی کەرکوك و ئەم هونەرە هونەرێکی خۆماڵی ئیسلامی کوردییەو لەوێوە گواستویانەتەوە بۆ کەرکوك، چونکە زیاتر ئەم هونەرە لەلایەن (عەلی نەقاشەوە) دروست کراوەو نەخشی بۆ کێشراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی چۆتە چوارچێوەیەکی ئیسلامییەوە زیاتر رووکارە کوردییەکەی لەدەست داوەو خاسیەتێکی ئیسلامی وەرگرتووە، لە هەمان کاتدا کەرکوك لە هونەری لۆقەندانادا تایبەتی خۆی هەیەو سیفاتەکانی جیاوازی هەیە وەکو ئەوەی کە هەیە لە ناوچەکانی تری کوردستان، لەبەر ئەوەی شێوەی دروستکردن و جۆری رەنگەکانی جیاوازی هەیە.

*** بنەڕەتی ناوی لۆقۆندان:**

بەزۆر جۆرو شێوە ناوی ئەم جۆرە نەخشە هاتووە:-

(لۆقۆندان)، (لۆقۆلدان)، (لوقوندان)، (لوقومدان)، (لۆقەندان)، (لقندان)، (لووقومدان)، (زمرە)، (ریز تاق)، **(تاق** تەرەج)، (مشكاة)، (كوی)، (زهرە).

**بەڵام** ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە، کە بنەڕەتی **ناوەکە** بەشێوەیەکی راست بەدەستەوە نایەت، بەپێی دوورو نزیك تووشی سووان بووە یان ووشەی بۆ زیاد کراوە یان لێی داتاشراوە، ئەویش بەپێی بێژەتی ئەو خەڵکە کە چۆن ئاسانکراوە لەگۆکردنیدا، بۆیە پیتێك بۆتە قوربانی لەجێگەی پیتێکی ترو، بۆتە گۆڕینی بێژەتی ووشەکە، هەر لەبەر ئەمەیە گۆکردنی ووشەکە لە نێوان زمانی کوردی و تورکی و فارسیدا تێکەڵاوی دروست کردووە.

ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەوەیە دەبێت لەپێشدا بزانین کە کاری گرنگی (لۆقوندان) چییە، ئەوەی کە زانراوە (لۆقوندان)، لەژووری دانیشتن بەکارهێنراوە ئەویش لەخۆیدا شوێنێکە گرنگەو بەرچاوە، بۆیە هەستاون بەدانانی ئەو شتانەی **کە** دەگمەن و بەهایە لەدانانی لەو شوێنەدا تا بەرچاو بێت یان لەهەمان کاتدا رووبەکی جوانکاری ژوورەکەی هەبێت، ئەویش لەبەر ئەوەی ژووری دانیشتنە، هەر لەبەر ئەمەیە بەچاوێکی گەورەو بەنرخەوە سەیرکراوە.

لەوانەیە بنەڕەتی ووشەکە لە (لۆقەنتە) یان (لوقم دان) ەوە هاتبێت، کە لەلۆقەنتە بەمانای چێشتخانە دێت، ئینجا رێگای پێ دەچێت بەکارهێنانی، دانانی شتی زۆر لەخانەکانی (لۆقەندان)دا وەکو چێشتخانە سەیر بکرێت کە هەموو جۆرە شتێکی لێ دەست بکەوێت بەڵام لەبەر گرانی گۆکردنی (لۆقەنتە)، ووشەکە بەرەو (لۆقەندان) بەکارهێنراوەو ئاسان کراوەتەوە

یان بنەڕەتی ووشەکە لە (لوقم دان)ەوە هاتبێت کە **ئەویش بۆ هەڵگرتنی هەموو ئەو شتانەی کە جۆری (لوقم)** ن و لەو جۆرە شوێنانە دابنرێت تا دوور بێت لەمێش و مەگەزو پیس بوون.

(بەڵام زۆر ڕێی تێدەچێت کە بنەڕەتی ووشەکە کوردی بێت، ئەویش بەو جۆرە هاتبێت (لۆقە-دان) یان (لۆق.. لۆق-دان)، بۆ نموونە بڕوانە:- لۆق، قاچ، پێ، لاق.

لۆقە. گورگە لۆقە، سەگ رەوت، قونە.

یان بڕوانە:-

(لاق، قاچ، الساق).

ئەوەی زیاتر ئەم رایە دەچەسپێنێت [٣]:

١. ووشەی (لاق)و (لۆق)، لەناوچەی کەرکوکدا زیاتر بەکاردەهێنرێت، کە ناوچەی سولەیمانی ووشەی (پێ) بەکاردەهێنن.

٢. هەروەها ئەم جۆرە نەخشە لەلایەن نەخشکاری کوردەوە دروست کراوە، بۆیە ئەمان ئەم جۆرە پێ ووتنەیان بەکارهێناوە نەك بێگانە.

٣. ئەگەر سەیری زمانی (تورکی)و (فارسی) بکەین، هیچ بنەڕەتییەکی ئەم ووشەیە نییەو، بۆیە تایبەتمەندە بەناوچەی کەرکوك.

٤. ((ئەگەر سەیری سەرچاوەی (شاکر سابر زابت) بکەین ووشەی (لۆقولدان تاق تەرج)ی کردووە کە ئەمە بەڵگەی تێکدانێتی لەووشەی کوردییەکە (لاق) **(لۆق)**...))[٤].

بەڵام ئەگەر سەیری سەرچاوە عەرەبییەکان بکەین دەبینین کە ووشەی ((کوی-مشكاة)) بەرامبەر (لوقوندان) بەکاردەهێنن کە ئەو راستییە ناپێکێت.

((كوى في داره كوى: فتحها)) یان:-

((الكوه الكوة، والكوة الخرق في الحائط)) [٥].

یان هەندێکی تر (مشكاة)یش بەکار دەهێنن کە دەکاتە تاقێك کە لەهەردوو لاوە کون بێت و جاران چرایان لێ دادەنا




**خانووی سەید فاتیح**




**خانووی عەلی ئاغا**

*** هونەری لوقوندانی ناوچەی کەرکوك:**

**ماموستا عەبدولڕەقیب یوسف ئاوا باسی هونەری لۆقوندان دەکات لەناوچەی کەرکوکدا:**

**((لەسەر هەیوانی کەلەگی کەرکوکدا لەبەشی سەرەوە کە گومەزییە نەخشی (لقندان لوقوندان) هەیە، ئەم نەخشە گەورەیە لەچەند ریزێك تاقی بچوك پێك دێت،کە سێ ریز یان زیاتر، ڕیزەکانی سەرێ ژمارەی تاقەکانی کەمترە چونکە (لوقوندان) گومەزی هەلکەوتووە، سەری تاقەکان بەچەند شێوەیەکە، هەندێکیان وەکو محرابن و هەندێکیان سەرەکانی دەبێتە گوڵ بەشێوەی کۆن (تخریمی)و بەشێوەیێکی زۆر جوان تاقەکان ئەکرێن.**

**(لوقوندان) ئەکرێن بەسێ بەش، بەشی نێوەڕاست نێوان دوو شکلی جسمداری وەکو (منارە)و لەبەزاریی سەری نەخشی (لوقندان)، (ماشاءالله) نوسراوە بەراستو چەپو هەندێك لەنەخشی لۆقندان نەخشکراون بەنەخشی رەنگاو رەنگ وەکو رەنگی ئاوزێڕو شین))[٦].**

**ماموستا (شاکر سابیر زابت) دەربارەی لۆقوندانەکانی کەرکوك دەلێت:-**

**(لەلای سەرەوەی دیواری بەرامبەردا، کە بەبنمیچەوە دەنووسا، کە لەتاق (تەرەجە)ی بچووك.. بچووك دەچوو، بەڵام رازاوەترو بەگەچ نەقشی قەبارەدار دەکراو، دەکرایەوە چەند چاوێك (چاو چاو دەبوو) بەمانەش دەوترا (لۆقولدان)و شووشەی رازاوەو (بەنەقش)و ئامرازی دیکەو بەنرخ و زیپوو تاقمی (مس)ی لێ دادەنرا.**

**خانووەکانی کەرکوك بەبۆیەی (بۆیاخی) رەنگاو رەنگ و نەقشی (زەخرەفەی)ی هەمەجۆر دەنەخشێنرا، سەر (لۆقولدان)و (تاق تەرەجە)کان بەگەچ و بەشێوەی قەبارەدار دەنەخشێنرا بۆیاخ دەکرا)[٧].**

**ئەوەی لێرەدا گرنگە سەرنجی خۆم دەخەمە سەر هەریەکە لەباسەکانی هێژایان (عەبدولڕەقیب یوسف)و (شاکر سابر زابت) دەربارەی هونەری (لۆقوندان):-**

ئەوەی گرنگە ئەوەیە ئەم جۆرە هونەرە زیاتر لەخانووی (کەلەگی)دا نەخشێنراوە، بەتایبەتی لەهەیوان یان ژووری گشتی دانیشتن. هەموو ئەو نەخشانە لەسەر رووی پانی ژوورەکە ئەولایەی کە بەرامبەر دەرگای دەرەوەیە دروست کراوە.

ئەوەی جێگای باسە پانی ژوورەکە دەکرێتە دوو بەشەوە، بەشی سەرەوەی نەخشی لۆقوندانەکەی لێ دەنەخشێنرێت، بەشی دووەمی کە خوارەوەیە بەبۆشی بەجێ دەهێڵن لەبەرئەوەی بۆ دانیشتن بەکاربهێنرێت. هەروەها بەشی سەرەوەی کە (لۆقەندانە) کەیە زیاترە لەبەشی خوارەوەی کە هیچ جۆرە نەخشێکی تێدا نییە. یان لەهەندێکی تردا بەپێچەوانەوەیە، بەشی نەخشەکە کەمترە.

مامۆستا عەبدولرەقیب یوسف وا باس ئەکات کە گوایە (لۆقوندان)، تەنها دوو گومەزی (منارە)یی هەیە، بەڵام لەکەرکوکدا نموونەی گومەزی چوار منارەیی هەیە وەکو ئەوەی ماڵی (سالح ماڵی) یە، کە منارەکانی هەردووکی ناوەڕاست گەورەترە لەمنارەکانی ئەملاو ئەولا، کە درێژی منارە گەورەکان هەریەکەی (١,٩٠) سنتیمەترە، بەڵام درێژی منارەکانی ئەملاو ئەولای (١,٤٣) سانتیمەترە لەنێوان بەشی سەرەوە لەگەڵ بەشی خوارەوەدا، ریزێك نەخشی رووەکی جیای دەکاتەوە بەپانی (٢٩) سانتیمەترەو بەدرێژی (٣,٠٧٥) سانتیمەتر، کە ئەم ریزە نەخشە بەردەوام دەبێت بەچوار دەوری ژوورەکە لەناوەڕاستی ژوورەکە بەدرێژی و پانی.

ژمارەی تاقەکان دەگۆڕدرێت بەپێی گەورەیی و بچووکی ژوورەکە لەسەر باری پانییەکەی، بۆ نموونە ژمارەی تاقەکانی لۆقوندانی ماڵی (سالح ماڵی)، ٢٨ تاقە یان تاقەکانی ماڵی (سەعید عومەر)، (٢٢) تاقەو، ژمارەی تاقەکانی ماڵی قادری ئیمام، بریتییە لە (٢٠) تاق، ژمارەی تاقەکانی ماڵی عەلی ئەترەقچی بریتییە لە (١٨) تاق، پێوانەی تاقەکانی ناوەڕاست و زۆری تاقەکان لەسەر شێوەی لاکێشەیی دروست کراوە، بەدرێژی (٥٠) سانتیمەترو پانی (٣٠) سانتیمەتر، کە پانی لەناوەوەی تاقەکە (٣١) سانتیمەترەو درێژی لەناوەوەی تاقەکە (٤٣) سانتیمەترە، کە هۆی ئەم جیاوازییەش دەگەڕێتەوە سەر ئەستوری گەچەکە لەدروستکردنی تاقەکاندا.

سەر رووی تاقەکان رازاوەتەوە بەنەخشی پەڕ پەڕەیی کە زیاتر ئەم لاو ئەولای تاقەکەی لەسەر رووی سەرەوە گرتۆتەوە، جۆری نەخشەکان رووەکییەو هیچ جۆرە نەخشێکی تر بەکارنەهێنراوە.

لەملاو ئەولای لۆقوندانەکە، (ماشاءالله) یان (یاالله یاالله) نوسراوە، بەڵام هەندێك (لۆقوندان) هەیە کە هیچ ئایەتێك نەنوسراوە، لەجیاتی ئەوە تاقی بەنەخش دروستکراوە.. یان (ماشاء الله) لەسەرەوەی لۆقوندانەکە نوسراوە.

ئەوەی سەرنج دەدرێت لەهونەری (لۆقوندان) دا، نەخشکار هەستاوە بەدابەشکردنی خانەکان بەپێی پانتایی ئەو رووبەرەی کە نەخشەکەی لێ دروست کردووە، ئەویش لەزیادکردنی منارەو ژمارەی تاقەکان و پانتایی رەنگ و جۆری نەخش و ئەو بۆیانەی کە بەکاری هێناوە



خانووی سدیق عەلاف




خانووی حاجی تەیفور



هونەر لۆقەندانی لە یەکێ لە خانووی جولەکەکانی شاری کەرکوك لە کۆندا

لەنەخشەکەدا. بەمانایەکی تر ویستویەتی جوانکاری دروست بکات بەپێی ئەو ژینگەیەی کە هۆڵەکەی لێ بنیات نراوە، کە دەگەڕێتەوە سەر کارامەیی نەخشکار لەو توانا و هزرەی کە بەکاری هێناوە بۆ ئەو سازدانە.

ئەو نەخشکارانەی کە لەناو شاری کەرکوکدا ئەم هونەرەیان برەو پێداوە، هەر یەکە لەعەلی نەقاشی کەرکوکی و حەسەن نەقاشی کەرکوکی بوونە.

ئەو خانوانەی کە نەخشی لۆقوندانیان تێدا نەخشاندوە ماڵی (عەلی ئەترەقچی)و (شێخ عەلی تالەبانی)و (مەلا قادری ئیمام)و (سالح ماڵی)و (سەید عومەر)و گەلێك ماڵی تر، بەڵام ماڵی (شێخ عەلی تالەبانی) هەموو نەخشەکانی لەناوچووەو ڕووخێنراوە.

(عەلی نەقاشی کەرکوکی لەخانووی مەلا قادری ئیمامدا، کە دەکەوێتە بەرامبەر مزگەوتی ئیمام قاسمی کەرکوك، نەخش و نیگارێکی جوان و ڕەنگاو ڕەنگی لەسەر ڕووی گەچەکە هەڵکۆڵیوەو، چەند تابلۆیەکی زەیتی سەر دیوارو نیگاری (لۆقوندانی) گومەز ئاسا لەژمارەیەك ڕیز تاقی بچوك و دوو تەنی شێوە منارەییدا، نەخشاندووە[8].

دەربارەی بەکارهێنانی ڕەنگ لەهونەری (لۆقوندان)دا، ئەوەی زیاتر نەخشاندنی تاقەکان هەیە ڕەنگی شین و ئاو زێڕو سوورو سپی، بەڵام ئەوەی لەهەمووی زیاتر ڕەنگی شینە ئینجا ڕەنگی ئاوزێڕە.

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**


(١) گۆڤاری (سومر)، جلدی سی‌و سێیەم، دکتۆر یاسین محمود الخالص، (تل الفخار کوروخانی).
(٢) (لەپێناوی کۆکردنەوەو زیندوکردنەوەی کەلەپووری کوردیدا، بانگەوازێك بۆ رووناکبیرانی کورد)، عەبدولرەقیب یوسف، بڵاوکراوەکانی پرۆژەی هاوسەر (٢)، ١٩٨٥، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، لاپەرە ٧٦.
(٣) (فەرهەنگی کشتوکاڵ)، مەعروف قەرەداغی مەردۆخی، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم، دار السلام، بەغدا، ١٩٧٢، لاپەرە (٩٣).
(٤) (کرکوکده اجتماعي حیات)، شاکر سابیر زابت، بەزمانی تورکی، لاپەرە (٦٥-٦٩)، زۆر سوپاسی بەرێز ئەحمەد تاقانە دەکەم لەوەرگێرانی ئەو چەند دێرە.
(٥) (المنجد معجم مدرسي للغة العربية)، لویس مەعلوف، چاپخانەی (الکاثولیکیة)، بەیروت، چاپی دەیەم، نیسان، ١٩٥١، لاپەرە (٧٥٠).
(٦) گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢)، تشرینی دووەم، ١٩٨٢ لاپەرە (٢٠)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(شێوەی کەڵەکی لەهونەری ئاوەدان کردنەوەی کوردیدا)، عەبدلرەقیب یوسف.
(٧) (کرکوکده اجتماعي حیات)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٦٥-٦٩).
(٨) (بانگەوازێك بۆ رووناکبیرانی کورد)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٧٧).

## بەشی یانزەهەم

# کاریگەری هونەری بیناکارییە ئایینییەکان بەسەر شێوەی بیناسازی کڵێسەکانی ناوچەی کەرکوکدا

هەر لەسەردەمانێکی زووەوە ئەگەر نەڵێین هەر لەسەردەمەکانی پێش مێژووەوە، ئەم ناوچەیە ئاوەدان بووەو جۆرەها داب و نەریتی ئایینی تێدا گەشەی کردووەو خاوەنی جۆرەها ڕێنومایی و هەڵگری ئایینی بووە کە قۆناغ بە قۆناغەکانی مێژوو گەشەی کردووەو هەنگاوی پێویستی پێشکەوتووی ناوە بەرەو کامڵ بوونی ئایینی لەئاقارەکەیدا.

هەر لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین مێژووی ئایینییەکان سەیر بکەین و کاریگەری هەر یەکێکیان بەسەر ئەوی ترەوە دیاری بکەین و بکەوینە دیاریکردنی خاڵە هاوبەش و خاڵە جیاوازەکانی گەشە بووی ئایینیەکان لەئاسۆی هەر یەکێکیانەوە.

گرنگترین شوێنێك کە جێگەی بڵاوکردنەوەی بیرو باوەڕە ئایینییەکان بێت، ئەو شوێنەیە کە مرۆڤ ڕووی پەرستنی تێدا بەکار دەهێنێت، ئەویش تەنها بیناکارییەکی سادە نییە، بەڵکو هەڵگری جۆرەها سیفاتی خۆیەتی، کە زۆر جیاوازە لەڕووی شێوەی بیناکاری گشتی، ئەویش لەبەر ئەوەی هەموو شوێنەکانی تر پیرۆزترو هەڵگری جۆرەها تایبەتمەندی خۆیەتی کە مرۆڤ زیاتر بایەخی پێ دەدات.

هەر لەسەرەتاکانی بڵاوبوونەوەی ئایین دا، شوێنی پەرستن جێگەیەکی دیاری بیناسازی هەبووە، هەر یەکەی هەڵگری قۆناغێکی مێژووییە و خاوەنی تەرزێکی بیناکاری دیاریکراوە.

یەکێك لەو ئایینانە، ئایینی مەسیحیە کە قۆناغێکی مێژوویی دوورو درێژی بڕیوەو خاوەنی تایبەتمەندی خۆیەتی لەپێگەیاندنی هونەری بیناکاری، ئینجا یان لەژێر کاریگەری ئایینەکانی تردا بوو یان هەڵگری ژینگەیەکی دیاری خۆی بووە یان تێکەڵاو بەهەردوو باروودۆخەکە بووە.

یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی ئەم ئایینە دروست کردنی کڵێسەیە، کە تیایدا ڕێنمایی ئایینیەکانی تێدا جێبەجێ دەکرێت، کڵێسەیش خاوەنی چەند لایەنێکی بیناکارییە لەڕووی بەشەکانی نێویدا، کەهەریەکەی خاوەنی مێژووییەکی دیارو قۆناغی، جیاواز. جیاوازی بڕیوەو تا گەیشتۆتە ئەو شێوەیەی ئێستای.

خاڵێکی گرنگ هەیە لێرەدا ئەوەیە، کە ئایینی مەسیحی سەری هەڵداوە و گەشەی کردووە لە ئاقارەکانی ڕۆژهەڵاتداو لە هەمان کاتدا لەڕۆژئاوایش گەشەی کردووە، بۆیە هەرچەندێك سەیر بکەین کە کاریگەری ڕۆژهەڵاتی لەهەموو لایەنەکانەوە بەسەرەوە دیارە، چ لەڕووی تایبەتمەندی ئایینەکە یان لەشێوەی بیناکاری کڵێسەدا، هەرچەندەش کە ڕێنماییە ئایینییەکانی کڵێسەی ڕۆژئاوایی بەسەرەوە بێت، بەڵام زیاتر کەوتۆتە بەر کارتێکردنی ژینگەکەی ڕۆژهەڵاتەوە و لەوێوە خۆی پێگەیاندووە و گەشەی کردووە.

ئەگەر سەیر بکەین کە هەر چەندە ڕێنماییەکان لە ڕۆژئاوادا دەرچێت، بەڵام زیاتر کاریگەری بەسەر لایەنە ئایینییەکەوە هەیە وەکو ئەوەی کاریگەری بەسەر شێوەی بیناکارییەوە هەبێت.

یەکێك لەو دیاردانەی کە زۆر بەزەقی بەدیار کەوتووە، کارتێکردنی هونەری بیناکاری پەرستگاو ئاتەشگەو تەوراتگەیە بەسەر هونەری بیناکاری کڵێسەوە، ئەویش دەگەڕێتەوە بەسەر دیاردەی بڵاوبوونەوەی ئایینەکە لەڕۆژهەڵات و گەشەکردنی لەنێو ژینگەی ئەو ئایینانەدا، کە هەریەکەی دوورو نزیك ڕۆڵی خۆی بینیوە لەسەر شێوەی بیناکاری کڵێسەدا.

هەر لەبەر ئەوەیە بەسەیر نازانرێت کە دروستکردنی یەکەم مزگەوتێك لەنیمچە دوورگەی عەرەبی جیاوازی هەیە لەگەڵ مزگەوتێك لەناوچەو ئاقارەکانی تری ئیسلامی، ئەویش دەگەڕێتەوە ژێر کاریگەری ژینگە ئایینیەکە.

لێرەدا دەگەینە ئەو راستییە کە شێوەی بیناکاری هەموو بیناکارییە ئایینییەکانی ناوچەی کەرکوك زنجیرەیەکی نەپچڕاوەیەو پەیوەستی چەند خاڵێکی هاوبەش هەیە لەنێوانیاندا، کە دەتوانین کاریگەری هەریەکێکیان بەسەر ئەوی ترەوە بدۆزرێتەوە، ئینجا ئەم زنجیرەیە یان شتێکی لێ زیاد کراوە یان شتێکی لێ کەم کراوەتەوە، ئەویش بەپێی رێنمایی هەریەکە لەئایینەکە لەجۆری بەکارهێنانی کۆتەڵ و ئاگردان و شوێنی قوربانی و پاککردنەوە (العماد) و سەکۆی قەشەو دەرگاو پەنجەرەو هەیوان و راڕەو کاریتەو بیرو سەکۆی دانیشتن و شوێنی پاراستنی زەیت و بخورو شوێنی ئیشکگرتن و خەلوەتگاو میحراب و پێویستی تر.

دەبینین زۆربەی ئایینەکان بەشێك لەم کەرەستانەیان بەکارهێناوە، بەڵام هەر یەکە بەپێی پێویستی رێنمایی ئایینییەکانی خۆیان گۆڕانکارییان تێدا کردووە، کە دەربارەی شێوەی بیناکاریش هەر بەو جۆرە کەوتۆتە بەر ئەم گۆڕانکارییەوە، گەلێك هێڵی هاوبەش و هاوپەیوەست و هێڵی تایبەتمەند بە ئایینەکانەوە سەری هەڵداوە کە تایبەتی ئەو ژینگەیەی بەخۆیەوە گرتووەو بۆتە مۆرکێکی دیاری ژینگە رۆژهەڵاتییەکە، کە هەڵگری بنەما دیارەکانی خۆیەتی.

هەر لەبەر ئەوەیە کار گەیشتۆتە ئەوەی کە جۆری کەرەستەی بیناکاریش رووە دیارەکانی خۆی وەرگرتووە کە جیاوازە لەگەڵ ناوچەکانی تردا.

مامۆستا دکتۆر (یوسف حبی) ئاوا باسی دیاردە دیارەکانی کڵێسەی رۆژهەڵاتی دەکات:

(ئەوەی کە کڵێسەکانی رۆژهەڵات جیا دەکاتەوە لە کڵێسەکانی رۆژئاوای بیزەنتی و لاتینی و هی تر کە پێی دەوترێت (بازلیك)، ئەویش بەبوونی دەروازە (دەرگا) لەهەردوو لای باری درێژی کۆتەڵەکە، لەلای دیوای سەروو خواروی هۆڵە گەورەکە بەرەو رۆژهەڵات دەڕوانێت کە، شێوەیەکی لاکێشەیی هەیە، بەڵام دەروازەکانی کڵێسەکانی رۆژئاوا بەرەو رووی دیواری قوژبنی رۆژئاوایە بەرامبەر بە کۆتەڵ (هیکل) و (شوێنی قوربانی – مذبح) کە دەکاتە لای پانی نەك لای درێژی هۆڵەکە. ئەوەی کە جێگەی سوودە باسی لێوە بکرێت ئەوەیە کە پەرستگا کۆنەکان لە وڵاتی میزۆپۆتامیادا لەزۆری کاتدا دەروازەکانیان (دەرگا) لەسەر دیواری پانی نەبووە کە پەرستگا (کۆتەڵ، الصنم) لەکۆتایی سووچی دیوارەکە بووە تا بۆ ئەوەی بەرامبەر (المذبح والمعبود) نەبێت کە لەناوەوە راستەوخۆیە، کە ئەمیش بەپێچەوانەی (بازلیك) ە، کە ئەمیش شێوەی کڵێسەی رۆژهەڵاتی پارستوویە.

هەڵە نین ئەگەر بڵێین کە مەسحییەکانی رۆژهەڵات هەستاو بەوەرگرتنی شێوەی بیناکاری کڵێسەکانیان لەشێوەی (مجامع)ی جوولەکەکان.. لەهەمان کاتدا (مجامع)ی جوولەکەکان لەژێر کاریگەری شێوەی بیناکاری پەرستگا کۆنەکانی نێوان دوو رووبار بووە[1].

لێرەدا دەگەینە ئەو راستییانەی خوارەوە دەربارەی هێڵی هاوبەش لەنێوان هونەری بیناکاری ئایینی لە ناوچەی کەرکوکدا:

١. هەموو بیناکارییە ئایینیەکان شێوەیەکی لاکێشەیی هەیەو هیچ شێوەیەکی چوارگۆشەیی بەرچاو ناکەوێت، ئەویش زۆر بەروونی لەپەرستگای (عشتار–تیشۆپ) لەنوزی و پەرستگای کوڕووخانی بەرچاو دەکەوێت کە هاوشێوەیە لەگەڵ کڵێسەکانی ناوچەی کەرکوکدا. (ئەوەی بەرچاو دەکەوێت لەپەرستگای نوزی شێوەی لاکێشەیی هەبووە کە ئەمە هاو شێوە بووە لەگەڵ ئەو پەرستگایەی هەبووە لە کوڕووخانی (تل فخار) کە هاوسەردەمێتی[2].

هەروەها دەتوانین بڵێین کە (کە نەخشەی گشتی سەکۆکەی کوڕووخانی بەلای درێژیدا چووە، ئەو پەرستگایەی کە لەسەری دروستکراوە شێوە لاکێشەیی هەبوو دووبارە هەروەکو پەرستگاکانی نوزی وا بووە[3].

٢. زۆری بیناکارییە ئایینیەکان دەروازە یان دەرگاکانیان کەوتۆتە سەر باری درێژی بیناکارییەکە، کە لەسەر پانی بیناکارییەکە بەرچاو ناکەوێت.

٣. هەموو بیناکارییەکان دەورە دراوە بە حەوشەیەکی فراوان، کە راستەوخۆ ناچێتە نێو بیناکارییە ئایینیەکەوە ئەویش بۆ ئەوەیە زیاتر رووبەکی پارێزراوو پیرۆزی هەبێت.

٤. هەموو بیناکارییە ئایینیەکانی ئەم ناوچەیە، چوونە ژوورەوە راستەوخۆ نیە بەرامبەر کۆتەڵ بەڵکو لەسەر باری درێژەوەبووی شکاوە یان لەسەر باری درێژەوە بووی راستەوخۆیە، بەڵام هۆڵێك یان راڕەوێکی بۆکراوە، کە بەدەروازەیەکی تر لەتەنیشتەوە دێتە ژوورەوە.

زۆربەی بیناکارییەکانی کوردستان: (بریتیە لەو پەرستگایانەی کە شوێنێکی سەرەکی و بەرزی هەیە، ژوورێکی درێژەو چوونە ژوورەوە بۆ ئەو پەناگەیە لەسووچێکی بارە درێژەکەیەوە کە دوور لەسەکۆی کۆتەڵی خوداوەندەکە یان لەلایەکی کورتی بەرامبەر سەکۆی کۆتەڵی خوداوەندەکە بووە[4].

٥. (هەروەها لەدەوروبەری ژووری (هەیکەل)، ژووری تر هەبوو کە کۆتەڵی خوداوەندی تری لێ هەڵدەگیرا)[5]. بەکارهێنانی فرە ژووری لەبیناکارییە ئایینیەکانی ناوچەی کەرکوکدا ئەویش لەبەکارهێنانی ژووری شت ومەك و زەیت و بخورو پاککردنەوەو پیاوی ئایینی و سەکۆی دانیشتن و ژووری ئاگردان.

٦. باو بوونی یەك دەروازە هەروەها لەهەمان کاتدا بەکارهێنانی دەروازە لەسەر باری درێژی بیناکارییەکە یان بەکارهێنانی زیاتر لە دوو دەروازە هەروەکو ئەوەی هەیە لەپەرستگای (نوزی).

٧. نەبوونی بەڵگەیەکی مێژوویی لەبیناکاری ئایینی ناوچەی کەرکوك دەربارەی (زەقوورە) و بوونی لەو ناوچەیە، کە ئەمیش جۆرێکە لەباڵا دەستی بیناکاری ئایینی پەرستگا، کە لەوانەیە لە دوا رۆژدا لەدوای پشکنینێکی زۆر بەڵگەی لەو جۆرەمان بەدەست بکەوێت.

٨. دیاردەیەکی تر لەبیناکاری ئایینی ناوچەی کەرکوك هونەری تازەکردنەوەیە لەپەرستگاکاندا ئەویش

بە دەست پیا هێنانی یان گەورە کردنەوەی یان گۆڕینی شێوەی بیناکارییەکەی لەهەمان شوێندا هەروەکو ئەوەی پەرستگاکانی (نوزی)و (کوپرووخانی). بۆ نموونە دەربارەی پەرستگای (نوزی): (گۆڕانێکی زۆر کەم هاتووە بەسەر پەرستگای عەشتار (چینی یەکەم) لەنوزیدا ئەویش لەسەردەمی پاشا (شوشتار) بەو شێوەییەی کە باو بووەو گۆڕین لە چینەکانی ژێرەوە هەبووە)[٦].

(لەبەر ئەوەی ئەم پەرستگایە دروستکراوە لە سەردەمی (بەرەبەیانی بنەماڵە هەرە کۆنەکان – فجر السلالات)، کە لەو کاتەدا ئەم شوێنە پێی وتراوە (گاسور)، کە دەکاتە ماوەی ئەکەدییەکان، هەروەها دووبارە دروستکردنەوەی لەسەردەمی میتانییەکاندا بەشێوەیەکی وا فراوان کراوەتەوە کە جێگەی بەشێکی زۆرتر لە نوێژکەران بگرێت، دەتوانین مێژوویەکی دیار دابنێین لەپاشماوەی نامەکانی پاشایی میتانی (شوشتار)، نزیکەی ١٤٦٠ی پێش زایین)[٧] هەر لەبەر ئەوەیە ناتوانین بڵێین کە ئەم هونەرە هونەرێکی تەواوی بیناکاری هوری – میتانیە[٨].

٩. بەکارهێنانی چەند چینێك لەسەر یەکتری لەهەمان شوێنی بیناکارییە کۆنەکە وەکو ئەوەی لەپەرستگاکانی کوپرووخانی یان سێ چینی مزگەوتەکەی (داقوق) یان مەرقەدی (ئۆمەر مەندان) یا مەرقەدی (زین العابدین) رووی داوە.

(وا بەدەردەکەوێت کە سەکۆی پەرستگای کوپرووخانی تووشی داروخاندن بووە لەماوەی دووجاردا، جارێکیان لەلایەن دوژمن لەو کاتەی کە دەستیان گرتووە بە سەر کۆشکەکە داو گوندەکەیان هەر هەمووی سووتاندووە یان جارێکیان لەلایەن دانیشتوانی چینی یەکەمەوە کە هەستاون بەتەختکردنی بەشێکی سەکۆکەو دایان بڕیوە بۆ دروستکردنی خانوو بۆ نیشتەجێ بوونیان)[٩].

١٠. دەربارەی هونەری نەخش و نیگار لەبیناکارییە ئایینیەکاندا، گەلێك بەڵگە بەدەستەوەیە کە بایەخیان بە رازاندنەوەی داوەو لەم هونەرەدا دەست رەنگینیان بەکارهێناوە.

(لەیەکێك لەمەزارەکانی پەرستگای نوزیدا دیوارەکانی ناوەوەی رازاوەتەوە لەدەرەوە بەپارچەی دار لەسەر شێوەی داری درێژ بەبیناکارییەکەوە چەسپ کراوە، لەهەندێك شوێنی تردا رووی دیوارەکان رازاوەتەوە بەناوکی هەڵتۆقیوو لەسەر شێوەی بزماری قوڕی شووشەیی تێکەڵاو کە بەم بزمارانەوە هەندێك کەرەستەی چنراو هەڵواسراوە کە رازاوەتەوە بە میرو (خرز))[١٠].

*** بەراووردێکی نەخشەی کڵێسەکانی ناوچەی کەرکوك لەنێوان کڵێسەی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایدا:**

لەلاپەرەکانی پێشووی ئەم باسەدا ئەوەمان سەلماند کەنەخشەیەکی هاوبەش هەیە لەنێوان کڵێسەکانی ناوچەی کەرکوکدا لەگەڵ شێوەی بیناکاری ڕۆژهەڵاتی و پەرستگاکانی کەرکوکدا کە هەریەکە لە پەرستگاکانی (نوزی)و (کوپرووخانی)مان کردە پێوەری باسەکەمان.

ئەو راستیە کە هەیە ئەوەیە کڵێسەکانی ناوچەی کەرکوك هەڵگری چەند سیفاتێکی خۆیەتی، دیاردەی رەنگدانەوەی ئەو ژینگەیەی تێدا گەشەی کردووەو خاسیەتەکانی ئەو شارستانیانەی وەرگرتووە. بۆیە کاتێك بمانەوێت ئەو سیفەتانەی ناوچەکەی بدۆزینەوە دەبێت سەیری بەراووردێکی کڵێسەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بکەین و بیخەینە تای تەرازووی لەگەڵ شێوەی بیناکاری کڵێسەکانی کەرکوك لەخوودی خۆیدا.

هەر لەنێوان کڵێسە ڕۆژهەڵاتییەکەدا جۆرە جیاوازییەك دروست بووە هەریەکەی هەڵگری سیفاتی ژینگەکانی خۆیانن لەنێو تەرزە ڕۆژهەڵاتییەکەداو هەموو دەم خووی ناوچەکان خاسیەتە جیاوازییەکانیان دروستکردووە، کە ئەویش بەپێی رێنمایی رێگە دراوەکانی کە باوە لەداب و نەریتی ئایینیەکەدا، هەندێك جار لادانە لەخوودی بنەڕەتی سەرەکی ئایینەکە، کە ئایینی مەسیحیە.

ئەگەر سەرنجێکی کڵێسەی ڕۆژهەڵاتی و کڵێسەی ڕۆژئاوایی بدەین دەبینین کە لەلایەن وردەکاریی بیناکارییەوە گەلێك جیاوازی هەیە کە هەڵگری رەنگدانەوەی گەشە کردنی هەریەکێکیانە.

کڵێسەکانی ڕۆژهەڵات زۆرتر بایەخی بە چڕکردنەوەی شێوەی بیناکاری داوە، کە ئەوەی پێویست بووە گرنگی پێداوەو هەوڵیان داوە کە ئەو لایەنانە بەکار بهێنن لەگەڵ خواستی بارووودۆخ و ژینگە ئایینیەکەدا گونجاوە، بۆیە ئەگەر سەیری کڵێسەی ڕۆژئاوایی بکەین بایەخیان بەزیادە رۆیی لەبیناکاریدا داوەو زیاتر لایەنە بیناکارییەکەیان وورد کردۆتەوە بۆ گەلێك بەشی جۆراوجۆر کە تا کارە ئایینەکانیش لەو ئاستەوە خوول دەخوات. لێرەدا دەگەینە ئەم خاڵانەی خوارەوە:

١. بەهۆی گەشەکردنی ئایینەکە لەڕۆژهەڵاتدا بووژاندنەوەی لەنێو ئایینی جولەکەو زەردەشتی و ئیسلامدا، وای لێ هاتووە کە هەردەم لەژێر کاریگەری و بەربەرەکانی نێو ئایینەکاندا بێت و هەموو دەم بەرەو رووی کاولکاری و فەوتاندن بێت بۆیە هەستاون بە دروستکردنی کڵێسەیەك کە لەگەڵ خواستی پێویستییە گرنگەکاندا بگونجێت و بتوانێت بەرگەی ئەو بەربەرەکانیە بگرێت. هەر ئەمەیش وای کردووە کەپێوانەی گشتی کڵێسەکە بچووك بێت و هەوڵ چڕ کردنی بیناکاریەکەی بدرێت کە لەهەندێك جاردا کار گەیشتۆتە ئەوەی پێی بڵێن (دێر)، کە نموونەی ئەمە زۆر بەروونی بەدەردەکەوێت لەکڵێسەکانی ناوچەی کەرکوکدا، هەر لەم ڕوانگەیەوە پێوانەی گشتی کڵێسەیەکی ناوچەی کەرکوك بچووکترە لەچاو پێوانەی گشتی کڵێسەیەکی ڕۆژهەڵاتی.

٢. رووی سادەیی بەکارهێنان لەکڵێسەکانی ناوچەی کەرکوکدا جیاوازە لەگەڵ کڵێسەی ڕۆژهەڵاتدا، ئەوەی سەرنج دەدرێت ئەوەیە پێویستی کڵێسەکە زۆر بەسانایی وەرگیراوەو کەمتر رووکەشی تێدا بەکارهێنراوەو هەوڵدراوە کە هەرزانی تەنانەت لەجۆری کەرەستەکەشدا بکرێت وەکو بەکارهێنانی خشت و خشتی سوورەوەکراو بەردوو گەچ و

قێردا، چونکە لەبەرچاو گێرانی رووخاندنی هەردەم بیریان لە بەکارهێنانی کەرەستەی هەرزان‌و بەردەست کردووە وەکو ئەوەی هەوڵ بەدەست هێنانی کەرەستەی دوور دەست بدەن.

٣. بەکارهێنانی حەوشە شتێکی زۆر باو بووەو دەورە درانی بەشوورەی قایم‌و بەرز بۆ بەرگری کردن، زۆر بەزەقی رەنگی داوەتەوە لەکڵێسەکانی رۆژهەڵات‌و کڵێسەکانی ناوچەی کەرکوکدا.. کە لەگەڵێك کاتدا بنەمایەکی گرنگی کڵێسەکانە.

٤. شوێنی (العماد- پاککردنەوە) لە کڵێسەکانی ناوچەی کەرکوکدا بریتییە لەحەوزێکی بچکۆلانەو لەقوژبنێکی دووری کڵێسە دروستکراوەو ئەو بایەخەی پێنەدراوە لەبەرئەوەی لەناوچەکە دا گەلێك رووبارو گۆمەم هەیە کە کاری ئەم پاککردنەوەی تێدا بەئەنجام گەیاندراوە زیاتر وەکو ئەوەی لەنێو کڵێسەکەدا بەئەنجام گەیەنرابێت.

٥. کەمی بەکارهێنانی پەنجەرە لە کڵێسەکانی ناوچەی کەرکوکدا، ئەمیش زیاتر لەژێر کارتێکردنی روویەکی بەرگری خۆی دەگرێتەوە.

٦. بەکارهێنانی ژێر زەمین یان دروستکردنی (تونێل- نفق) لەکڵێسەکانی ناوچەی کەرکوك، ئەمیش زیاتر لایەنێکی بەرگری لەخۆی گرتووە، یان بۆ شاردنەوەی مردوو بەکارهێنراوە کە نموونەمان کڵێسە سوورەکەیە کە تاکو ئێستاکەش پاشماوەی تونێل‌و ژێر زەمینەکەی ماوە، ئەمیش تایبەتمەندییەکی کڵێسەکانی ناوچەی کەرکوکە.

٧. ئەگەر بڕوانینە قۆناغەکانی بیناکاری کڵێسەکانی ناوچەی کەرکوك، ئەوەیە گۆڕانی هەمەلایەنە بەسەر دروستکردنەکەیدا هاتووەو هەر جارێك بەجۆرێك‌و بە شێوازێکی تر دروستکراوە، زیاتر لەگەڵ بارە سەربازی‌و سیاسیەکەدا گونجاوە، کاتێك ناوچەکە هێور بۆتەوە، بیناکاری کڵێسەکە لەبارێکی باشتر ساز دراوەتەوە، یان کاتێك بارە سیاسیەکە لەبار نەبووە، بۆتە فەوتاندنی شێوەی بیناکارییەکەو لەدەست دانی، هەروەکو ئەوەی روویدا لە ناوچەی (داقوق)، کە تەنها پاشماوەیەکی بیناکاری چییە بەجێ نەماوە، ئەویش دەگەڕێتەوە سەر کاریگەری ئەو شەڕو ئاژاوەیەی کە لەناوچەی داقوقدا روویدا، ناوچەکەی تووشی کاولکاری کرد، کەماوەی فەرمانڕەوایی عەباسییەکان لەو ناوچەیەدا باشترین بەڵگەی ئەو راستیە بووە، دروست بوونی (خەواریج) گۆڕانێکی گەورە بوو کە نەخشەی ناوچەکەی بەتەواوەتی گۆڕی.

٨. بەکارهێنانی کۆڵەکەو کەوان‌و هەیوان لەکڵێسەکانی ناوچەی کەرکوکدا، ئەمیش لەژێر کاریگەری ئەو بیناکارییە ئایینیانەدا بووە کەلەناوچەکەدا گەشەیان کردووە، زیاتر خوازراوە لەهونەری بیناکاری ساسانییەکان‌و لەهونەری بیناکاری کڵێسەدا بایەخی پێ دراوە، یان لە هەندێك کاتدا هەر هەمان شوێنی ئاتەشگەکە کراوەتە کڵێسە، ئەویش بەتایبەتی لەبن هێزی قەڵەمڕەوی ساسانییەکان لەناوچەکەداو گەشەکردنی ئایینی مەسیحی لەو ناوچەیەدا.

جۆری کۆڵەکەکان زیاتر لوولەکی بووەو زۆر کەم رێدەکەوێت کە کۆڵەکەکان چوارگۆشەیی بێت، سنگی کۆڵەکەو گەلێك جار لەشی کۆڵەکە رازاوەتەوە بەنەخش‌و نیگاری جۆر بەجۆر کە زیاتر نەخش‌و نیگارەکان نەخشی رووەکی بووە، نموونەی ئەم باسەمان کڵێسەی (سوور)و کاتەدرائی (ام الأحزان)ە لەسەر قەڵا. لەهەمان کاتدا هونەری گوومەت‌و کەوانە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی هونەری بیناکاری کڵێسە لەناوچەکەدا، زۆری کەوانەکان لەهۆڵی کڵێسەکە دەڕوانێتە سەر کۆڵەکەکان‌و نێوانیان بەگوومەت دروستکراوە، زۆر کەم رێدەکەوێت لەو چوارچێوەیە چوو بێتە دەرەوە.

٩. بەکارهێنانی گۆڕو گەلێك جار گۆڕستان شتێکی باو بووەو بۆ ئەم مەبەستە ژێر زەمین لێدراوە بۆ شاردنەوەی مردووەکان، ئەویش زیاتر لەناوچەیەکی دووری حەوشەکەدا دروستکراوە.

١٠. دیاردەیەکی تر لەهونەری بیناکاری کڵێسەکانی ناوچەی کەرکوك، دروست کردنێتی لەسەر چەند چینێکی کڵێسەکان کەهەریەکەی دەگەڕێتەوە ماوەیەکی مێژوویی جیاواز.. جیاواز، لەوانەیە هۆی ئەم جۆرە بگەڕێتەوە سەر چەند دیاردەیەك، هۆیەکی ئەم دروستکردنە دەگەڕێتەوە بەسەر رووخاندنی تەواوەتی کڵێسەکە، کە ئەمە وای کردووە لەگەڵ خۆیدا ببێتە رووخاندنی هەموو بنەماکانی ئەو کڵێسانە، ئەمە وا دەکات زۆر بەزەحمەت چاك بکرێتەوە یان دەستی پێدا بهێنرێت بۆیە بڕیاری دروستکردنی دەدرێت لەهەمان شوێن بەڵام بەشێوەیەکی بیناکاری تر، جیاواز لە بیناکارییەکەی ژێرەوە.

یان هۆیەکی تر دەگەڕێتەوە سەر شوێنی دروستکردنەکە، وەکو ئەوەی لەسەردەمانێکدا، شوێنێکی قەرەباڵغ بووەو پێویستی بەوە کردوە کە ئەو کڵێسەیە لەوێدا بوو بێت، بەڵام لەسەردەمانێکی تردا ئەو پێویستییەی لەدەست داوەو ئینجا ماوەیەکی تر هاتووە تایبەتمەندی خۆی وەرگرتووەو پێویستی دروستکردنی هاتووە یان بایەخدان بە شێوەی بیناکاری کڵێسە وای کردووە کە دووبارەو لەسەر شێوازێکی تر دروست بکرێتەوە، گەلێك جار فراوان کردنەوەی بە خۆیەوە دیووە.

یان گۆڕان‌و پێشکەوتنی ئایینەکە وای کردووە، لەگەڵ خۆیدا ببێتە فراوانکردنی کڵێسەکان‌و زیاد کردنی پێویستییەکانی، ئەمیش خۆی دیوەتەوە لەدروستکردنەوەی دووبارەو لەسەر شێوەی تازە بابەت.

١١- دیاردەیەکی تری بیناکاری کڵێسەکانی ناوچەی کەرکوك بوونی چەند چینێکی بیناکاری لەسەر یەکتری کە ئاتشگەو تەوراتگەو کڵێسەو مزگەوت هەر یەکەی بەپێی سەردەمی خۆی چین لەدوای چین لەسەر یەکتری دروستکراوەو هەر یەکەیان لەقۆناغێکی مێژوویی دا ئاوەدان بووەو لەدواییدا بنیات نراوەتەوە لەسەر شێوەو شێوازێکی جیاواز لەوی ترو بۆ مەبەستێکی جیاواز لەئایینەکەی تر ئامانجی پێکاوە. لێرە بەدواوە هەوڵ دەدەم کە چەند نموونەیەکی لێ بهێنمەوە وهەوڵی دیاریکردنی ئەو جیاوازییە بدەم لەهێڵی گۆڕانە بیناکارییەکەدا.

لێرە بەدواوە چەند نموونەیەکی کڵێسەکانی ناوچەکە دەهێنمەوە بۆ ڕاستی بۆ چوونەکانمان:

*** کڵێسە سوورەکە:**

(چینی یەکەمی ئەم کڵێسەیە لەساڵی (٤٧٠)ی زایینی لەلایەن (مار مارون)ەوە دروستکراوە کە ناسراوە بە (یۆحەنای سێیەم)، مەترانی کەرکوك بوو، ئەویش لەیادی ئەو دوانزە هەزار شەهیدەدا دروستکراوە کە لەگەڵ (مار تەهمازکرد)، لەناو چوون بۆیە بەناوبانگ بووە بە (دێری مار تەهمازکرد)، کە لەدواییدا ناسراوە بە کڵێسە سوورەکە.

لەساڵی (١٩١٨)دا ئەو کاتەی کە عوسمانییەکان کشانەوە لەناوچەکەدا، ئەم شوێنە جێگەی تەقەمەنی بوو، بۆیە









هەستان بەتەقینەوەی ئەم کلێسەیە بۆ ئەوەی نەکەوێتە دەستی ئینگلیزەکان، بەهۆی ئەمەوە بووە هۆی لەدەستدانی تەواوی بیناکاری کلێسەکە.

چینی دووەمی ئەم کلێسەیە لە ساڵی (١٩٢٣)دا دووبارە دروستکراوەتەوە، لەسەردەمی مەتران (ئیستیفان جەبری)، کە ئەمجارە بووە تەواوی گۆڕانی کلێسەکە لەلایەن قەبارەو شێوەی بیناکارییەکەی، ئەم کارانە لەلایەن بیناکار وەستا (ئەلیاس عیسا) بەئەنجام گەیەنراوە.

لە ساڵی (١٩٨٣-١٩٨٤)دا، خاوەن باوەڕ (پۆلس ئیستیفان یوسف) هەستاوە بە دروستکردنی پەرستگایەك و لکاندنەوەی بەبیناکارییە کۆنەکەوە [11].

(دەتوانین چینی یەکەمی ئەم کلێسەیە بەکۆنترین پاشماوەی ئایینی مەسیحی نیشان بدەین لەعێراقدا [12].

لێرەدا دەتوانین بگەینە ئەو راستیە، کەسەرەتای دروستکردنی چینی یەکەمی لەشێوەی (دێر)دا بووەو بەرە بەرە گەورە کراوەتەوەو کراوەتە (کلێسە)، بەدەردەکەوێت کە قۆناغی مێژووی بەدوو چیندا ڕۆیوە، لەچینی دووەمدا چاککاریو رێکخستنی تێدا کراوەو هەوڵی چاك کردن و فراوان کردنەوەی دراوە.

هەر لەسەرچاوەکانەوە دەردەکەوێت کە گۆڕانکارییەکی گەورە کراوە لەشێوەی بیناکاریەکەو هەموو بنەما کۆنەکانی بیناکارییەکە گۆڕانی بەسەردا هاتووە لەشێوەو قەبارەو پانتایی بەشەکانی، سەرچاوەکان هیچیان ئاماژە بۆ هونەری نەخش و نیگار ناکەن لەو کلێسەیەدا، لەوانەیە نەخش و نیگاری تێدا هەبوو بێت و لەساڵی (١٩١٨)دا رووخێنرابێت.

*** کاتەدرانی (ام الاحزان):**

ئەمە بریتیە لەبیناکارییەکی زۆر قەشەنگ و لەکاتی خۆیدا جێگایەکی گرنگی هەبووە بەتایبەتی لەلایەنی شێوەی بیناکارییەوە.

ئەم بیناکارییەش وەکو کلێسە سوورەکە لەسەر پاشماوەی چەند کلێسەیەك دروستکراوە، کەهەریەکەی دەگەڕێتەوە سەردەمانێکی جیاواز.. جیاواز.

سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن، سەرەتای دروستکردنی دەگەڕێتەوە ساڵی (١٨٦٢)ی زایینی لەسەدەمی مەتران (یۆحەنا تمرز)، بەڵام هەندێك سەرچاوەی تر ئاماژە بەوە دەکەن کە گوایە لە ساڵی (١٨٥٦)ی زاینیی دروست کراوە.

لەنێوان ساڵانی (١٩٠٤-١٩٠٦) دووبارە دروستکراوەتەوە لەسەر پاشماوەی کلێسە کۆنەکە، کە دەکاتە سەردەمی (تۆدۆر مەسیح)، لەساڵانی (١٩٠٤-١٩١٧)ی زایینی [13].

(هەروەها سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن لەماوەی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم چەند گۆڕانێك روویدا لەدروستکردنەکەی و زیاد کردنی تێدا کراو چەند بەشێکی لێ دابڕا ئەویش بیناکاری ئێستای کە بۆی زیاد کرا (الهیکل) و سێ ژووری بچووك بوو کە دەڕوانێتە سەر راڕەوێکی پان کە کۆتایی دێت لەلای دەروازەی سەرەکی کلێسەکە [14].

لەساڵی (١٩٦٥)دا دووبارە ئەم کاتەدرانیە تووشی رووخاندن بووەو لە ساڵی (١٩٧٨-١٩٧٩) دەستی پێدا هێنراوەتەوە، بەڵام لەکاتی چۆڵکردنی قەڵادا تووشی رووخاندن و کاولکاری هاتووەو هەموو نەخش و پاشماوەکانی لە زەوی کەوتووە.

سەرچاوەیەکی سریانی بەم جۆرە باسی دروست بوونی دەکات:

((ئەمە دامەزراوە، بیناکراوە لەسەر قەڵای سلوخ (کەرکوك) لە ساڵی (١٨٥٦) ی لەدایك بوونی مەسیح، کە ناوی ئەم کلێسەیە هەڵگری ناوێکی گرنگە ئەویش (الام الحزینة)، لە کاتی باپیرەی گەورە، (پاپا پێوسی نۆیەم)، ئەسقەفی رۆماو، هەر یەکە لە (مار یوسف ئەودۆ)، جاثالیقی بە تریقی کلدان، مار یۆحنا تمرز. سەرۆکی ئەساقفەی کەرکوك (سلوخ)و دەوروبەری دروستکراوە.

کار لە دروستکردنی کراوە بە ئازایی کۆمەڵێك لەگەڵ سەرۆکی ئەساقیفەکان، لەگەڵ ئازایی پیاو چاك و لەخوا ترس خوالێخۆش بووی وڵاتی (طوقات) (خواجا یوسف تەرەف باشی)، کە هەستا بە دانی چارەکی پێویستیەکانی دروستکردنی ئەم کلێسەیە، بۆ زانیاری ئەم کلێسەیە هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی پانزە هەزار (١٥٠٠٠) چەرخی تێچووە، کە بە پارەی ئەستەمبوڵ دەکاتە (٣٧٠٠) هەزار قەرشی، بەشێکی زۆر، خواترس وپیاو چاك پارەیان داوە، هەریەکە بە پێی توانای، کە خوا چاکەی گشتیان بداتەوە...)) [15].

ئەم کلێسەیە کەوتۆتە سەر قەڵا، کە زۆر دوور نییە لە بازاڕی قەیسەری.. ئەم بیناکارییەی ئێستا، پێك هاتووە لە (هیکل-کۆتەڵ) بێجگە لە سێ ژوور کە رووخاوە، حەوشەیەکی بچووکی لە ژوورەوە هەیە، کە دەڕوات بۆ











ڕاڕەوێك کە کۆتایی دێت لە دەروازەی سەرەکی کڵێسەکە. ئەم دەروازەیەش گۆڕانی بەسەردا هاتووە. کە بنەڕەتەکەی ناناسرێتەوە.

هەیکەلی کاتدرائیەکە پێکهاتووە لە هۆڵێکی لاکێشەیی گەورە. سێ گومەتی لە شێوەی ناڵ بەسەرییەوەیە، گومەتی ناوەڕاست بەرزترە لەو دووانەکەی ئەم لاو ئەولا، کە لە ناوەوە لەسەر ریزێك کۆڵەکەی نیوە بازنەیی کە (میخ)ەکانی لە مەڕمەڕ دروست کراوە، لەسەر کۆڵەکەیەکی بازنەیی لە

هەمان بەرد کە تیرەکەی (٧٧)سم، وە (تیجان)ی نەخشداری هەیە، بەرامبەر ئەم کۆڵەکانە، کۆڵەکەی نیوە هەیە لە شێوەی بازنەیی بەرامبەر بە دیوارەکە. کە چەند کەوانەیەك لە بەردی مەرمەڕش هەڵیگرتووە، بەڵام بچووك تر لەوەی پێشوو، هەندێك شێوەی ئەم کۆڵەکانە شێوە لاکێشەییە بەتایبەتی ئەوانەی تەنیشتی ئەو دەروازەیەی کە دەڕوانێتە (هیکل)ەکە لەسەر ئەم نیوە کۆڵەکانەوە، کۆڵەکەی گەچی دیار هەیە، لەبەرامبەر (هیکل)ەکە. چینێك مەرمەڕ هەیە لەزەوییەکەی بە بەرزی (٣٠)سم یان زیاتر، لەپێش ئەمەوە چینێکی تر هەیە کە بەشێکی کەمی لێدۆزراوەتەوە.

لە گۆڕەپانەکە، بەدرێژایی لای سەرووی رۆژهەڵاتی، بانێك هەیە بە گرێ وگەچ وبەرد، کە لە پێشەوە راوەستاوە لەسەر سێ کۆڵەکەی نیوە بازنەیی، کە لە سەر کێڵەکەیەکی شێوە لاکێشەیی راوەستاوە، کە (تیجان)ی نییە، بەڵام بە چینێکی سادە لە نەخش داپۆشراوە، ئەم کۆڵەکانەو کەوانانەکان گشتی کەوتووە[١٦].

* کڵێسەی مەریەم نانا - مزگەوتی گەورە - نۆلۆ جامع:

بنەڕەتی مزگەوتی گەورە لەسەر قەڵا، وا دەردەکەوێت کڵێسە بووبێت، هەروەها لەچینی کڵێسەو چاککردنەکانیدا وا دیار دەخات کە چەند جارێك کراوەتە کڵێسەو لەدوا جاردا کراوەتە مزگەوت و هەندێك گۆڕان لەبنەڕەتە بیناکارییەکەیدا کراوە.

سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە گوایە سەرەتای دروستکردنەکەی دەگەڕێتەوە سەرەتای سەدەی سیانزەهەمی زایینی، چونکە لەبەرئەوەی لەکتێبی (تقويم قديم للكنيسة الكلدانية النسطورية)دا هاتووە بەبوونی کڵێسەیەك لە کەرکوك بەناوی (مريەم بەتول)، ئەویش لەنێوان ساڵانی (١٠٠٠-١٧٠٠)ی زایینی، پاشماوەی ئەم مزگەوتە هیچی لێ نەماوەتەوەو تەنیا هەندێك گوومەت و پاشماوەی منارەکەیەتی[١٧].

* نۆمەر مەندان:

(سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە گوایە ئەم شوێنە لەسەردەمانێکی زوودا بنکەی پەرستنی (ساکا-سکس)[١٨] بووە)، بەڵام لەسەردەمی بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلامدا کراوەتە مەرقەدێکی پیرۆزی موسڵمانەکان و خەڵکی زیارەتی دەکەن، کە وا پێدەچێت هەر ئەو شوێنە بێت پیرۆز کرابێت و بنەڕەتی ناوەکەش بۆ ئەوێ بگەڕێتەوە.

* سێ چینی مزگەوتەکەی داقوق:

بەپێی ئەو پشکنینانەی کە لەناوچەی داقوقدا کراوە، بە تایبەتی لەمنارەو هەر سێ مزگەوتەکەی داقوق، ئەوە دەردەخەن کە گوایە هەریەکەی دەگەڕێتەوە ماوەی جیاواز. جیاواز، هەرچەندە کە هەڵکۆڵینەکان ئەوە دەردەخەن کە گوایە لەشێوەی مزگەوتە بەڵام بەپێی شێوەی هەر سێ چینەکە دەردەکەوێت، گوایە هەرسێکی مزگەوت نییە بەڵکو هەر یەکەی خاوەنی تایبەتمەندییەکی خۆیەتی[١٩].

بۆیە زۆر رێگەی پێدەچێت کە چینی سێیەم ئاتەشگە یان زۆر راستر بڵێین کە لەوانەیە کڵێسە بووبێت و چینەکانی دووەم و یەکەم مزگەوت بوو بێت، تازەکردنەوەی بەخۆیەوە دیبێت.

* مزگەوتی دانیال پێغەمبەر:

بنەڕەتی چینەکانی ژێرەوەی دەگەڕێتەوە سەر ئەوەی کە پەرستگا (تەوراتگەی) جولەکەکان بووبێت، ئەمانە پاشماوەی (سبی بابلی) بووەو لێرەدا ماونەتەوەو هەر لەم شوێنەدا نێژراون، بۆیە ئەگەر سەیری بیناکاری ئەم شوێنە بکەین دەبینین کە تێکەڵاوە لە نێوان هونەری بیناکاری پەرستگای جولەکەکان و مزگەوتی موسڵمانەکاندایە، بەڵام زیاتر کاریگەری جولەکەکانی بەسەرەوە دیارە.

* کاتەدرائی ئەبرەشی کەرکوك:

نوێترین کارێکی بیناکاری کە کراوە لەناوچەی کەرکوك دروستکردنی (کاتەدرائی ئەبرەشی کەرکوك)ە، دەتوانین بەراووردێکی زۆر جوانی گۆڕانی قۆناغەکانی بیناکاری کڵێسەکانی ئەم ناوچەیە بکەین لەنێوان کڵێسەی رۆژهەڵاتی و کڵێسەی رۆژئاوایی و گۆڕانکارییەکانی بە شێوەیە دەربچێت تا لە قاوغی ناوچەگەرێتی و هەوڵدان بۆ وەرگرتنی جیهانی رۆژهەڵاتی خۆ ببینێتەوە.

ئەگەر بڕوانینە رووی دەرەوەی لەناوەڕاستیدا بریتییە لە گوومەتێکی چین لەسەر چین و لەسەرەوە بەخاچێك رازاوەتەوە، بەردەمی کاتەدرائیەکە لەسەرەوە بەدوو قولە (برج) رازاوەتەوە، کە دیسانەوە بەخاچ نەخشێنراوەو بەردەمی کڵێسەکە بەکۆڵەکەو هەیوان دروستکراوە کە زیاتر چۆتە رووییەکی کڵێسەی رۆژهەڵاتی.

بەڕێز مەتران ئەندوراس حەنا بەم جۆرە باسی ناوەوەی دەکات:

(زیاتر بایەخمان بەوە داوە، بەپێی پێویست بۆ رێکخستنی لەسەر شێوەی هونەری بیناکاری کڵێسەی رۆژهەڵاتی، ئەویش بەوەی (بیم)مان بۆی زیاد کردووە، نەك لەناوەڕاستی (الهيكل)، بەڵکو هەستاوین بەبەستنەوەی بە (مذبح)ەوە بۆ ئاسانی هاتووچۆ لە نێوانیاندا، مرۆڤ دەتوانێت سەرکەوێت لە (الهيكل)ەوە بۆ (بيم) بەپەیژەیەك و لەوێوە بۆ (مذبح) بەهەمان شێوە بەپەیژەیەك، هەستاوین بەدانانی (بيت القربان) لەناوەڕاستی دیوارەکە بەرامبەر (مذبح) بەبەرزی مەتر ونیوێك لەسەر (ضريح القديس) ئەویش بەپێی هونەری بیناکاری کۆن، وا سەیرمان کرد جێگەی خۆی نییە کە (بيت القربان) لەیەکێك لە سووچەکاندا بشارینەوە، لەدەستە راست یان دەست چەپدا[٢٠].

ئەوەی سەرنج دەدرێت لەم کاتەدرائیە بەکارهێنانی شووشەی نەرم بەدەوری حەوشەی کڵێسەکەدا، کە ئەمە بیناکارییەکی نوێیە لەشێوەی بیناکاری کڵێسە لە ناوچەی کەرکوکدا، لەبەر ئەوەی بیناکارییەکانی پێشوو بەشووشەی بەرز دەورە دراوە، لەهەندێك جاردا گەیشتۆتە ئاستی بیناکارییەکە.









*** تەوراتگە - تەورات - پەرستگا:**

لەزۆربەی سەرچاوە کوردییەکاندا بەشوێنی پیرۆزی جوولەکەکان وتراوە (پەرستگا)، بەڵام ئەوەی کە جێگەی سەرنجەو دەماو دەم لەخەڵك بیستراوە کە بەشوێنی پیرۆزی جوولەکەکانی کەرکوك وتراوە لەگەڕەکی جولەکەکان (تەوراتگە) یان (تەوراتەکە)و تاکو ئێستا کە بەپاشماوەی دەڵێن شوێنی تەوراتەکە، بۆیە منیش بەپێویستم زانی کە ووشەی پەرستگای جولەکەکان بکەمە تەوراتگەی جوولەکەکان، ئیتر نازانم تا چەند راستم پێکاوەو خزمەتی فەرهەنگ سازی کوردیم کردووە.

*** مێژووی هونەری ئەیقۆنات لەتەرزی بیناکاری کڵێسەکانی ناوچەی کەرکوکدا:**

بڵابوونەوەی ئایینی مەسیحی وەکو هەموو ئایینەکانی تر، خاوەنی هەڵگری سیفاتی تایبەتی خۆیەتی کە چەند لایەنێکی جیاوازو تایبەتمەندی هەیە کە بەستراونەتەوە بەسەردەمو کاتی دیاریکراوی خۆی، بۆیە ئەو تایبەتییەی، توانایەکی ئایینی پێداوە. کە پەروەردەی ژینگەیەکی دیارو بەرچاوەو هەموو رێنماییەکانی لەقاوغی ئەو ژیارو ژینگەیەوە هەڵقوڵاوە.

ئەگەر سەیری ئایینی مەسیحی بکەین، چەند لایەنێك و

سیفاتێکی هەیە کە جیاوازە لەئایینی زەردەشتیو جوولەکەو ئایینی ئیسلام، چ لەرووی شێوازی بڵاوکردنەوەو جۆری هەڵسوکەوتی کۆمەڵ لەگەڵ ئایینەکەو ڕێگای چوونە ناوەوەی بیروڕای ئایینی لەکڵێسەو شێوازە دیارەکانی ناو کڵێسەدا.

هونەری تەرزی بیناکاری کڵێسەو هونەری ئەیقۆنات، شێوازی بابەتەکانی ناو کڵێسەو چۆنیەتی نەخشەی کڵێسەو تەراتیلی ئایینی ناو کڵێسە هەریەکەیان هەڵگری خاسیەتی ناو ئایینی مەسیحین، لەگەڵ خۆیدا بۆتە تاودانی جۆرەها بابەتی ئایینی.

یەکێك لەو بابەتە ئایینیو هونەرییانەی ناو ئایینی مەسیحی هونەری وێنەی (ئەیقۆنات) یان هونەری جیهانی وێنەکێشانی مەسیحیەتو چوارچێوە ئایینیەکەیەتی. هونەری ئەیقۆناتیش هەڵگری ئەو ژینگەیەیە کە تیایدا گەشەی کردووە لە قۆناغەکانی بڵاوکردنەوەی ئایینی مەسیحی. هەر بۆیە هەڵگری ئەو سەردەمانە بە ناخی تابلۆکاندا ڕۆچووەتە خوارەوە.

ناوچەی کەرکوکیش یەکێکە لەو شوێنانەی کە خاوەنی تایبەتی خۆیەتی لە هونەری ئەیقۆناتدا، چ لەڕووی کاریگەری هونەری ئەیقۆناتی ناوچەکانی تر، چ لەڕووی تایبەت مەندی هونەری ئەیقۆناتی کەرکوك بۆیە لێرە بەدواوە هەوڵ ئەدەم بەراووردێکی ئەو لایەنە شیبکەمەوە لەڕووی هەڵسەنگاندنی تابلۆکانو گۆڕانی قۆناغە مێژووییەکان لە بەرامبەر ئەو تابلۆو کۆتەڵە ئەیقۆناتانەدا.

*** بنەڕەتی ناوی ئەیقۆنات(*):**

لە فەرهەنگی (المنجد)دا واباسی (ئەیقۆنە) هاتووە:

(الایقونة: الصورة والتمثال یقابلها فی العربیة النصمة) [٢١]، کەلێرەدا ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە بەرامبەری وێنەو کۆتەڵە بە مانا فراوانەکەی.

هەروەها لە فەرهەنگی زانیاریدا وای بۆ دەچێت کە ((ایقونة، ئایکون)): بریتییە لەوێنەو پەیکەر[٢٢]. ((وشەی ئەیقۆنە، ووشەیەکی یۆنانیە کە مانای وێنە دەگەیەنێت، دەتوانین کەبەکاری بهێنین بە شێوەیەکی گشتی بۆ هەموو وێنەیەك، یان لە هەندێك کاری تایبەتیدا بۆ وێنەی ئایینی دیاری کراوی پاشماوەی کڵێسەی بیزەنتی، کە وێنە کێشراوە بە پێی تەکنیکێکی هونەری باوو شیاو، لەسەر پارچە دارێك یان وێنەیەکی پەیکەری کۆتەڵ یان نەخشاندنی لەسەر کەرەستەیەکی پیرۆز.

بنەڕەتی تەکنیکی هونەری ئەو کارانە دەگەڕێتەوە سەر هونەری میسری کۆن، بۆ ڕازاندنەوەی گۆڕەکانیان بە وێنەی مردوو، بەڵام بیزەنتیەکان هەستان بە تەواوکردنی ئەم هونەرە لەگەڵ گۆڕینی ماناکەی بۆ هونەری مەسیحی تایبەتی کە لەدواییدا ڕووسەکان پێشکەوتنێکیان لەو هونەرە هێنایە گۆڕێ بە شێوازێکی ناوخۆیی دیاری کراو.

دەتوانین ئەیقۆنە بەوە دابنێین لە ڕووی هونەرییەوە کە کارێکی بە بایەخو بەهایە، هەروەها ناتوانین تێگەیشتنمان هەبێت دەربارەی ئەیقۆنە بەشێوەیەکی راستو دروست ئەگەر هەڵنەسین بە وەرگرتنی ڕوویەکی ئایینی، چونکە لەبەرئەوەی تەنها کارێکی هونەری نیە وەکو ئەوەی زۆری خەڵك لە ڕۆژئاوادا لە جەوهەری وێنە دەگەن چونکە لەبەرئەوەی لە ڕووی جەوهەرەوە وێنەی کڵێسەیە، دەربڕینی لە باوەڕهێنانو داواکردن بۆیەتی، لەبەرئەوە ناتوانیت تێبگەیت لێی ئەگەر لەناو چوارچێوەی باوەڕی کڵێسە نەبێت، هەروەکو ئەوەی کە کڵێسەماڵی خوایە لەسەر زەوی، هەر بۆیە تابلۆی ئەیقۆناتەکان ئاسمانیەکانی ئێستان لەبەردەم دیدەی خاوەن باوەڕدا.

وێنەکێشی ئەیقۆنات هەڵدەستێت بەکارەکەی وەکو باوەڕهێنەرێك لەو چوارچێوەی ئەو مەرجەو باوەڕانەی کە کڵێسە هەیەتی دەربارەی ئەو جۆرە وێنە ئایینیانە، کە ئەمە وادەگەیەنێت دەربڕینی هەستو خەیاڵاتی خۆی نیە بۆ ئەو وێنانە، بەڵکو چوونە ناخی لاهوتی کڵێسەییە.

هەر بۆیە ئەیقۆنە بە پلەی یەکەم، ئاماژە پێکردنە بۆنەوەی لەسەر هەموویەتیو هۆکارێکە بۆ گەیشتن بەوەی کە وێنەی دەکێشێت. کەلە هەندێك کاتدا ئەیقۆنە دادەنرێت بە بەرامبەری (الکتاب المقدس)و (الاسراء الکنیسیة)و (الکلمة والایقونة والسر)، لە دەروازەی ئەم سێ ئایەتەوە دەتوانێت باوەڕهێنەر بڕوات بەرەو جیهانو ژیانی خوا، کە ئەمە زۆر بە پڕی بەدەردەکەوێت لە ئەیقۆنەکاندا دەربارەی گەورەییو کردەوەی خواو گەیشتنی ئەم گەورەییە بە باوەڕهێنەر، بۆیە کاتێك باوەڕهێنەر کەسەیری ئەیقۆنە دەکات، نوێژ دەکات لە بەرامبەریداو ئاوەزی بەرەو تێگەیشتنی خوایی دەڕواتو ڕازییە بەو هێزە لەکۆڵ نەهاتەی کەهەیەتی.

کاتێك سروشتی نەهێنی ئەیقۆنە هەست پێ دەکات، رای دەکێشێتە نێو ئەو قوڵاییەی کە وێنەی دەکێشێت کە ژیانە بە بڵاوبوونەوەی ئاشتی تیایدا[٢٣].

ئەیقۆنۆگرافیا یان هونەری وێنەی ئەیقۆنی جیهانی مەسیحی، بریتییە لە بابەتێکی ئاسۆ فراوانو ڕەگێکی قوڵی هەیە، کە دەبێتە فراوان کردنی ئایینی مەسیحی بە تایبەتی لە ڕۆژهەڵاتدا، قوڵاییو ڕەگی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی بڵاوبوونەوەی مەسیحیەت.

ئەیقۆنۆگرافیا بریتییە لە هونەرێکی تایبەتی بە جیهانی مەسیحیەوە، هاو پەیوەستە بەرۆحو ڕەچاوی تێگەیشتنی مەسیحی بۆ دیتنی کارو وێنەکێشانی هەر لەکاتی بڵاوبونەوەی ئایینی مەسیحییەوە، کە باوەڕێك هەبووە بۆ پێگەیشتنو تێگەیشتنی جوانی مەسیحی کە ڕەنگ دەداتەوە لە وێنەکانی (یسوع)و (پاکیزە مەریەم)و (شەهید)و (پەیامبەر)و (قدیسی)یەکاندا کە ئەم جوانکارییە هەڵقوڵاوە لە بۆچوونی ئەفلاتونی تازە، هەوڵ دەدات وێنەی ئەو کەسانە بگرێت کە هەڵگری سیفەتەکانی وەکو چاکەکاریو بەخشینی ڕۆحی.

دەرخستنی ئەمانەلەڕوویاندالەماوەی دیاری کردنی هێڵو ڕەنگو جۆرەها تەکنیکاری وێنە گرتن، نەك بە گواستنەوەی سروشتێکی بێ گیان وەك ئەوەی هەیە، بەڵکو هەوڵ بدات لە ڕۆحێکی جوداو گەرماییەکی باوەڕیی وبەڵگەیەکی لاهوتی بداتێ[٢٤].

لە پێش هەموو شتێك.. وێنە كێشی ئەیقۆنات بریتییە لە مرۆڤێكی خاوەن باوەڕ، كە هەڵدەستێت بە دەربڕینی باوەڕەكەی لە ماوەی كارەكەیی و یارمەتی خەڵكی تر دەدات بۆ باوەڕهێنان و نزیك بوونەوە لە خوا لە دەروازەی ئەیقۆنەكەوە.

(وێنەكێشی ئەیقۆنات هەڵدەستێت بە بەكارهێنانی تەكنیكی تایبەتی وەكو دووری و سێبەرو ڕۆشنایی و بەراووردی لەگەڵ پێوانەی لەشی مرۆڤ و بەكارهێنانی ڕەمزی ڕەنگ، كە پەیوەند دارە بە یەكخستنی ئەندازەیی و هێڵەكانیان.

هەموو ئەوانە بۆ ئەوەیە كە بتوانرێت ئەیقۆنەكە لە سنووری شوێن و كاتی خۆیدا دەربچێت و دووربینییەكی بێ كۆتایی پێ بدات.

هەروەها بنەڕەتی هونەری ئەیقۆنەگرافی، ڕێگە ناگرێت لەهەمەڕەنگی ئەو هونەرەی كە دێت لە شارستانی و ڕۆشنبیری میللەتەكانی وولاتە مەسیحیەكان و دابونەریتی هەریەكە لەو كلێساییانە، بۆ وەرگرتنی زانیاری ئەو میللەتانە، هەر لەم ڕوانگەیەوەیە كە پاشماوەی ئەیقۆنە گرافیەكان دەكرێت بەم سێ بەشەوە:

١. كاریگەری هیلینی بەسەرەوەیە.
٢. كاریگەری فارسی و ئاسیاوی بەسەرەوەیە.
٣. لەژێر كاریگەری سادەیی و سانایی و ڕوحێكی ڕەمەكی بەسەرەوەیە[٢٥].

*** كاریگەری بڵاوبوونەوەی هونەری ئەیقۆنات:**

هەر لەسەرەتاكانی بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی ئەم هونەرەش كەوتۆتە بڵاوبوونەوەو مێژووییەكی دوورو درێژی بڕیوە شان بەشانی ئایینەكەو لەگەڵ قۆناغەكانی مێژوودا تایبەتمەندی خۆی وەرگرتووە لەرووی جۆری كەرەستەو ڕەنگ و هێڵ و كاریگەری وێنەكان و پانتایی ئەیقۆنەكان.

هەر لە سەرەتاكانەوە ئەمیش سادەیی و سانایی لەوێنەكردن و ئینجا گۆڕان لەشێوەی وێنەكان، بایەخدان پێی و چڕكردنی لایەنەكانی ئەیقۆنەكان زۆر بەزەقی لەقۆناغە مێژووییەكاندا بەدەردەكەوێت.

هەندێك لەسەرچاوەكان ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن كە یەكەم (ئەیقۆنەیەك) كە بڵاوبووبێتەوە، سەرچاوەكەی دەگەڕێتەوە بنەڕەتی (سریانی) ڕەهاوی لە (ڕەها)، كەوێنەی مەسیح بووە كە ناسراوە بە (دەستەسڕی پیرۆز)، یەكەم ئەیقۆنەیەكی پاكیزە مەریەم دەگەڕێتەوە ئەنتاكیە لە سوریا[٢٦].

لێرەدا دەگەینە ئەو ڕاستییە كە بڵاوبوونەوەی یەكەم ئەیقۆنە دەگەڕێتەوە ڕۆژهەڵات و لەوێوە گەشەی كردووە بەناوچەكانی تردا

بڵاوبوونەوەی ئەیقۆنە لەگەڵ خۆیدا كاریگەری و بەریەرەكانی دروستكردووە، كە تا ماوەیەكی چاك جێگەی مشت و مڕی خەڵكی كلێسەو دەوڵەت بووە، لەسەر چۆنیەتی بەكارهێنانی هونەری ئەیقۆنات لەنێو كلێسەدا. (لەبەر ئەمە سەیر دەكەین كۆمەڵەكە بووە دوو بەشەوە كە هەندێكی لایەنگری وێنەی ئەیقۆنات بوون وەكو كلێسەو (ڕاهب)و (پاپا)و (گەل)، بەڵام ئەوانەی كە دژی وێنەی ئەیقۆنات بوو ئیمپراتۆرو سوپا و بەشێكی زۆری ڕۆژهەڵات.

ئەوانەی كە پشتگیری ئەم ئەیقۆنەیان دەكرد، بەڵگەیان ئەوە بوو كە گوایە دەبێت مەسیح و پاكیزە مەریەم لەهەموو شوێنێك هەبێت و ڕێزی بگیرێت، دەبێت وێنەكان لەشوێنێك دابنرێت كە جێگەی ستایش كردن بێت، بەڵام ئەوانەی كە دژی ئەم كارە بوون، بەڵگەیان ئەوە بوو كە بڵاوبوونەوەی (مەسیح) بەمانای بەتاڵ كردنێتی لەلاهوتێتی و بێ نرخ كردنێتی لە پیرۆزییەكەی[٢٧]. لێرەدا دەگەینە ئەو ڕاستییەی كە ئەو ژینگەیەی كە ئایینی مەسیحی تێدا بڵاوبۆتەوە دەوری گەورەی بینیوە لەسەر هونەری ئەیقۆنات و كاریگەری خۆی بەجێ هێشتووە لەپێگەیاندنی ئەم هونەرەدا.

سەیریكردنی ئەو ژینگەیەو كەوتنە ژێر باڵی لەنێو بۆتەی شارستانییەكانی ڕۆژهەڵاتدا بووە پێگەیاندنی هونەرێكی ئەیقۆنی ڕۆژهەڵاتی جیاواز لەجیهانی هونەری ئەیقۆنی ڕۆژئاوایی، كە ئەمیش زۆر بە زەقی بەدەردەكەوێت لە جۆری كەرەستەو پانتایی ڕەنگ و هێڵ و سیمای وێنەكاندا.

شارستانییەتەكانی ڕۆژهەڵات كەوتبووە ژێر كاریگەری جۆرەها ئایینی وەكو ئایینی زەردەشتی وجوولەكەو ئایینی ئیسلام، كە هەریەكە لەمانە بوو بووە سازدانی جۆرەها بیروباوەڕی ئایینی كە ئایینی مەسیحی لەنێو ئەو بیروباوەڕو ئایینانەدا قاو درابوو. بۆیە كاریگەری ئەم هونەرەش پابەندی ئەو بیروباوەڕە ئایینیانە بووە.

هەر لەڕوانگەی ئەم كاریگەرییەوە، سازدانی وێنەكێشێكی خاوەن باوەڕی ڕۆژهەڵات، گەورە بوو بەو ژینگەیە پێویستی بەوە دەكرد بكەوێتە ژێر كارتێكردنی ئەو بنەمایانەی كەهەیەو چۆنیەتی وەرگرتنی ئەو هونەرە لەگەڵ گونجاندنی بنەما دیارەكانیدا، تا بتوانێت ببێتە كامڵ بوونی تابلۆیەكی ئەیقۆنی، تەنانەت كار گەیشتۆتە ئەوەی جۆری بەكارهێنانی جۆرە ڕەنگێك لەناوچەیەكدا باو بووە ڕەنگی داوەتەوە بەسەر پانتایی ڕەنگەكانی ئەیقۆنەكاندا، هەروەكو ئەوەی كە باو بووە لەكاریگەری ڕەنگی شین و سەوز لەئایینی زەردەشتیدا مانەوەی ئەمە لەئایینیەكانی تردا، كە ئایینی مەسیحی یەكێكە لەوانەی كەوتۆتە بەر ئەو پانتاییە ڕەنگییە، هەروەها ئاوەزی (عقل) مرۆڤێكی خاوەن وێنەكێش باوەڕ هێنەری ئایینەكە لەڕۆژهەڵاتدا مەودای جیاوازو فراوانە لەگەڵ مرۆڤێكی ڕۆژئاوادا، لە بۆچوونی بۆ ڕاكێشانی وێنەكان و دابەشكردنی ڕەنگ و هێڵ بەپێی مەودای ئاوەزی ئەو كەسە.

*** سەرەتاكانی بڵاوبوونەوەی هونەری ئەیقۆنات لەكلێسەكانی ناوچەی كەركوك:**

هەر چەندە كە سەرچاوەكان زۆر كەمە دەربارەی بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی لەناوچەی كەركوكدا بەڵام سەرچاوەكان ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن كە گوایە هەر لەسەرەتای بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحیدا ناوچەی (باجرمی) یان (بیت گرمای)، شوێنێكی گرنگی ئەو ئایینە بووەو گەلێك شێوەی بیناكاری كلێسە لەو ناوچەیەدا بڵاوبۆتەوە كە ناوچەی (خورماتوو)و (داقووق) بەشێكی گرنگی بووە، بەڵام

تاکو ئێستاکە بەشێکی گرنگی ئەو پاشماوانە بەدەستمان نەگەیشتووە.

ئەوەی کە جێگەی ڕاستییە، ئەوەیە هەر لەسەردەمی خەلیفەی موسڵمانەکان، عومەر کوڕی خەتاب، لەناوچەی کەرکوکدا، لەسەر قەڵاو دەوروبەری بە ڕێژەیەکی چاك کڵێسەو دێر هەبووە، کە لەکاتی هاتنی موسڵمان بەشێکی ئەم کڵێسانە کراوەتە مزگەوت لەگەڵ جۆرە دەستکاریەك کە لەگەڵ شێوازی داب و نەریتی موسڵماندا بگونجێت.

کۆنترین سەرچاوەیەك دەربارەی هونەری ئەیقۆنات لە کڵێسەکانی کەرکوك، دەگەڕێتەوە بۆ کڵێسەی (مەریەم ئانا- مەریەمانە) کە دەکاتە چینی ژێرەوەی (ئۆلۆ جامع).

سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە گوایە لەدوای چاککردنێکی زۆر کە بەسەر ئەم مزگەوتەدا هاتووە. بووە هۆی دۆزینەوەی ئەیقۆنات، کە بریتییە لە وێنەی (پاکیزە مەریەم)، لەسەر دیوارەکانی، لەگەڵ دۆزینەوەی ماڵی شەهیدان لەژێر زەمینێکی فراوان، لێکۆڵەرەوەی ئەڵمانی (هرتسفیلد)، لەو باوەڕەدا کەلەبنەڕەتدا کڵێسە بووەو ئەویش لەجۆری نەخش و تەرزی بیناکارییەکەیدا.

وا باوەڕ هەیە کە بنەڕەتی دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی سیانزەهەمی زایینی، لەکتێبی (تقويم قديم للكنيسة الكلدانية النسطورية) باسی ئەوە هاتووە کە گوایە بوونی کڵێسەیەك هەبوو بەناوی (مەریەم بەتول- مريم البتول) لەنێوان ساڵانی (١٠٠٠-١٧٠٠)ی زایینی)[٢٨].

لێرەدا دەگەینە ئەم ڕاستییانەی خوارەوە:

١. بەپێی سەرچاوەکان کۆنترین ئەیقۆنەیەك لە کڵێسەکانی ناوچەی کەرکوك دەگەڕێتەوە نێوان ساڵانی (١٠٠٠-١٧٠٠) ی زایینی یان لەوانەیە لەسەدەی سانزەهەمی زایینی، کە جیاوازی ئەم مێژووانەش دەگەڕێتەوە سەر جیاوازی ماوەی چاکردنی کڵێسە کە لەتەرزی هونەری بیناکارییەکەی.. ئینجا لەگەڵ ئەم چاککردانەدا ئەیقۆنەکانیش گۆڕانی بەسەردا هاتووە، کە چین لەسەر چینی دەستی پێدا هێنراوە.

٢. بەپێی سەرچاوەکان وا بەدەردەکەوێت کە جۆری وێنەی ئەیقۆنەکە (پاکیزە مەریەم)ە، ئەویش لەبەرئەوەی بنەڕەتی ناوەکە بەوەوەیە.

٣. هەروەها وا بەدەردەکەوێت کەکەرەستەی ئەیقۆنەکە لەگەچ دروستکراوەو لەسەر دیوارەکە نەخش کراوە.

٤. زانیاریمان نییە دەربارەی جۆری ڕەنگ و هێڵەکانی ئەیقۆنەکە، چۆنیەتی ئاستی هونەری ئەیقۆنەکە لە چیدایە.. هەروەها ناوی هونەرمەندی ئەیقۆنەکە نادیارە.

٥. بزربوونی ژمارەیەکی زۆری ئەیقۆنات لەکڵێسەکانی ناوچەی کەرکوك دەگەڕێتەوە ژێر کاریگەری بڵاوبوونەوەی ئیسلام، لەگەڵ کاریگەری (مذهب)ەکانی نێو ئایینی مەسیحی دەربارەی کێشانی هونەری ئەیقۆنات.

٦. دەتوانین بگەینە ئەو ڕاستییە کە کڵێسەکانی ناوچەی کەرکوك بێ بەش نەبووە لەکێشانی هونەری ئەیقۆنات.

٧. سەرچاوەکان بەدەستەوە نییە، یان نەدۆزاوەتەوە کە کۆتەڵی ئەیقۆنی هەبێت و ئەوەی کە هەیە لەم سەردەمەی ئێستامان هەیە.

٨. بەپێی ئەو سەرچاوانەی کە دەماو دەم پێمان گەیشتووە بابەتەکانی هونەری ئەیقۆناتەکانی نێو کڵێسەکان بریتی بووە لەتابلۆی (پاکیزە مەریەم) و (یەسوع) و (پاکیزە) و (پێغەمبەر عیسا) و (مار تەهمازکرد).

*** کاریگەری بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام بەسەر هونەری ئەیقۆنات لەناوچەی کەرکوکدا:**

بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلامیش لەگەڵ خۆیدا بووە هەڵگری جۆرەها بیروڕاو بۆ چوون، کە کاریگەری زۆر بە زەقی ڕەنگی دایەوە لەو ژینگەیەداو کارتێکردنی هەر بەسەر ئایینی ئیسلامەوە نەبوو بەڵکو ئایینیەکانی ترش کەوتنە بەر شاڵاوی ئەو گۆڕانە، کە ئایینی مەسیحی یەکێك بووە لەو ئایینانە، کەوتە بەر تەوژمی بیرو داب و نەریتی کۆمەڵگەی نیمچە دورگەی عەرەبی و بەهۆی ئیسلامەوە.

یەکێك لەو دیاردە زەقانە کە زۆر بەڕوونی بەدەرکەوت لەدوای کۆچی دوایی پێغەمبەر سەرهەڵدانی قەدەغەکردنی وێنەی مرۆڤی بووە، کە بووە کاردانەوەیەکی گەورەی جیهانی ئیسلامی، لەهەمان کاتدا کاریگەری دروستکرد لەسەر شێوەی نەخش و نیگارو شێواندنی گەلێك لایەنی بیناکاری لەبەر خاتری جێبەجێکردنی بیروبۆچوونە ئایینیەکە.

(قەدەغەکردنی بابەتی وێنەی مرۆڤی، بووە هۆی ڕوودانی بەربەرەکانییەکی گەورە لەمێژووی ئیسلامدا کە هەریەکە لە (فقهاء)کان جیاوازیان هەبوو لەڕێگەی قەدەغەکردنیدا، کە بەتایبەتی لەقورئاندا، بۆ چوونێکی ڕوون نییە دەربارەی قەدەغەکردن، ئەوەی کەهاتووە بەڵگەیەکی زۆر کزە دەربارەی ڕێگە نەدانی وێنەیە وەکو ئایەتەکانی سورەتی (الحشر) کە دەڵێت: (هو الله الخالق الباري المصور له الأسماء الحسنى، يسبح له مافي السموات والأرض وهو العزيز الحكيم..) یان لەسورەتی (ال عمران) دەڵێت: (هو الذي يصوركم في الأرحام كيف يشاء، لا اله الا هو العزيز الحكيم) یان لەسورەتی (الأعراف) دەڵێت: (لقد خلقناكم ثم صورناكم ثم قلنا للملائكة اسجدوا لادم فسجدوا الا ابليس لم يكن من الساجدين) هەروەها لەسورەتی (المؤمن)یش بەم جۆرەیە (الله الذي جعل لكم الأرض قراراً والسماء بناء وصوركم فأحسن صوركم ورزقكم من الطيبات، ذلكم الله ربكم فتبارك الله رب العالمين)، سورەتی (مائدە) بەم جۆرە دەست پێ ئەکات: (يا ايها الذين امنوا انما الخمر والميسر والأنصاب والأزلام رجس من عمل الشيطان، فأجتنبوه لعلكم تفلحون..).

ئەم پێنج ئایەتە باسی قەدەغەکردن ناکات بەڕوونی و دیار، ئەوەی کە (فقهاء)ەکان بۆی دەڕۆن لەدەروازەی (تأويل) کردنەوەیە ئەویش بەوەی کەسیفەتی وێنەکێش سیفەتی تەنیا خوایە کە گەورەی هەموویەتی، بەڵام دەربارەی ئەو قەدەغەکردنە هاتووە لەسوورەتی (المائدە) دەربارەی قەدەغەکردنی (الأنصاب)، ئەمە زیاتر بۆ ئەوە دەڕوات کە ماناکەی (دەربارەی ئەو بتانەیە کە دەیان پەرستوو قوربانیان بۆی دەداو بەخوێن سووریان دەکرد ئەمیش ئەوانە دەگرێتەوە کە شەریك بۆ خوا دەدۆزنەوە لەپەرستندا. یان هەندێکی تر ڕایان لەگەڵ بیروبۆچوونی هەندێك فەرموودەی

پێغەمبەر بوو، بەڵام ئەویش دیسان بەروونی بۆ دەروازەی باسەکە ناڕوات[29].

هەر لەسەر کاریگەری ئەم قەدەغەکردنە بووە، ڕوودانی شەڕو ئاژاوەیەکی زۆرو گەلێك کێشەی دروستکرد بۆ خەڵکی و تەنانەت لەهەندێك کاتدا کاری خوێناوی ڕوویدا، بەڵام ئەگەر سەیری هونەری نەخش و نیگاری ئیسلامی بکەین دەبینین هەر هەمووی خوازراوە لەبنەڕەتەکانی هونەری مەسیحی ڕۆژهەڵاتی و هونەری ئێرانی لەگەڵ پاشماوەی هونەری (ساسانی)، لە پاڵ جۆرە دەسکارییەك کە لەگەڵ داب و نەریتی ئیسلامدا بگونجێت. بۆیە لەگەڵ ئەم جۆرە قەدەغەکردنندا، کاریگەرییەکی گەورەی کردە سەر هونەری نەخش و نیگاری ئیسلامی کەخۆی لەم جۆرە خاڵانەدا دەدۆزێتەوە:

١. بایەخدان بەنەخش و نیگاری ڕووەکی لەجۆری گەڵاو بەری میوەو دارو درەخت و زیاتر نزیك کردنەوە لە هێمای ڕەمزی نەخش و نیگار.

٢. کێشانی وێنەی خەیاڵی ئاژەڵان کە داچۆڕابێت لەڕووی ڕاستی وەکو ئەوەی هەیە لەسروشت وەکو وێنەی (بوراق) کە نموونەی ئەم ڕاو بۆ چوونەیە.

٣. تێکدان و لەناودانی هەموو هونەرێکی پێش خۆیان کە ڕووی نەخش و نیگاری مرۆڤی تێدا هەبێت، کە یەکێك لەو هونەرە بەرزانەی جیهانی مەسیحی هونەری (ئەیقۆناتە)، کە زۆر بەبێ بەزەییانە کەوتنە گیانی ئەم هونەرە، زۆر لەڕاستی مێژووییەکەوە لایان داوە بوونە هەڵگری دەمارگیری نەتەوەیی عەرەبی بۆ تێکدانی.

بۆیە بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام گەورەترین کووتەك بوو بەسەر ئەم هونەرەو ماوەیەکی گرنگی ئەم هونەرەی لەناودا کە هەر لەسەرەتاکانی بڵاوبوونەوەی مەسیحی تا سەدەی حەڤدەهەمی خایاند و هەموو ئەم شوێنەوارەیان لەدەست داو بەناوی هونەری (کافران) ناو زەد دەکرا. کە هەر لەخۆیدا کاربەدەستانی ئیسلام و عەرەب وەکو کووتەکێك بۆ گیانی نەتەوەکان بەکاریان دەهێنا کە زیاتریان ئیمپراتۆریەتی عوسمانیەکان بوو کە بنەمای دەوڵەتەکەی لەسەر ئەو سیاسەتە بوو، نەتەوەکان بداتە گیانی یەکتری.

بۆیە بەدوور نازانرێت کە ناوچەیەکی وەکو (داقوق) لەسەرەتاکانی بڵاوبوونەوەی مەسیحیدا شوێنێکی گرنگی ئەو ئایینە بووە بەڵام ئێستا تەنیا پاشماوەیەکی ئەم ئایینە چییە لەم ناوچەیەدا نەماوە، کە زۆر ڕێگە پێی دەچێت کە یەکێك لەچینەکانی مزگەوتەکەی داقوق کڵێسە بوو بێت، یان چینی ژێرەوەی (مرقد زين العابدين) کڵێسە بوو بێت. کە هۆی نەمانی ئەم پاشماوانە دەگەڕێتەوە سەر ئەو توندو تیژییەی بەربەرەکانی خەواریج لە سەردەمی ئیسلامدا بۆ فەوتاندنی ئەم شوێنەوارانە کە ئەیقۆنات یەکێکە لەمانەو پاشماوەکانی کڵێسە سوورەکەو کڵێسەی (مەریەمانە) ئەم ڕاستییە یەك لا دەکەنەوە کە تا چ ڕادەیەك بێ بەزەییانە لەناوبراوەو سووتێنراوە.

هەر لەبەر ئەمەیە کە پاشماوەی ئەیقۆنات لەناوچەی کەرکوکدا گەلێك لایەنی لەدەست داوەو سەرەتاکانی زووی ئەم هونەرەمان بەرچاو ناکەوێت و ئەوەی ماوەتەوە هی ئەم ماوەیەی دواییە، هەروەها ڕێی پێ دەچێت ئەگەر لەدوا ڕۆژدا ناوچەکانی کەرکوك هەڵدرێتەوە پاشماوەی لەم جۆرانەمان بەدەست بکەوێت.

دەتوانین بڵێین کە ژینگەی ڕۆژهەڵات زۆر جیاوازی هەیە لە ژینگەی ڕۆژئاوا، ئینجا هەر ئەم جوادییە کە توانیویەتی ڕەنگ بداتەوە لەهونەری ئەیقۆنات ئەویش بەوەی ڕۆژهەڵات کەمتر بایەخیان بەو هونەرە داوەو نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە ڕوویەکی بەرزی هەبێت یان بتوانێت توانایەکی ئایینی کە داچۆڕابێت لەهەموو ڕوویەکی تر، هەر لەبەر ئەمە کاریگەری بڵاوبوونەوەی ئیسلام دەوری خۆی بینیوە لەشێواندنی ڕووی هونەری ئەیقۆنەکان.

هەروەکو بەدەردەکەوێت کە کاریگەری بڵاوبوونەوەی ئیسلام و باڵا دەستی ڕووی سیاسی و سەربازی بۆ ئایینەکە وای کردووە کە هەردەم ئایینی مەسیحی بکەوێتە دوای ئەو سیاسەتەوەو ڕوویەکی چەوساوە وەربگرێت، هەر لەبەر ئەمەیە لەسازدانی هونەری ئەیقۆناتدا شتی بەدەست و ئاسان هەڵگرتنی بەکارهێناوە تا بەزوویی لەتاڵان بیپارێزێت تا بەوەی کاری گەورە لەهونەری ئەیقۆنات ساز بدات.

کاریگەری ڕووی قەدەغەکردنی وێنەی مرۆڤ لەلایەن ئایینی ئیسلامەوە وای کردووە کە هونەری ئەیقۆنات ڕوویەکی بێ بایەخی هەبێت بەو جۆرە خۆ خەریك کردنی پێوە نەبێت کە برەو بە هونەرەکەی بدرێت، تا بەوەی نەکەوێتە بەر تیرو توانج و لۆمە.

کاریگەری بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام وای کرد کە ژمارەیەکی زۆر ئەوانەی کە دەستیان هەبوو لە هونەری ئەیقۆنات لەناو چوون، یان شەهید بوون و کەسانی تر نەبوو بەوگیانە ئایینیەوە بێتە مەیدان، یا ئەگەر هەبوو بێت ماوەیەکی زۆری ویستوەو تا بتوانێت یەکێك جێگەی بگرێتەوە.

هەر بەهۆی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلامەوە کۆتەڵی ئەیقۆنات هیچ پاشماوەیەکمان لەناوچەی کەرکوکدا بەرچاو ناکەوێت، ئەویش لەبەر ئەوەی کۆتەڵی ئەیقۆنات زیاتر، ڕووی پەرستنی (جاهلی)یەت بەدەردەخات و ڕێگەیەکە بۆ ئەو سەردەمە، هەرچەندە ئەمە بۆچوونێکی هەڵەیە کە بەراورد لەنێوان پەرستنی سەردەمی (جاهلی) و سەردەمی (مەسیحی)دا بکرێت، کە جاهلییەکان مانای تاکە پەرستنی خوایان نەبوو وەکو ئەوەی لەسەردەمی مەسیحییەکاندا بەڕوونی تاکێتی خوا بەدەردەکەوێت، چونکە لەو سەردەمەدا هاوتایان بۆ گەورەیی خوا دادەنا.

کاریگەری بڵاوبوونەوەی جۆرەها مەزهەب، هاوسەردەم بووە لەگەڵ بڵاوبوونەوی ئایینی ئیسلامدا، کە ئەمە لەخۆیدا بووە کاریگەری بەسەر ڕادەربڕین بەسەر هونەری ئەیقۆناتەوە، بەجۆرێك لەخوودی (مەسیح) و (پاکیزە مەریەم) دەدوان، کە هەریەکەیان بەشێوازێك لەکێشانی وێنەی مەسیح و پاکیزە مەریەمدا بۆچوونی هونەری دەخستە ڕوو.

ئایینی ئیسلامیش لەباسکردنی مەسیح دا زۆر بەڕوونی ئەو جیاوازییانەی خستۆتە ڕوو چ لەخوودی (مەسیح) و

(پاکیزە مەریەم)دا ئەویش بەسەرهەڵدان و دەرخستنی لایەنە شاراوەکانی، بۆیە کاریگەری بەسەر تابلۆی ئەیقۆنات ڕەنگ دەداتەوەو دەوری هەیە لەسەر ئاستی هونەری هێڵەکانی ئەیقۆنات، هاوپەیوەستی جیهانی ئیسلامی و مەسیحی هۆیەکی گرنگ بوو بۆ کاریگەری ڕووخاندنی هونەری ئەیقۆنات:

(بەشێکی زۆری مێژوونووسەکان لەو باوەڕەدان کە موسڵمانەکان دەورێکی گرنگی بزاڤی ڕووخاندنی ئەم ئەیقۆنانەیان بووەو (فقهاء) کانیان بیروبۆچوونێکی توندو تیژیان هەبووە لە کێشانی وێنەی خاوەن ڕووح و زیندوو، هەر لەهەمان کاتدا هەستاون بە هێنانی نموونە لە فەرموودەکانی پێغەمبەر کە هەر چەندە پێغەمبەر بە زمانیدا نەهاتووە دەربارەی ئەم کۆتەڵ و وێنانە، کەلەوانەیە ئەو فەرموودانە ئەو کاتە ڕێك خرابێت کە کاتێك کڵێسەی بیزەنتی بڕیاری نەمانی ئەیقۆناتی دابێت ئەویش لەکۆتایی سەردەمی ئەمەوی و سەرەتای سەردەمی عەباسیدا)[٣٠].

(هەندێك بۆ ئەو باوەڕە دەڕۆن کە گوایە کۆمەڵەی نەمانی ئەیقۆنات کەوتبوونە ژێری کاریگەری هەڵوێستی ئیسلام دەربارەیان.. کەئەمەش گەلێك لەمێژوو نووسە ئەوروپییەکان لەو باوەڕدا بوونەو بۆ نموونە نازناوی ئیمپراتۆر (لاونی سێیەم) پێی وتراوە (لاونی هەڵگری بیری ئیسلامی).

هەندێك لەئالاّ هەڵگرانی نەمانی ئەیقۆنات دەڵێن کە گوایە هۆی سەرکەوتنی سەربازی موسڵمانەکان بەسەر ئیمپراتۆریەتی مەسحییەکانەوە (بیزەنتی) لەسەدەی ناوەڕاستداو بەشێکی زۆری ئاقارەکانیان لەبەشی خۆرهەڵات و خوارووەدا لێیان داگیر کردبوو وەکو (ئەرمینیا) و (ولاتی شاخ)و (میسر)، کە گوایە هۆی سەرەکی دوژمنایەتییان دژی وێنەو کۆتەڵە، کە ئایینی بێت یان ئایینی نەبێت، چونکە مزگەوتەکانیان بێ بەشە لێی. ئەوە دەزانین کە بەشێکی زۆری گەڕۆك و مێژوونووسەکان پیاوە ئایینیە بیزەنتییەکان سەریان داوە لەشارە ئیسلامییەکان، ئەو ڕاستییانەیان بۆ دەرکەوتووە کە کۆنترین سەردانێك بۆ شاری (قدس) لەساڵی ٥٠ی کۆچی بووە (٦٧٠)ی زایینی لەلایەن مێژوونووسی بیزەنتی مەتران (ئەرکوفس Arcuifus)، کە وەسپی مزگەوتی عومەر کوڕی خەتابی داوە بەوەی کە بێ بەشە لە هەموو وێنەو کۆتەڵێك، کە جیاواز لەوەی هەیە لەکڵێسەکاندا)[٣١].

بەهۆی کارتێکردنی ئەیقۆنات بەنێو خوودی مرۆڤداو کارلێکەری بۆ ئەوەی کە بێتە گەڕانەوەی بۆ بت پەرستی و دوور کەوتنەوەی لەئایینی مەسیحی، ئەمە وای کرد کۆمەڵێك سەرهەڵبدات بۆ ڕووخاندنی ئەم هونەرەو چاولێکەری ئیسلام بۆ لەناودانی، چونکە ئەم کارە وای کردووە کە لەبنەڕەتی ڕاستی ئایینەکە دوور بکەوێتەوەو گەلێك لایەنی لاوەکی لەخۆی بگرێت.

ڕەچاوکردنی ئەوەی کە هەردوو ئایینی مەسیحی و ئایینی ئیسلام کە دوو ئایینی ئاسمانین، بۆیە هەوڵدان بۆ ئەوەی چاو لەیەکتری بکەن بۆ ڕێنمایی ئایینیەکان دوور کەوتنەوە لەکاری پەرستن کە ڕووحێکی بێ گیانی هەبێت ببێتە داشۆرانی ئاوەزی مرۆڤ.

ئەگەر سەرنج بدەینە مزگەوتەکانی کەرکوك بەشێکی لەسەر چینەکانی کڵێسەکان دروستکراوە، کە ئەمیش لەگەڵ خۆیدا بۆتە لەدەستدانی بەشێکی گرنگی هونەری ئەیقۆنات یان لەگەلێك کاتدا هەر لەناو کڵێسەدا دروستکراوە وەکو کڵێسەی (مەریەم ئانا).

*** بابەتەکانی هونەری ئەیقۆنات لەناوچەی کەرکوکدا:**

ئەگەر سەرنجێکی بابەتی ئەیقۆنەکانی ئەم ناوچەیە بدەین دەبینین خۆی لەم خالانەی خوارەوە دەبینێتەوە.

١. زۆربەی بابەتەکانی ئەم ئەیقۆنانە، باسەکانی دەربارەی (مەریەمانە)و (مەسیح)و (یەسوع)و (مار تەعمازکرد)و (قوتابییەکانی)و (دەربڕینی کارەکانی مەسیح)و وێنەو بەکارهێنانی ئەیقۆنە بەدیار خستنی جۆری بڵاوبوونەوەی ئایینەکەو لەدایك بوونی مەسیح و گەشەکردنی ژیانی منداڵی و مێردمنداڵی.

٢. زۆربەی ئەیقۆنەکانی کەلەم ناوچەیەدا هەیە ئەوەی کە لەهەموو کڵێسەکاندا هەیە باس لەخواستە ئایینیەکانی ناوچەی کەرکوك ناکات، ئەوەی لەتابلۆکاندا بەرچاو دەکەوێت تەنیا ئەیقۆنەی (مارتەعمازگرد)، ئەیقۆنەکانی تر هەموو باسەکانی لەخولگەیەکی جیهانی ئاقارە مەسحیەکانەوە سووڕ دەخواتەوەو ئەوەی هەیە لەچوارچێوەی دابەشکردنێکی ئایینەوە دروستکراوە.

٣. قەبارەی زۆربەی بابەتەکانی ئەیقۆنەکان لەنێوان (٣٠-٣٥)سم درێژی و (١٠-١٥) سم پانی خول دەخوات، زۆر بەدەگمەن ڕێ دەکەوێت کە ئەیقۆنەیەك لەنێوان (١-١,٥) م درێژی و (٥٠)سم پانیدا بێت، کە ئاگاتە پەنجەکانی دەست.

٤. زۆربەی ئەیقۆنەکانی ئەم ناوچەیە لەسەر تەختەیان خام یان کاغەز وێنە کێشراوە، زۆر کەم ڕێدەکەوێت کە لەسەر تەنەکە یان گەچ دروست کرابێت، زیاتر بەشێوەیەکی ئامادە باشی بۆ کراوەو بایەخی پێ دراوە.

٥. زۆربەی تابلۆکانی ئەم ئەیقۆنانە بەجۆرەها ڕەنگ نەخشکراوە تا بۆ ئەوەی زیاتر لایەنێکی واقعی بدات بەو تابلۆیە، هەر لەهەمان کاتدا بایەخ دراوە بەڕەنگی تاریك لەزۆربەی تابلۆکاندا، وهێڵی تەماوی زاڵە بەسەر تابلۆکاندا بەتایبەتی لەئەیقۆنی (مەریەم)و لەدایك بوونی (یسوع)دا، کە مرۆڤ هەست بە جیهانێکی نادیاری ئەم ژیانەو چەرمە سەرییەکانی دەکات.

٦. بایەخ نەدان بەهونەری ئەیقۆنات لەناوچەی کەرکوکدا، وای کردووە کەئەم هونەرە نەگاتە ئاستێکی بەرزی جیهانی لەنێو کڵێسەکاندا سەیر نەکردنی ئەم ئەیقۆنانە بەچاوێکی بەرز.

٧. زۆربەی تابلۆکانی ئەم کڵێسانە زۆر بچووك و دیارە لەچاو فراوانی هۆڵ و قەبەی کڵێسەکاندا، کەلەسەر ئاستێکی نەخشە داڕێژراو بەرهەم نەهاتووە تەنانەت گەلێك جار کڵێسەیەکی تر، بێ ئەوەی بایەخ بەئاست و نەخشەی کڵێسەکە بدەن، هەروەکو گواستنەوەی ئەیقۆنەکانی کاتەدرایی (ام الاحزان)، بۆ کڵێسەی (مار یوسف) لەشەقامی

کۆماری.

٨. دیار نەبوونی ئەوانەی کە ئەم نەخشانەیان کێشاوە یان ناوی ئەو وێنەکێشانەی لەناوچەی کەرکوکدا دەستیان هەبووە لەهونەری ئەیقۆناتدا، کەتەنیا ناوی وێنە کێش (مارگۆرگیس)مان بەرچاو دەکەوێت.

٩. بەهۆی فەوتاندنی بەشێکی زۆری کڵێسەکان و رووخاندنی بۆتە هۆیەکی گرنگ بۆ لەناو چوونی بەشێکی زۆری ئەم شاکاری ئەیقۆنانەو نەدۆزرانەوەی زنجیرە مێژوییەکانی ئەم هونەرە لەناوچەی کەرکوکدا.

١٠. کۆچکردنی بەشێکی زۆری ئەوانەی بایەخیان دەدا بەم هونەرە، وای کرد کە کاریگەری ئەم هونەرە بەرەو نەمان بڕوات، تا رادەیەك وەستانی لەسەر ئاستی کڵێسەکاندا.

١١. گەلێك رووداو و کارەساتی تایبەت بەجیهانی مەسیحیەوە روویداوە لەناوچەی کەرکوکدا، بەڵام هیچ یەکێك لەم رووداوانە نەبۆتە بابەتی تابلۆکانی ئەیقۆنەکان، وەکو رووداوی (مار تەهمازکرد)و (شەهید شیرین)و (چوار راهبە ئافرەتەکان)و گەلێکی تر، کە پێویستە رەنگدانەوەی مەزهەب و دیاردەی کڵێسەکان بێت، بۆیە زیاتر تابلۆکان لەچوارچێوەی جیهانی مەسیحی بەگشتی دەسووڕێتەوەو کەوتە بەر ئەو کاریگەریە جیهانییەوە.

١٢. بەکارهێنانی کۆتەڵی ئەیقۆنیش باوەو بەشێکی بەرچاوی لە کڵێسەدا بەرچاو دەکەوێت، بەتایبەتی لە کڵێسەکانی ئەم سەردەمی ئێستاماندا.

ئەوەی لەئەیقۆنەکانی کڵێسەی (مریم العذراء)دا بەرچاو دەکەوێت کە لەسەر خام یان پەڕۆ دروست کراوەو تا رادەیەك قەبارەی تابلۆکە گەورەیە کە نزیکەی مەتر بۆ پانی (٥٠)سم دەبێت..و بابەتی تابلۆکانی وێنەی (مەریەم)و (یەسوعە).

بەڵام ئەوەی لەکڵێسە (سوورەکە) بەرچاو دەکەوێت بریتییە لە هونەری ئەیقۆنی ئەم دوایەو پاشماوەی کڵێسەکەی سەردەمی عوسمانییەکانمان هیچ بەرچاو ناکەوێت، ئەوەی ماوە تازە بابەتەو بابەتەکانی بریتییە لە دوو تابلۆی (پاکیزە مەریەم)و لەگەڵ دوو تابلۆی (مەسیح) و تابلۆیەکی قوتابییەکانی (مەسیح) لەکاتی بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحیدا. لەیەکێك لەتابلۆکاندا بریتییە لە پاکیزە مەریەم بەجلو بەرگێکی پۆشتەوەو فریشتەکان دەورەیان لێ داوەو پاکیزە مەریەم تاجێکی ئاڵتونی لەسەردایە.

لەتابلۆی دووەمی پاکیزەدا بریتییە لە وێنەی پاکیزە مەریەم بەروویەکی خەماوی و تابلۆکەی روویەکی تەماوی وەرگرتووەو جلێکی پۆشتەی پۆشیوە.

لەتابلۆی (مەسیح)دا بریتییە لە وێنەی (مەسیح) بەگەورەیی لەپشتیەوە خۆرێکی گەورە هەیەو جلووبەرگێکی پۆشتەی لەبەردایەو هێڵی تابلۆکە تا رادەیەك رەنگی تاریك، پانتاییەکی گەورەی داپۆشیوە وچەند رەنگێك زاڵە بەسەر تابلۆکەدا کە ئەویش رەنگی سوورو زەردە، زۆربەی تابلۆکان قەبارەیەکی بچووکی هەیەو لەنێوان (٥٠-٣٠)سم تێپەر ناکات.

گەورەترین کڵێسەیەك کە تابلۆی ئەیقۆناتی لەخۆی گرتبێت، کڵێسەی (مار یوسف)ە لەشەقامی کۆماری کە دەوری نزیکەی (٣٠-٣٥) تابلۆی ئەیقۆنی لەخۆی گرتووە بێجگە لە کۆتەڵی ئەیقۆنەیی نێو کڵێسەکەو دەرەوەی کڵێسەکە.

لەهەردوو ریزی باری درێژی کڵێسەکە بەوێنەی ئەیقۆنەیی رازاوەتەوە دەربارەی شێوەو چۆنیەتی بڵاوکردنەوەی ئایینی مەسیحی و هەڵسوکەوتی مەسیح لە گەڵ کۆمەڵ و چۆنیەتی بڵاوکردنەوەی رێنماییەکانی لەنێو ئەو کۆمەڵەداو زیاتر تابلۆکانی ئەم کڵێسەیە لەچوارچێوەیەکی خەیاڵ ئامێزەوە نزیکەو تا رادەیەك هێڵی تەماوی بەسەرەوە دیارەو زۆربەی بابەتی تابلۆکان دەربارەی (مەریەم پاکین)و (مەسیح)ە. بەڵام نوێترین ئەیقۆنەیەك ئەوانەیە کە دروست کراوە لە کاتەدرایی ئەبرەشی کەرکوك (قلب يسوع)، کە تارادەیەك هەوڵدراوە تەکنیکی تازە بابەت و کەرەستەی جۆر بەجۆرو تازە لەئامێز بگرێت.

(لەم کڵێسەیەدا ویستویانە کەهەموو یادگارەکانی ئەبرەشییەی (کەرخ سلوخ) کۆبکەنەوە، بەپێی مێژوو، ئەویش هەستاون بە رازاندنەوەی دیوارەکانی بەتابلۆیەکی هونەری (مار تەهمازکرد) کە تابلۆی ئەو فەرمانڕەوایەی کە ژمارەیەکی زۆری لەمەسیحییەکانی ناوچەی کەرکوك کوشت کەیەکێك لەوانە (شیرین و مندالەکانی بوو) لەسەردەمی پاشای ساسانی (شاپوری دووەم)دا بوو لەنێوان ساڵانی (٣١٠-٣٧٩)ی زایینی بەڵام لەدواییدا لەسەردەمی پاشا یەزدەگوردی دووەم (٤٣٨-٤٥٣)ی زایینی باوەڕی بە ئایینی مەسیحی هێنا.

شووشەی پەنجەرەکانی رەنگاورەنگەو بەگەلێك لایەن و رووداوی ئایینی گرنگ رازاوەتەوە، بۆیە هەستاون بەرازاندنەوەی کاتەدرایەکە بەقۆناغەکانی دەرکەوتی خاچ و قۆناغی دەرکەوتنی نەهێنی گوڵی (اسرار الوردية) کە دەرکەوتنی خاچەکە بریتییە لە چواردە قۆناغ و ئینجا قۆناغێکی تریان بۆ زیاد کردووە ئەویش قۆناغی قیامەتە تا بۆ ئەوەی یەکسان بێت لەگەڵ (اسرار الوردية) کە بریتییە لە پانزە قۆناغ کە رووی هەر پەنجەرەیەك لەم سەروو ئەو سەرەوە قۆناغێکی لەخۆی گرتووە. بەیەکسانی[٣٢].







**ئەیقۆنەکانی کلێسەی (مار یوسف)**









**ئەیقۆنەکانی کلێسەی (مار یوسف)**





*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

(١) گۆڤاری (بين النهرين)، ژمارە (٥٣-٥٤)، لاپەڕە (٥٢-٥٣)، (اصول العمارة الكنيسة في العراق).
(٢) (الكشاف الأثري في العراق)، د. قەحتان رەشید سالح، لاپەڕە (٩٠).
(٣) گۆڤاری (سومر)، بەشی یەکەم، جلدی سی و سێیەم، ١٩٧٧، لاپەڕە (٣٢).
(٤) (حضارة العراق)، بەشی سێیەم، لاپەڕە (١٠٧).
(٥) گۆڤاری (بين النهرين)، ژمارە (٥٣-٥٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو.
(٦) (الفن في العراق القديم)، ئەنتوان مورتگارت، وەرگێڕانی: عیسا سەلمان و سەلیم تاها ئەلتکریتی، چاپخانەی (اديب بەغداية)، بەغدا، ١٩٧٥، لاپەڕە (٣١٨).
(٧) (اثار بلاد الرافدين)، سیتون لوید، وەرگێڕانی د. سامی سەعید ئەلئەحمەدی، (دار الرشيد للنشر)، ١٩٨٠، لاپەڕە (٢٠٦-٢٠٧).
(٨) ئەنتوان مورتگارت، هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (٣١٨).
(٩) گۆڤاری (سومر)، بەشی یەکەم، جلدی ٣٣، ١٩٧٧، لاپەڕە (٣٢).
(١٠) سیتون لوید، هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢٠٦-٢٠٧).
(١١) گۆڤاری (بين النهرين)، ژمارە (٢٧)، سالّی حەوتەم، سالّی ١٩٧٩، لاپەڕە (٣١٥)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی: (الشهيد طهمازكرد وديره)، رۆڤائیل میناس.
(١٢) گۆڤاری (الفكر المسيحي)، ژمارە (٢٢٠)، سالّی بیست و دووەم، کانون یەکەم، ١٩٨٦، لاپەڕە (٤١٢). لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:
(كنيسة الحمراء في كركوك)، نوئێل بەهجەت.
(١٣) گۆڤاری (بين النهرين)، ژمارە (٥٣-٥٤)، سالّی ١٩٨٦، لاپەڕە (١٢١-١٢٢)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:
(اساقفة كركوك عبر التاريخ)، رۆڤائیل میناس.
(١٤) گۆڤاری (الفنون)، ژمارە (٤٤)، ١٨ حوزەیران، ١٩٧٩، لاپەڕە (٥٧-٥٨) لێکۆڵینەوەیە بەناونیشانی:
(العاملون في المؤسسة العامة للآثار يدخلون قلعة كركوك من سبعة مواقع)، محەمەد داود.
(١٥) گۆڤاری (الاخاء)، ژمارە (١٠)، شوبات، ١٩٨٣، لاپەڕە (٣٦).
(١٦) (الكشاف الاثري في العراق)، د. قەحتان رەشید سالح، زانکۆی موسڵ، بەغدا، ١٩٨٧، (المؤسسة العامة للاثار والتراث)، مديرية دار الكتب للطباعة والنشر، لاپەڕە (٩٦).
(١٧) گۆڤاری (الإخاء)، ژمارە ١٠، شوبات، ١٩٨٣، سالّی ٢٢، لاپەڕە (٢٨)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:
(بمناسبة تطوير قلعة كركوك، رۆڤائیل میناس.
(١٨) (دراسات كردية في بلاد سوبارتو)، د.جەمال رەشید ئەحمەد، بەغدا، ١٩٨٤، لاپەڕە (٣٥).
(١٩) گۆڤاری (سومر)، بەشی یەکەم و دووەم، جلدی دوانزەهەم، ١٩٥٦، وائل ئەلروبەیعی، لاپەڕە (٥٨-٦١).
(٢٠) گۆڤاری (نجم المشرق)، ژمارە (٢٧)، سالّی حەوتەم، سالّی ٢٠٠١، لاپەڕە ٣٨٠-٣٨٥، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:
(كاتدرائية ابرشية كركوك الجديدة قلب يسوع).

(*) هەڵوێستی کڵێسەی رۆژهەڵاتی دەربارەی هونەری ئەیقۆنات: لە کتێبی (مجمع الكنائس الشرقية) بەم جۆرە باسی ئەیقۆنە یان وێنەی پیرۆز دەکات: (ئەیقۆناتە پیرۆزەکان بەهایەکی گەورەی هەیە، بەلای کەمەوە لەهەندێك کڵێسەی رۆژهەڵاتی، ئەمە بریتیە لە روانینێکی گەورە بۆ بەرچاوی خاوەن باوەڕ دەربارەی ئەو گەورانەی کە خوا پێیانی گەیاندووە لەسەر زەوی، بەتایبەتی ئەوانەی بەهۆی ووشەی بەرجەستەوە دروست بووە، یان ئەوەی دروست بووە، بەهۆی (قدیس)و (کڵێسە) هەر لەبەر ئەم بەرچاویە کە ئەم ئەیقۆنانە بایەخێکی گەورەی هەیە لە ژیانی (لیترجیا) کە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی (لیترجیا)، لەڕاستی دا ئاهەنگ و بیرکردنەوەیە و سووتانەوەی هەموو سەردەمەکانە کە تێدا ئەم رووداوانە بەوێنە و رێگەدانی بە رێگەیەکی پاك، دەورێکی گەورەی هەیە بۆ چاولێکەری و چەسپاندنی لە ناوەڕۆدڵی ئەوەی کەئاواتی پێیەتی.

هەر بەشێك لە مێژووی پیرۆز لەراستیدا ئەبێتە دروستکردنی کارێکی گەورە لەکارەکانی توانای خوای گەورە. مانای ئەیقۆنەکان دیارە، لەگەڵ بەراووردی وێنەی تردا، هەڵدەستێت بەوەی کە ئامادە دەبێت و دەور دەبینێت، نەك تەنیا رووکاری مرۆڤ وەکو ئەوەی کە دەبینرێت لە چاوی زەوی، بەڵکو تازە کردنەوەی مەسیحییەتی رەهایە، (..وەکو ئەوەی کەچاو نایبینێت و، گوێ بیستی نییە و دڵیش ترپەی پێ ناکات).

ئەوەی لەئەیقۆناتەکان دەبینرێت، تەنیا بریتییە لە دەربڕینی دووربینی ئەو مرۆڤە ئاسمانییانە، کە تێدا دیاردەیەکی پیرۆزی تێدایە، تا رادەیەك بەشداری ئەوە دەکات خوداییە، هەر لەبەر ئەمەیە ئەیقۆنەکان جێگەو بابەتی راستەوخۆی پەرستنە، رێز لەو ئەیقۆنانە دەگیرێت کە رێزی کردەوەی (السيد)و کردەوەکانی دەگیرێت.

بەپێی درێژایی چەند سەدەیەك هەر یەکە لەکڵێسەکانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا، پێشکەوتنیان بەخۆیانەوە دیوەو جۆرەها تەکنیك و شێوازو شکڵی رێکو پێکی وێنەی پیرۆزیان کێشاوە، کە ئەویش دەربڕینە بۆ ئەو باوەڕو نزیك کردنەوەی لەخەڵکی، بەڵام لەم سەدانەی دواییدا بووە پێشکەوتنی هونەری مەسیحی رۆژئاوایی و بووە وەرگرتنی هێڵێکی سروشتی خۆی، لەهەمان کاتدا کڵێسەی رۆژهەڵاتی زیاتر ئەمانەتی خۆی پاراستووە لەشێوازی کۆن دەربارەی پێ راگەیاندن بەراستییەکانی ئاسمانی و وێنەکێشانی.

هەتا ئەم کاتەی ئێستامان بوونی جۆرەها قوتابخانەی جیاواز هەیە، کە کاری هەوڵدانە بۆ پاراستنی ئەو کۆنینەیە و

جۆرەها ئەیقۆن و وێنەو قوماش بەرهەم دەهێنێت بۆ درێژ بوونەوەی ئەو نموونە کۆنانە، بێ ئەوەی دوور بکەوێتەوە بەهۆی ئەو کاریگەریە رۆشنبیریەی هاوچەرخ کە بلاوبۆتەوە لەناوچەکەدا. هەر بەهەمان شێوە رۆژئاوایش خودی ئەو بەرزییەی باوەڕو هونەری گەڕاندۆتەوە.

بڕوانە: (مجمع الكنائس الشرقية، توجيه، لتطبيق المبادئ الليترجية الواردة في مجموعة قوانين الكنائس الشرقية)، لە بڵاوکراوەکانی (اللجنة الأسقفية لوسائل الأعلام)، جل الديب، لوبنان، لاپەڕە (١٤٥-١٤٦-١٤٧).

(٢١) (المنجد، معجم مدرسي للغة العربية)، لويس مەعلوف، چاپی دوانزەهەم، نیسان، ١٩٥١، چاپخانەی (الكاثوليكية)، بەیروت، لاپەڕە ٢٠.

(٢٢) (القاموس العلمي، عربي – كردي)، بەشی یەکەم، کەمال جەلال غەریب، چاپی یەکەم، ١٩٧٤، چاپخانەی (کامەران)، سلێمانی، لاپەڕە ١٨٧.

(٢٣) گۆڤاری (بين النهرين)، ژمارە (١١١-١١٢)، سالی ٢٨ سالی ٢٠٠٠، لاپەرە (٢٨٥) لێکۆڵینەوەیەکە بەناویشانی: (الأيقونة)، الأب مەنسور ئەلموخلسی.

(٢٤) گۆڤاری (بين النهرين)، ژمارە (٨٩-٩٠)، سالی (٢٣)، سالی (١٩٩٥)، لاپەڕە (١٢٦)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی: (الأيقونوغرافيا السريانية)، الأب د. عەبدۆ بەدەوی).

(٢٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی (١٢٦-١٣٠).

(٢٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٢٨).

(٢٧) لە کتێبی (الكنيسة في الأزمنة البربرية) وەرگیراوە کە بە زمانی فەرەنسییە، نووسینی (دانیال روبس) (LEGLISE DESTEMPS BABARES ١٩٥٠) سوپاسی برای بەڕێز (ئیستیفان رەبان) دەکەم بۆ وەرگێڕانی.

(٢٨) گۆڤاری (الإخاء)، ژمارە (١٠) شوبات، ١٩٨٣، سالی (٢٢)، لاپەرە (٢٧،٢٨)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی: (بمناسبة تطوير قلعة كركوك)، رۆفائیل میناس.

(٢٩) (زمن لكل الأزمنة، نظرات واراء في الفن)، بلند ئەلحەیدەری، لێکۆڵینەوەیەکی هونەری تێدایە دەربارەی هونەری ئیسلامی، لاپەڕە (٢٣، ٢٦، ٢٧).

(٣٠) گۆڤاری (بين النهرين)، ژمارە (١١٣، ١١٦، سالی (٢٩) سالی (٢٠٠١)، لاپەرە (١١٣،١١٤)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:

(الفنون وحركة كاسري الأيقونات في العصر البيزنطي)، د. عەبدولعەزیز حەمید سالح.

(٣١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١١١، ١١٢).

(٣٢) گۆڤاری (نجم المشرق)، ژمارە (٢٧)، سالی حەوتەم، سالی (٢٠٠١) لاپەڕەکانی (٣٧٨-٣٨٠،٣٧٩)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:

(كاتدرائية ابرشية كركوك الجديدة)، مەتران ئەندراوس سەنا.

# بەشی دوازەیەم

## هەڵسەنگاندنی هونەری بینکاری و نەخش و نیگاری کەرکوك

١. ئەگەر سەرنجێکی مێژوویانە لە هونەری بیناکاریو تەلارسازی کەرکوك بدەین ئەو ڕاستییە یەکلا دەبێتەوە کە هەڵگری ئەو قۆناغە مێژوویانە بووە کە کەرکوکی پێدا ڕۆیشتووە.

هەر قۆناغێکی لەو قۆناغە مێژوویانە هەڵگری سیفاتو تایبەتمەندی سەردەمەکەی خۆی پێوە دیار بووە، ئەویش لە چوارچێوەی ئەوەی کە ئەو هونەرە لە خۆڕا نەیتوانیووە خۆی بڕسکێنێت، بەڵکو لەگەڵ هەنگاوە مێژووییەکاندا توانیویەتی جوانکاری خۆی بەدەر بخات لە چوارچێوەی ئەو توانا بیناکارییەی کە هەنگاوی بەرچاوی ناوە لە تێگەیشتن بۆ کارەکان.

لێکدانەوەمان لە ڕووی مێژووییەوە بۆ تەلارسازی کەرکوك ئەوەیە کە پارچەیەکی هاوگونجاوو تەریب بووە لەگەڵ مێژوودا، نەبووتە بەشێکی دابڕاو لە مێژوو یان نامۆ لە قۆناغە مێژوویەکان، نموونەی ئەم تێگەیشتنەمان دروستبوونی قۆناغەکانی قەڵا، پاشماوەی شارستانیەتە گەورەکان، پێگەیاندنی هونەری نەخشو نیگارە لەو تەلارسازییانە.

٢. گۆڕانکاری هونەری تەلارسازی کەرکوك گۆڕانکارییەکی هەڕەمەکی بووە، ئەوەیش خۆی بینیوەتەوە لە بنەمایەکی بێ نەخشە بێ ئەوەی گرنگی بە گۆڕانکاری سەردەمەکان بدرێت، زیاتر مرۆڤ تێگەیشتنی هەبووە یان ئارەزووەکانی مرۆڤ دەوری بینیووە لە فراوانکردنو نەخشەدانانی تەلارسازییەکانی، چونکە ئەو فراوانبوونەی شار لە ڕووی تەلارسازییەوە بە شێوەیە بووە کە خواستی مرۆڤەکانی جێ بەجێ کردووە.

یەکە کارگێڕییانەکانی حکومەتە یەك لە دوا یەکەکان بە شێوەیە نەبووە بتوانێت نەخشەی خۆی دابڕێژێت لە پێناو فراوانکردنی شارەکە لەسەر بنەمای نەخشەو ئامارو تێگەیشتنی بیناسازی، مرۆڤەکان زیاتر باڵادەست بوونە لە تێڕوانین بۆ هونەری بیناسازی وەکو ئەوەی یەکە کارگێڕییەکانی دەوڵەت دەوری هەبوو بێت.

سەردەمی بەعس بە پێچەوانەی خواستەکانی مرۆڤ جوڵاوەتەوە، هەوڵی داوە لەسەر ئەو بنەمایە کار بکات کە سیاسەتو تێگەیشتنی بۆ تەلارسازی چۆن بووە نەك خواستی مرۆڤەکان باڵا دەست بێت لەو بیناکارییەدا، هەر بۆیە لەو سەردەمەدا تێگەیشتنە سەربازییەکان دەوریان بینی لە داڕمانی بەشێکی زۆری هونەری بیناکاری کەرکوك کە ڕووخانی قەڵای کەرکوك بەشێکی گەورەی ئەو نەهامەتییە بوو لە پێناو جێبەجێ کردنی مەرامەکانیان.

٣. کاریگەری پشتاوپشتی موڵکی خانووبەرەو زەوی بۆ ئەوە یەك لە دوای یەکەکان دەوری هەیە لە شێواندنی هونەری تەلارسازی کەرکوکدا، لەوەدا خۆی دەبینێتەوە هەندێك جار کاریگەری موڵکەکان دەبێتە تێکدانی بنەماکانی گەڕەكو شارو شەقامە گشتییەکان.

مانەوەی موڵکەکان پشتاوپشت لە هەندێك جاردا دەبێتە شێواندنی خانوویەکی گەورە بۆ چەند یەکەیەکی جیاوەبوو، هەر یەکێك بەشی خۆی وەردەگرێت، لەم بارەدا بەشێك لە هونەری تەلارسازی بنەماکانی خۆی لە دەستدەدات یان لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی تەلارسازی سەردەمدا ناگونجێت.

هەندێك جار ئەو موڵکانە دەبنە لە دەستدانی بەشێکی زۆری نەخشو نیگاری نێو ئەو خانووانە ئەویش لەوەدا خۆی یەکانگیردەکات کە بیرکردنەوەیان بۆ دابەشبوونی ئەو موڵکە بێ ئەوەی بایەخ بە بنەما کەلەپووریو شوێنەوارییەکەی بدەن.

٤. یەکێك لەو یەکە گرنگانەی بیناکاری کەرکوك قەڵای کەرکوکە، ئەگەر لە ڕووی بیناکارییەوە بڕوانینە قەڵای کەرکوك دەگەینە ئەو ڕاستییە کە بە یەکێك لەو بەشە بەهایانە

دادەنرێت کە توانای کۆکردنەوەی هەموو مۆرکەکانی بیناکاری قۆناغە مێژووییەکانی لە خۆی چڕ کردۆتەوە.

لێکدانەوەمان بۆ قەڵای کەرکوك بەوەدا دەشکێتەوە کە بەشێکی دانەبڕاوە لە هەموو رووی تەلارسازیی و لەوێوە چەخماخەی هەنگاوەکانی بیناکاری پەلی هاویشتووە بۆ گەڕەکەکانی کەرکوك، بۆیە بەشێکی ئەو تەلارسازییە هەمان کۆپی شوێنەکانی تری ناو کەرکوکە، یان لە هەندێك باردا گۆڕانکاری کراوە لەو تەرزە بیناکارییانەی کە لەسەر قەڵادا هەبووە.

(بارە تۆپۆگرافییەکەی قەڵای کەرکوك بووە بە سنوورێکی دەرەکی و رۆڵی دیوارێکی پۆڵاینی بۆ پاراستنی گەڕەك و پێکهاتە میعمارییەکانی ناو قەڵا بینیوە، ئەو بارە تۆپۆگرافییەی قەڵا توانیویەتی سەدە دوای سەدە بە بەردەوامی بیناکانی قەڵا بپارێزێت.

هەروەها تەپۆڵکەکەی قەڵا توانیویەتی ناسنامەو توخمە میعمارییە رەسەنەکانی قەڵا لە تەوژمی پرۆسەی مۆدێرنیزەکردن رزگار بکات و بیناکانی قەڵا بە کۆنتێکیست و شوێنی رەسەنی خۆیانەوە The sense of belonginess to the place گرێ بدات و بە دووریان بگرێت لە تەرزی میعماری نامۆ بە قەڵای ناوچەکە)[1].

(ئێستاتیکای قەڵا تەنها لە شێوازی بیناسازی خانوو و تەلارە ناودارەکانی بە دەرناکەوێت (کە تەنها ٨٪)ی بەهایەکی میعماریی و مێژووییان هەیە، بەڵکو بەهای میعماری قەڵا لە تێکڕای پەیکەرو نەخشە گشتییەکەیدا دەردەکەوێت کە بە شێوەیەکی ئۆرگانیکی و بە ئەندازەیەکی چڕو پتەو Compact داڕێـژراوە بە بێ هێشتنەوەی هیچ فەزایەکی نیگەتیڤ Negative Space هەر چەندە سەرجەم فەزاو کۆڵانەکانی قەڵا بەر لە رووخاندنی بە کۆشك و بینا بە چڕی داڕێـژرابوو، بەڵام ئەم کارە نەخشەسازییە نەبووە هۆی دروستبوونی بەربەستی هاتوچۆ لەناو کۆڵانە تەسکەکاندا، لەبەر ئەوەی هۆکارەکانی هاتوچۆ لە سەردەمی کۆندا لە قەڵادا تەنها پێکهاتبوو لە ئەسپ و گوێدرێژو حوشترو ئاژەڵی تر، لەبەر ئەوەی ئەم فەزا بینایانە بەهاریکاریی و رەزامەندی دانیشتوانەکەی دروستبوون، بەتایبەتی لە رێگەی ئاڵوگۆڕی بیروڕاو رازیبوونی دانیشتوانی دانیشتوانەکەیەوە، واتە: تاك رەچاوی پێداویستی گشتی دەکردو خەڵکی گەڕەکیش رەچاوی پێداویستی تاکیان دەکرد)[2].

٥. گرنگی کەرکوك لە بوونی چەند جارێك بە پایتەخت و مەڵبەندی کارگێڕی دەوری بینیوە لە گرنگی قەڵا لەو قۆناغە مێژووییانەدا، بەتایبەتی لە بواری بیناکارییدا، ئەوەیش لـەوەدا خـۆی دەبینێتـەوە کە هـەوڵ دراوە ئاستی ئەو بیناکارییانە لە توانای ئەو قۆناغە کارگێڕیی و بەڕێوەبەرییانە بێت کە لە سەردەمە جیاجیاکاندا جێگەو پێگەی خۆی هەبووە.

لێکدانەوەمان بۆ ئەمە لـەوەدا سـەرچاوە دەگرێت کە پێویستی بوونی شوێنێکی ناوەندی سیاسی و سەربازی دەوری بینیوە لە دروستکردنی یەکە بیناکارییەکان بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکان:

(کەرکوك پایتەختی دەوڵەتی گوتی بووە لە هەزارەی سێیەمی پێش زایینـدا، بۆیـە لـەو مـاوەیـەدا کـەرکوك پایتەختیان بووە گرنگی خۆیان پێ داوە.

جـاری دووەم بـۆتـە پـایـتـەخـی بـەشـی رۆژهـەڵاتـی ئیمپراتۆریەتی (هوری-میتانییەکان) لە سەدەی هەژدەهەمی پێش زایینـدا، لە جاری سێیەمدا بۆتە پایتەختی دەوڵەتی ئەدیابین لە سەدەی یەکەمی زایینـدا، پێش ئەوەی هەولێر ببێتە دەوڵـەت و سنووری کوردستانی باشوور لە زەمانی دەوڵەتی ئەشکانیدا.

لە جاری چوارەمدا پاش کۆچکردنی میری کورد سورخاب (سوهراب)ی کوڕی بەدر لە ساڵی (١٠٧)ی زایینیی لە میرانی دەوڵەتی ئانازی (غنازی)ی کوردو میری هەرێمی شارەزوور (شـهرزور)و نـاوچـەی کـەرکـوك و یـان هـەنـدێ لـە ناوچەی کەرکوك کە لە مێژوودا هاتووە داقوقا و خانیجار (خورماتوو)ش لە دەستیدا بوو.

مـیری تـورکـان (قـەفـجـاق)ی کـوڕی ئـەرسـەلان تـاش لە عەشیرەتی (ئیوانی-ئیواقی) لە عەشیرەتە تورکمانەکانی سەلجوقی لـە نـاوچـەی شـارەزوورو نـاوچـەی کـەرکوکدا میرنشینی خۆی دامـەزرانـدو کەرکوکی کـردە مەڵبەندی میرنشینە فراوانـەکـەی و ئەمە سـەرەتـای جێنشین بوونی تورکمان بوو لە هـەردوو ناوچەدا بە پشتگیری دەوڵەتی سەلجوقی چونکە سورخاب نەیدەهێلا تورکمان بێنە ناوچەی کەرکوك و شـارەزوور بـەڵام لە کاتی سورخابدا عەشیرەتی ئیوانی کە (بەیات) لە تیرەکانی بوو دامەزرابوو لە ناوچەکانی نێوان (زەهاو) تا نزیك هەمەدان.

لە جاری پێنجەمدا کەرکوك بـووە مەڵبەندی (ولایـەتی شـارەزوور) لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە، کە سوڵتانی عوسمانی کوردستانی باشووری داگیر کرد لە ساڵی (١٥٣٤)ی زایینیدا، هەندێ لە ناوچەی کرمانشا لەگەڵ ناوچەی مەریوان و سەردەشت و شنۆو هەندێ لە هەکاریش لە نێو چوارچێوەی ولایەتی شارەزووردا بوو و لە ساڵی (١٨٧٠)ی زایینیدا (مەدحەت پاشا) ناوی گۆڕی بە (متصرفیة شهرزور)[3].

٦. ئـەوەی بـەرچـاو دەکـەوێـت لـە هـونـەری تـەلارسـازی کەرکوکدا بوونی کۆڵەکەو کەوانەیە بە شێوەیەکی بەرچاو لە هەموو بوارەکانی هونەری تەلارسازیدا، ئەویش لە رێگای ئەو پاشماوانەی کە بۆمان بە جێماوە ئەوە دەخەنە روو کە هونەری کۆڵەکەو کەوانە بەشێکی دانەبڕاوە لە هونەری بیناسازی ناوچەکانی کەرکوك.

بـوونـی کـۆڵـەکـە بە شـێـوەی جـۆراوجـۆرو کـەرەسـتـەی هەمەچەشن بەکار هێنراوە بەتایبەتی لە شێوەی بازنەیی و چـوارگـۆشـەیـی و لـوولـەکـیـدا، ئـەمـیـش هـاوپـەیـوەسـتی مێژوویەکی دوورودرێژە لە بنەماکانی خانووبەرەدا هەر لە سەردەمە زووەکانەوە تاوەکو ئەم سەردەمەی ئێستامان.

دروستکردنی کۆڵەکە بە جۆرەها کەرەستەی وەکو (بەرد، گەچ، مەڕمەڕ) دروست کـراوەو لە هەندێك کاتدا رەنگیش دەوری خۆی بینیووە لە رازاندنەوەیدا.

کـەوانـە ئـەو بەشە دانـەبـڕاوەیـە لە هـونـەری تـەلارسـازی

کەرکوکدا کە هەر لە سەردەمانێکی زوودا نموونەی جۆراوجۆرو بەرچاومان هەیە کە خۆی دەبینێتەوە لە جۆرەها شێوەی کەوانە، وەکو: (کەوانەی پەیژەیی، کەوانەی هێلکەیی، کەوانەی نیو بازنەیی، کەوانەی درێژەوەبوو، کەوانەی کوور، کەوانەی راست، کەوانەی ڕاکشاو)[٤] لەگەڵ گەلێك جۆری تری کەوانە.

ئەگەر سەیری شارستانییە بەرچاوەکانی کەرکوك بکەین وەکو (سەردەمی هوری–میتانی، ئاشووری، میدی، ساسانی) گەلێك شێوەی کەوانەیی جۆربەجۆر لە هونەری تەرلاسازی ئەو کاتەدا بەکارهاتووە، هەندێك جار لەگەڵ کۆڵەکەو جۆرەکانی تێکهەڵکێشی یەکتری بوونە بە شێوەیەکی ئەوتۆ بوونەتە دووانەیەکی هاوگونجاو لە تەرلاسازی کەرکوکدا، یان بە واتایەکی تر نەبوونی ئەو دوو بنەمایە لە هونەری تەرلاسازی کەرکوکدا بە کەم‌و کورتی حیساب دەکرێت، یان ئەو گرنگییەی نابێت کە جوانکاری خۆی بەدەر بخات.

٧. ڕەنگ لە تەلارسازی کەرکوکدا بەشێکی بەرچاوی داگیر کردووە، لە هەمان کاتدا هاوگونجاوی سەردەمە مێژووییە جیاجیاکان بووە، بە شێوەیەکی ئەوتۆ تێکهەڵکێشی جۆرەها ڕەنگ بووە، خاوەنی ڕەنگدانەوەی ئایین‌و نەتەوەو بیروباوەڕە کۆمەڵایەتییەکانی نێو کۆمەڵگەی کەرکوك بووە.

جۆرەکانی ڕەنگ‌و ئەو هێمایانەی تێکهەڵکێشی ڕەنگەکانی بوونە دەوریان بینیوە لە جوانکاری هونەری تەلارسازیدا، بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە ڕەنگدانەوەو بەکارهێنانی دەوری بینیوە لە تەرلاسازی کەرکوکدا، کە هێمای ئەو ماوە مێژووییانە بووە کە پێدا تێپەڕیوە.

٨. لە نێو کەرکوك‌و دەوروبەریدا گەلێك تایبەتمەندی تەلارسازی هەیە کە لە شارەکانی تری جیا دەکاتەوە ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو داهێنانەی کە ئاوەزی مرۆڤی ئەو ناوچەیە داهێنانی تێدا کردووە لە دروست کردنی کۆڵەکەو ئاسیاو و خان‌و مزگەوت‌و بانگۆی مزگەوتەکان، ئەگەر بێت‌و بەراوردێکی بیناکاری‌و نەخش‌و نیگاری بکەین تایبەتمەندی خۆی تێدا دەدۆزرێتەوە کە جیاوازە لە ناوچەکانی تر، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری ژینگەیی‌و مرۆیی‌و جۆری کەرەستەکانی ئەو ناوچەیە.



مزگەوتی (کەلۆر) لەلایەن (دەروێش عەبدوڵڵا)وە لە سەرەتای پەنجاکان دروست کراوە، بەرزی بڵندگۆکەی (١٢) مەترەو بە قوڕو خشت دروست کراوە، دوو پەیژەی هەبووە یەکێکیان لە ناوەوە ئەوی تریان لە دەرەوە.



* سەرچاوەو پەراوێزەکان:

(١) (کەرکووك لە نێوان رابردوو و ئێستاو داهاتوودا)، د. ئازاد حەمە ئەحمەد شێخانی، ٢٠١٣، لاپەرە (٤١).
(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٥٦).
(٣) (وێران کردنی قەڵای کەرکوك و هەوڵدانم بۆ رزگارکردنی)، عەبدولڕەقیب یوسف، ٢٠١٠، لاپەڕەکانی (١٨-٢١).
(٤) گۆڤاری (سوبارتو)، ژمارە ٢، ساڵی دووەم، پایزی ساڵی (٢٠٠٨)، لاپەرە (٨٤)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی: (العقود في عمارة بلاد الرافدين القديمة)، لە نووسینی: ئاری خەلیل مەنمی.



# سەرچاوەکان

* سەرچاوەکانی کتێب بە زمانی کوردی:

– (بانگەوازێك بۆ ڕووناکبیرانی کورد، لە پێناوی کۆکردنەوەو زیندوو کردنەوەی کەلەپووری کوردیدا)، عەبدولڕقیب یوسف، بڵاوکراوەکانی پرۆژەی هاوسەر، ساڵی ۱۹۸۵، چاپخانەی (کامەران)، سلێمانی.

– (مێژووی نەتەوەی کورد)، ساڵح قەفتان.

– (میدیا)، ئی م دیاکۆف، وەرگێڕانی بورهان قانع ساڵی ۱۹۷۸ چاپی یەکەم.

– (گەشتێك لە کوردستاندا)، عەلائوددین سوجادی، ساڵی ۱۹٥٦، چاپخانەی (معارف)، بەغدا.

– (مێژووی مۆسیقای کوردی)، حەمەی حەمە باقی، بەشی یەکەم.

– (زەردەشت)، نووسین و ئامادەکردنی عەبدوڵڵا قەرەداغی (مەلا عەلی)، سوید، ۱۹۹۷، چاپی یەکەم، ۱۹۹۷، ستۆکهۆڵم.

– (شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ، ۱۹۲۰)، نووسینی مستەفا نەریمان، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی ۱۹۸۵.

– (لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری)، د. جەماڵ ڕەشید، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ۱۹۸۸.

– (وێرانکردنی قەڵای کەرکوك و هەوڵدانم بۆ ڕزگارکردنی)، عەبدولڕەقیب یوسف، هەولێر، ۲۰۱۰.

– (بیرەوەرییەکانی ژیانم)، مستەفا نەریمان، بەغدا، ۱۹۹٤.

– (شاعیرو ناودارانی کاکەیی)، هەردەوێل کاکەیی، ساڵی ۱۹۹۰، بەغدا.

– (شاری سلێمانی)، بەرگی یەکەم، ئەکرەمی مەحموودی ڕەشە، بەغدا، (دار الحرية للطباعة)، ۱۹۸۷.

– (شاری سلێمانی)، بەرگی دووەم، چاپی دووەم، نووسین و کۆکردنەوەی ئەکرەمی مەحمودی ساڵەی ڕەشە، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، ساڵی ۱۹۸۹.

– (ئاوڕدانەوەیەك لەبزوتنەوەی هەقە)، مستەفا عەسکەری، چاپخانەی عەلا، بەغدا، ۱۹۸۳.

– (فەرهەنگی کشتوکاڵ)، مەعروف قەرەداغی مەردۆخی، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم، دار السلام، بەغدا، ۱۹۷۲.

– (کەرکووك لە نێوان ڕابردوو و ئێستا و داهاتوودا)، د. ئازاد حەمە ئەحمەد شێخانی، ۲۰۱۳.

* سەرچاوەکانی کتێب بە زمانی عەرەبی:

– (المدارس اليهودية والإيرانية في العراق، دراسة مقارنة)، د.فازڵ ئەلبەراك، چاپی دووەم، بەغدا، ۱۹۸۵.

– (الكشاف الاثري في العراق)، د. قەحتان ڕەشید ساڵح، بەغدا، ساڵی ۱۹۸۷،

– (تاريخ الفن العراقي القديم، الرسم والنقوش الجدارية والفخارية والحجرية وعلاقتها بفنون الاطفال)، نووسینی، محەمەد حوسێن جودی، وەزارەتی ڕاگەیاندنی عێراقی یارمەتیداوە لە بڵاوکردنەوەی، چاپخانەی نوعمان، نەجەف، ساڵی، (۱۹۷٤ م – ۱۳۹٤ هـ)، بەشی یەکەم.

– (المرشد الى مواطن الاثار والحضارة، الرحلة الرابعة، بغداد–كركوك–السليمانية)، نووسینی: تاها باقر، فوئاد سەفەر، بەغدا، ۱۹٦٥.

- (المرشد الى مواطن الاثار والحضارة، الرحلة الخامسة، بغداد-اربيل)، ١٩٦٦.
- (المرشد الى مواطن الاثار والحضارة، الرحلة السادسة، بغداد-حلبجة)، ١٩٦٦.
- (العراق القديم)، جۆرج رۆ، وەرگێڕانی: حوسێن عەلوان حوسێن، وەزارەتی رۆشنبیریو راگەیاندنی عێراق، ١٩٨٤.
- (حضارة العراق)، بەرگی یەکەم، نووسینی کۆمەڵێك نووسەرو مێژوونووس، چاپخانەی (الحرية).
- (حضارة العراق)، بەرگی سێیەم، نووسینی کۆمەڵێك نووسەرو مێژوونووس، چاپخانەی (الحرية).
- (حضارة العراق)، بەرگی نۆیەم، نووسینی کۆمەڵێك نووسەرو مێژوونووس، چاپخانەی (الحرية).
- (حضارة العراق)، بەرگی دەیەم، نووسینی کۆمەڵێك نووسەرو مێژوونووس، چاپخانەی (الحرية).
- (مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، الجزء الاول، الوجيز في تاريخ حضارة وادي الرافدين)، نووسینی، (تاها باقر)، بڵاوکراوەکانی (دار البيان)، چاپی یەکەم، (١٩٧٣، ١٣٩٣) چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا.
- (تاريخ فن العمارة العراقية في مختلف العصور) نووسینی (شەریف یوسف)، (دار الرشيد للنشر)، ١٩٨٢.
- (الكهف الاثري في العراق)، دکتۆر قەحتان رەشید سالح.
- (نشوء الحضارة)، دیڤدو جوان ئۆتس، وەرگێڕانی (لوتفی ئەلخوری)، دار الشؤون الثقافية العامة، زنجیرەی سەد کتێب، چاپی یەکەم، ١٩٨٨، چاپخانەی (دار الحرية للطباعة) بەغدا.
- (الفن في العراق القديم)، ئەنتوان مورتگات، وەرگێڕانی د. عیسا سەلمان، سەلیم تاها تکریتی، چاپخانەی (الاديب البغدادي)، بەغدا ١٩٧٥.
- (آثار بلاد الرافدين)، سینتون لوید، وەرگێڕانی د. سامی سەعید ئەلئەحمەدی، وەزارەتی رۆشنبیریو راگەیاندن، (دار الرشيد للنشر)، ١٩٨٠.
- (كركوك وهويتها العمرانية)، سوبحی سەعاتچی، (مؤسسة وقف كركوك)، کەرکوك، ٢٠١٠.
- (الفن في العراق القديم، سومر وبابل وآشور)، د. سەروەت عوکاشە، (المؤسسة العامة للدراسات والنشر)، بەیروت، چاپخانەی (فينيقيا).
- (متحف راوتنشتراوخ بوست لمدينة كولونيا كنوز فن العراق من العصور القديمة حتى الاسلام معرض في متحف)، ٢٧ حوزەیران هەتا ٢٠ ئەیلول ١٩٦٤.
- (المدينة والحياة المدنية)، بەشی یەکەم، کۆمەڵێك لە مامۆسایانی مێژوو، بەغدا، ١٩٨٨.
- (المدينة والحياة المدنية)، بەشی سێیەم، کۆمەڵێك مێژوونووس، بەغدا، ١٩٨٨.
- (الكاشيون ١٥٣٠-١١٦٠ ق. م.)، دکتۆر مەحمود ئەمین، چاپخانەی (العاني)، بەغدا، ١٩٦٣.
- (العراق قديماً وحديثاً)، عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی، چاپی حەوتەم، لە بڵاوکراوەکانی (دار اليقظة العربية)، بەغدا، ١٩٨٢.
- (الأسواق الشعبية في مدينة كركوك، دراسة انثروبولوجية)، شەفیق ئیبراهیم سالح ئەلجبوری، نامەی ماجستێر بەسەرپەرشتی د. خالید فەرج ئەلجابری، حوزەیران، ١٩٩٤ م-١٤١٥هـ).
- (ماذا في كركوك) فەهمی عەرب ئاغا، فازڵ محەمەد مەلا مستەفا، ساڵی (١٩٥٧).
- (بلاد مابين النهرين)، ليوا وينهايم، وەرگێڕانی فەیزی عەبدولرەزاق، ١٩٨١، لە بڵاوکروەکانی (دار الرشيد للنشر).
- (العراق في التاريخ)، نووسینی کۆمەڵێك نووسەری عێراقی.
- (فنون الشرق الأوسط، من الغزو الأغريقي حتى الفتح الاسلامي)، نیعمەت ئیسماعیل عەلام، (دار المعارف) لە میسر، ١٩٧٥.
- (لمحات عن الفن العراقي)، د. خالد جادر، سلسلة الثقافة الشعبية، مديرية الفنون والثقافة الشعبية، وزارة الأرشاد، چاپخانەی (الرابطة)، بەغدا.
- (شهداء المشرق)، الاب البير ابونا، بەشی یەکەم، بەغدا ١٩٨٥.
- (زمن لكل الأزمنة، نظرات وآراء في الفن)، نووسینی (بلند حەیدەری)، چاپی یەکەم، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بەیروت، ١٩٨١.
- (الأصول المعمارية للملوية)، د. تاهیر موزەفەر ئەلعەمید.
- (الفنون الاسلامية)، م. س. ديماند، وەرگێڕانی: ئەحمەد محەمەد عیسا، بەدواداچوونەوە: د. ئەحمەد فیکری، (دار المعارف) لە میسر، چاپی دووەم، ساڵی (١٩٥٨).
- (التصوير في الاسلام عند الفرس)، زەکی محەمەد حەسەن، چاپی یەکەم، چاپخانەی (لجنة التأليف والترجمة والنشر)، ساڵی (١٣٥٤-١٩٣٦).
- (المدينة الأسلامية)، د. محەمەد عەبدولستار عوسمان، (عالم المعرفة)، کوێت، ١٩٨٨، چاپخانەی (الرسالة).
- (مراكز ثقافية معمورة في كردستان، دراسة اهم المراكز الثقافية التي برزت في شمال العراق خلال القرون المتأخرة)، د. عیماد عەبدولسەلام رەئوف، بەغدا، ١٩٩٧، (دار الثقافة والنشر الكردية).
- (الفنون الاسلامية في العصر الاسلامي)، د. زەکی محەمەد حەسەن، چاپی دووەم، قاهیرە، چاپخانەی (الكتب المصرية)، ١٩٤٦، لە چاپکراوەکانی (دار الآثار العربية).
- (القباب المخروطية في العراق)، عەتا ئەلحەدیسی، هەنا عەبدولخالق، بەغدا، ١٩٧٤، چاپخانەی (الحرية).

- (المشاهدات ذات القباب المخروطي في العراق)، عەلائوددین ئەحمەد ئەلعانی، (دار الحرية للطباعة).
- (العمارات العربية الاسلامية في العراق)، بەرگی یەکەم، نووسینی هەر یەکە لە: د. عیسا سەلمان، نەجلە ئەلعیزی، هەنا عەبدولخالق، نەجاە یونس، ساڵی (١٩٨٢).
- (لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث)، بەشی یەکەم، د. عەلی ئەلوەردی، چاپخانەی (الارشاد)، ١٩٦٩.
- (تاريخ في العهد العثماني ١٦٣٨ز - ١٧٥٠ز، دراسة في احواله السياسية)، چاپی یەکەم، ١٩٨٤.
- (فنون الاسلام)، د. زەکی محەمەد حەسەن، چاپی یەکەم، ١٩٤٨ (مكتبة النهضة المصرية)، قاهیرە، چاپخانەی (لجنة التأليف والترجمة والنشر).
- (القاموس العلمي، عربي - كردي)، بەشی یەکەم، کەمال جەلال غەریب، چاپی یەکەم، ١٩٧٤، چاپخانەی (کامەران)، سلێمانی.
- (القاموس العلمي)، کەمال جەلال غەریب، بەشی دووەم.
- (كركوك المدينة التي تغفو على اديمها ذاكرة التأريخ)، جیهاد زایر، محەمەد جەبیر.
- (كركوك وهويتها العمرانية)، سوبحی سەعاتچی، ٢٠١٠.
- (الجيش والسلاح)، بەشی پێنجەم، بەغدا، ١٩٨٨.
- (سوق القيصيرية الاثري في كركوك)، محەمەد عەبدوڵڵا سالح.
- (العراق الشمالي)، محەمەد هادی ئەلدەفتەری، عەبدوڵڵا حەسەن.
- (ابراهيم خان ثائر من كوردستان)، موکەڕەم تاڵەبانی، چاپخانەی ئەسعەد - بەغدا، ١٩٧١.
- (العمارة الحديثة في العراق، تحليل مقارن في هندسة العمارة والتخطيط)، ئەندازیار عەقیل نوری مەلا حوێش، (دار الشؤون الثقافية العامة)، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٨.
- (الفن المعماري والهندسة التشكيلية العامة في المساجد الاسلامية والمراقد المقدسة)، شاکر هادی غەزەب.
- (الأكراد، دراسة جغرافية اثنوغرافية)، د. شاکر خەسباك، زانکۆی بەغدا، چاپخانەی (الشرقية)، ١٩٧٢.
- (المنجد، معجم مدرسي للغة العربية)، لویس مەعلوف، چاپخانەی (الكاثوليكية)، بەیروت، چاپی دەیەم، نیسان، ١٩٥١.
- (المنجد، معجم مدرسي للغة العربية)، لویس مەعلوف، چاپی دوانزەهەم، چاپخانەی (الكاثوليكية)، بەیروت، نیسان، ١٩٥١.
- (دراسات كردية في بلاد سوبارتو)، د.جەمال ڕەشید ئەحمەد، بەغدا، ١٩٨٤.
- (مجمع الكنائس الشرقية، توجيه، لتطبيق المبادئ الليترجية الواردة في مجموعة قوانين الكنائس الشرقية)، لە بڵاوکراوەکانی (اللجنة الأسقفية لوسائل الأعلام)، جل الديب، لوبنان.

· سەرچاوەکانی کتێب بە زمانی تورکی:
- (کرکوکده اجتماعی حیات)، شاکر سابیر زابت، بەزمانی تورکی.

· سەرچاوەکانی کتێب بە زمانی ئینگلیزی:
- (قەڵای کەرکوك)، دلێر هیدایەت، بەزمانی ئینگلیزی، نامەی ماجستێرە کە لەزانکۆی بەغدا وەریگرتووە.

· سەرچاوەکانی کتێب بە زمانی فەرەنسی:
- (الكنيسة في الأزمنة البربرية)، وەرگێڕاوە لە زمانی فەرەنسییەوە، نووسینی (دانیال ڕوبس) (LEGLISE DESTEMPS BABARES 1950).

· سەرچاوەکانی گۆڤارو ڕۆژنامەکان:
* گۆڤاری (کۆڕی زانیاری کورد - المجمع العلمي الكردي):
- گۆڤاری (کۆڕی زانیاری کورد - المجمع العلمي الكردي)، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ساڵی ١٩٧٣، چاپخانەی (کۆڕی زانیاری کورد)، بەغدا، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(عصور ما قبل التأريخ في وادي الرافدين على ضوء التنقيبات الاثرية في كردستان العراق) نووسینی: تاها باقر.
- گۆڤاری (کۆڕی زانیاری کورد)، بەرگی دووەم، بەشی دووەم.
* گۆڤاری (کاروان):
- گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢)، تشرینی دووەم، ١٩٨٢، لیکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(شێوەی کەڵەکی لەهونەری ئاوەدان کردنەوەی کوردیدا)، عەبدلرەقیب یوسف.
- گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٣)، تشرینی یەکەم، ساڵی ١٩٨٣، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(من المواقع الاثرية في كردستان - بەردەبەڵکە)، نووسینی کەمال نوری مەعروف.
- گۆڤاری (کاروان)، ژمارە ١٦، کانوونی دووەم، ساڵی دووەم، ١٩٨٣، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(من المواقع الاثرية في كردستان-کەریم شاهر)، نووسینی کەمال نوری مەعروف.

- گۆڤاری (کاروان)، ژمارە ٦٢ کانونی دووەمو شوبات، ساڵی ١٩٨٨، لێکۆڵینەوەیەك بە ناونیشانی:
(سۆمەریەکان ئاری بوون)، نووسینی پاکیزە رەفیق حیلمی.
* گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ):
- گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە (٥٥-٥٦)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(یەکەمین لانکەی مرۆڤایەتی)، نووسینی (رەزا شوان).
- گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١١)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(مرۆڤی چاخی بەستەڵەك)، نووسینی (دکتۆر جەمال رەشید ئەحمەد).
- گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١٤)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(کوردستان لە دوا دوای چاخی سەهۆڵبەندانەکەدا). نووسینی (فوئاد حەمە خورشید)و (مەریەم عەزیز فەتاح)، حوزیران، ساڵی (١٩٨٧).
- گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە ١٣٨، ١٩٩٦، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(تاکەی خۆمان بەکەم بزانین)، د. حەسەن جاف.
- گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە ١٤٠.
- گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١٤٠)ی ساڵی (١٩٩٧)، لاپەڕە (٥٧)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناو نیشانی:
(باجگری و دۆخی ئابووری ناوچەکانی کوردستان)، دکتۆر کاوێس قەفتان.
* گۆڤاری (رەنگین):
- گۆڤاری (رەنگین)، ژمارە (٥٠)، ساڵی ١٩٩٢، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(وولاتەکەی خۆت بناسە، کوردستانی پێش مێژوو. بەشی سێیەم، دەربارەی قەڵای (چەرمو).
- گۆڤاری (رەنگین)، ژمارە ٩٦، ١٩٩٦، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(سیروان، شیروانە نییە)، مەلا جەمیل رۆژبەیانی.
- گۆڤاری (رەنگین)، ژمارە (١٠٠-١٠١)، ١٩٩٧، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(قەڵای شێروانە رەمزی زیرەکی و مەردایەتی حەمە پاشای جافە)، عەبدوڵڵا کاکە رەش.
- گۆڤاری (رەنگین)، ژمارە ١٤٧، نیسان، ٢٠٠١، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(هەوارگەی دڵان و گوڵاڵەی دەشتی گەرمیان، ناوچەی حەوتەغان)، ئیدریس هەفتەغاری و حەسەن عەلی.
* گۆڤاری (اهل النفط):
- گۆڤاری (اهل النفط)، کانوونی دووەم، ساڵی ١٩٥٢، ساڵی یەکەم، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(اهل النفط تتحدث في چرمو مع الباحثين (لان ادم عرف النفط)، نووسینی: عەبدولستار فەوزی.
* گۆڤاری (شانەدەر):
- گۆڤاری (شانەدەر)، ژمارە ٦، حوزیرانی ١٩٨٨، ساڵی دووەم، ساڵی (١٩٩٨)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(فخار ماقبل التاريخ والعصور التاريخية، اشكاله والوانه وزخارفه)، نووسینی زوبێر بیلال ئیسماعیل.
* گۆڤاری (آفاق عربية):
- گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە (٥)، ١٩٥٦.
- گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە ٧ ساڵی دووەم، ١٩٧٣.
- گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە (٥)، کانونی دووەم، ١٩٧٦.
- گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە ٧ ساڵی دووەم، ساڵی ١٩٧٧.
- گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە ١٠، ١٩٨٠، ساڵی پێنجەم، حوزەیران، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(دراسة في عمارة العراق بين الحربين ١٩٢٠-١٩٤٠)، د. خالد السلطاني.
- گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە ٢، ساڵی ١٩٨٤، ساڵی دەیەم، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(التناسب في العمارة الاسلامية)، عەوف عەبدولڕەحمان خزن).
- گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە ٣، ساڵی ١٩٨٤، تشرین دووەم، لێکۆڵینەوەیەکە بەناو نیشانی:
(جمالية الفن العربي الاسلامي في الخط والزخرفة)، محەمەد حوسێن جودی.
- گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە ٤، ساڵی دەیەم، کانونی یەکەم، ١٩٨٤، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(دراسة فی عمارة الخمسينات في العراق)، د.خالد السلطانی.
- گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە (١، ٢)، ساڵی دەیەم، کانونی یەکەم، ١٩٨٥.
- گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە ٨، ساڵی دوانزەهەم، ١٩٨٧، لاپەڕە (٧٠-٧٨)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(العناصر التشكيلية في العمارة)، ناوی نووسەرو وەرگێڕەکەی دیار نییە.
- گۆڤاری (افاق عربية)، ژمارە (٥) ایار (١٩٨٨)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(الشناشيل طراز معماري عربي اصيل)، حەمید محەمەد حەسەن.

